# زانایانی ئیسلام

## کێن و چۆن؟



عەلی باپیر



# زانایانی ئیسلام

# کێن و چۆنن؟

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

نووسینی

**عەلی باپیر**

چاپی سێیەم

١٤٣٢ك - ٢٠١١ز




﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ
ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ
بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴾ فاطر: ٢٣

﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ
وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴾ السجدة: ٤٢



## پێشکەش بێ:

١- بەزاناو پێشەوا رەسەنەکانی ئیسلام کە:

چاك دەزانن چی‌یان لەپێغەمبەری خواوە ﷺ بە میرات گرتووە، لەبەرچی پلە پایەی بەرزی میراتگرێتی پێغەمبەرو پێشەوایەتی مسوڵمانانیان وەرگرتوە. بۆیە بەهەر نرخێك بێ میراتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەپارێزن و، لەژێر گوشاری هیچ ترس و تەماعێکیش دا لەبیریان ناچێو لێیان تێك ناچێ، کە لەبەر چیو هەتاکەی شایستەی پێشەوایەتیو خاوەنی حورمەت و رێزن!

٢- بە هەموو ئەو زاناو پێشەوا رەسەن و مامۆستا بەرێزانەی کە ناڕاستەوخۆ لەکتێب و بەرهەمە بەپێزەکانیان و راستەوخۆ لەقسەو فێرکردن و ئامۆژگاریو ئاراستە بەهێزەکانیان، بەهرەمەند بووم و بۆم بوونەتە چراو مۆم و لەشەوەزەنگی بێئاگایی‌دا پێیان بەرەو خوا چووم. خوایە بەچاکترین شێوە پاداشتیان بدەیەوەو پلەوپایەیان یەکجار بەرزبکەیەوەو لە چڵکی گوناح و هەڵە خاوێنیان بکەیەوە.

٣- بە گەنج و قوتابی‌یە هۆشیارو بێدارەکانمان کە: بۆ خزمەتی میللەت لەژێر سایەی شەریعەت دا لەگەڵ مامۆستاو پێشەوایان دا زۆر گورج و گۆڵ خوێن گەرم و یەکجار بەئەدەب و شەرمن، هەم وەك پێویست رێزیان دەگرن، هەم زانستیان لێ وەردەگرن، هەم لەبەرانبەر ناحەزاندا وەك چاویان دەیان پارێزن و، وەك پوورە هەنگ دەوریان دەگرن.



# پێشەكی چاپی سێیەم

الحمد لله حق حمده والصلاة والسلام عبده وآله السائرين على دَرْبهِ والمنخرطين في سلك حزبهِ.

**خوێنەری بەڕێزو سەنگین!**

لەم چاپی سێیەمەی كتێبی: (زانایانی ئیسلام كێن و چۆنن؟!)دا بەپێویستی دەزانم ئاماژەیەكی كورت بەچەند مەسەلەیەك بكەم:

**یەكەم:** لەم ڕۆژگارەدا ئەركی زاناو شارەزایانی ئیسلام و پێشەوایانی موسوڵمانان، یەكجار هەستیارو دژوارە، هەستیارە: چونكە موسوڵمانان چ لە كوردستان و عیراق و چ لە غەیری عیراقدا، لەگەڵ هێرش و پەلامارێكی بێڕەزای سیكۆلاریزم و ئیباحییەت و بێبەندو بارییو بەرەڵاییدا روو بەڕوو بوونەتەوەو، بەرەنگاربوونەوەش پەكی لەسەر ئیمانی پتەوو دامەزراوو بەرچاوڕوونییو شارەزایی تەواو كەوتوە، كە دیارە پێشەنگی كاروانی ڕووبەڕووبوونەوەو بەرەنگارییش ناگونجێ جگە لە زاناو پێشەوایانی ئیسلام و موسوڵمانان كەسێكی دیكە بێ، هەروەها دژوارە: چونكە لەم ڕۆژگاری شۆڕشی زانراوەكان (الثورة المعلوماتیة)و چاوكرانەوەی گشتی خەڵك و جەماوەردا، زانابوون بە ئیسلام و پێشەوابوون بۆ موسوڵمانان، كارێكی ئاسان نییە مادام مامۆستایان بەناوی بێنێوەڕۆك و ناوونیشانی بێكرۆك رازی نەبن!

بەڵێ بەڕاستی هەركەسێك بیەوێ لەم ڕۆژگارەدا ببێتە ئەهلی میحراب و مینبەرو مافی پێشەوایەتی و مامۆستایەتی و چاوساغێتی بدات، پێویستە باش خۆی ئامادە بكات لە هەموو بوارەكانی فیكرییو عیلمییو عەقیدەییو رووحییو هۆشیاری سیاسی و

کۆمەڵایەتی دا، ئەگەرنا بێگومان لەئاستی جێبەجێ کردنی ئەرکی هەستیارو دژواریان دانابن و شیعری: (کالساعي الی الهَیْجا بغیر سلاح)یان بەسەردا دەچەسپێ.

**دووەم:** مادام زاناو شارەزایانی ئیسلام و پێشەوایانی موسوڵمانان، خۆیان بە جێگرو میراتگری پێغەمبەران (صلی الله علیهم وسلم) بزانن -کە دیارە ئەمەش راستییەکی نکووڵی لێ نەکراوە، بەڵام بۆ کەسانی شایستە-، پێویستە هەمیشەو دایم سیرەو ژیان و گوزەران و رەفتارو ئاکارو هەڵوێستەکانی پێغەمبەرانیان لەبەرچاوبێ، تاکو بە کردەوە بیانکەنە سەرمەشق و پێشڕەوی خۆیان و هەوڵبدەن لەقەدەر ئەوان بن!

بەڵێ فەرمایشتی: (إِنَّ العلماءَ وَرثَةُ الأنبیاء)[1]، کاتێك پێناسەو وەسفێکی شایستەی زانایان و شارەزایانی ئیسلام و مامۆستاو چاوساغانی موسوڵمانان دەبێو بەسەریاندا دەچەسپێ، کە ئەوانیش کەم و زۆر وەك پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بچن، لەئیمان و عەقیدەو خواپەرستیی و رەوشت و ئاکارو هەڵوێست و رەفتارو... هتدیاندا.

جا هەرکەسێ لە زانایان و شارەزایانی ئیسلام و پێشەوایانی موسوڵمانان، بەئەندازەی ئەوە بەمیراتگرو جێنشینی پێغەمبەرانی خوا (صلی الله علیهم وسلم) دادەنرێ، کە بەکردەوە لەو میراتەی ئەو بەرێزانەی پێبڕاوەو، تێیدا دەرکەوتوەو بەرجەستە بووە.

**سێیەم:** یاسا (سُنَّە)یەکی باوی خوای کابەجێیە سبحانە وتعالی کە هیچ کەس بەبێ تەحەممولکردنی رەنج و زەحمەت، هیچ بەرهەمێکی دەسگیر نابێو، بەهیچ ئامانجێك ناگات. وەك فەرموویەتی: ﴿ وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعۡيَهُۥ سَوۡفَ يُرَىٰ ﴾[2] واتە: وە کە مرۆڤ هیچ شتێکی دەسگیرنابێ مەگەر هەوڵی بۆ بدات و کۆششی بۆ بکات، وە کە بەرهەمی کۆششەکەی لەمەودوا دەبینرێ.

بۆیە پێویستە زاناو پێشەوایان ئەو راستییە لەدڵو مێشکیاندا درەوشاوەبێ، کە وەك چۆن بە ئەندازەی ئەوە کە فیکرو ئیمان و عەقیدەو عیبادەت و رەوشت و ئاکارو هەڵوێستی پێغەمبەرانیان تێدا بەرجەستە دەبێ، بەجێگرو میراتگری ئەوان دادەنرێن، بەهەمان شێوەش، بە ئەندازەی ئەوە دەتوانن هەڵگری فیکرو ئیمان و عەقیدەو عیبادەت

---

١- رواه أبوداود والترمذي وابن ماجه وحَسَّنه الألباني.

٢- النجم: ٣٩ - ٤٠

و ڕەوشت و ئاكارو ڕەفتارو هەڵوێستی پێغەمبەران بن، كە وەك ئەوان ئامادەیی باج (ضريبة)دان بن، چونكە وەك گوتراوە: (الغُنْمُ بالغُرْمِ) بەئەندازەی قازانج زیانیش هەیە! كەواتە، هەركەسێك بەبێ ئامادەیی فیداكاریی و سەروماڵ بەخشین لەپێناوی خواو ئایین و بەرنامەكەی دا، كەڵكەڵەی میراتگرێتی و جێگرێتی پێغەمبەرانی (عليهم الصلاة والسلام) لەكەللەدا بێ، با دڵنیا بێ كە خەیاڵپڵاوی كردوە!.

**لەكۆتایی‌دا:** هیوادارم ئەم كتێبە مایەی بەرچاو ڕوونیی مامۆستایانی بەڕێزو خۆشەویست بێو مایەی بەرزكردنەوەی ئاستیان بێ، لە هەموو ڕوویەكەوە، تاكو بەراستی شایستەی نازناوو ناوونیشانی بەرزی: میراتگرانی پێغەمبەران (ورثة الأنبياء)بن.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله الاّ أنت أستغفرك وأتوب إليك

**٢٣ شوال ١٤٣١ بەرانبەر ٢٠١٠/١٠/٢**

**هەولێر**





# پێشەکی چاپی دووەم

الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات، وعلى محمد وآله من الله تعالى الصلوات والسلام والبركات.

**خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!**

ئەوە ستایش بۆ خوای بێ وێنەو بەخشەر پاش لەکتێبخانانەدا نەمانی کتێبی (**زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟!**) لەماوەیەکی کەمداو لەسەر داوای دڵسۆزانێکی زۆر بۆ جاری دووەم لەچاپی دەدەینەوە، کت ومت وەك خۆیو بێ هیچ دەستکارییەك، بەلام بەپەسەندم زانی لەم پێشەکییەدا ئاماژە بەم چەند خاڵە بکەم:

**یەکەم:** هیوادارم بەندە لەم کتێبەدا توانیبێتم کە لەبواری ناساندن و هەڵوێست وەرگرتن لەئاست زاناو پێشەوایانی ئیسلامدا ئامانجم پێکابێت و گیرۆدەی ئەو تێپەڕاندن و بەزایەدان (إفراط تفریط)انە نەبووبم کە کەم و زۆر کەسانێکی زۆر لەسەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگا دووچاریان دەبن![1]

---

١– بۆ وێنە پاش کەوتنە بازاڕی ئەم کتێبە لەچەند لایەکەوە هەواڵی هەڵوێستی تێپەڕێنەرانەو بەزایەدەرانەی چەند کەسێکم لەبارەی هەندێك لەو زاناو پێشەوایانەوە کەباسی هەڵوێستەکانیانم کردوە، بەگوێدا چوو، کە بەپەسەندی دەزانم ئاماژەیەکیان پێبکەم: جارێ لەبارەی (شیخ الإسلام ابن تیمیە)وە کە مەگەر بابایەکی بێئاگا لەمێژوو و واقیع، ئەگەر نا هیچ نکوولّیی لەزاناییو لێهاتوویی ناکا، بیستمەوە کەهەندێك کەس هەر بەبیستنی ئەوە کە یەکێك لەو زانایانە لەم کتێبەدا مەدحیان کراوە (ابن تیمیة)یە، کەوتوونەتە زەم و زەمکاری کتێب و خاوەن کتێبیش!!

دیارە هەر کەسێکیش لەو بوارەدا بەتێبینیو سەرنجی بنیاتنەرانەی بەهرەمەندم بکات لێی مەمنوون دەبم و لەچاپەکانی داهاتووشدا ئەم کتێبەیان پێ دەوڵەمەندتر دەکەم.

**دووەم:** هەندێك لەدڵسۆزان پێشنیاریان کرد کە هەڵوێستی ژمارەیەکی دیکە لەزاناو پێشەوایانمان تۆمار بکەم، بەڵام لەم هەل و مەرجەدا هەم دەرفەتم نەبوو، وە هەم ئەم ژمارەیەی کە تۆمارم کردوون بە بەس (کافي)یم زانین، بۆ داهاتووش چی پێویست بوو خوا یاربێو هەل و مەرج رەخساوو لەباربێت، ئەنجامی دەدەین ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

**سێیەم:** ژمارەیەك لەو دڵسۆزانەی پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبەو سەرنج لێدانی ئەو چەند دێڕەی لەبارەی ئەزموونی (فەقێیەتی)و (مەلایەتی) خۆمەوە نووسیومن، بەداکۆکی کردنەوە داوا دەکەن کورتەیەکیش بێت لەبارەی (ژیاننامە)ی خۆمەوە بنووسم! بەڵام من جارێ پێم زووە، جا نازانم دوایش بەوکارە رادەگەم یان نا!

**چوارەم:** هەندێ کەس تێبینی و رەخنەیان هەیە لەسەر هەندێك لەو زاناو پێشەوایانەی کە ناویان هێناوەو وەك وەفایەك بۆ لێ بەهرەمەند بوونیان- ئەگەر کەمیش بێت- یادم کردوون، بەتایبەت هاوچەرخەکانیان!

---

لەبەرانبەریشدا کەسانێك هەن کە بیستوویانە لەو کتێبەدا ئاماژە بەوە کراوە کە (ابن تیمیة) (معصوم) نیەو لەچەند مەسەلەیەکیدا بەهەڵەدا چووەو نەیپێکاوە، ئەوانیش بەبارێکی دیکەدا قەڵس و لالووت بوون و حەساسییەتیان - ئەگەر نەش بووبێ- بۆ پەیدا بووە بەرانبەر بەکتێب و دانەریش!!

دیسان دەربارەی مەلا سەعیدی نۆرسیش بەهەمان شێوە هەندێك کەس کەلای بەزایەدان (تفریط)یان گرتوە، پێیان وابووە کە (نورسی) شایستەی ئەوە نیە بەزاناو پێشەوا ناو ببرێ!

لەحاڵێك دا کە زانایی و دانایی و شایستەیی ئەو کەڵە پێشەوایە هیچ خاوەن ویژدانێکی بەئاگا لام و جیمی تێدا ناکات و بێگومان یەکێکە لەو بلیمەتانەی ئوممەتی ئیسلام کە زۆر دەگمەنن و جێی خۆیەتی نازناوی نوێ کەرەوە (مجدد)ی لێ هەڵبدرێ!

هەندێکیش کەلای تێپەڕاندن (إفراط)یان گرتوە، بەوە نیگەران بوون و پێیان سەیرو عاجباتی بووە کە دوو سێ تێبینیو سەرنجم لەسەر ئەو مامۆستایە گوتبوو، کە زیاتریش روویان لەشوێنکەوتووان و قوتابیەکانیەتی تا خودی خۆی، هەرچەندە خۆیشی بێ هەڵە هەر نیە!!.

بەڵام من لەو کارەی خۆم پەشیمان نیم و هیچ کام لە زاناو پێشەوایانیش هەمووکەس هەر لێی رازی نین و نابن و منیش نەمگوتوە کە هیچ تێبینیو رەخنەم لەو کەسانە نیە کە زیکری خێریانم کردوە، بەڵام من لەکاتی ناوهێنانی ئەو زانایانەدا حاڵەتی (وەفاو صەفا)م رەچاو کردوە، نەك هەڵسەنگاندن و لەمەحەك دان!

عەرەبیش وتویانە: (خُذ ماصَفَى دَع ماكَدر).

**پێنجەم:** هەندێك براش تێبینیيان لەسەر ئەوە هەبووە کە بەندە سەرجەم زاناو پێشەوایانی ئیسلامم بە مەشرەبە جیاجیاو جۆراوجۆرەکانیانەوە پێکەوە باس کردوون و تێکەڵم کردوون، وەك: (ابن تيمية) و (أبو حامد الغزالي) یان (مەلا سەعیدی نورسی)و (سيد قطب)! بەڵام لەڕاستیدا من پێم وایە ئەوەی کردوومە شتێکی راست و دروستەو پێچەوانەکەی هەڵەیەو جێگای رەخنەو گلەییيە، چونکە بێگومان زاناو پێشەوایانی ئیسلام هەموویان دڵسۆزی ئیسلام و مسوڵمانان بوون و پێویستیشە رێز لەهەموویان بگرین و هەرکامێکیشیان بەئەندازەی راستیو ساغی بەرهەمەکەیو لەنیشانەدانی بۆچوونەکانی قسەی لێ وەربگرین، نەك بێین تەنها چاو لەسەر چەند زانایەك چڕ دابگرین و بەس قسەو بۆچوونی هەندێکیان وەربگرین! چونکە بەم کارە هەڵەیەمان هەم دووچاری بێ رێزیی بەرانبەر بەژمارەیەکی زۆر لەزاناو پێشەوایانمان دەبین و، هەم لەچەندان دەریای پڕ گەوهەرو مرواریی پێشەوایانیشمان بێبەش دەبین.

**شەشەم:** چەند دڵسۆزێکیش بەهەندێك لەسەرنج و هەڵسەنگاندنەکانی بەندە کەلەبارەی ژمارەیەك لەو زاناو پێشەوا بەرێزانەی ناویانم هێناوەو هەڵوێستە جوامێرو پرشنگدارەکانیانم گوڵبژێر کردوە قەڵس بوون!!

لەو بارەشەوە دەڵێم: بێگومان ئێمە هەموومان لەسەر ئەوە یەکدەنگین کە جگە لەپێغەمبەران (عليهم من الله أفضل الصلوات وأتم التسليمات)، هیچ کەس لە هەڵە پارێزراو (معصوم) نیە! کەواتە: مادام لەشیرازەو بازنەی رێزو حورمەت و ئەدەب نەچینە دەرێ زۆر ئاساییە کە جاروبار بۆ دەرس و پەند لێوەرگرتن، یان بەدوای شتی هەڵە نەکەوتن، ئاماژە بۆ هەڵەو کەم و کووڕیی ئەو بەرێزانە بکەین!

دیاره منیش بەسینگ فراوانیو سوپاسەوە تێبینیو سەرنجی هەر دڵسۆزێك كە لەوبارەوە وەك وەڵام و رەخنە بیخاتە روو، وەردەگرم، پێویستیشە كە هەموومان خۆمان لەسەر ئەوە رابهێنین كە بە وریاییو هۆشیارییو بەرچاو روونییەوە شوێنی زاناو پێشەوایانمان بكەوین و لەبەرهەم و بیرو بۆچوونەكانیان بەهرەمەند بین، نەك خوانەكردە عاطفییانەو سەركێڵانە شوێنیان بكەوین و لاسایان بكەینەوە!

كە ئەوە وێڕای نەگونجانی لەگەڵ: ((تەنها بە (معصوم) دانانی قورئان و سوننەت))دا، كە سەرەنجام لەجیاتی یەك ئیسلام چەند جۆرە ئیسلامێك پەیدا دەبن! بەڵێ وێڕای ئەوە ئەم رەفتارە پێچەوانەی ئامۆژگاریو ئاڕاستەی ئەو زاناو پێشەوا بەڕێزانەشمانە، كە هەمیشە داكۆكییان لەسەر ئەوە كردوە كە قسەو بۆچوونەكانیان وەك تێگەیشتنی ئەوان بۆ ئیسلام وەربگرین، نەك وەك خودی ئیسلام، كە بێگومان ئیسلام حەقیقەتی رەها (مطلق)یەو ئەگەری هەڵەو كەم وكوڕیی تێدا نییە بەڵام بیرو بۆچوونی ئینسانەكان گوێرەیی (نسبي)یەو لەقەدەر خۆیانە، ئیمام (شافعي)یش جوانی گوتوە: (رأيِي صَوابٌ يَحْتَمِلُ الخَطَأَ ورَأيِ غَيْرِي خَطَأٌ يَحْتَمِلُ الصَّواب)

**حەوتەم:** لەكۆتایدا هەندێك برای دڵسۆزیش تێبینی ئەوەیان هەبوو كە دەبووایە ژیان و گوزەرانی ئەو زاناو پێشەوایانەمان بەوردیی هێنابایە، وەڵام و عوزریشم لەوبارەوە ئەوەیە كە من نەم ویستووە ژیاننامەی ئەو زاناو پێشەوایانە بنووسم بەڵكو وەك لە ناوونیشانەكەش دەفامرێتەوە مەبەستم پێناسەی زانایان بووە لەبەر تیشكی هەڵوێستەكانیاندا.

خوا بەكەرەمی خۆی بەرەكەت و پێزی زیاتر بخاتە سەرجەم نیازو مەبەست و قسەو هەڵوێست و رەفتارەكانمانەوە بەهۆی زیاتر تێدا هاتنەدی راستی (إصابە)و ساغیی (إخلاص)یەوە، ئامین.

٣ی ذي الحجة ١٤٢٢

٢٠٠٢/٢/١٥

ئەحمەد ئاوا



## ڕێ خۆشکردن

**خوێنەرە بەڕێزو سەنگینەکان! ئەم نووسراوەی بەردەستتان لە ئەسڵدا یەکێکە لەو وتارانەی ڕۆژانی جومعە کە لەلایەن بەندەوە لە مزگەوتی (جیهاد)دا لەسلێمانی دراون، لەڕۆژی (٦ی سەفەری ١٤٢٠)ی کۆچی بەرانبەر بە (١٩٩٩/٥/٢١)ی زایینی.**

پاشان برای خۆشەویستمان کاك (معروف مجید شاسوار) ناسراو بە (جوتیار تەکیەیی)[١] لەسەر کاسێتەوە هێناویەتە سەر کاغەزو منیش کە لەم ڕۆژانەدا چاوم بە بەرهەمە دەستنووسەکانم دا گێڕاو کەوتەوە بەرچاوم، بە پێویست و پەسەندم زانی کە لەم بارودۆخ و هەلومەرجە تایبەتیو گشتیەماندا ئامادەی بکەم بۆ چاپ و بڵاوی بکەینەوە، چونکە کەم و زۆر -لەم هەل و مەرجەدا- گوێبێستی پڕوپاگەندەو موزایەدەکردن دەبین دژ بەئیسلامیەکان بەگشتیو دژ بە بەئێمەو مانانیش بەتایبەتی کە ڕێزو حورمەتی زاناو پێشەوایانی ئیسلام ناگرین و ڕق و قینمان لێیانە ! ![٢]

ئینجا وەك سەرنجم دا پێویست بوو کە چەند بابەت و مەسەلەیەکی دیکەش دابنرێن لەگەڵ ئەم وتارە بۆ ئەوەی نێوەڕۆك زیاتر پڕ بەپێستی ناوونیشان بێت. سەرەنجام باس و بابەتەکانی ئەم نووسراوە بەم جۆرەیان لێهات:



١- پێشمەرگەی تیپی تەکیەی سەر بەهێزی سلێمانیە.

٢- هەر لەدێر زەمانەوە پڕوپاگەندەو قسەوقسەلۆك و چەواشەکاری پیشەی ئەهلی باطلی خۆ بەبێهێز زان و دەستەپاچە بووە، لەبەرانبەر هەق و ڕاستیی ئەهلی هەقدا وەك لەگەلێك ئایەتی قورئاندا دەبینرێ.

## بەشی یەكەم

دەقـی وتارەكـەی مزگـەوتی جیهـاد، كـە وەك خـۆی هێشـتوومانەتەوە جگـە لەزیادكردنی چەند بڕگەیەك، لەگەڵ دەستكارییەكی كەمیش لەهەندێك وشەو رستەیدا كە جیاوازیی شێوازی گوتن و نووسین داخوازی دەكات.

شایانی باسیشە كە دەقی وتارەكە لەم پێنج خاڵە پێك هاتوە:

**یەكەم**: پێناسەی زانایانی ئیسلام.

**دووەم**: پلەو پایەی زانایانی ئیسلام لەقورئان و سوننەت دا.

**سێیەم**: سیفەت و ئاكارە بەرزەكانی زانایانی ئیسلام[١].

**چوارەم**: هەق و مافی زانایان بەسەر ئۆممەتەوە.

**پێنجەم**: ئـەركی سەرشـانی زانـاو پێشـەوایانی ئیسـلام بەرانبـەر بـە ئیسـلام و مسوڵمانان.

## بەشی دووەم

چەند ئامۆژگارییەك بۆ گەنج و قوتابییەكانمان لەبواری زانیارییە شـەرعییەكان و هەڵسووكەوتیان لەگەڵ زاناو پێشەوایانی ئیسلامدا.

كە سەرجەم دوازدە (١٢) ئامۆژگاری گرنگم ئاڕاستـەی خوشـك و بـرا گـەنج و لاوە خوێندەوارو خوێن گەرمەكانم كردوە، بۆ ئەوەی لەوبارەوە دووچاری هەڵە نـەبن و ئەگـەر دووچـاریش بـوون، بـزانن چـۆن هەڵـەكانیان راسـت دەكەنـەوەو دەگەڕێنـەوە سـەر راستەهێڵ.

## بەشی سێیەم

چەند رێڕوونیو پێشـنیارێك بـۆ زانـاو پێشـەوایەكانمان، كـە لـەم بەشـەدا (١٢) رێ ڕوونیی و پێشنیارم عەرزی مامۆستاو زانایانی ئیسلام و پێشـەواو چاوسـاغانی مسـوڵمان

---

١- خاڵی سێیەم و چوارەمم پاش و پێش پێكردوون.

کردوه، بەهیوای ئەوە کە ئەو ڕێڕوونیو تێبینیو پێشنیارانەم بەسینگ فراوانیەوە لیَ وەربگرن و، بەهاوکاریی دڵسۆزانەو دەستبار بۆ گرتنی برایانەم بۆ حیساب بکەن.

## بەشی چوارەم

زاناو پێشەوایانی رەسەن و هەڵوێستی جوامێرانەیان، کە سەرجەم هەڵوێستی جوامێرانەو بوێرانەی (٢١) لەزاناو پێشەوا میراتگرە سەربەرزەکانی پێغەمبەری خوامانﷺ بەنموونە هێناونەوە، کە زۆربەی بوارە جیاجیاکانیان گرتوونەتەوە، وە ئەم بەشە هەم لەڕووی نێوەڕۆك و هەم لەڕووی قەبارەشەوە گەورەترین و گرنگترین بەشی ئەم کتێبەیە.

## بەشی پێنجەم

رەواندنەوەی تەمی تۆمەتێك، لەم بەشەدا کە بەشی کۆتاییەیە، تۆمەت (تهمة)ی (رێزو حورمەت لە زاناو پێشەوایان نەگرتن)م – جا چ ئاڕاستەی بەندە کرابێ چ غەیری بەندە– توێژیوەتەوەو لە مەحەکم داوەو پاش ئەوەی تیشکی بەڵگەو حەقیقەت و واقیعم خستۆتە سەر، دەرکەوتوە کە تۆمەتی ناوبراو جگە لە (تەم و مژ)ی پڕوپاگەندەو درۆو دەلەسەی ناحەزانەو چەواشەکاریی دڵڕەشانە چیتر نیە![1]

لەخوای کاربەجیو دادگەرو بەخشەریش داواکارم کە ئەم نوسراوە بەهەر پێنج بەش و بابەتەکانییەوە ببێتە مایەی بەرچاوڕوونی زیاتری کۆمەڵگەکەمان بە هەموو توێژەکانییەوە، بۆ چاکتر حاڵیبوون و هاتنە سەرحاڵی.

گومانیشی تێدا نیە کە ئێمەی مسوڵمان بەهەموومانەوە نەبیو، لەسەر بناغەی لە یەکتر تێگەیشتن و دەستبار بۆ یەکتر گرتن نەبیَ، بەبیَ جیاکردنەوەو هەڵاواردنی هیچ کەس و کۆمەڵ و چین و توێژێك، هیچمان بۆ بەهیچ ناکریَ، هەر بۆیەش پێشینانمان

---

١– هەڵبەتە هەموو یاسایەك ریزپەڕی هەن (لِکُل قاعدة شواذ) منیش لێرەدا نامەویَ پاکانە بۆ قسەو تەعبیری دوور لەئەدەب و بیَ نەزاکەتی هەڵەشەو پەڵەشانەی هەندێك گەنج و هەرزەکار بکەم، یان پاساوی قسەو هێرشی ناقۆڵاو بیَ مانای هەندێك وتاربێژی دەم هەراش بدەم، بەڵکو مەبەستم رەواندنەوەی تۆمەتی ناوبراوە لەئیسلامییەکان بەگشتی نەك لەتاك تاکیان.

گوتوویانە: برا لەپشت برابێ مەگەر قەزا لەلای خوابێت! هەروەها عەرەبیش گوتوویانە: (المرءُ قليلٌ بِنَفْسِهِ كثيرٌ بأخيه).

**کەواتە:** با لەسەر بناغەی بەندایەتی بۆ خواکردن، برایەتییەکی راستەقینە لەگەڵ یەکتردا بکەین، وەك پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (...وكونوا عباد الله إخواناً)[١]، دەبا هیچ کام لەئێمە ئەوی دیکەی بەلاوە زیاد نەبێ، چونکە بێگومان ئەم کارو کاروانە ئیسلامییە پێویستی بەهەمووومان هەیەو هیچ کاممانی لێ زیاد نیە، خوا بکات بەهەمووشمانەوە بتوانین کارێك بکەین و مەدارێك ساز بکەین!

**هەموو لایەکیشتان بەو خوایە دەسپێرم کە سپاردە زایە ناکات.**

پێنج شەممە ٢٣ی شەوالی ١٤٢١ی کۆچی

١٨ی کانوونی دووەمی ٢٠٠١ی زایینی

ئەحمەد ئاوا



١- رواه مسلم.

# بەشی یەکەم

دەقی

وتارەكەی مزگەوتی جیهاد

كە لەڕۆژی جومعە

٦ی سەفەری ١٤٢٠

بەرانبەر بە: ١٩٩٩/٥/٢١ز دا درا.



(إنَّ الحمدَ لله، نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعُوذُ باللهِ مِن شرورِ أنْفُسِنا ومِن سيِّآت أعمالِنا، مَنْ يَهْدِه الله فلا مُضِلَّ لَهُ ومَنْ يُضْلِلْ فلا هاديَ لَهُ، وأشهدُ أن لا إله إلاّ الله وحده لاشريك لَهُ وأشهدُ أن محمداً عبده ورسوله. صلوات الله وسلامُهُ عليه وعلى آله وصحبه ومن اهتدى بِهَدْيِه).

★ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾[1]

★ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾[2]

★ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾[3]

أما بَعْدُ:

فإن أصدقَ الحديث كلام الله وخَير الهَدي هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وشرَّ الأمور مُحْدَثَاتُها. وكل مُحْدَثَةٍ بِدْعةٌ وكل بِدْعةٍ ضلالة وكل ضلالةٍ في النار.



١- آل عمران: ١٠٢.

٢- النساء: ١.

٣- الأحزاب: ٧٠ - ٧١.

**مسوڵمانانی بەڕێزو خۆشەویست! برایان خوشکان!**

لە وتاری ئەمڕۆماندا باسی زانایانتـان بـۆ دەکـەم باسـی (**علمـاو الإسـلام، زانایـانی ئیسلام کێن و چۆنن؟!**). جا ئێمە خوا پشتیوان بێ لەپێنج خاڵاندا تیشك دەخەینە سـەر ئەو مەسەلەیە.

سـەرەتا لـەخاڵی یەکەمـدا پێناسـەی زانایـانی ئیسـلام دەکـەین، پاشـان لـەخاڵی دووەمدا، لەروانگەی قورئان و سوننەتەوە پلەو پایەی زانایان دەخەینەڕوو، ئینجا لەخاڵی سێیەمدا سیفەت و ئاکارو نیشـانەکانی میراتگرانـی پێغەمبـەرﷺ کـە زانـاو پێشـەوایانی رەسەنی ئیسلامن دەخەینەڕوو، دوایـی باسـی هـەق و مـافی شـەرعیی زانـاو پێشـەوایانی ئیسلام دەکەین کە بەسـەر مسـوڵمانانەوە هەیانـە، ئینجـا لـەکۆتاییو لـەخاڵی پێنجەمـدا تیشك دەخەینە سەر ئەرکی گەورەو گرنگ و گرانـی سەرشـانی جێنشـینانی پێغەمبـەران (ع یهم الصلاة والسلام) کە تەنیا زاناو پێشەوایانی راست و رەسەنی ئیسلامن.

بەڵام لەسەرەتاوە پێویستە روونکردنەوەیەکتان عەرز بکەم: ئەویش ئەوەیـە کـە لـە کوردستاندا بەهەموو بەش و پارچەکانییەوە، هەروەها لەغەیری کوردستانیشـدا زۆربـەی هەر زۆری خەڵك و جەماوەر زیاتر تەنیا مامۆستایانی[1] ئایینی (علماء الدین) کە شۆرەت و نازنـاوی (مـەلا) یـان[2] بەسـەردا بـڕاوەو جـل و بـەرگێکی[3] تایبـەتییان هەیـە، بـەزانایانی ئیسلام و شارەزایانی ئیسلام دادەنێن!! کە لەراستیدا وا نیەو لە ئیسلامدا شارەزابوون و

---

١- زاراوەی زانایانی ئایین یان مامۆستایانی ئایین، ئیشکالێکی تێدا نیە، چونکە مەبەست پێی ئـەو کەسـانەیە کە پسپۆڕییو شارەزایییان لەوبارەوە هەیە، بەڵام زاراوەی پیاوانی ئـایین (رجـال الـدين) هەڵەیـەو ئیشـکالاتی زۆری تێدایە، چونکە یەکەم: ئیسلام و ئایین وێڕای رەگـەزی نێرینـە رەگـەزی مێیینەیشـی پێویسـتە، دووەم: دەبێ سەرجەم نێرینەکانی ئوممەت پیاوی ئایینی بن نەك تەنیا توێژێکیان.

٢- قسـە زۆرن لەسـەر ئەسـڵ و ریشـەی وشـەی مـەلا، بـەڵام تـا ئێسـتا لەهیچیان دا نەگەیشـتوومە دڵنیـاییو قەناعەت.

٣- لە هیچ دەقێکـی شـەرعیدا جۆرە بـەرگ و پۆشـاکێکی تایبـەت بۆ زانایـان دیـاری نـەکراوەو، ئـەو جۆرە پۆشـاکەش کـە ئێسـتا بـاوەو تایبـەت کـراوە بـەزانایانی ئایینـەوە زادەو بەرهـەمی عـورفی کۆمەڵگایـەو، وەك مێژووزانان دەڵێن لەچاخی عەبباسییەکان بەملاوە رەواجی کەوتۆتە سەر.

زانابوون، جگە لەخودی زانایی‌و شارەزایی‌یەکە هیچ مەرج بەند (شرط و قید)ێکی دیکەی نیە، وەك رەچەو مەسلەك و ناوو شۆرەت و بەرگ و پۆشاك و دیمەن و بیچمێکی تایبەت.

کەواتە: بەکوردی‌و بەکورتی مەرج نیە تەنیا (مەلا) زانای ئیسلام بێت و زانایەتی بەئیسلام لەمەلایەتی‌دا کورت هەڵنەهاتووە، هەیە زانایەو مەلاش نیەو بگرە هەیە مەلاشە بەڵام زانا نیە بەئیسلام و، دیارە ناوی بێ نێوەرۆکیش هیچی لێ هەڵناوەرێ‌و کورد گوتەنی: بە حەڵوا حەڵوا دەم شیرین نابێ!

**بەڵێ خوشك و برا بەرێزەکانم!** نەهەموو مەلایەك زانایەو نە هەموو زانایەکیش مەلایە، ئینجا ئەوەش کە خەڵکی پێیان وایە هەرکەسێك مێزەرێکی سپی بەسەریەوە پێچاو کەواو سەڵتەیەکی پۆشی، حەتمەن دەبێ زاناو شارەزاو میراتگری پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، یان هەرکەسێك لەو بەرگ و دیمەنەدا نەبوو بۆ وێنە: سەری رووت بوو! ئەوە ئەگەر لەئیسلامدا عەللامەش بێ هەر بەزانای ئیسلام و شارەزاو چاوساغی مسوڵمانان دانەنرێ‌و ئیعترافی پێ نەکرێ! بەڵێ هەرکام لەو دوو جۆرە بۆچوونە هەڵەو پەڵەن و زادەو بەرهەمی عورف و باوی خەڵك و کۆمەڵگان و، هیچ پەیوەندی‌یان بە ئیسلام و شەرعەوە نیە.

ئێستاش با بچینە سەر خاڵی یەکەم و بزانین زانایانی ئیسلام کێن؟!






# خاڵی یەکەم

# پێناسەی زانایانی ئیسلام

دیارە وشەی زانا (عالم) لەزانین (علم)ەوە هاتوە، چونکە زانا کەسێکە کە دەزانێ. وشەی زانین (علم)یش زانایان بەچەند شێوەیەك پێناسەیان کردوە کە رەنگە ئەوە چاکترینیان بێ: (إدراك الشيءُ على ما هو عليه) زانینی شتێك و پەی پێ بردنی بەو جۆرەی کە هەیەو بەو واقیعەی کە لەسەریەتی.

کەوابێ: زانای ئیسلام (عالِمُ الإسلام)یش کەسێکە کە بەئیسلام شارەزاو ئاشنایە بەو جۆرەی کە ئیسلام هەیە، واتە زانایی‌و شارەزایی بە حەقیقەتی ئیسلام.

ئینجا ئایا ئیسلام چییە؟! ئیسلام و حەقیقەتی ئیسلام بریتیە لە قورئان و سوننەت، بەڵێ کتێبی خوا (كتاب الله)و رێبازی پێغەمبەری خوا(سنه رسول الله) ﷺ دوو تەنیا سەرچاوەی روون و بێ‌چەندو چوونی ئیسلامەتین، جا هەرچی کتێبی خوایە ئەوە ئاشکراو روونە کە فەرمایشتی خواو وەحی راستەوخۆی خوایەو، سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ شەرح و لێکدانەوەو چۆنیەتی جێبەجێکردن (كيفية تطبيق)ی ئەو زاتە بەرزەیە بۆ قورئان و کەلامی بێ‌وێنەی خوای پەروەردگار، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾[1].

واتە: ئەی-موحەممەد- ئێمە قورئانمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوارێ تاکو ئەوەی کە بۆ خەڵکیمان ناردۆتە خوار بۆیان روون بکەیتەوە، وە بۆ ئەوەی تێفکرین و وردببنەوە.

ئنجا ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بەچی‌و چۆن چۆنی قورئان بۆ خەڵکی روون دەکاتەوە؟! ئەوە دایکی بڕواداران عائیشە (خوا لێی رازی بێ) روونی کردۆتەوە کە لەوەڵامی یەکێکدا کەلێی پرسی: ئایا رەوشت و ئاکاری پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو؟!

---

١- النحل: ٤٤ .

گوتی: (كان خلقه القرآن)[1]، واته ڕەوشت و ڕەفتاری پێغەمبەری خوا كتومت وەك قورئـان بوو، خـوا چـی فـەرمووە پێغەمبـەری خـواش ﷺ وای كـردوەو بـەوجۆرە هەڵسـوكەوت و ڕەفتاری كردوە، ئنجا ڕەوشت و ڕەفتـارو ئاكـاری بـەرزو بێوێنـەی پێغەمبـەریش ﷺ كـە ڕێباز (سنة)[2]ی پێ دەگوترێ بەگشتی سێ جۆرە:

أ- فەرمایشتەكانی (أَقْوَالُهُ).

ب- كردەوەكانی (أَفْعالُهُ).

ج- دان پێداهێنانەكانی[3] (تَقْريراتُهُ).

ئیمام شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لەوبارەوە كە ئیسلام تـەنیا بریتیـە لـەوەی كە لەدوو توێی قورئان و سوننەتدایە شیعرێكی جوانی هەیە. گوتوویەتی[4]:

كلُّ العلـوم سِوى القـرآن مَشْـغَلَةٌ    إلاّ الَحـديثَ والفِقْـهَ في الـدِّين

العلـمُ ماكـان فِيـهِ قـالَ حَـدَّثَنا    سـوى ذلـكَ وسـواسُ الشـياطين

واتـە: جگـە لـەقورئان و حـەدیس و لـەئایین تێگەیشـتن سـەرجەم زانسـتەكانی تـر سـەرقاڵیی بـێ هـودەن، چـونكە زانیـاریی -مەبەسـت زانیـاریی شـەرعیە- ئەوەیـە كـە (گوتی) و (حدثنا)ی تێدا بێ، جگە لەوە هەمووی هەر خوتخوتەی شەیطانەكانە.

بەڵێ بۆ تێگەیشتن لەئیسلام و بوونە زانای ئیسلام (عالِمُ الإسلام) ئینسان دەبـێ لـە قورئان و سوننەت تێبگات و شارەزابێ.

---

١- رواه مسلم.

٢- وشەی (سنە) لـەزاراوی فەرمایشـت ناسـان (محـدثین)دا، ئەوەیـە كـە گوتمـان، بـەڵام لـەزاراوی شـەرعزانان (فقهاء)دا ئەوەیە كە لەخوار فەرز (واجب)ەوەیە كە (تطوع)ە.

٣- دان پێداهێنان (تقریر) ئەوەیـە كەشـتێك بـەئاگاداریی پێغەمبـەری خـوا ﷺ كرابـێ یـان گوترابێو ئـەویش ڕەزامەندیی لەسەر دەربڕیبێو پیشان دابێ.

٤- دیارە مەبەستی شافیعی لێرەدا زانیـاری شـەرعی (العلـم الشـرعي)یـە، نـەك زانیـاریی بەموتڵـەقی، واتـە بـۆ تێگەیشتنی ئیسـلام جگـە لـەقورئان و سـوننەت دادت نـادات، بگـرە وەك وەسوەسـەی شـەیتانەكان سەریشـت لێدەشێوێنێ، ئەگەرنا بێ گومان لەغەیری بواری ئیسلام ناسیدا زانیارییەكانی دیكـە پەسـەندو چـاك و بگـرە فەرزو پێویستیشن و، هەر ئامانجەش دەبێ لەڕێی سروشتی خۆیەوە بۆی بچێ ئەگەرنا پێی ناگەی.

شـايانى باسيشـه كـه بـاقى سەرچـاوەكانى ديكـەى ياسـادانان (المصـادر الأخـرى للتشريع)يش چ ئەوانەى كە زۆربـەى هـەرەزۆرى نزيـك بـە يەكدەنگى (إجمـاع)ى زانايـان لەسەريان رێك كەوتوون كە ئيجماع (الإجماع) و قياس (القياس)ن و، چ ئەوانەى كە كەم و زۆر كێشەو راجيايى (الإختلاف)يـان لەسـەريان هەيـە كـە (الإستصحاب والعرف ومذهب الصحابي والإستحسان والمصالح المرسلة وشَرْعُ مَنْ قبلنا)ن، سەرجەميان هەر لەقورئان و سوننەتەوە هەڵهێنجراون و وەرگيراون.

**كەواتـە:** زاناى ئايين (عالم الدين) كە مەبەستمان لـەئايين لێرەدا ئيسـلامە ئەگـەرنا وشەى ئايين (الدين) لە ئەسڵ دا بەهەر بەرنامەيەك دەگوترێ كە خەڵكى شـوێنى بكـەون، جا چ لـەخواوە هـاتبێو چ ئينسـان داينـابێ، كـە بـەو پێيـە وەك چۆن ئيسـلام ئايينـەو هەركام لەجووايەتى (اليهودية)و ديانايەتى (النصرانية) ئايينن، سـيكۆلاريزم و ليبراليـزم و سۆسياليزم و...هتديش هەر ئـايينن، ئەوەنـدە هەيـە ئيسـلام ئـاينێكى هەقـە: ﴿ هُوَ الَّذِيٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ... ﴾[1] ، بەڵام ئەوانى تر[2] ئاينێكى ناهەق و هەڵەن، بەڵێ زاناى زاناى ئايين و شارەزاى ئيسلام باباپەكە كـە لـەكتێبى خـواو رێبـازى پێغەمبەرەكەيـدا ﷺ شارەزاو سەر راست و بەرچاو روونەو، بەئەندازەى زانايىو شارەزاييەكەى لـەو بـوارەدا بەزانا (عالم)و پێشەوا (إمام) دادەنرێ.

هەركەسێك لەقورئان و سوننەتدا نەشارەزاو كۆڵەوار بێـت ئـەوە نـاوو قـەدو قيافـەو ديمەنى هەر چۆنێكى بێ، هـەر بەنـەزان بـەئايين (جاهِـلٌ بالـدين) دادەنـرێ، كەواتـە ئـەو بۆچوونەى كە گەلێك كەس لەو بارەوە هەيـەتى كـە پێيـان وايـە هەركەسـێك زانسـتەكانى (النَّحو والصَّرف واللُّغة والبَلاغة والمنْطِـق والفِقْـه وأصـول الفِقْـه والفلكيـات والفَلسـفة وعِلْـمُ الكلام و...الخ)ى خوێند ئـەوە هەرچـەندە هـيچ ئاگـاى لـەقورئان و سـوننەت نـەبێ، هـەر بە(عالم) بەئيسلام دادەنرێ! ئەوە بێگومان بۆچوونێكى هەڵەيە، چـونكە سـەرجەم ئـەو جۆرە زانيارىيانە هۆو وەسيلەى تێگەيشتن و حاڵى بوونن لە قورئان و سوننەت.

---

١- الصف: ٩ .

٢- دياره جووايەتىو ديانايەتى لە ئەسڵداو بۆ كات و قۆناغى خۆيان ئايين و بەرنامەى راسـت و دروسـتى خـوا بوون، بەڵام دوايى كاتيان بەسەرچووەو نەسخ كراونـەوەو گۆڕين و دەسـتكاريكردنى زۆريشـيان تێدا ئـەنجام دراوە.

هەر بۆیەش زانایانی ئیسلام ئەو جۆرە زانستانەیان بەزانستە ئامرازییەکان (العلوم الآلية) ناوزەد کردوون، واتە ئەو زانیاریيانەی پێویستن بۆ کەسێك کە بیەوێ لەقورئان و سوننەت تێبگات و شارەزابێ، ئاخر ئینسان بەبێ شارەزایی بەزمانی عەرەبی بە (نحو وصرف ولغة وبلاغة)یەوە لەقورئان و سوننەت حاڵی نابێ، هەروەها بەبێ زانیاری بنچینەکانی شەرع (علم أصول الفِقْه) ناتوانێ حوکم و یاساکان لەدەقەکانی قورئان و سوننەت هەڵبهێنجێ.

بەڵێ وەك یەکێك لەزانایان گوتوویەتی ئەسڵی ئایین (قال الله وقال الرسول)ەو زانستەکانی دیکە هەموویان دەبێ لەخزمەت قورئان و سوننەتدا بن و، وەك وەسیلەو ئامرازی تێگەیشتنی ئەوان سەیربکرێن، نەك بکرێنە ئامانج و مەبەست و قورئان و سوننەت فەرامۆش بکرێن.

**ئنجا پێویستە لێرەدا دوو راستی گەورەمان لەبیر نەچن:**

**یەکەم:** وەك چۆن بەبێ ئەو زانیاريیانەی کە بە (العلوم الآلية) ناوبراون ئینسان ناتوانێ لە دەقە شەرعیيەکان تێبگات بەتایبەت شارەزایی بەزمانی عەرەبی بەهەموو بەشەکانیيەوە، هیچ کەسێکیش ناتوانێ تەنیا بەهۆی شارەزایی هەبوونی بەو زانیاريیانەوە لافی لەئیسلامدا شارەزابوون لێبدات! بەڵێ دەتوانێ بڵێ من ئامراز (آلة)ی لەقورئان و سوننەت شارەزابوونم پێیە، بەڵام ئامرازی ئەنجام دانی کارێك دەستگیرکردن شتێکەو، خودی ئەنجام دانی کارەکەش شتێکی دیکەیە، بەڵێ زۆر کەس هەیە کە عەرەبی زانێکە وەك بولبول عەرەبی دەڵێ، بەڵام رەنگە لەبواری شارەزایی بەئیسلامدا هیچی بەسەر هیچەوە نەبێ.

**دووەم:** زانابوون لەئاییندا گوێرەیی (نیسبی)یەو بێجگە لەخوا (جَلَّ جَلالُهُ) هیچ کەس نییە بتوانێ لافی ئەوە لێبدات کە هەموو شتێك لەئایین دەزانێ، دیارە پێغەمبەری خواش ﷺ خوای زاناو تواناو شارەزای کردوە، ئەگەرنا هیچ کەس بۆی نیە بڵێ: من هەموو شتێك لەئیسلام دەزانم، چونکە ئیسلام کە لەوەحیو زانیاریی بێسنووری خواوەیە، سنووری کۆتایی نیەو بۆ ژیان و گوزەرانی سەرلەبەری مرۆڤایەتی هاتوە بەپانایی زەمین و بەدرێژایی زەمان.

**بەكورتی:** وەك چۆن لەدیندا شارەزابوون و بەئیسلام زانابوون، لەسەر هیچ چین و توێژو كۆمەڵ و مەسلەكێك تاپۆ نەكراوە، كۆكردنەوەی سەرجەم راستییەكانی ئایین (جمع حقائق الدین)یش كالآیەك نیە بەبالای هیچ بەشەرێك براببێ‌و، وەك چۆن بێجگە لەخوای زانای ئاشكراو پەنهان، هیچ كەس بەسەرجەم نهێنییەكانی بوون (أسْرار الوجود) شارەزا نیە، بێجگە لە خۆیشی هیچ كەس وەك خۆی بەڕاستییەكانی ئایین و بەرنامەكەی ئاگادار نیە.

**كەواتە:** لەئیسلامدا بەهیچ جۆرێك بوارو دەرفەت بەزاناو پسپۆڕان و شارەزایان نادرێ، كە وەك دەستەو دایەرەی كە هەنووتی كلێساو كەنیشتەی دیان و جووەكان، تەفسیركردن و شەرح و لێكدانەوەی كتێبی خواو خستنەرووی راستییەكانی ئایین (حقائق الدین) لەسەر خۆیان تاپۆ بكەن و، خۆیان چۆنیان مەیل و ئارەزوو لێبوو ئاوا مل بەدەقەكانی ئایین بادەن، هەر بۆیەش كە دەبینین لە مێژووی ئیسلامدا هەموو مسوڵمانێكی سادە با پیرەژنێكیش بووبێ، بۆی هەبووە سەرنج و تێبینیی‌و رەخنەی خۆی ئاڕاستەی هەركەسێك بكات كە پێی وابووە بەهەڵە لەدەقێك حاڵی بووە، با ئەو كەسە خەلیفەی مسوڵمانان و پایە بەرزێكی وەك عومەری كوڕی خەططابیش بووبێ.

## لەكۆتایی ئەم خاڵەشدا دەڵێم:

خوای پەروەردگار فەرمووویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ... ﴾[1]، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە فەرمانبەریی خوا بكەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بكەن، دیارە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەكەیشی بەهۆی پابەندیی‌و مل كەچیمان بۆ قورئان و سوننەت دێتەدی، كەواتە ئەسڵ و بناغەی دینداریی‌و مسوڵمانەتی، فەرمانبەریی كردن (إطاعة)ی خواو پێغەمبەرە ﷺ كە لەپابەندیی بە قورئان و سوننەت (الإلتزام بالكتاب والسُنَّة)دا تەجەللا دەكات و، هەركەسێكی دیكەش كە لەئیسلامەتی فەرمانبەریی بۆ دەكرێ‌و بەقسەی دەكرێ‌و رێزو حورمەتی دەگیرێ، هەر بەهۆی پابەندیی‌یەوە بە قورئان و سوننەت و بەئەندازەی گوێڕایەڵیی و فەرمانبەرییەتی بۆ

---

١- النساء: ٥٩.

خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، جا ئەو کەسە چ خەلیفە راشیدەکان (الخلفاء الراشدون)بن، چ هاوەڵانی دیکەی بەڕێزو دڵسۆزیو چ بنەماڵە (أهل البیت)ی خاوەن حورمەتی بن، چ پێشەوا سەر مەزەبەکان و چ زانا هەڵکەوتووەکانی ئیسلام، لەپێشین و پاشین (من السلف والخلف) (رەزاو رەحمەتی خوا لەسەر هەموویان بێت).

ئەو وتە بەنرخ و پڕ واتایەی یەکەمین و گەورەترین جێنشینی پێغەمبەریش ئەبووبەکری صدیق (خوا لێی رازی بێ) کە لەیەکەمین ڕۆژی هەڵبژێردرانییەوە بەخەلیفەو مشوورخۆری مسوڵمانان ئاراستەی مسوڵمانانی کرد, ئەو ڕاستییەی گوتمان بەجوانترین شێوە دەردەخات:

(قَد وُلِّيْتُ عَليكم ولستُ بِخَيرِكُم، إنْ أَطَعْتُ الله ورسولَهُ فَـأَطيعوني وإنْ عَصَـيْتُهُما فَـلا طَاعةَ لي عليكم...).





 
# خاڵی دووەم


# پلەو پایەی زانایانی ئیسلام

پلەوپایەی زاناو پێشەوایان لەئیسلامدا، پلەوپایەیەکە یەکجار بەرزەو لەچەندان ئایەت و فەرمووودەدا ئاماژەی بۆ کراوە، بەڵام بێگومان زاناو پێشەوایانی رەسەن و راست و بەو چەمك (مفهوم)و تێگەیشتنەی کە لەخاڵی یەکەم دا خستمانەڕوو، ئەوانەی کە لەئیسلامدا سەر ڕاست و شارەزان و بەگوێرەی زانیاریو شارەزاییەکەشیان رەفتارو هەڵسوکەوت دەکەن، وەك دواتر باسی دەکەین.

**ئەمەش چەند دەقێکی قورئان و سوننەت لەوبارەوە:**

١- خوای زاناو دادگەر لەئایەتی ژمارە (١١)ی سورەتی (المجادلة)دا فەرموویەتی: ﴿ ...يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ ... ﴾ واتە: خوا ئەوانەتان کە ئیمانیان هێناوە بەرزیان دەکاتەوە، وە ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە بەچەندان پلە - بەرزیان دەکاتەوە-.

بەڵێ ئینسان بەهۆی ئیمانەوە بەرز دەبێتەوە، لەلای خواو خەڵکی بەرز دەبێتەوەو حورمەت و رێزی بۆ پەیدا دەبێ لە دونیاو قیامەتدا، بەڵام ئەو بڕوادارانەی کە خوای بەخشەر زانیاری داوێتیو لەبەرنامەی خۆیدا شارەزاو زانای کردوون، ئەوانە بەچەندان پلە بەسەر باقی مسوڵمانانندا رێزو پلەو پایەیان بۆ زیاد دەکات! کەواتە: لەدیندا شارەزابوون و زانایيو دانایی و سەر ڕاستیی، مایەی پایە بەرزییە لە دونیاو قیامەتدا.

٢- هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٩) سورەتی (الزمر)دا فەرموویەتی: ﴿ ..قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴾ واتە: بلێ ئایا کەسانێك کە دەزانن و کەسانێك کە نازانن یەکسانن؟ بێگومان تەنها خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن.

دیارە لێرەدا شێوەی پرسیارکردنەکە لەزمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێ: (الإستفهام الإنكاري) واتە هەر پرسیارکردنەکە خۆی ئینکاریيو نکوڵیی نێوەڕۆکی خۆی دەگەیەنێو پێویستی بەوەڵامدرانەوە ناکات.

٣- هەروەها لە ئایەتی ژمارە (١٨)ی سورەتی (آل عمران)دا فەرموویەتی:

﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ ... ﴾

واتە: خوا شایەدیی‌دا کە جگە لەوی پەرستراوی دی نین، هەروەها فریشتەکانیو خاەن زانستەکانیش- هەمان شایەدییاندا لەسەر یەکتاییو تەنیا پەرستراوێتی خوا-، وەك دەبینین خوای زانا شایەدیی‌دانی زانایانی لەسەر تەنیا پەرستراوێتی خۆی، لەڕیزی هی خۆیو فریشتە بێ هەڵەو پەڵەکانیدا حیساب کردوە!!

٤- پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ وێنە، لە فەرموودەیەکیدا فەرموویەتی: (یشفع یوم القیامة ثلاثة: الأنبیاءُ ثم العُلماءُ ثم الشُهداءُ)[١]، واتە: لەرۆژی قیامەت دا سێ جۆرە کەس تکا (شفاعة) بۆ مسوڵمانان دەکەن، کە خوا بیانبەخشێ: پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێ)، پاشان زانایان، ئنجا شەهیدان.

٥- لەفەرموودەیەکی تریشدا کە شان و شەوکەتی زانایانی چاك تێدا خراوەتەڕوو فەرموویەتی: (من سَلَكَ طریقاً یَلْتَمِسُ فیه علماً سَهّل اللهُ لَهُ طریقاً إلى الجنة. وإن العالِمَ لَیَسْتَغْفِرُ لَهُ مَن في السّموات ومَن في الأرض حتّى الحیتانُ في الماء، وفَضْلُ العالِمِ على العابِدِ كَفَضلِ القَمَرِ على سائرِ الكواكِب. إنَّ العَلَماءَ وَرَثَةُ الأنبیاءِ وإنَّ الأنبیاءَ لم یُورِّثُوا دیناراً ولا درهماً إنّما ورَّثوا العِلم، فَمَن أخذهُ أخذَ بحظٍ وافر)[٢]. واتە: هەرکەسێك ڕێیەك بگرێتە بەر کە لێیەوە زانیاری-شەرعیی- وەدەست بخات، ئەوە خوا ڕێی چوونە بەهەشتی بۆ هەموارو ئاسان دەکات، بابای زاناش هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە داوای لێبوردنی بۆ- لەخوا- دەکات تەنانەت ماسییەکانیش لەئاودا، هەروەها گەورەیی و پایەی زانا بەسەر بابای خواپەرستدا وەك پایەو جیاوازی مانگ وایە بەسەر ئەستێرەکانی دیکەدا، وە بێگومان زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، دیارە پێغەمبەرانیش زێڕو زیویان بەمیرات بەجێ نەهێشتوە، بەڵکو زانستیان کردۆتە میرات، جا هەکەسێك ئەو میراتی زانستە وەربگرێ، ئەوە بێگومان پشك و بەشێکی چاکی پێبڕاوە.

دیارە ئەم فەرموودەیە گەلێك شتی لێوەردەگیرێن لەبارەی فەزڵ و پلەوپایەی بەرزو باڵای زاناو میراتگرانی پێغەمبەرەوە ﷺ کە لێرەدا مەودای ئەوەمان نیە وەك پێویست بیانخەینەڕوو، بەڵام هەر بەکورتی ئاماژە بەچەند شتێك دەکەین:

أ- زاناو شارەزابوون لەئایین و بەرنامەی خوادا یەکسانە بەنیشتەجێبوون لە بەهەشتدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕێی بەدوای زانستدا چوونی کردۆتە مایەی ڕێبردنە بەهەشت!

---

١- رواه ابن ماجه بسند حسن.

٢- رواه أحمد وأبوداود والترمذي وابن ماجه وحسنه الألباني.

ب- دروستکراوەکانی خوا تێکڕا ئینسانی زانایان خۆش دەوێت و داوای بەزەیی‌و بەخشش و لێبوردنی خوای بۆ دەکەن، کەواتە سەرجەم بوونەوەر بەچاوی ڕێزو حورمەت و گەورەیی‌یەوە تەماشای بابای زانا دەکەن!

ج- ئاشکرایە کە بەسەدان و بگرە هەزاران ئەستێرە هێندەی مانگ شەوق و ڕووناکی‌یان نیە[1]! دەجا جیاوازی زاناو ئیمتیازی بەسەر باقی خەڵکیدا هێندەی جیاوازی‌و ئیمتیازی نێوان مانگ و ئەستێرەکانە!

د- مادام زانایان جێنشین و میراتگری پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوانﷺ، کەواتە بۆ پایەبەرزیی لەپێغەمبەران بترازێ، زانایانن!!

هـ- زانیاری (عِلْم) تەنها میراتێکە کە پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا بۆ جێنشین و میراتگرەکانی خۆیانیان بەجێهێشتوە، کەواتە: مەبەست لەو زانیارییە هەرجۆرە زانیاری‌یەك نیە، چونکە غەیری پێغەمبەرانیش لەوەدا بەشدارن -واتە لەزانیاری گشتی‌دا- بەڵکو مەبەست زانیارییەکی دانسقەو تایبەتی‌یە کە بریتی‌یە لەزانیاری هەبوون بەخوای پەروەردگارو ناوو سیفەتەکانی‌و ئایین و بەرنامەکەی‌و چۆنیەتی بەندایەتی (عبودیة) بۆ کردنی‌و پەرستنی.

و- هەرکەسێك خۆی بەمیراتگرو جێگری پێغەمبەران بزانی‌و ئەو پشك و بەشەی پێ‌ببڕێ کە پێغەمبەرﷺ بە (حظٍّ وافرِ)ی ناوبردوەو، پاشان ئەو زانیارییە بەکەم بگرێ‌و ڕێزی نەگرێ، یان خوانەکردە لە بازاڕی ڕەشی طاغوتەکاندا هەرزان فرۆشی بکات، ئەوە بێگومان خۆی لەڕیزی زانایان بردۆتە دەرێ‌و خۆشی گیرۆدەی ئازارو سزاو تۆڵەی خوای دادگەرو تۆڵەسێن دەکات، هەر بۆیەش خوای پەنهان بین فەرموویەتی: ﴿ ...وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا ... ﴾[2]، کە بێگومان خوای کاربەجێ مەبەستی ئەوە نیە کە زانایان ئایەتەکانی خوا بەنرخی هەرزان و کەم نەفرۆشن و بەقیمەتێکی باش و گرانیان بدەن! بەڵکو مەبەستی ئەوەیە ئایەتەکانی خوا بەهەموو دونیاش نەگۆڕنەوە، چونکە سەر لەبەری دونیاش لەبەرانبەر ئایین و ئایەتەکانی خوادا هەرکەم و گچکەو نابووتە!!

---

١- دیارە بەنیسبەت خەڵکی سەر زەوی‌یەوەو مەبەستی فەرموودەکەش هەر ئەوەیە، ئەگەرنا بێگومان وەك زانیاری گەردووناسی ڕوونی کردۆتەوە، هەرکام لە ئەستێرەکان خۆرن و لەگەڵ مانگ دا ناچنە تەرازووەوە.

٢- المائدة:٤٤.

 خاڵی سێیەم 

# سیفەت و ئاکارە بەرزەکانی زانایانی ئیسلام

بێگومان سیفەت بەرزیی‌و ئاکارو رەوشت پەسەندیی، درووشم و نیشانەی هەر بڕوادارو مسوڵمانێکەو، هەوەنتەش نیە کەخوای کاربەجێ لەبەرانبەر پڕوپاگەندەی ناحەزانی پێغەمبەرەکەیداو، بۆ بەرپەرچ دانەوەی تۆمەت و رەواندنەوەی گومانەکانیان رەوشتی بەرزو مەزنی ئەو زاتە ناوازەیە بە بەڵگە دێنێتەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ۝١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ۝٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ۝٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ﴾[1].

دەجا بێگومان زانایانیش کە جێنشین و میراتگری پێغەمبەری خوانﷺ، دیارە دەبێ هەرکامێکیان کەم و زۆر پشك و بەشی لەو رەوشتە مەزن و سیفەت و ئاکارە بەرزو پەسەندانەی پێغەمبەرداﷺ هەبێ، جا ئێستا با سەر بەچەند دەقێکی قورئاندا بگرین و تێفکرین داخو گرنگترین و بەرچاوترین سیفەت و نیشانەی زاناو پێشەوایان چین، بۆ ئەوەی بەهەڵە لێیان حاڵی نەبین و لەناسینیاندا بە سەهوو نەچین و دوومەڵ بەبەز حاڵی نەبین:

١- لە ئایەتی ژمارە (٩)ی سورەتی (الزمر)دا خوای زانا لەبارەی بەندە زاناکانی‌یەوە فەرموویەتی: ﴿ أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦۗ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾، واتە: یان[2] ئایا کەسێك کە لەشەوگاردا خواپەرستە بەسەجدە بردوویی‌و راوەستاویی کە مەترسی دوا

---

١- القلم: ١ - ٤.

٢- دیارە ئەم جۆرە تەعبیرە بەزاراوەی رەوانبێژیی قرتاندن و کورتکردنەوە(حذف وایجاز)ێکی تێدایە کە لەسیاقی ئایەتەکانەوە دەزانرێ، وەك: ئایا بابایەکی نەزانی سەرگەردان چاکترە یان کەسێك کە ....هتد.

ڕۆژی هەیەو ئومێدی بەبەزەییو بەخششی پەروەردگاریەتی! بڵێ ئایا ئەوانەی کە دەزانن و ئەوانەی کە نازانن وەك یەکن؟! بێگومان بەس خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن.

وەك دەبینین خوای پەروەردگار لەم ئایەتەدا پێناسەو مەدحی ئەو بەندە هەڵبژاردانەی خۆی بەم سیفەت و ئاکارانە دەکات:

أ- قانت آناء الیل.

ب- ساجداً.

ج- وقائماً.

د- یحذر الآخرة.

ه- ویرجو رحمة ربه.

و- الذین یعلمون.

ز- أولوا الألباب.



بەڵێ بابای زاناو پێشەوای ئیسلام و مسوڵمانان، نابێ تەنیا بەناوو بە جل و بەرگ و چیو چیو لە مسوڵمانان، لە ئوممەت، لە شوێنکەوتووانیو پەیڕەوانی جیابکرێتەوە، وە نابێ زاناو پێشەوای ئیسلام تەنیا قسەو وتاری لەخەڵکی زیاد بێت، بەڵکو پێویستە بەکردەوەو ڕەفتارو پەرێزو، ئاکار ئیمتیازو زیادەی بەسەریانەوە هەبێ، کە بێگومان خواپەرستی- بەمانای تایبەتی- و تەقواو تەزکیەو دواڕۆژ هەڵبژاردن و دونیا بەکەمگرتن، گەورەترین و چاکترین جۆری کردەوەی چاکن.

بەڵێ زاناو پێشەوا دەبێ هەوڵ بدات لەهەموو شتێکی پەسەندو باشدا لەپێش ئوممەتەکەیەوە بێت و، ئیمتیازو زیادەی بەسەریانەوە هەبێو، ناوی خۆی بەخۆیەوە بێت بەکردەوە (إمام)یان بێت و لەپێشیانەوە بێت، جگە لەکاتی تەماع و بەرژەوەندییدا! لەوانەبێ کە: (یَقِلُّونَ عندَ الطَمعِ ویَکثُرون عندَ الفزعِ).

کەواتە: ئەو مەلایەی کە دەڵێ: (کاکە بەقسەم بکەن و بەعەمەلم مەکەن) با دڵنیابێ کە هیچ کەس گوێ بۆ قسەی بێ کردەوەی ناگرێو، قسەی بێکردەوە وەك پارەی قەڵبەو هیچ کەس وەریناگرێ.

هەروەها ئەو کەسەش کە بەناو مەلاو زانایەو بەخەیاڵ خۆی پێ چاوساغ و پێشەوایە، بەڵام ڕەفتار کوێخایەو عەودالی دونیایەو گورگەو لەپێستی مەڕدایە، با

دڵنیابێ کە ئەو ناوە خۆشەو رواڵەتە بێکاکڵ و بۆشەی ئەگەر بۆ ژیانی زوو تێپەڕی دونیاش تۆزە سوودێکی بۆی هەبێ، لەڕۆژی دواییدا کە نهێنییەکان ئاشکرا دەبن ﴿ يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴾[1]، نەك هەر هیچ دادی نادات و بەکەڵکی نایەت، بگرە دەبێتە مایەی قەرزدارییو شەرمەزارییشی.

٢- لە سورەتی (الرعد)یش دا خوای زانای پەنهان و ئاشکرا، لە ئایەتەکانی (١٩-٢٢)دا (١٠) سیفەت و نیشانەی گرنگ و گەورەی لەزانایان و میراتگرانی رەسەن و راستەقینەی پێغەمبەرىﷺ هەڵداون:

﴿ أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴾.

واتە: ئایا- ئەی موحەممەد!- ئەو کەسەی کە دەزانێ ئەوەی بۆ تۆ نێرراوەتە خوار لەپەروەردگارتەوە، حەق و راستە، وەك ئەو کەسەیە کە کوێرو کوترە؟! بێگومان تەنیا خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن و بێدار دەبنەوە. ئەو کەسانەی کە پەیمانی خوا جێبەجێ دەکەن و بەڵێن ناشکێنن. وە ئەوانەی کە هەموو ئەو پەیوەندییانەی کە خوا فەرمانی بەگەیاندونیان کردوە دەیانگەیەنن، وە لەپەروەردگاریان دەترسێن و مەترسی ئاکامی خراپی لێپرسینەوەیان هەیە. وە ئەو کەسانەی کە لەپێناوی رەزامەندییو دیداری رووی خوادا ئارامیان گرتوەو نوێژیان بەرپاکردوەو بەپەنهانیو ئاشکرا لەوەی کە پێمان داون بەخشیویانە، وە بەچاکە خراپە بەرپەرچ دەدەنەوە، ئا ئەوانە سەرەنجامی چاکی مەنزڵگای دواڕۆژیان هەیە.



١- الطارق: ٩.

وەك دەبینین خوای كاربەجێ ئەم (١٠) سیفەت و ڕەوشت و ئاكارە ڕەندو پەسەندانە دەكاتە نیشانەو دروشمی زانایان:[١]

١- ﴿ ..يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ .. ﴾[٢]، (زانایان دڵنیان لە ڕاستیی‌و تەواویی هیدایەت و بەرنامەی نێرراوی خوا).

٢- ﴿ ...أُوْلُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾[٣]، (داناو خاوەن عەقڵی تەواو و دامەزراوی ئەوتۆن كە پەندو عیبرەت لەهەر شتێك وەردەگرن و سەركێڵانە لەشتان نافكرن).

٣- ﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ﴾[٤]، (وەفاداران و بەڵێن و پەیمانی بەندایەتی لەگەڵ خوادا دەبەنە سەرو نایشكێنن).

٤- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ... ﴾[٥]، (مافی خەڵكی دەوروبەری خۆیان جێبەجێ‌دەكەن، هەر لەدایك و باب و هاوسەرو ڕۆڵانەوە بگرە..هەتا خزم و دراوسێ‌و ڕێبوارو میوان و هەتیوو هەژارو لێقەوماوو...هتد، وە سەرجەم پەیوەندییەكان دەگەیەنن و نایانپسێنن).

٥- ﴿ ...وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ.. ﴾[٦]، (ترس و سامی پەروەردگاریان و هەیبەت و شەرم لێ‌كردنی، دڵ و دەروونی لێواو لێوكردوون و، لێ‌ترسان و لێ‌سڵەمینەوەی هەر شت و كەسێكی دیكەی لەدڵ دا لابردوون).

٦- ﴿ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴾[٧]، (هەمیشە ترس و بیمی ئەوەیان هەیە كە لەڕۆژی دواییدا گیرۆدەی ئاكام و ئەنجامی شوومی كردەوە خراپ و هەڵەو پەڵەكانیان ببن).

---

١- لەوەوە هەڵم هێنجا كە ئەم سیفەت و ئاكارانە هەرچەندە بەگشتی هی هەموو بڕواداران، بەڵام زیاتر تایبەتن تایبەتن بەزاناو پێشەوایانەوە، كە یەكەمین سیفەتیان زانایی‌یەو ئنجا هەركام لەدانایی‌و پەیمان و بەڵێن بردنە سەرو لەبەرانبەر خراپەدا چاكەكردن، زیاتر هەر لەوان چاوەڕێ دەكرێن.

٢- الرعد: ١٩.

٣- الرعد: ١٩.

٤- الرعد: ٢٠.

٥- الرعد: ٢١.

٦- الرعد: ٢١.

٧- الرعد: ٢١.

٧- ﴿ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ ﴾[١] ، (لەپێناوی خواو بەئومێدی دیداری رووی بێوێنەی، لەسەر گەلێك شت و لەبەرانبەر گەلێك قسەو رەفتارو كردەوەو هەڵوێستی ناقۆلای كە دەربارەیان دەكرێو، دەشتوانن بەچەند قات سزاو تۆڵەیان بدەنەوە، خۆڕادەگرن و پشوو درێژیی و دڵگەورەیی دەنوێنن).

٨- ﴿ ...وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ.. ﴾[٢] ، (نوێژەكانیان بەو شێوە رواڵەتیی و دەروونییەی كە شەرع بڕیاری داوەو دیاری كراوە، بەرپا دەكەن و، هیچ شتێكی گەورەو گچكەو رواڵەت و پەنهانیان لێ بەزایە نادەن).

٩- ﴿ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرًّا وَعَلَانِيَةً ﴾[٣] ، (لەوەی كە خوا پێی داون لەكات و شوێنی خۆیی و بەئەندازەی شیاوو بەچۆنێتی پێویستی خۆی- لە ئاشكرا كردن ئەگەر حیكمەت لەوەدا بێت، وەك بوونە سەرمەشق، وە پەنهان كردن ئەگەر بەرژەوەندیی لەوەدا بێ وەك پاراستنی هەستی خێر پێكراوو سەغڵەت نەكردنی- لەپێناوی خوادا دەبەخشن).

١٠- ﴿ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾[٤] ، (بەقسەو رەفتارو شێوازی چاك و پەسەندو بەرز بەرپەرچ و وەڵامی خراپەو هەڵەی بەرانبەریان دەدەنەوە، واتە: لەئاستی بەرزی خۆیان دانابەزن و بەخراپەی بەرانبەرەكەیان ناكەن و لەگەڵیان ناچنە تەرازووەوەو، قسەیەك نالێن و كردەوەیەك ناكەن، كە شایستەی پلەوپایەی بالای زانایی و دانایی و مامۆستایەتی و پێشەوایەتییان نەبێت!).

**٣-** وە لە سورەتی (الفرقان)یش لە دوو توێی (١٤) ئایەت دا(٦٣ تا ٧٦) خوای كاربەجێ (١٣) سیفەت و خەسڵەتی بەرزو پەسەندی كردۆتە درووشم و نیشانەی ئەو بەندە چاك و هەڵبژاردانەی خۆی كە بە (عباد الرحمن) ناوزەدی كردوون،[٥] وەك فەرموویەتی:

---

١- الرعد: ٢٢.
٢- الرعد: ٢٢.
٣- الرعد: ٢٢.
٤- الرعد: ٢٢.
٥- لەوەوە هەڵم هێنجا كە ئەم ئایەتانەش زیاتر تایبەتن بەزاناو پێشەوایانەوە كە سیفەتی كۆتاییان: ﴿ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾ الفرقان: ٧٤، هەر هی ئەوانەو لەخەڵكی تر ناوەشێتەوە.

﴿ وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا
﴿٦٣﴾ وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا ﴿٦٤﴾ وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ
جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ
يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا
يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَاعَفْ لَهُ
الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ
يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَإِنَّهُ يَتُوبُ
إِلَى اللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَالَّذِينَ إِذَا
ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ
أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُولَٰئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ
بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا ﴿٧٥﴾ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾

### ئەو سێزدە سیفەت و ئاكارەش ئەمانەن:

١- ﴿ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا ﴾[١]، (ئەوانەی كە بە ئارامییو ویقارەوە بەڕێدا دەڕۆن) واتە: هەر لەشێوەی ڕۆیشتنیشیاندا هێدییو مەندییو ئارامییو ڕێزو ویقارو سەنگینییان تێدا دەبینی.

٢- ﴿ وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا ﴾[٢]، (وە كاتێك نەفامەكان بیاندوێنن دەڵێن: سەلامتان لێبێ، یان قسەیەكی سەلامەتیان لەگەڵ دەكەن، یان بەلەبارییی بەجێیان دەهێڵن و لەگەڵیان پێوە ناچن)، بەڵێ زاناو پێشەواو بەندە هەڵبژاردەكانی خوا بەر لەوەی بەخواپەرستیی[٣] -بەمانای تەسك و تایبەتی- بناسرێن بەشێوە هەڵسوكەوت و

١- الفرقان: ٦٣.
٢- الفرقان: ٦٣.
٣- لەكتێبی (خواپەرستی ئیسلامیی) بەرگی (١)دا، بەتێرو تەسەلی چەمك و واتای (عبادة) توێژراوەتەوە.

رەفتاری بەرزو جوامێرانەو قسەو گوفتاری پاك و چاكیان دەناسرێن، وە نەك هەر دەست پێشخەریی لە قسەو رەفتاری هەڵەو خراپ و هەڵەدا ناكەن، بگرە هەر وەڵامی قسەو رەفتاری هەڵەو خراپیش نادەنەوەو، ئەگەر جارێك لەجارانیش لووت و بزووت و رێیان لە بەد رەفتارێك كەوت و درووو درکی نەفامێکیش لەدامێن و بەلەکیان ئالا، زۆر بەشێنەییەو وەستایی لەكۆڵ خۆیانی دەكەنەوە.

٣- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴾[١]، (وە ئەوانەی كە لەشەوگاردا بەسەجدە بردوویی‌و راوەستاویی لەخزمەت پەروەردگاریاندا دەمێننەوە)، بەڵێ ئەو بەندە رەندو پەسەندانەی خوا، لەسۆنگەی ئەوەوە رەوشت و رەفتاری رۆژیان هێندە جوان و بەرزە، كە شەوگاریان ئاوا بەسەر بردوەو، نیزیكیان لەخوا رەفتارو ئاكاری ئاوا لەگەڵ خەڵكیدا جوان و شیرین كردوون!.

٤- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴾[٢]: (وە ئەوانەی كە دەپارێنەوەو دەڵێن: پەروەردگارمان ئازاری دۆزەخمان لێلابدە، بێگومان ئازارو ئەشكەنجەی درێژخایەنەو لەكۆڵ نابێتەوە)، سەرنج بدە چۆن پاش ئەو هەموو جوامێریی‌و نەجابەتەی نێوخەڵكی‌و پارێزكاریی‌و عیبادەتەی كە بۆ خوا ئەنجامی دەدەن، لەجیاتی لەخۆبایی بوون (غرور)و خۆ لێ گۆڕان و دڵنیابوون، هەر چاكترو زیاتر سەری بەندایەتی بۆ خوا دادەنەوێنن و، بەدڵ و بەكوڵ لێی دەپارێنەوە كە لەسزاو جەزرەبەی نێو دۆزەخ چەپەڵەیان بدات!!

دیارە ئەوە پیشەو عادەتی زاناو پێشەوایانی هۆشیارو دڵ بێدارە، چونكە ئینسان هەتا خواناس ترو زاناتر بێت چاكترو زیاتر سام و هەیبەت و شەرم و رێزی لەدڵ دا پەیدا دەبێت بەرانبەر بەخوا، وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ ...إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ... ﴾[٣].



١- الفرقان: ٦٤.
٢- الفرقان: ٦٥.
٣- فاطر: ٢٨.

پێغەمبەریشﷺ فەرموویەتی: (**إني لأخشاكم لله..**)[1].

٥- ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴾[2] : (وە کەسانێك "بەندەی هەڵبـژاردەی خـوای بەبـەزەیین" کـە لـەکاتی مـاڵ خـەرج کردنـدا نـە زیادەڕۆیی دەکەن و نە ڕژدیـی دەکـەن، بـەڵکو لـەو نێوانـەدا کارامانـە ڕەفتـار دەکـەن)، دیـارە دۆسـتانی خـواو بەنـدە هەڵبـژاردەو زانـاو دانایـەکانی، وەنـەبێ تـەنیا لـەبواری مەعنەوییو پەیوەندی لەگەڵ خوادا شارەزاو کارامـەو لێـزان بـن، بـەڵکو لـەبواری ژیـان و گوزەران و ئابووریو چیو چیشدا هەر کارامەو وەستاو شارەزان.

٦- ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾[3]: (وە ئـەو کەسـانەی کـە وێـڕای خـوا لەپەرسـتراوێکی دی ناپاڕێنـەوە)، چـونکە دڵنیـاو دڵ دامـەزراون، کـە جگـە لـەخوای پەروەردگارو تاك، هیچ کەس و هـیچ شـتێکی دیکـە نیـە کـە شایسـتەی پەرسـتران بێـت، دیارە خۆپاراستنیش لە هەموو جۆرو شێوەکانی هاوبـەش پەرسـتیی (الشـرك) بەگـەورەو بچـووك و ئاشـکراو پـەنهان و تـاکیو کۆمەڵییـەوەو، لـە هەرکەسـێك بـواری عەقیـدەو درووشمـەکان و یاسـاکان (العقیـدة والشـعائر والشـرائع)دا، مەگـەر چـۆن دەنـا بەنـدە هەلبژاردەو زاناو هۆشیارو بێدارەکان نەبێ بۆیان ناکرێ[4].

٧و٨-﴿ ...وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَ.. ﴾[5]: (وە نەفسـێك کەوا خوا قەدەغەی کردوە بکوژرێ، مەگەر بەهەقی شەرعیی ئەگەرنا نایکوژن، وە زیناش ناکەن)، دیارە پاش شیرك- کە لەغەیری خوا پاڕانەوە یەکێکە لەجۆرەکانی- کە هەرگیز خوا قەڵـەمی عـەفوی بەسـەردا نـاهێنێ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ... ﴾[6] ، قـەتڵ و زینا گەورەترین گوناحن، ئاشکراشە کە تەنیا کەسێك وەك پێویسـت دەتـوانێ خـۆی لـەو

---

١- رواه البخاري.

٢- الفرقان: ٦٧

٣- الفرقان: ٦٨

٤- بڕوانە کتێبی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی....) بەرگی سێیەم.

٥- الفرقان: ٦٨

٦- النساء: ١١٦

گوناحە زلانە بپارێزێ کە وریای خۆی بێت و تـوخنی ئـەو گوناحـە گـەورەو گچکانەش ناکەوێ کە بۆیان دەبنە پێشەکیو رێخۆشکەر.

٩و١٠- ﴿ وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا ﴾[١]: (وە ئەوانەی کە ئامادەی بەشداریی کردن و دیتن و بیستنی قسەی درۆو رەفتاری گوناح و هەڵە نابن، وە کاتێك بەلای قسەو رەفتاری پـووچ و بێکەڵکدا راببرن بـەرێزو حورمەتـەوە تێدەپـەڕن)، بەڵێ زاناو پێشەوایان نەك هـەر قسـەی درۆو هەڵـەو گونـاح و پەڵـەیان نیـە، بگـرە لـەهی خەڵکی دیکەشدا بەشدارو ئامادە نابن، وە نەك هـەر خۆیـان سـەرگەرمی قسـەو رەفتـاری پووچ و (لغو)٢ نابن، بگرە هەرکات رێشیان بەلایدا رۆیی بەحورمەت و رێزو نەجابەتەوەو بەخێرایی رادەبوورن!

کەواتە: ئەو کەسانەی کە نەك هەر قسەی پووچ و بۆش بەڵکو زمانیان بۆتە زبڵدانی درۆو قسەی ناشیرین و بێجێو هەڵـەو پەڵـە، هەرچـەندە جبـەو مێزەریشـیان زۆر چـاك و نایاب بێت، جـارێ بـەو رەفتارانەیانـەوە نەبوونەتـە مسـوڵمانێکی ئاسـاییو عـادەتیش چ جای بەچاوساغ دابنرێن!

هەروەها ئەو کەسانەی کە لەسەر مینبـەری پێغەمبـەری رەوشـت بـەرزو مـەزن وەك شـایەری کارامـە هەرچـی بەسـەر زاریـان دابـێ نایگێڕنـەوە لەقسـەی درۆو هەڵـەو چەواشـەکارییانەو وشـەو تـەعبیری زەق و رەق و بـێ رەونـەق و بێنەزاکـەت و دوور لەحورمەت، هەرچەندە خۆیـان پێمـەلاو وتاربێـژو قسـەڕەوان و زۆرزان بـێ، لەتـەرازووی قورئان و سوننەت داهیچ و بۆشن و وەك پووشن.

چ جای ئەو کەسانەی کە بوونەتە دەهۆڵ کوت و زوڕناژەنی ئـەهلی کـوفرو نیفـاق و خۆیانیان سووك و چرووك کردوەو لەلای خواو خەڵکی مسوڵمانی هۆشیار، ئابڕووی دونیاو قیامەتی خۆیانیان بردوە!

---

١- الفرقان: ٧٢

٢- (لغو) وەك (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی لەئەسڵ دا لە (لغا)وە هاتوە کە بـەدەنگی چۆلەکەو تـەیرو تـواڵ دەگوترێو، لەزاراوەشدا هەر قسەو رەفتارێکی بێکەڵك و سوود دەگرێتەوە با گوناحیش بێ.

١١- ﴿ وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴾[١] : (وه ئـــەو كەسانەی كە كاتێك ئایەتـەكانی خوایـان بخرێتـەوە بـیر- و بۆیـان بخوێندرێنـەوە- وەك بابایەكی كەڕو كوێرو لەپەڕووو كەوتوو ڕەفتاریان لەبەرانبەردا ناكـەن)، واتـە: لەبەرانبـەر ئایەتەكانی خواو حوكم و یاسایەكانی شەرع دا ئاژەڵانە ڕەفتـار ناكـەن و بـەدڵ و گیـان و تەسلیمیان دەبن و لێیان تێدەگەن و پێیان پێدەگەن! بەڵێ زانـاو پێشـەوای ئیسـلام، نەك هەر نابێ حەساسیەتی بـەهیچ ئایـەت و فـەرموودەو دەقێكـی شـەرعیی هـەبێو بڕو بیانووی بۆ بهێنێتەوەو فێرعەونانە تەسلیمی نەبێ! بـەڵكو دەبـێ لەهـەموو كـەس زیـاترو چـاكترو زووتـر، سـەری تەسـلیم و گـەردن كەچـیی بـۆ خـواو ئایەتـەكانی دابنـەوێنێو لەبەرانبەر شەرعی خواو پێغەمبەرەكەیدا ﷺ موو نەپسێنێ[٢].

١٢و١٣- ﴿ وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾[٣]: (وە ئـەو كەسـانە -بەنـدەی هەڵبـژاردەی خـوای بەبـەزەیین - كـە دەڵێن: پەروەردگارمان خێزان و وەچەمان بۆ بگێڕە بەمایـەی دڵخۆشـیو بەختـەوەریی، واتـە وایـان لێبكـە كـە پێیـان سـەربەرزو دڵخـۆش بـین، وە بمـان گێـڕە بەپێشـەوا بـۆ پارێزكاران).

**بەڵێ خوشك و برا مسوڵمانەكانم!** یەكی دیكە لە خەسڵەت و دروشـم و نیشـانەكانی ئەو زاناو پێشەوایانە ئەوەیە كـە زۆر بەتـەنگ مـاڵ و خێـزان و وەچـەیانەوەن و هەمیشـە لەهەوڵی ئەوەدان كە لەسەر بنچینەی ئیمان و تـەقواو تەزكیـەو ڕەوشـتی بـەرزو پەسـەند تێیـان بگەیـەنن و پێیـان بگەیـەنن، بـۆ ئـەوەی لـەدونیاو دواڕۆژدا بۆیـان ببنـە مایـەی سەربەرزیو ڕووسووریی، نـەك لەئـەنجامی كەمتەرخـەمیو مشـوور لێنەخواردنیانـەوە، بلح و بێخێر دەربچن و ببنە هۆی عەیبدارییو گوناحبارییو شەرمەزارییان!

---

١- الفرقان: ٧٣

٢- بەداخەوە مەلای وا دەناسم گیرۆدەی زۆر گوناح و هەڵەو پەڵە بووەو، هـەر ئایـەت و فەرموودەیـەكیش كـە ئاماژە بەیەكێك لەو عەیب و هەڵانە بكات كە تێیدان، پێیان قەڵس دەبێو حەز دەكات نەیان بیستێ!!

٣- الفرقان: ٧٤

ئینجا جێی سەرنجە کە (عباد الرحمن) پاش رابردنی دوازدە سیفەتی پێشوو ئەوجار لەخوا دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾[1]، بمانگێڕە بەپێشەوای پارێزکاران! تاکو بزانرێ کە پێشەوایەتیو رابەرایەتی پارێزکاران کاڵایەك نیە بەباڵای هەموو کەسێك ببڕێو هەروا بەگۆترەو هەوەنتە دەستگیر نابێ! بەڵکو کەسانێك شایستەی ئەو پلەو پایەن کە خاوەنی سەرجەم ئەم سیفەت و ئاکارو رەفتارە بەرزو پەسەندانە بن!

هەروەها لەو ئایەتەوە وەردەگیرێ کە نابێ مسوڵمانان و پارێزکاران رازی بن و مل بدەن بۆ پێشەوایەتیو سەرۆکایەتی هەرکەسێك کە دەیەوێت خۆی لەسەریان بکاتە کوێخا! بەڵکو دەبێ برا گەورەو مشوورخۆرێکی شایستەو چاك و لەقەدەر ئایینەکەیان خۆیان هەڵبژێرن.

هەرچەندە وشەی (إمام) لێرەدا چەمکێکی فراوانی هەیەو تایبەت نیە بەبەرپرس (مسؤل)بوون و سەرکردەو مشوورخۆر بوونەوە، بەڵکو زیاتر ئەوەی لێدەفامرێتەوە کە ئەو بەندە هەڵبژاردانە داوای ئەوەیان کردبێ کە خوای بێوێنە وایان لێبکات کە لەبواری دینداریو پارێزکارییدا بتوانن ببنە پێشڕەو (أسوة)و سەرمەشقی مسوڵمانان.

بەم ئەندازەیەش لە توێژینەوەی ئەم خاڵی سێیەمە دەگەڕێین و دەچینە سەر خاڵی چوارەم.



---

[1]- الفرقان: ٧٤

 **خاڵی چوارەم** 

# ماف و هەقی زاناو پێشەوایان بەسەر خەڵکەوە

زاناو پێشەوایانی رەسەنی ئیسلام مادام میراتگرو جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ بن، دیارە نابێ وەك خەڵكی ئاسایی سەیر بكرێن و وەك ئەوان مامەڵەو هەڵس و كەوتیان لەگەڵ بكرێ، بەڵكو دەبێ بەشێوەیەك رەفتاریان لەگەڵ بكرێ كە لەگەڵ پایەو مەقامی باڵاو كەسایەتی رێزداریان دا بگونجێ.

كە دەتوانین بڵێین بەگشتی ئەو جۆرە هەڵس وكەوت و رەفتارە لەدوو خاڵان دا خۆی دەنوێنێ:

١- رێزو حورمەت گرتنیان بەهەموو شێوەیەك.

٢- بەقسەكردنیان و پشتیوانی لێكردنیان لەسنووری شەرع و توانادا.

دیارە لەوبارەشەوە دەقی قورئان و سوننەت زۆرن، بۆ وێنە:

١- خوای كاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ ... ﴾[1].

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە: فەرمانبەریی خوا بكەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بكەن، وە هی كاربەدەستانێك كە لەخۆتانن، جا ئەگەر لەشتێك دا كێشەكەتان پەیدا بوو ئەوە بیگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەر..

زۆربەی هەرەزۆری زانایانیش بۆ وێنە (نووي و ابن تيمية) وشەی (أولي الأمر)یان بەزانایان فەرمانداران (العلماء والأمراء) تەفسیر كردوە، كە ئەگەر بەقووڵی سەرنج بدەین دەستەڵات و شەرعیەتی فەرمانداران (أمراء)یش هەر دەگەڕێتەوە بۆ زانایان (علماء) چونكە بەبێ بڕیاری زانایان و فەتوایان هیچ دەستەڵاتدارێك لەنێو مسوڵمانانندا نابێتە خاوەنی حوكم و دەستەڵاتێكی شەرعیی رەوا، ئینجا هەرچەندە زانایان و پێشەوایان پێویستە گوێڕایەڵییان بۆ بكرێو بەقسەو فەرمانیان بكرێ، بەڵام لەكاتی كێشەو مشت ومڕی نێوان میللەت و زانایان و كاربەدەستاندا، پێویستە بگێڕرێتەوە بۆلای قورئان و

---

١- النساء: ٥٩

سوننەت و تەرازووی شەرع، چونکە لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا شەریعەت سەروەرو باڵا دەستەو دەبێ هەموو لایەك بە پادشاو گەداو زاناو عەوامەوە، مل کەچ و پابەندی بن و لێی لانەدەن.

٢- پێغەمبەری پێشەواشمانﷺ فەرموویەتی: (إنَّ مِن إجلال الله إكرام ذي الشيبة المسلم، وحامل القرآن غير الغالي فيه ولا الجافي عنه، وإكرام ذي السلطان المقسط)[١].

واتە: لە رێزگرتن و بەگەورەگرتنی خوا ئەوەیە کە رێزو حورمەتی مسوڵمانی (پیاو یان ژن) سەر سپیو تەمەندار بگیرێ، هەروەها بابایەك کە ئاشناو هەڵگری قورئان بێ، بەمەرجێك دووچاری زۆر تێدا رۆچوون (غُلُوّ)و دوورەپەرێزیی و لێنامۆ بوونی نەبووبێ، وە خاوەن دەستەڵاتێکی دادگەر.

**بەڵێ مسوڵمانە بەرێزو خۆشەویستەکان!** وەك لەم فەرموودەیەدا دەبینین پێغەمبەری خواﷺ رێزو حورمەت لێگرتنی ئینسانی بەساڵداچوو و شارەزاو هەڵگری ورئان و حوکمڕانی دادگەر، بە بەڵگەو نیشانەی رێزگرتن و بەگەورە گرتنی خوای پەروەردگار داناوە!

جا جێی سەرنج ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ بۆ بابای زاناو شارەزاو هەڵگری قورئان دوو مەرجی داناون:

**یەك:** (غير الغالي فيه) تێیدا رۆنەچووە، مەبەستیش لە رۆنەچوون (عدم الغُلُوّ) ئەوەیە کە ئینسان سنوورەکانی شەرع نەبەزێنێ و لە ئایین و بەرنامەی خوا تێنەپەڕێنێ، بۆ وێنە: کەسێك کە دەچێ هێندە سەرگەرمی خواپەرستیی‌و شەخسیی‌و تایبەتی دەبێ، بۆ وێنە هەمیشە بەڕۆژوو دەبێ‌و ناپیسێنێتەوە، وە شەوانەش هەرگیز ناخەوێ‌و هەر بەبێداریی دەمێنێتەوەو سەرەنجام دووچاری نەخۆشیی‌و وەزع تێکچوون دەبێ، ئەوە هەرچەندە بەحیسابی خۆی بۆ خوا رازیکردن وا دەکات، بەڵام بێگومان بەو جۆرە رەفتارە هەڵەو ناشەرعییەی خوا لەخۆی دەڕەنجێنێ‌و تووڕە دەکات، بۆچی؟!

چونکە ئەو بابایە بەخەیاڵی خاوی خۆی دەیەوێ لە ئیسلام بەولاوەتر بچێ! ناشزانێ کە تێپەڕاندن لە سنووری شەرع هەر بەلادان دادەنرێ‌و، سەربارەش هەرجۆرە

١- رواه أبوداود.

زیادەڕۆیی (إفراط)و تێپەڕاندن و ڕۆچوونێك، حەتمەن لەسەر حیسابی لایەنەكانی دیكەی دینداریی‌و مسوڵمانەتی‌یەو خاوەنەكەی هەرچۆن بێ هەر لەسەری قەرزدار دەبێتەوە.

وە لەڕاستی‌دا جوانی‌ی و ڕەونەق و تێرو تەواویی ئیسلام و مسوڵمانەتی تەنیا لەكاتێكدا دێتەدی كە بەگوێرەی تەرازووی قورئان و سوننەت بەڕێوەبچی‌ێو، تەنیا لەو حاڵەتەشدا مسوڵمان هاوسەنگ (متوازن) دەبی‌ێو بەپێچەوانەوە هەر لاسەنگ و لاتەڵ دەردەچێ.

هەر بۆیەش پێغەمبەری خواﷺ وەك لە فەرموودەیەكدا هاتوە كە (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە ئامۆژگاری یەكێك لە هاوەڵانی خۆی كردوە كە دووچاری ئەو حاڵەتەی (الغلو) و ڕۆچوون و تێپەڕاندنە بووەو ڕێ‌ڕوونی كردوە كە هەق و مافی هەركام لە پەروەردگاری‌و جەستەی‌و میوانی‌و خێزانی بدات و، پاشان فەرموویەتی: (فأعط كل ذي حقٍ حقَّهُ) مافی هەر خاوەن هەقێك بدە!!

دوو: (ولا الجافي عنه) لێی نامۆ نەبووەو خۆی لێ‌دووره پەرێز نەگرتوە، ئەمیش دیسان مەرجێكی دیكەی زۆر گرنگە بۆ بابای زاناو هەڵگری قورئان، چونكە هەركام لەتێپەڕاندن (إفراط)و بەزایەدان (تفريط) دوو دەردو نەخۆشی كوشندەی دینداریی‌و مسوڵمانەتین و، یەكێك لە پێشەوایانی پێشین (أئمة السلف)یشمان كە پێم وایە عەلی كوڕی ئەبوو طالیبە (خوا لێی ڕازی بێ) لەو بارەوە گوتوویەتی:

(قصم ظهر الدين رجلان: جاهل متنسك وعالم متهتك) واتە: دوو كەس پشتی ئاینیان شكاندوە: نەزانێكی ڕۆچوو لەپەرستنداو زانایەكی بێ بەندو بارو بەدرەفتار.

كەواتە: پوختەی قسان ئەوەیە كە بابای زاناو بە قورئان شارەزا، بەمەرجێك دووچاری هیچ كام لەدوو نەخۆشی كوشندەی تێپەڕاندن و بەزایەدان نەبووبی‌ێو، بەشێوەیەكی ڕێك و پێك پێیەوە پابەند بێت، ڕێزو حورمەت گرتنی- كە بێگومان بەقسەكردنی‌و فەرمانبەریی كردنی‌و پشتگیری كردنیشی هەر جۆرێكە لەڕێزو حورمەت گرتنی- بەڵگەو نیشانەی بە بەرزو مەزن و بەڕێزگرتنی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارە.

٣- هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەیدا هەر لەوبارەوە فەرموویەتی: (لیس منا من لم یجل کبیرنا ویرحم صغیرنا ویعرف لعالمنا حقه)١. واتە: هەرکەسێك ڕێزو حورمەتی بابای بەساڵداچوومان نەگرێو بەزەیی بەگچکەماندا نەیەتەوەو حەق و مافی بابای زانامان نەدات، ئەوە لەئێمە نیە.

ئاشکراشە کە مەبەست لە حەق و ماف پێدانی زانایان زۆر شتە، هەر لەڕێزو قەدرگرتن و بەقسەکردن و فەرمانبەریکردنەوە بگرە هەتا هەموو جۆرو شێوەکانی هاوکاریکردن و دەستبار بۆ گرتن و پشتگیریکردن.

ئینجا دیارە هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەت و فەرموودە بەهێزو پیرۆزانەدا بووە کە سەرجەم زاناو پێشەوایانی ئیسلام لەسەر ئەوە رێك کەوتوون کە هەرکەسێك بەچاوی سووك تەماشای زانایەکی ئیسلام بکات یان گاڵتەی پێبکات. ئەوە ئەگەر لەبەر ئایینەکەی بێ، بابای بەسووك سەیرکەرو گاڵتە پێکەر پێی کافر دەبێت، بەڵام ئەگەر تەنیا لەبەر شەخسی زانایەکە بێت ئەوە کافر نابێ بەڵام گوناحێکی گەورەی کردووە، مادام بابای بەسوك تەماشاکەر بەڵگەو پاساوێکی ڕاست و بەجێی بەدەستەوە نەبێ و لەسەر ناهەق بێ!

ئینجا لەکۆتایی ئەم خاڵی چوارەمەش دا دەڵێم: پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: (إنَّما جُعِلَ الإمام لِيُؤتَمَّ بِهِ)[٢]. واتە: پێشەوا بەتەنیا بۆ ئەوە کراوە بەپێشەوا کە پەیڕەویی لێبکرێو بکرێتە سەرمەشق و پێشڕەو!

**جا موسوڵمانە بەڕێزەکان!** پێویستە بزانین کە وەك چۆن بۆ نوێژو طاعەتی شەخسیو تایبەتیمان پێویستیمان بەئیمام و پێشەوا هەیە، بۆ سەرجەم کارو چالاکیو طاعەتە کۆمەڵایەکانی وەك: جەنگ و جیهادو حوکم و سیاسەت و دادوەرییو چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانمان و...هتد، دیسان پێویستیمان هەر بەئیمام و مشوورخۆرێك هەیە، ئەویش تەنیاو تەنیا دەبێ بابایەکی زاناو شارەزاو سەرڕاست بێت.

---

١- رواه الحاكم وحسنه الألباني.

٢- رواه مسلم.

ئینجا بێگومان هیچ زاناو پێشەوایەکیش بەتەنیا کاروباری بۆ بەڕێوە ناچێ‌و نە ئوممەتی بێ ئیمام و نە ئیمامی بێ ئوممەت هیچ کامیان بەبێ یەکتر مەداری دین و ژینیان پێ‌سازنابێ، بۆیە پێویستە بەوپەڕی چاوی ڕێزو حورمەتەوە تەماشای زاناو پێشەوایانمان بکەین و ئەو (تعزیزو توقیر)ەی کە کاتی خۆی هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەکانی پێغەمبەری خوا (خوا لێیان ڕازی بێ) بۆ پێغەمبەری خواﷺ هەیانبووە، ﴿ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ ... ﴾[1] ، ئێمەش لەقەدەر خۆیان بۆ زانایان و پێشەوایانمان هەمانبێ، چونکە مادام زانایان میراتگری پێغەمبەری خواﷺ بن، دیارە وەك چۆن ئەرك و ئەمانەت و زانستەکەییان بەمیرات گرتوە، پشتگیریی لێ‌کران (تعزیر)و ڕێزو قەدر لێگیران (توقیر)یشیان هەر لێ بەمیرات گرتوون، چونکە (الغُنمُ بالغُرمِ).

بەڵێ موسوڵمانینە! زاناو پێشەوایانی ئیسلام پێویستە ڕێز لێگیراوو پشتیوانی لێ‌کراو بن، چونکە ئیمامی بێ ئوممەت زەلیل و ئوممەتی بێ ئیمامیش دیلەو، هەردووکیان بەیەکەوە جوانن و، تەنیا بەدەست بار بۆ یەکتر گرتنیش کوڵ و باری قورسی دینداریی‌و ئیسلامەتی دەتوانن.

وە دەبێ هەمووماندڵنیابین کە وەك چۆن نوێژی بەکۆمەڵ (جماعة) بەبێ ئیمام دروست نابێ، کۆمەڵ و کۆمەڵگای ئیسلامییش بەبێ سێبەرو برا گەورەیەك نایەتەدی!

ئینجا دەبێ وریاش بین و بزانین کە بۆچی ناحەزو دوژمنانی ئیسلام و مسوڵمانان هێندە جەخت دەکەن لەسەر فشار خستنەسەر ئەو کەسانەی کە لەنێو مسوڵمانان دا وەك سەرو سەرکردەو پێشەوا سەیر دەکرێن، کە یان بکرێن و لەخشتە ببرێن، یان هەر نەبێ لەبەر چاوان ببێزێنرێن و ناشیرین بکرێن! چونکە دەزانن کە میللەتی بێ‌سەرو سێبەر، وەك مەڕی بێ‌شوانەو بەسێنایی زەفەری پێ‌دەبردرێ‌و بەردەست دەکرێ!!

ئێستاش نۆرەی خاڵی پێنجەم و کۆتاییە.



[1]- الفتح: ٩

 خاڵی پێنجەم 

# ئەركی سەرشانی زانایانی ئیسلام چیە؟!

**موسوڵمانە سەنگینەكان!** دەتوانین بەیەك رستە ئەركی سەرشانی زاناو پێشەوایانی ئیسلام بخەینەروو و بڵێین: (بریتیە لە پاراستنی میراتی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێ)، **پاراستنی میراتی پێغەمبەرانیش (سەلامی خوایان لەسەر بێ) بە دوو شتان دەبێ:**

١- بەپێی بەرنامە (منهج)ێكی راست و دروست و بەشێوەیەكی راست (صحیح) ئیسلام وەربگرن و تێبگەن و لەخەڵكی بگەیەنن: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ... ﴾[1].

٢- بەشێوەیەكی راست و شەرعیانە ئیسلام لەسەر ئەرزی واقیع پیادە بكەن و كیان و قەوارەی ئیسلامی بەرپا بكەن:﴿ ..أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ ... ﴾[2].

ئینجا تەنیا شتێكیش كە دەستەبەركەر (چامن)ی هێنانەدی هەركام لەو دوو ئامانجەیە، بریتیە لە چاك چاك تێگەیشتن و هەزم كردن و پاشان پێوە پابەندبوون و گرتنی رێبازی دینداریكردنی عیلمیانەو عەمەلیانەی پێشینەی چاكمان (سلفنا الصالح) كە بێگومان رێبازی پێغەمبەری خواﷺ رێبازی جێنشینە سەر راستە هیدایەت دراوەكانی، لەپێشی پێشەوەیەتی.

جا لێرەدا بەپێویستی دەزانم تیشك بخەمە سەر مەسەلەی هەوڵدان و كردوكۆش كردنی زاناو پێشەوایانی ئیسلام بۆ بەرپاكردنی ئایین (إقامة الدين)و كیان و قەوارەی سیاسی بۆ پەیداكردنیو لەمەیدانی واقیع دا چەسپاندنی، چونكە زۆر كەس لەو مەسەلەیەدا لەم رۆژگارەماندا دووچاری سەرگەردانیو سەرلێشێوان و چەواشەكران بووە، بەهۆی قسەو قسەلۆك و پروپاگەندەی بەرواڵەت فریودەرو ژەهراویانەی كەسانێكی زۆرزانەوە، كە دەڵێن: (كاكی خۆم دین و سیاسەتیان نەگوتوە، ئاخر چۆن دەبێ زاناو

---

١- الجاثية: ١٨

٢- الشورى: ١٣

پێشەوایانی مێزەرە سپیو پەرێز پاك و پیاو چاك و مامۆستایانی خواناس و دڵ رووناك و موبارەك، بچنە نێو تۆزو خۆڵ و زەلکاوی سیاسەتەوە! سیاسەتێك کە پڕپڕە لەفرت و فێڵ و تەڵەکەبازییو چەواشەکارییو بێباریيو بێبەندوباریی[1]، قەت قەت ناکرێو ناگونجێ مامۆستاو پێشەوایانی ئایین هەر توخنی بکەون چ جای بەنێویشی بکەون! چونکە ئەو زاتە موبارەك و بەرێزانە بەو تەرزەکارو پیشەیە، تۆزو خۆڵاوییو قوڕاوییو لێخن و چڵکن دەبن و شتی ئاواش بەهیچ رەنگێك لەوان ناوەشێتەوە!!)[2]

بەڵێ ئەم جۆرە قسانەو ئەو چەشنە پڕوپاگەندانە سەرپاك فێڵ و پیلان و نەخشەکێشانی ناحەزانی زۆرزانن و، مەبەستیان ئەوەیە کە خەڵکی پاك و چاکی وەك مامۆستاو پێشەوایان لەژێر فشارو کاریگەریی ئەم جۆرە قسانەدا حوکم و سیاسەتیان لەبەرچاو ببێزرێو، سەرەنجام ئەو زۆرزان و فێڵبازانە مەیدانیان بۆ تەخت و ئاچووغ و

---

١– دیارە ئەو جۆرە کەسانە لەهەمبانەی خۆیاندا گوێز دەژمێرن، ئەگەر نا سیاسەتی دیندارانە چ درۆو دەلەسەو فێڵ و فەرەجی تێدا نیەو، خەم لێخواردن و سەرپەرشتی کردنێکی راست و دروست و بێفێڵی خەڵك و میللەتە.

٢– لێرەدا بەپەسەندی دەزانم ئەم قۆڵە نەزیلەیەی خۆم بگێڕمەوە:

پاش ئەوەی ساڵی (١٩٨٣)دا ئیمتیحانێکی مەلایەتیم لە هەولێرداو دەرچووم و لەجیاتی عەسکەرییکردن بە (إنتداب)بە (مەلا) دامەزرام و دوای چەند ساڵێك لە سۆنگەی تەنگ پێهەڵچنینی رژێمی بەعسەوە ماڵەکەمم لە (١٩٨٥–١٩٨٦)دا لەدێی (سەرسیان)ەوە گواستەوە بۆ گوندی (گەلۆوی ماخۆبزنان)، رۆژێکیان کە لەشارۆچکەی (سەنگەسەر)ەوە دەگەڕامەوە بۆ ماڵ، لەدامێن گوندی (دووگۆمان) سەگێك رامالێکردینێو بۆمان هات– رەفیقێکم لەگەڵ بوو– دیارە من لەسەرەتاوە هیچ خۆم لە سەگەکە شلوێنەکردو گوێم پێنەدا، بەڵام کە دوایی لەئەنجامی مشەوەش بوونی رەفیقەکەم و چەند جار ئاوڕدانەوەیدا، تەواو هێرش و پەلامارەکانی نیزیك کردەوەو ترسام ئەگەر نەشمان گرێ بەئاوو لیکی زاری پیسمان بکات، بەناچاری بۆ دوورخستنەوەی دوو سێ بەردم رێگورزاندن و راوم نا، دیارە کات زستان و باران و سەرما بوو و خۆمانمان داپێچا بوو، هەر هێندەم زانی مام حاجییەکی مەرداڕ کە خاوەنی سەگەکە بوو، لەدوورەوە بەتوڕەیی تێی خوڕین و توورەبوو کە بۆچی بەردمان بەسەگەکەیدا داوە، ئینجا کە نیزیك بووەوە منی ناسییەوە، بەسەرسوڕمان و هەناسەبڕکێو شپرزەییەوە گوتی: مامۆستا ئەوە تۆی، کوڕە مامۆستا خۆتۆ پیاوێکی بەرێزی، چۆن دەبێ بەرد بەسەگدا بدەی؟! منیش گوتم جا مام حاجی هەر چونکە مامۆستاو بەرێزم دەبێ سەگانیش لەخۆم دەرنەکەم و لێیان گەرێم بمگرن یان لە قوڕو چڵپاوم هەڵکێشن؟! خۆ دەبێ پیاوی بەرێز لەخەڵکی دی زیاتر ئاگای لەخۆی بێت، چونکە لەقوڕ هەڵکێشرانی لێناشیرینترە!!

چۆڵ بێت، بەکەیفی خۆیان ئەسپی سەرکێشی ئارەزوویان لە مەیدانی دابین کردنی بەرژەوەندییەکانیان دا تاوبدەن!

نەخێر نابێ زانایان و مامۆستایانی پێشەوا مەیدانی مشوور لێخواردنی خەڵك و کۆمەڵگا لە هەموو بوارەکانی ژیان و گوزەران دا چۆڵ بکەن، چونکە مەیدان بەجێهێشتنیان زوڵم و ستەمێکە لەخۆیان و ئایینەکەیان و گەل و میللەتەکەشیانی دەکەن!

ئاخر چۆن دەبێ زانایانی ئیسلام و پێشەوایانی موسوڵمانان دەست لە سیاسەت و حوکم وەرنەدەن و ئەو مەیدانەیان لێقەدەغە بکەن و، ئەو ئەرکە بەرزو پیرۆزە مشوورخۆریی و سەرپەرشتیکردنەیان لێزەوت (غصب) بکەن؟! مەگەر ئیسلام تەنیا نوێژو رۆژوویەو پەیوەندییەکی رووحیی رووتی نێوان خواو بەندەیە- وەك ئایینی شێوێنراوی نەصرانیەت- تاکو پێویست نەکات زاناو پێشەواو چاوساغەکانی موسوڵمانان باسی حوکم و سیاسەت بکەن؟! ئایا ئیسلامەتی:

هەم (ئیمام عەقیدەو تێڕوانین) و هەم (ئەنجام دانی درووشمەکانی بەندایەتی وەك نوێژو رۆژوو و حەج و زیکرو هتد) و هەم (ئەخلاق و ئاکارو ئادابی بەرزو جوان) و هەم (سیستەمی حوکم و سیاسەت و ئابووریی‌و جەنگ و ئاشتی‌و...هتد) و هەم (دادوەریی‌و هەڵبڕینی کێشەو گرفتەکان و چەسپاندنی دادگەریی) و هەم ...هەم، نیە؟!

دەجا ئایا ئیسلامێکی ئاوا مەزن و پان و پۆڕ، چۆن و بە چ عەقڵێك دەکرێ‌و دەگونجێ کە بەبێ کیان و قەوارەی سەربەخۆو بەبێ بەدەستەوەگرتنی جڵەوی حوکم و سیاسەت، بەڕێوە بچێ‌و بەرپابکرێ؟!!

نەخێر ناکرێ‌و نابێ کە زانایانی ئیسلام و پێشەوایانی موسوڵمانان لە مزگەت و میحرابەکانیان دا حەپس بکرێن و، هەر بەوەندە وازبێنن و، قەناعەت بکەن کە پێش نوێژیی بۆ خەڵکی بکەن و لەنێو مزگەوت دا مشووریان بخۆن، بەڵام لەدەرەوەی جوغزی مزگەوتدا وێڵیان بکەن؟!!

بەڵکو دەبێ وەك پێغەمبەرە بەرزو بەڕێزەکەیان ﷺ کە خۆیان بەجێگرو میراتگری دەزانن، وەك پێش نوێژیکردن، مشوور لێخواردن و سەرپەرشتیکردن و

سەرکردەیێتیکردنی خەڵك و میللەتیش بەئەرك و ماف (وظیفة وحق)ی شـەرعیی خۆیـان بزانن.

ئـەدی ئـەگـەر زانـاو پێشـەواو میراتگرانـی پێغەمبـەرﷺ نەیەنـە مەیـدانیو چـالاکانە مشوور نـەخۆن، کـێ درووشمـەکانی ئیسـلام بـەرپا دەکـات و کـێ سیستـەمەکانی پیـادە دەکات؟! بەبێ سەرپەرشتیکەرو خەمخۆر چۆن چۆنی عەقیدەو فەرهـەنگ و ئـەخلاق و ئادابی موسوڵمانان سەلامەت و پارێزراو دەبێ؟!

بەڵێ مسوڵمانینە! پێویستە ئـەو زانـاو مامۆسـتا بـەڕێزو پایەبەرزانـەی کـە خۆیـان بـەمیراتگری پێغەمبـەرﷺ دەزانـن بـەکردەوە (بالفعـل) بـۆ خـەڵك و کۆمەڵگاکـەیان ببنـە پێشەواو پێشڕەو و چاوساغ و، مشووری دین و ژینیان بخۆن و سەرپەرشتییان بکـەن و، دەبێ خەڵك و میللەتیش لەدەوریان کۆببێتەوەو باوەشیان بۆ بگرێتەوەو لەسنووری شەرع دا فەرمانەکانیان جێبەجێ بکات!

بەڵێ دەبێ مامۆستاو شارەزایانی ئیسلام رادەنە مەیدان و بـەدەنگێکی دلێـرو زوڵاڵ لە خەڵك و جەماوەری موسوڵمانیانەوە بخوڕن و بڵێن:

وەرن خەڵکینە بـا حـوکم بـە (مـا أنـزل الله) بکـەین و، وەرن بـا شـوێن پێغەمبـەری خـواﷺ بکـەوین! هـەر زانایـەکی ئیسـلام بیـەوێ دەعـوای میراتگرایـەتی پێغەمبـەرانی (سەلامی خوایان لەسەر بێ) لێ بسەلمێنرێو رێزو حورمەتی پێشەوایەتی مسـوڵمانانی بـۆ دابنرێ، دەبێ زۆر بەجیددیو بوێرانەو لێبڕاوانـە مشـووری پاراسـتنی ئـەو میراتـە بـەرزو بێوێنەیە بخوات، بەڵام دەبێ مشووری هـەموو میراتەکـە بخـوات نـەك گوڵبـژێری بکـات! بێنێ ئەوەی کە ئارەقی پێوەناکات و پێیەوە سـەغڵەت نـابێ، هـەر لەگـەڵ ئـەوە خـەریك بێت! چـونکە تـۆ کـە دەڵێـی مـن میراتگـرو جێگری پێغەمبـەری خـوام ﷺ نـابێ مـافی هەڵبژاردن و سەرپشك بوون بەخۆت بدەی! ئینجا ئایا پێغەمبەری کۆتاییﷺ تەنیا نوێـژو رۆژووی لـەدوای خـۆی بـەمیرات بـەجێ هێشـتوە! یـاخود بەرنامـەو شـەریعەتێکی بـۆ کردووینە میرات و ئەمانەتێکی خستۆتە ئەستۆمان کە سەرتاپای ژیان و گوزەرانی تـاك و کۆمەڵی گرتۆتە نێو خۆی، بەرنامەو ئایینێك کە هەم عیبادەت و طاعەتـەو، هـەم حـوکم و سیاسەت و، عەقڵ و دڵ و مزگـەوت و بـازاڕو حیکمـەت و حکومـەت و زانسـت و تەزکیـەو

دوانگـەو فەرمانگـەو (المنـبر والـدائرة)و دونيـاو دواڕۆژ، پێکـەوە دەبەسـتێتەوەو هـەر هەموويان وەك دەنكەكانى تەسبيحێك بـە دەزووى بەندايـەتى (عبوديـة)و ديندارييـەوە دەكـات و پێكـەوەيان كۆدەكاتـەوە، وە كەسـانێك پـەروەردە دەكـات كـە مـەردى مەيدانەكانى: طاعەت و كەسابەت و فيـداكارىو شـەهادەت و حـوكم و سياسـەت بـن و، مەردى حەرب و ميحراب بن و، لەپێناوى خوادا شەونوێژو شەبەيخوون و تـەقواو تەقـەيان هەرپىّ وەك يەك بـن و جياوازىيـان لـەنێوان دا نەكـەن و، بـەكورتى: خـوا چـى پىّچاكە ئەوانيش پێيان چاك و چيشى پىّخراپە ئەوانيش پێيان خراپ بێـت و، مـل كەچـى شـەرع بن نەك، شوێن كەوتەى ميزاج و تەبع و پابەندى (هُدى) بن نەك گوىّ لە مستى (هَوى)!

**بەلّىّ موسولّمانينە! خوشكان، برايان!** ئێمەى كۆمەلّگاى كـوردەوارى لـەم قۆناغـە ناسك و سەخت و دژوارەى كە ميللەتەكەمانى پێدا رەت دەبىّ لـە هـەموو قۆناغێـك زيـاتر پەكمان لەسەر ئەوە كەوتوە كە پێكەوە تەباو برا بين و كۆك و رێك بين و لـەدەورى يـەك بين، ئينجا بەتەئكيد ئەوەشمان بۆ ناكرىّ هەتا ئيسلام نەكەين بەچەق (مركز)ێك كە گـەل و ميللەتەكەمانى لەدەوروبەر كۆبێتەوە، ديارە تاكە كەسێكيش كـە دروسـت و رەوا بێـت، ميللـەت و خـەلّكى مسـولّمانى لىّكۆبێتـەوە زانـاو پێشـەواو چاوسـاغى ئيسـلامە، چـونكە بەهيچ رەنگێك رەوا نيە گەل و جەماوەرى ديندارو مسولّمان بـەدواى كەسـێك بكـەون كـە بىّدينە، نامسولّمانە، ئاخر كەسێك نەك هەر بـەرِىّى خـوا نـەزانىّو رێبـازى پێغەمبـەرﷺ نەناسىّ، بەلّكو هەر برِواشى پێيان نەبىّو هەر دانيشيان پێدا نەهێنىّ، چۆن رەوايەو خـوا بەردارە ببێتە پێشەواو سەركردەو پێشرِەوى خەلّكى مسولّمان؟!!

كەواتە: با رابەرو پێشەواو چاوساغەكانى خۆمان بناسين، كە تەنياو تـەنيا زانايـانى ئيسلام و ميراتگرانى راستەقينەى پێغەمبەرنﷺ وە بـا دەوريـان بگـرين و رێـزو قـەدريان بگـرين و لـەنێو خۆمانيانـەوە بگـرين و بـەرگرييان لىّبكـەين و گوێيـان بـۆ بگـرين و فەرمانەكانيان جىّبەجىّ بكەين و پشتيان بگـرين، چـونكە خـواى كاربـەجىّ لـە ميللـەتى مسولّمان رِازى نابىّ كە رِابەرو سەركردەو پێشەواى خۆيان لەنێو غەيرى خۆيان دا ديـارى بكەن، سەرنج بدە چۆن فەرموويـەتى:﴿...وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ..﴾[1]، دەبىّ كاربەدەسـت و

١- النساء: ٥٩

مشوور خۆرانمان لەخۆمان بن و سەربەخۆمان بن و مل کەچی ئایینەکەمان و پابەندی شەریعەتی خواو ڕێبازی پێغەمبەرەکەمانﷺ بن، ئەگەرنا شەرعیەتی بوونە براگەورەو سەرکردەو سەرمەشقیانی نیەو نابێ.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستیشم ئەوە نیە کە خەڵك و میللەتی مسوڵمانمان بانگ بکەم بۆ هاتنە نێو ڕیزی کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامیەکان، چونکە بازنەو جوغزی حیزب و کۆمەڵ لەوە گچکەترە کە جێگای میللەت و جەماوەری تێدا وەبێ! بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە ئێمەی میللەتی کوردستان بە هەموو چین و توێژەکانمانەوە لەدەوری زاناو شارەزایانی[1] ئیسلام –لە هەر بەرگ و شێوەو دیمەنێك دا بن، بەڵام بەمەرجی ڕەسەن بوون– کۆببین و دەستباریان بۆ بگرین، بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵاو بەیداغی ئیسلام و گێڕانەوەی حوکمی شەرع، وەك خوای کاربەجێ فەرمانی پێکردووین:[2]

---

١– وەك پێشتر گوتمان تەئکیدی دەکەینەوە کە مەبەستمان لەزاناو شارەزایانی ئیسلام کۆمەڵ و توێژێکی تایبەتی نیە وەك (مەلا)، بەڵکو هەرکەسێك کە بە (واقیعی بەئیسلام زاناو شارەزایە)، دیارە لە قورئان و سوننەتیش دا تەنیا وشەکانی (عالم)و (فقیە) (علماء) هاتوون بەبێ خستنە سەری هیچ جۆرە (قید)و (صفة)ێکی تایبەت.

٢– جارێکیان لەگەڵ مەلایەکی سەر بە حیزبە عەلمانیەکان قسەو باسمان بوو، مەلایەکە لێکدا لێکدا دەیگوت: ئەوە نیە خوا فەرموویەتی: ﴿..وَلَا تَفَرَّقُواْ...﴾ آل عمران: ١٠٣، کەواتە گەل و میللەتی ئێمە پێویستە یەك بێت و پێکەوە بێت و ناکۆك نەبێ!، منیش پێم گوت: بەڵێ ڕاستە خوا فەرمانی کردوە بەیەکبوونمان و پێکەوە بوونمان و پەرتەوازە نەبوونمان، بەڵام خوای کاربەجێو دادگەرو پەنهان بین بەر لەوەی پێمان بفەرموێ: ﴿وَلَا تَفَرَّقُواْ﴾ آل عمران: ١٠٣، فەرموویەتی: ﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا﴾ آل عمران: ١٠٣، تێکڕاو وێکڕا دەست بە ڕێسمانی خوا بگرن! کەواتە دەستەبەرکەر (ضامن) پەرتەوازە نەبوون و دابڕ دابڕ نەبوون، بریتیە لەکۆبوون و کۆك بوون لەسەربناغەی ئایین و بەرنامەی خوا! بەڵێ هەر کەسێك بیەوێ گەل و میللەت دوچاری دەردی کوشندەی پەرتەوازەییو ناکۆکیو دووبەرەکی نەبێ، پێویستە بەرلەوەی گلەییو ئامۆژگاریان ئاراستە بکات کە ناکۆك و نارێك نەبن، پێیان بڵێ کە دەست بە بەرنامەو ڕێسمانی مەحکەمی خواوە بگرن، هەروەها هەرکەسێکیش بیەوێ پێشەوایەکی باش بێت بۆ موسڵمانان و متمانەو باوەڕی پێبکەن و لەدەوری نەپرژێن، دەبێ بەر لە هەموویان خۆی ملکەچی شەرع و ڕێبازی خوا بێت و توند دەست بەڕێسمانی بەرنامەی خواوە بگرێ، ئەگەرنا جگە لەخۆی نابێ یەخەی کەس بگرێ!

﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ... ﴾[1]، چونکە بێگومان ئاوا نەبێ نە بەتەواویی موسوڵمانەتی خۆمانمان پێئێسپات دەکرێ‌و، نە باری قورسی ئیسلامیشمان پێ دەست دەدرێتێ، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ یەکسەر پاش فەرمان کردن بە بەپاکردنی بەرنامەی خوا﴿ ..أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ .. ﴾[2]، فەرموویەتی: تێیدا پەرتەوازە مەبن﴿ ..وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ .. ﴾، چونکە ئەگەر بێت و کۆو کۆك و رێك و پێك نەبین، مەحاڵە بتوانین و شایستەی ئەوە بین ئەرکی بەرپاکردنی ئایین جێبەجێ بکەین.

ئینجا من دڵنیاشم کە هەتا ئیسلامی‌یەکان زیاتر تێبگەن و پێبگەن و کامڵ بن، چاکتر هەنگاوی برایەتی‌و یەکریزیی‌و یەکبوون بەرەو یەکتر دەنێن، بەڵام وەك گەلێك جاری دیکەش گوتوومەو تەئکیدی دەکەمەوە. کە من هیچ کاتێك وشەو ناوی (ئیسلامیی) تەنیا ناکەمە کاڵای باڵای کۆمەڵ و لایەنە ئیسلامی‌یەکانی وەك: کۆمەڵی ئیسلامیی‌و یەککرتووی ئیسلامیی! بەڵکو هەر مسوڵمانێك چ پیر بێ چ گەنج، چ پیاو چ ئافرەت، چ خوێندەوار چ نەخوێندەوار، چ زاناو چ نەزان، چ مەلاو شێخ چ غەیری ئەوان.. هەرکەسێك بڵێ خۆم بە بەندەی خوا دەزانم و شوێن کەوتووی پێغەمبەری خوام و بێجگە لەئیسلام بەئایین و بەرنامەیەکی دیکە رازی نیم و، بەپێی تواناش هەوڵ بدات و کردو کۆش بکات بۆ بەرپاکردنی حوکمی ئایینی خوا، ئەوە ئینسانێکی ئیسلامیی‌یە با لەهیچ کۆمەڵ و حیزبێکی ئیسلامییشدا نەبێ!

چونکە ئیسلامیی بوون یانی شوێن کەوتنی ئیسلام، وە ئیسلامیی بابایەکە کە بەدوای ئیسلام دەکەوێ‌و تەنیا ئیسلامەتی بە بەرنامەو رێبازو ژیان و گوزەرانی خۆی‌و میللەتەکەی دەزانێ.

ئەمە لەلایەکەوە لە لایەکی دیکەشەوە هەرکەسێك شوێن غەیری ئیسلام بکەوێ، یان غەیری ئیسلامی وەك بەرنامەو رێبازی ژیان و گوزەرانی تاك و کۆمەڵ پێ‌ڕاست و دروست بێت، ئەوە ئەگەر مەلاش بێت نەك هەر ئیسلامیی نیە، بگرە هەر مسوڵمانیش نیە! وە

---

١- آل عمران:١٠٣

٢- الشوری: ١٣

بابای وا ئەگەر مەلاو شێخیش بێت، ئەوە هیچ کە بۆ پێشەوایەتی و برا گەورایەتی مسوڵمانان ناشێ، بگرە هەر بەمسوڵمانیش دانانرێ، مەگەر لەوجۆرە کەسانە بێ کە لەڕووی شەرعەوە بە بیانوو برکراو و(إقامة الحجة) لەسەر کراو دانەنرێ، ئەگەرنا پیاوی وا نەك لە میحراب و مینبەری پێغەمبەرﷺ بەڵکو پێویستە هەر لە مزگەوتیش دەربکرێو لەبازنەو جوغزی مسوڵمانەتیش وەدەربنرێ!

**بەڵێ خوشك و برا مسوڵمانە خۆشەویستەکانم!** ئەی ئەهلی مزگەوت! هەرکەسێکتان بینی لەو مەلاو شێخ و حاجیە فەقیرحاڵ و سەرگەردان یان دڵ بەتاڵ و زۆرزانانەی کە بەدوای سیکۆلاریزم و لیبراڵیزم و ناسیۆنالیزم و سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم و سەرجەم ڕێچکە ئیزم دارەکان کەوتبوو، کە لەدرۆزناوی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواوە هەڵقولاون، ئەوە بەناوی بێ نێوەڕۆك و بەمێزەرەو کەواو سەڵتەو شاڵ و کەشیدەکانیان فریو مەخۆن و، دڵنیابن کە ئەوجۆرە کەسانە جارێ پەکیان لەسەر ئەوە کەوتوە کە بەڵگە بهێننەوە بۆ ئیسپاتی مسوڵمانەتی خۆیان، نەك پێشەوایەتیو ڕیش سپیایەتی ئەهلی ئیمان[1]!، مەگەر خوا نەیفەرمووە: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾[2] ؟؟! واتە: هەرکەسێك جگە لەئیسلام شوێنی بەرنامەیەکی دیکە بکەوێ، ئەوە لێی وەرناگیرێو وە ئەو کەسە لەدوا ڕۆژدا لەزیانبارانە؟!

پێغەمبەری خواﷺ لەیەکێك لە فەرمایشتە بەرزو پیرۆزەکانیدا لەوبارەوە نوختەی خستۆتە سەر پیت و مەسەلەکەیدا وا ڕۆشن کردۆتەوە هیچ مشت ومڕێك هەڵنەگرێ، کە فەرموویەتی: (**ذاق طعم الايمانِ من رضي بالله ربا وبحمدﷺ نبياً ورسولاً**

---

١- ئایا مەلایەك دووعا بکات رووسە کافرە زۆردارەکان بەسەر موسوڵمانە ستەم دیدە چیچانیەکان دا زاڵ بن، ئەگەر یەکجار نەزان و گێل و بێهەواڵ نەبێ دەگونجێ بەموسڵمان دابنرێ؟! یان مەلایەك بڵێ کوڕینە زۆر وریابن ئەم رەمەزانە ئەگەر وەك پار ڕێگا بە ئیسلامیەکان بدرێ ئەهلی مزگەوتمان بەدەستەوە ناهێڵن؟! یان مەلایەك و شێخێك هەرچی ئیسلامیە بیانبوغزێنێو شکست و نابوودییان بەخۆزگە بخوازێ! بە موسوڵمان و دیندار دادەنرێن؟!! کە ئەم جۆرانە هەموویان هەن و ئەو هەڵوێست و رەفتارانەش کە ئاماژەم پێیان کرد لەو جۆرە کەسانە بینراون و بیستراون! بەڵام بەپێویستی نازانم ناوی کەس بێنم.

٢- آل عمران: ٨٥

**وبالاسـلام دينـاً)**[١] ، واتـه: هەركەسـێك بـه پـەروەردگارێتی خـواو پێغەمبەرایـەتیو رەوانـەکراوێتی موحەممـەدﷺ و بەرنامـەییێتی ئیسـلام رازی بـووبێ، ئـەوە تـام و چـێژی ئیمانی کردوه، کەوابێ: هەرکەسێك یەکێك لەم سێیانەی نەبێ، ئەوە مانای وایە مسوڵمان و دیندار نیە، چونکە تامی ئیمانی نەکردوەو نازانێ چیەو چۆنە !

جا خوا بەلوتفی خۆی هەموو لایـەکمان بکاتـە مسـوڵمانی راسـت و تـەواوو لەخڵتـەو ژەنگـی نـەفامێتی (جاهلیـة)و شـیرك و بیدعـەت پاکمـان بکاتـەوەو، بمانکاتـە کۆمـەڵگاو میللەتێکی تۆکمەو پێکەوە جۆشدراوو پتەوو دامەزراو، خوایـە ریزەکانمـان مەحکـەم تـرو برایەتیمان پتەوترو نێوانمان خۆشتر بکـەو، هەرچـی بـوغزو کینـەو حەسـەدو خەسـڵەتی پیس و بەد هەیـە، دڵ و دەروونمـانی لێپـاك بکـەوەو بـەئاوی ئیمـان و رەحمـەتی خـۆت بیشۆ !

خوایە شیفای نەخۆشەکانمان بدەو، گرفتـی خـاوەن گرفتـەکانمان چارەسـەر بکـەو کاری خێرو چاکە بۆ موسوڵمانان ئاسان بکە.

خوایە زاناو پێشەوایەکانمان وا لێبکـه کـه شایسـتەیی ئـەوەیان هـەبێ ناوونیشـانی میراتگرێتیو جێگرایەتی پێغەمبەری تۆیان لەسەر بێ.

خوایە هیدایەتمان بدە کە بەمسوڵمانەتی بژین و بەئیمانەوە بمرین و لـەژێر عەلـەم و بەیداغی پێغەمبەرەکەتدا حەشر بکرێین و، لەحـەوزی کـەوثـەر تێـراوبین و بەدیـداری تـۆ شادبین، آمین.



---

١- رواه مسلم

# بەشی دووەم

## چەند ئامۆژگاریەك
## بۆ گەنج و قوتابیەکانمان
## لە بواری
## زانستە شەرعیەکان و
## هەڵسوکەوت لەگەڵ زانا و
## پێشەوایانی ئیسلامدا



## خوێنەری بەڕێز و خۆشەویست!

خوا پشتیوان بێ لەم بەشی دووەمەدا هەوڵ دەدەین لە (١٢)خاڵان دا چەند ئامۆژگاری‌یەکی گرنگ ئاراستەی ئەو گەنج و لاوە خوێندەوارە دڵگەرمانەمان بکەین کە دەیانەوێ لەبواری وەدەست هێنانی زانستە شەرعییەکان و شارەزایی لە ئایینی خواداو، رەفتارو هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ زاناو پێشەوایەکانی ئیسلامدا، دووچاری هەڵەو پەڵەو نەپچڕاندنی شیرازەی ئەدەب نەبن و، قسەو هەڵوێستێکیان لێ نەپشکوێتەوە کە مایەی عەیبداریی‌و گوناهباریی‌یان بێ.

شایانی باسیشە کە لەوبارەوە قسەو باس و ئامۆژگاری پێویست یەکجار زۆر هەن، بەڵام وەك گوتراوە: (ما لایُدرك كُلُّه لایُتْرك جُلُّهُ)، هەولێشم داوە لەو (١٢) خاڵەدا ئەوەی لەم قۆناغەدا زیاتر پێویستە رەچاو بکرێ، بەگوشراوی بیخەمەڕوو، بەشکم لەداهاتووشدا چ لەنووسراوێکی سەربەخۆو چ لەچاپەکانی دیکەی ئەم کتێبەدا دەرفەتی فراوان کردنی ئەم ئامۆژگارییانەمان بۆ بڕەخسێ‌و بتوانین زیاترو چاکتر تیشکیان بخەینە سەر.

ئینجا هەرچەندە ئامۆژگاری‌یەکان راستەوخۆ ئاڕاستەی براو خوشکە گەنج و لاوەکانمان کراون، بەڵام بێگومان بەهرە لێوەرگرتنیان تایبەت نیە بەوانەوەو بۆ توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگاش –إن شاء الله– هەر جێگای کەڵك و سوودن.

**جێی خۆشیەتی کە لێرەدا ئەم دوو راستی‌یەش بڵێم:**

١– ئەوەی کە لەم چەند لاپەڕەیەداو لەدوو توێی ئەم (١٢) خاڵەدا دەینووسم پوختەی بیروڕاو بۆچوونی بەندەو هەڵوێستیەتی لەوبارەوە، بۆیە داوایەکی دڵسۆزانە لەهەموو ئەو براو خوشکە دڵسۆزو پەرۆشانە دەکەم، کە خۆیان لەبەندە بەنیزیك دەزانن و کەم و زۆر قسەو رەفتارو هەڵوێستەکانیان لەسەر وی حیساب دەکرێن، بەر لەهەموو

کەس بەو ئامۆژگاریيانەوە پابەند بن و، با بە ناهەق و بەهۆی قسەو رەفتاری هەڵەو کرچ و کاڵی ئەوانەوە، رەخنەو گلەیی‌و گازندەی ئاڕاستە نەکری‌و خەڵکێکی دڵ نەخۆش و ناحەزیش بیانوو بانگەشەی خراپی دەستگیر نەبێ.

٢- هەرچەندە لێرەدا بەگشتی رووی دوواندنم لە گەنج و خوێندەوارەکانمانەو رەنگە هەندێك وشەو تەعبیری مەیلەو زبریشم بەکارهێنابن، بەهاندەری دڵسۆزیی‌و پەرۆش و بە تەنگەوەبوونم بۆیان، بەڵام بێگومان گەنج و لاوو خوێندەوارو رۆشنبیرەکانمان هەموویان وەك یەك و لەیەك ئاستدا نین و، پێم وایە ژمارەیەکی زۆریان ئەو شتانەی کەمن لێرەدا وەك ئامۆژگاری ئاڕاستەیان دەکەم، (الحمد لله) جێبەجێیان کردوون و هێناویاننەدی‌و پێشینانیش گوتوویانە: (کاریلە هەر لەبن سەبەتەدا نابێ)، کەواتە: ئەم ئامۆژگارییانە زیاتر ئەوانی دیکەیان تێدا رەچاوکراون و، بۆ ئەوانەی کە تارادەیەك قۆناغیان بڕیون و هەڵبواردوون زیاتر بیرخەرەوە (تَذکِرَة)ن.

## ١- هەرچەندە حەماسەت و دلگەرمی گرنگە، بەڵام بەبێ شارەزایی‌و بەرچاو ڕوونیی، نەك هەر کارو چالاکی ئیسلامیی بگرە دینداریی‌یەکی شەخسی تێرو تەواویش ناکرێ:

بەڵێ ئەی گەنج و لاوەکانی ئیسلام و رۆڵە فیداکارو خوێن گەرمەکانی میللەتی مسوڵمانی کوردستان! وەك چۆن ئینسان بەبێ شارەزایی ناتوانێ بەهیچ رێیەك دا بڕوات و بگرە ئەگەر بە ناشارەزایی ملی رێ بگرێ، مەگەر چۆن دەنا زۆر نیزیکە کە لەجیاتی گەیشتنە مەنزڵ دووچاری سەرگەردانی‌و تەنانەت سەر بەفەتارەت چوونیش ببێ! مسوڵمانەتی‌و دینداریيش بەبێ زانیاری‌و بەرچاوروونیی ناکرێ‌و ناگونجێ، بەتایبەت بۆ کەسێکیش کە بیەوێ کارێك بۆ ئیسلام و مسوڵمانان ئەنجام بدات.

خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾[١].

---

١- یوسف: ١٠٨

واتە: -ئەی موحەممەدﷺ بڵێ: ئەمەیە ڕێبازی من لەبەر ڕۆشنایی‌دا بانگەواز بۆلای خوا دەکەم خۆم و ئەوانەش کە شوێنم کەوتوون، وە پاکیی بۆ خوا، وە من لەهاوبەش - بۆخوا- دانەران نیم.

ئەگەر بەوردیی سەرنجی ئەم ئایەتە بەهێزو پێزە بدەین، بەلای کەمەوە ئەم شەش ڕاستی‌یە مەزنەی لەمەڕ ئەو مەسەلەیە تێدان کە ئێمە خەریکی توێژینەوەینی:

١- بێگومان لەم ئایەتەدا ڕووی دوواندن (خِطابْ) لەگەڵ پێغەمبەرەﷺو بەصیغەی فرمان (أمرْ)یش پێی گوتراوە کە (بڵێت): (قُلْ)، ئەم جۆرە تەعبیرەش وەك زانایانی (أصول الفِقْه) گوتوویانە، مەگەر بەڵگەیەکی لادەر (قرينةُ صارِفةٌ) هەبێ ئەگەرنا فەڕزبوون (وجوب) دەگەیەنێو لێرەشدا هیچ (قرينة)یەك نیە، کەواتە: گوتنی ئەو ڕاستی‌یانەی کە ئەم ئایەتە گرتوونیە خۆیو پێوە پابەند بوونیشیان فەڕزو پێویستە.

٢- ئا ئەمەیە ڕێبازی من ﴿..هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ..﴾[1]، کە دواتر بەڕستەی: ﴿..أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ..﴾[2]، تەفسیر کراوەو ڕوون کراوەتەوە، دەق (نَصّ)ە لەسەر ئەوە کە تەنیا ئەوەی خراوەتەڕوو بەرنامەو ڕێبازی ڕاستەقینەی پێغەمبەرەﷺ، کەواتە هەر شتێك کە پێچەوانەی ئەوە بێت کە گوتراوە، ئەوە ڕێبازو بەرنامەی ئەو نیەو شتێکی دیکەیەو لێی جیایە.

٣- خەڵکی بۆلای خوا بانگ دەکەم لەبەر ڕۆشنایی‌دا ﴿أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ﴾[3]، کە ڕوون کەرەوەی ڕستەی پێشوویە: ﴿هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ﴾[4]، ئەوە دەگەیەنێ کە بەبێ بەرچاو ڕوونی‌یو شارەزایی خەڵك بانگ کردن بۆ لای خواو ئایینەکەی، هیچ پەیوەندی بەڕێبازی پێغەمبەرەوە ﷺنیەو پێی بێگانەو نائاشنایە!



١- یوسف: ١٠٨
٢- یوسف: ١٠٨
٣- یوسف: ١٠٨
٤- یوسف: ١٠٨

٤- خۆم و ئەوانەی شوێنم کەوتوون ﴿أَنَاْ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي﴾[١]، ئەمیش ئەوە دەگەیەنێ کە هەرکەسێکیش خۆی بەشوێن کەتووی ئەو پێغەمبەرە بزانێ، هەر ئەوەیە بەرنامەو ڕێبازی- کە بەزانیاریو شارەزاییەوە دینداریی خۆی بکات و خەڵکیشی بۆلا بانگ بکات-، وە غەیری ئەوە هیچەو پووچە.

٥- وە پاکییو بێهەڵەو پەڵەیی بۆ خوایە ﴿وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ﴾[٢]، واتە پاکییو بێخەوشی بۆ خوای بێوێنەو تاك، کە بەبێ زانیاریو بەنەشارەزایی خەڵکی بۆ لای بانگ بکرێو، لەسەر بناغەی نەزانییو بێئاگایی بەندایەتی بۆ بکرێو بپەرسترێ!

٦- وەمن لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم ﴿وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾[٣]، چونکە تایبەتمەندیترین خەسڵەتی کافرو هاوبەش پەرستەکان، بەهەموو جۆرو شێوەکانیانەوە ئەوەیە کە نەزان و بێئاگاو سەرکێڵن و، هەر ئەو نەشارەزاییو بێئاگاییەشە کە گیرۆدەی گەورەترین گوناح و نزمترین سیفەتی کردوون، کە بریتیە لەهاوبەش بۆ خوا پەیداکردن.

**جا ئەی گەنج و خوێندەوارە خۆشەویستەکان!** وریاو بێدارو هۆشیار بن و بۆ ئەوەی بتوانن هەم مسوڵمانەتییەکی پوخت و چاك ئەنجام بدەن و هەم خزمەتێکی ڕێك وپێك بەئیسلام و مسوڵمانان بکەن، چ لەبواری بانگەوازو پەروەردەو چ لەبواری فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپەو چ لەبواری جەنگ و جیهادو چ لەبواری کارو چالاکی دیبلۆماسیو سیاسیدا، بەبێ پسانەوە سەرگەرمی وەدەست هێنانی زانیاریو شارەزایی بن، ئەگەرنا بەمەرەدی ئەو کابرایە دەچن کە دەگێڕنەوە جارێکیان لەسەر ڕێی جوولەیەکی کاروانچیو بازرگان خۆی لەبۆسە دەنێو، کە دەگاتە لای تێی دەخورێ: مسوڵمان بە دەنا دەتکوژم! ئەویش زۆر لێی دەپاڕێتەوە کە نەیکوژێ، بەڵام فایدێی

---

١- یوسف: ١٠٨

٢- یوسف: ١٠٨

٣- یوسف: ١٠٨

نابێو هەر سوور دەبێ لەسەر کوشتنی ئەگەر مسوڵمان نەبێ،[1] پاشان بابای جوو کە بێ هیوا دەبێ وازی لێناهێنێ، دەڵێ باشە کاکە مسوڵمان دەبم، بەڵام چی بڵێم تاکو مسوڵمان بم؟! ئەویش دەڵێ وەڵڵا نازانم، بەڵام هەردەبێ مسوڵمان ببی!!

## ٢- بەبێ ڕەچاوکردنی ڕیز (ترتیب)ی لەگرنگترەوە بۆ گرنگ چوون، ناگونجێ بەشێوەیەکی ڕاست و دروست لەئیسلام شارەزابین:

**بۆ وێنە:**

أ- شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە قورئان دەق ومەتنی ئیسلامەو سوننەتیش شەرح و تەفسیرو لێکدانەوەیەتیو، هیچ کاتێکیش بەبێ تێگەیشتن و سەردەرکردنێکی سەرەتایی لە مەتن، ئینسان ناتوانێ لە شەرح و تەفسیرەکەی حاڵی بێ، خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: ﴿ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾[2] ، واتە: وە- قورئانی- بیر خەرەوەمان بۆ تۆ ناردۆتە خوارێ، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوارێ بۆیان ڕوون بکەیەوەو بەڵکو بیربکەنەوە.

ئینجا بێگومان کتێبی خوا (كِتابُ الله)ش هەمووی هەر پێویستی بەشەرح و تەفسیر نیەو بەشێکی بەلای کەمەوە مانای گشتیەکەی ڕوون و ئاشکرایە، وەك خوای مەزن فەموویەتی: ﴿ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴾[3] ، واتە: وە بێگومان قورئانمان بۆ لێتێگەیشتن ئاسان کردوە، ئایا کەس نیە بێ لێی حاڵی بێ!!

**کەواتە: ئەی خوشك و برا ئیسلامیەکان!** بەر لەهەر شتێك خەریکی قورئان بن، بیخوێننەوە، لەبەری بکەن، تێی بگەن، تێیەوە ڕابمێنن و بیری لێبکەنەوەو تێیدا قووڵ

---

١- دیارە (أهل الكتاب) مادام سەرانە (جزية) بدەن بەدەوڵەتی ئیسلامیی، پێویستە سەرو ماڵ و ناموس و...هتد یان پارێزراوبێو ڕەفتاری ئەو کابرایە هەر لەبناغەوە هەڵەو ناشەرعیی بووە.

٢- النحل: ٤٤

٣- القمر: ١٧

ببنـــەوە: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾[1] ، واتـــە: ئـــەم وڕئانە كتێبێكی بەپیت و پێزە بۆیە بۆلای تۆمان ناردۆتە خواریٚ كە لە ئایەتەكانیـیـەوە رامێنن، وە بۆ ئەوەی خاوەن عەقڵان پەند وەربگرن.

پاشان دوای شارەزایی لەقورئان بۆ زیاترو چاكترو قـووڵتر تێگەیشتنی سـەرگەرمی سوننەتی پێغەمبەری خواﷺ بن، چونكە بەتەئكید هەندێك شتی قورئـان بـەبیٚ سـوننەت وەك پێویسـت لێیـان تیٚناگـەین و وەك چۆن سـوننەت بـەدیلی قورئـان نیـە، قورئـانیش بەدیلی سوننەت نیەو هەردووكیان پێویستیان بەیەكتر هەیـە، بـۆ نموونـە: قورئـان باسـی نوێژو رۆژوو و زەكات و...هتد دەكات، بـەڵام بێگومـان بـەبیٚ سـوننەت هـیچ كـام لەمانـە بەوجۆرەی كە ئیسلام دیاری كردوە، نازانرێن و ئەنجامیش نادرێن.

كەواتە: ئەو گەنج و خوێندەوارانـەی كـە بەرلـەوەی شـتێك لـەقورئان بـزانن، دەچـن سـەرگەرمی سـوننەت دەبـن، وەك لەبـەركردنی دەقـەكانی سـوننەت و زانینـی نـاوی راویـیـەكان و..هتـد ئـەوە بـا دڵنیـا بـن كـە بەرنامـە (منهج)ی لەئیسـلام شـارەزابوونیان هەڵەیـەو پێچـەوانەی رێبـازی قورئـان و سوننەتیشـە، چـونكە نـەخوای كاربـەجیٚ وای فـەرمووە و نـە پێغەمبـەری خـواشﷺ لەگـەڵ هـاوەڵانی بـەرێزو دڵسـۆزدا ئـاوا رەفتـاری كـردوە! ئـەوەتا لەچـوار شـوێنی قورئانـیٚ دا كـە چـوار ئـەرك (وظیفـة)و كـارە گـەورەو گرنگـەكانی پێغەمبـەرﷺ خراونەتـەڕوو، كـە (تـلاوة الآیـات)و (تزكیـة)و (تعلـیم الكتـاب والحكمة)ن هەمیشە هەر (تلاوة الایات) پێش خراوە، هەرچەندە سیٚیەكەی دیكـە پـاش و پێشیان پیٚكراوە!

**ئەو چوار شوێنەش ئەمانەن:**

١و٢- (البقرة) ئایەتەكانی ژمارە (١٢٩)و (١٥١).

٣- (آل عمران) ئایەتی ژمارە (١٦٤).

٤- (الجمعة) ئایەتی ژمارە (٢).

ئینجـا بەرهـەم و كەلـەپووری زانـاو پێشەوایانیشـمان لەپلـەی سـێیەم دا نـۆرەی دەگاتیٚو نابیٚ بەهیچ جۆرێك پێش قورئـان و سـوننەت بخرێن، چـونكە خـوای كاربـەجیٚ

---

[1] - ص: ٢٩

فەرموویـــــــــەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[1]، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێنـاوە- هـیچ قسـەو بڕیـارو هەڵوێسـتێك- پـێش دەستی خـواو پێغەمبەرەكـەی مەخـەن، وە پـارێز لـەخوا بكـەن بێگومـان خـوا بیسـەری زانایە.

دیارە پێویستە ئەوەش بزانرێ كە قسەو بەرهەم و ئیجتیهادی زانـاو پێشـەوایان جـا هەركەسێك بـن و لەهـەر ئاسـتێكی بـەرزدا بـن، هـەر بەتێگەیشـتن و تەفسـیری ئـەوان بـۆ ئیسـلام دادەنـرێ، نـەك بـەخودی ئیسـلام و، هەمیشـەش شـیمانە (إحتمـال)ی راسـتیی‌و هەڵەیی هەر هەیەو، هەق و راستیی موتڵەق تـەنیاو تـەنیا قورئـان وسـوننەتن، زانایـانیش لەوبارەوە جوانیان گوتوە: (أقوال العلماء يُسْتَدلُ لهَا ولا يُسْتَدلُ بِها).

ب- بوارێكی دیكـەی رەچاوكردنی ریـز (ترتیـب) ئەوەیـە كـە لـەخودی ئیسـلام داو لەبەش و پێكهێنەرەكانیدا لە گرنگترەوە بۆ گرنگ بچین، بۆ نموونە: ماقووڵ نیە كەسێك لەئیمان و عەقیدە- كە بناغـەی مسـوڵمانەتیيە- حـاڵی نـەبووبێ‌و بچـێ خـەریكی وردە بابەتـە خیلافیيـەكان بێـت! یـان جـارێ عیبادەتـە گـەورەو سـەرەكیيەكان و فـەڕزە گرنگەكانی ئەنجام نەدابێ‌و، بچێ سەرگەرمی سوننەتان بێ! یان جارێ گوناحە زلـەكانی هەر تێدا بن و بچێ هەراو مشت ومڕ لەسـەر شـتی ناپەسـەند (مَكْرُوه)و (خِلافُ الأولْـى) بكات!!

دیارە هەر كەسانێكی ئاواش بوون لەخەڵكی كووفەو پرسیاری حوكمی خـوێنی كـێچ لە (ابن عباس) دەكەن و ئەویش دوای ئەوەی كە دەزانێ خەڵكی كوێن و چ كەسن!

پێیان دەڵێ: خـوێنی حوسـەین دەڕێـژن و لـەخوێنی كێچ دەپرسـن! (تَسْفِكون دَمَ الحُسَينِ وتسألون عن دَمِ البراغيث!!).

منیش برا ئیسلامیی وا دەناسم كە بەهەفتەو مانگ نەك دڵی برادەرو خـزم و دۆسـت بەناهەق دێشـێنێ‌و دەیـان رەنجێنـێ، بـەڵكو دڵـی بـاب و دایكیشـی نارەحـەت دەكـات و قسەیان لەگەڵ ناكـات، كەچـی خۆیشـی بەنوێكـەرەوە (مجدِّد)ی ئـایین دەزانێ‌و لەسـەر

---

١- الحجرات: ١

شتێکی گچکەی وەك ریش کورت کردنەوەو[1] تەرتیب کردنی، هەراو مشت ومڕی وادەکات، کەچکی قوڵەی تیٚ بڕنەکات!!

## ٣- هەرچەندە ئیسلام بەس لەدوو توێی قورئان و سوننەت دایە، بەڵام بەبێ شارەزایی لەزمانی عەرەبیدا لێتێگەیشتنیان مەیسەر نابێ:

وەك پێشتریش- لەبەشی یەکەم دا- خستمانەڕوو ئاینی خوا تەنیا دوو سەرچاوەی روون و بێچەندو چوونی هەن کە قورئان و سوننەتن، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە قورئان و سوننەت بەزمانی عەرەبی هاتوون، ئاشکرایە کە هەرکەسێك بەزمانی عەرەبی ئاشنا نەبێ، ناتوانێ راستەوخۆو وەك پێویست لە ئیسلام شارەزابێو لە قورئان و سوننەت تێبگات.

کەواتە: ئامۆژگاری دڵسۆزانەم بۆ گەنج و لاوەکانمان ئەوەیە سەفسەطەی لەو جۆرە نەکەن کە لەهەندێك کەسم بیستوە: ((مادام ئیسلام لەقورئان و سوننەت دایە، کەواتە بەخوێندن و لەبەرکردنی قورئان و سوننەت مەدار ساز دەبێو پێویست بەو هەموو زانستانە ناکات، وەك (نحو، صرف، بلاغة، علوم القرآن، علوم الحديث، أصول الفقه...!!))، چونکە بەڵێ ئیسلام هەر قورئان و سوننەتە، بەڵام قورئان و سوننەتیش بەزمانی عەرەبی هاتوون و بەبێ زمانزانین، هەروەها ئاشنایی بەو زانستانەی کە لەخزمەت قورئان و سوننەت دان، ناتوانین لێیان تێبگەین، ئایا دەریاکان گەوهەرو مرواریی زۆریان تێدا نین؟! بەڵام بێجگە لەمەلەوان و دەریاوان و(غواص)ەکان هیچ کەسیدی بۆی دەردەهێنرێن؟!

بەکورتی: هیچ ئامانج (هدف)ێك بەبێ وەسیلەو ئامراز (آلة) نایەتەدیو ئامرازی تێگەیشتن لەقورئان و سوننەتیش شارەزایی هەبوونە بەو زانستانەی کە بە (العلوم الآلية) ناسراون، کە گرنگترینیان زمانی عەرەبیە بەهەموو جۆرو بەشەکانیەوە.

---

١- بڕوانە: (خواپەرستیی ئیسلامیی) بەرگی یەکەم)، وە بڕوانە نامیلکەی: (پێشمەرگەی ئیسلام) چاپی سێیەم، بۆ مەسەلەی ریش هێشتنەوە.

با بۆ گرنگی‌و بایەخی عەرەبی زانین و پەندو عیبرەت وەرگرتنیش ئەم قۆڵە نەزیلەیەی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە:

لەسەرەتای هەشتایەکان دا لەگەڵ برایەك کە خۆی بە (مُجْتَهِدْ)ی موتڵەق دەزانی‌و قەناعەتیشی وابوو هەرکەسێك ئەوەندە زمانی عەرەبی بزانێ کە ڕۆژنامەو گۆڤاری پێبخوێنێتەوە، دەتوانێ بەتەواوی لەقورئان و سوننەت تێبگات! بوو بە وتوویژمان، من بۆ ئەوەی پێی بسەلمێنم کە (إجتهاد) کردن هێندەش ئاسان نیەو عەرەبی زانینەکەی ئەویش بایی بوون بە (مجتهد)ی ناکات، پێم گوت:

باشە جەنابت چۆن لەقورئان بۆم هەڵدەهێنجی کە حەج کردن وێڕای پیاوان لەسەر ئافرەتانیش فەرزە، خۆ خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ... ﴾[1]، ؟! ئەویش گوتی: دەزانم لەم ئایەتەدا تەنیا باسی پیاوان (رِجال) کراوە، بەلام لەئایەتی دیکەدا باسی ژنانیش کراوە، یان لەسوننەت دا باسی ئەوان کراوە! دیارە من دەمزانی کە ئەو پێی وایە وشەی (رِجالاً) لێرەدا کۆی (رَجُلْ)ە، بۆیە ئەو پرسیارەم لێکرد، پاشان بۆم ڕوون کردەوە کە نەخێر وانیەو وشەی (رِجالاً) لێرەدا کۆی پیادە (راجِلْ)یەو نێرو مێ دەگرێتەوەو بەرانبەرەکەیشی سوارەکانن، کە بە (وعلى كلَ ضامِرٍ) تەعبیر کراوە!

پاشان پێم گوت: برای خۆشەویستم پێم وایە ئێستا گەیشتوویە ئەو قەناعەتە کە بوونە (مجتهد) کارێکی هێندە ئاسان نیەو جەنابت جارێ زۆر زۆرت ماوە!

**٤- با زانایانی ئیسلام بە فریشتە نەزانین و لەکاتی دیتنی هەڵەو پەڵەیەکیان دا لەبەرچاومان نەکەون، وە با هەر شتێك کە باش تێیدا شارەزان بەخۆ بەکەم زانین (تواضع)ەوە لێیان وەربگرین:**

بێگومان زاناو پێشەوایانی ئیسلام وەك هەر ئینسانێکی دیکە ئینسانن و دەگونجێ دووچاری هەڵەی عیلمی‌و عەمەلی ببن و هەرکەسێك لێیان چاوەڕێ بکات کە هەرگیز هەڵەو ناتەواوییان تێدا نەبینێ، چاوەڕوانیەکەی خۆی هەڵەو ناتەواوە، پێغەمبەری خوا ﷺ

---

١- الحج: ٢٧

فەرموویەتی: (كل بني أدمَ خطّاءٌ وخير الخطائين التوابون)[1]، واتە: هەموو ئادەمیزادەكان هەڵەكارن و چاكترین هەڵەكارانیش تۆبەكەرانن، كەواتە: نابێ چاوەڕێی بێهەڵەو پەڵەیی لەهیچ ئینسانێك بكەین.

خوای پەروەردگاریش تبارك وتعالى لەبارەی ئوممەتی پێغەمبەرﷺ بەگشتیو زاناو پێشەوایانی بەتایبەت فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴾[2]، واتە: پاشان كتێبی خۆمانمان كردە میراتی ئەو بەندانەمان كە هەڵمان بژاردوون، جا هەیانە ستەمی لەخۆی كردوەو هەیانە میانجیەو هەشیانە لەچاكەكان دا پێش كەوتۆتەوە بەیارمەتی خوا، جا ئا ئەوەیە بەخششی گەورە.

وەك دەبینین خوای بەخشندە ئەوانەی كە دوایین كتێبی خۆی- كە قورئانە- یان پێدەدات، سەرەتا بەگشتی بەبەندە هەڵبژاردەكان ﴿ ..ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا.. ﴾[3]، ناویان دەبات، پاشان ئەو بەندە پەسەندو هەڵبژاردانە - كە بێگومان زانایان لەپێشەوەیانن- دەكاتە سێ بەشەوە:

أ- (ظالِمٌ لنفسه).

ب- (مُقتصِدٌ).

ج- (سابق بالخيرات).

ئینجا ئەگەر گریمان رستەی: ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴾[4] یش تایبەت بێ بە (سابِقٌ بالخيرات)ەوە هەرچەندە وا پێدەچێ بۆ هەرسێكیان بگەڕێتەوە، ئەوە هەرچۆنێكی بێ رستەی: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ﴾[5]، هەرسێكیان هەر دەگرێتەوە، كەواتە: ئەو كەسانەش كە دووچاری هەڵەو پەڵە دەبن -چ زانا بن چ خەڵكی دی- ئەوە لە تەرازووی خوادا مادام هەڵگرو شوێن كەوتەی كتێبی خوابن هەر بە بەندەی پەسەندو

---

١- أخرجه الترمذي وابن ماجه، بڕوانە: (كشف الخفا ومزيل الألباس...) للعجلوني/ ج٢ص١٥٨.

٢- فاطر: ٣٢

٣- فاطر: ٣٢

٤- فاطر: ٣٢

٥- فاطر: ٣٢

چاك دادەنرێن و هیچ كەس بۆی نیە لەسەر كەم وكووڕیی‌و هەڵەكانیان زەڕبیان بەسەردا بهێنێ!!

گوتراویشە: (مِنْ فضائلِ الرجال أن تُعَدَّ مَعايِبُهُمْ) واتە: لەچاكەی پیاوان ئەوەیە كە عەیب و هەڵەكانیان بژمێررێن! بەڵام ئەو كەسە داماوە، كە لەبەر عەیب زۆری پێی بگوترێ: (پووشكە لەكایە ناگیرێن).

پێشم وایە هەركەسێك بە ویژدان و واقیع بینیی‌یەوە سەرنجی بارودۆخ و هەل و مەرجی فەقێیەتی‌و دەرس خوێندنی مەلایەكانی كوردەواریی‌ ــ و غەیری كوردەوارییش ــ و شێوەی ژیان و گوزەرانیان بدات و، بزانێ چەند بە دەردەسەریی‌و كولەمەرگی‌و رووت و رەجاڵی‌و شپرزە حاڵی خوێندوویانەو بوونەتە مەلا، گەلێك جاران لەجیاتی گلەیی‌و گازندە عوزرو پاساویان بۆ دەهێنێتەوەو بەرگری‌یان لێدەكات! بەڵام وریابن لێرەدا نە مەبەستم هەموو مەلایەك و نەهەموو حاڵەتێكیشە! چونكە مەلایەك كە بەنەخشەو بەرنامەیەكی بۆ داڕێژراوەوە هەڵەو پەڵە بكات، رەفتارەكانی پاساو نادرێنەوەو حاڵەتی خیانەت و خۆفرۆشیی‌و دین فرۆشیی‌و دژایەتی كارو خەبات و رەوتی ئیسلامەتیشی، هیچ عوزرێكی بۆ ناهێنرێتەوە! سوودو كەڵك وەرگرتنیش لەزاناو پێشەوایان لەو بوارانەدا كە تێیدا پسپۆڕو شارەزان بەپێی بنچینەی: (خُذْ ما صَفا دَعْ ماكَدَرَ) پیشەی بابای عاقڵ و لێزانەو كەسێكیش هەڵەو كەم و كورتی‌یەكانی زانایەك بكاتە پەرچ و بیانووی بەهرە وەرنەگرتن لەخێرو بێرو چاكەكانی، ناحاڵی‌و لێنەزانە! ئایا هیچ باخەوانێك درەختێك لەبنەوە دەبڕێ، هەر لەبەرئەوەی چەند دانەیەك میوەی رزیوو بەكەڵك نەهاتووی پێوەیە؟!

**٥- ئیسلام زۆر فراوان و قووڵەو با خەیاڵ نەكەین كە بەماوەیەكی كەم و بەخوێندنەوەی چەند كتێب و نامیلكەیەك و بیستنی چەند وتارێك بەموراد دەگەین، وە دەبێ بزانین كە مەگەر چۆن دەنا بەبێ مامۆستای پسپۆڕ ناتوانین وەك پێویست لەقورئان و سوننەت و زانستە شەرعیی‌یەكانیان شارەزابین:**

**بەڵێ خوشك و برا بەڕێزو خۆشەویستەکانم!** هۆشیارو بێدار بن و بە لەبەرکردنی چەند سوورەتە قورئانێك و چەند دەقێکی سوننەت، لەخۆتان بایی مەبن و کورد گوتەنی: بەمستە ئاوێك مەکەونە مەلە!

وە دڵنیابن کە زاناو پێشەوایان هەروا (بەسەبرێك و دوو فووان) نەبوونەتە ئەو پێشەواو بلیمەتانەی کە ناوو شۆرەتیان دەرکردوە! بەڵکو هەرکام لەو کەڵە پیاوانە دوای ئارام گرییو پشوودرێژییو شەونخوونیو رەنج و زەحمەت و...هتدی زۆر، ئەوجار بەو پلەو پایەیە گەیشتوون، بۆیە لەوبارەوە گوتوویانە: (العلمُ لايعْطيك بَعْضَهُ حتى تعطيه كُلَّكَ) واتە: زانست هەندێکیت ناداتێ، هەتا هەموویتی نەدەیتێ!

کەواتە:

أ- بەخوێندنێکی کەم وزانینی چەند مەسەلەو بابەتێك خەیاڵ بڵاوی ئەوە مەکەن کە چوونەتە ریزی زاناو پێشەوایانی ئیسلام و وەك ئەوان لەخۆتان مەڕوانن، چونکە راست گوتراوە: (ئەوەی لە بڵیندان بڕوانێ دەنەویان دەکەوێ).

ب- وا مەزانن کە بە لەبەرکردن (حِفْظ)ی قورئان- هەمووی یان بەشێکی- و فەرموودەکانی پێغەمبەری خواﷺ یەکسەر بوونەتە شەرعزان (فقە)و هەق و شایستەیی ئەوەتان هەیە کە فەتوا دەربکەن! چونکە پێغەمبەرﷺ فەورموویەتی: (مَنْ يُرِدِ اللهُ بهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ في الدّين)[1] ، واتە: هەرکەسێك خوا بیەوێ چاکەی بداتێ لەئایین دا شارەزای دەکات، کەواتە: شارەزابوون لە ئایین دا مایەی خێرو چاکەو بەختەوەرییە نەك لەبەرکردنی دەقەکانی ئایین! هەر بۆیەش نەیفەرمووە: (مَن يُرد الله به خَيْراً يُحَفِّظْهُ نصُوصَ الدين)!!

هەڵبەتە مەبەستم ئەوە نیە دەقەکانی قورئان و سوننەت لەبەر نەکەین! کە ئەوەش خۆی لەخۆیدا کارێکی خێرو چاکە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە تەنیا بە لەبەرکردنی قورئان و سوننەت وازنەهێنین، بەڵکو هەوڵ بدەین، لەبەر تیشکی تەفسیرو شەرح و لێکدانەوەی زانایانی رەسەن و بیرکردنەوەو رامانی خۆشمان دا هەرچی زیاتر قووڵترو چاکتر تێیان بگەین.

---

١- رواه البخاري.

وە بـەپێی بۆلـوان هـەولێش بـدەن کـە هەرچـۆن بـووە لەسـەر دەسـتی زانـاو مامۆستایەکی پسپۆڕ زانستە شـەرعیی‌یەکان وەربگـرن و تـەنیا بـەموتالاّو خوێندنـەوەی کتێب واز مەهێنن، چونکە خوێندن و فێربوونی زانست لەسەر دەستی زاناو مامۆسـتایانی شارەزاو پسپۆڕ، بەرەکەت دارترو متمانە پێکراوترو ئاسانترەو، وێڕای زانست ئەدەبیشـی لەگەڵ فێردەبن و وەردەگرن.

## ٦- تـەنیا بەشـێوازی شـەرعیی‌یانەو رەوشـتی مسـوڵمانانەوە دەتـوانین وەك پێویسـت خزمـەت بکـەین و کـارو چـالاکی شـایان ئـەنجام بـدەین و زانینـی رووت هیچی لێ‌سەوز نابێ:

**بەڵێ خوشك و برا گەنج و خوێندەوارە ئیسلامیی‌یەکانم!** لە ئیسلامدا شەرعی‌و پاك و راست و ساغ بوونی ئامانج و مەبەست، چەندە گرنگ و پێویستە، هی شێوازو وەسـیـەو هۆکارەکانیش هێندە، وەك چۆن ئەو هەوارو مەنزڵـەی کـە بـۆی دەچـی پێویسـتە پـاك و چاك بێت، ئەو رێیەی کە لێشیەوە دەڕۆی، هەر دەبـێ راسـت و پـاك بێـت و (الغايـة تُبَـرِّرُ الوسِيْلَة) ئامانج هۆکـار پاسـاو دەدات، کـە یەکێکـە لـە بنچینەکانی سیاسـەتی چـەوت و میکیاڤیلیانەی سەردەم، بەهیچ رەنگێك لە ئیسلام دا جێی نابێتەوە.

ئاخر براو خوشکە بەڕێزەکانم!

ئیسلام ڕاستیی (صِدْق)یەو بەدرۆو دەلەسە خزمەت ناکرێ!

وە ئیسلام هەق (حق)ەو بەتاڵ (باطِلْ) بەڕێوە نابرێ!

وە مسـوڵمانەتی لەگـەڵ خـۆو خـواو خـەڵك دا ڕاسـت و دروسـت بوونـەو بـەنیفاق و چەواشەکاریی‌و دوو ڕوویی‌و (إِزْدواجية) ئەنجام نادرێ!

کەسـانێکیش کـە بێ‌بـاریی‌و چەواشـەکاریی‌و دوو ڕوویی‌ـو درۆو دەلەسـەو فێـڵ و فەرەج و ژێر بەژێرو قۆرت و پێچ و بێ‌بەڵێنیی‌و پەیمان شکێنیی...بەزیرەکیی‌و سیاسەت و کارامەیی‌و وریایی دادەنێن! لەجیاتی دڵ پێ‌خۆشبوون و پـێ سەرسام بوون، شایستەی دڵ پێ‌سووتان و دووعای هیدایەت و بۆکرانن!

**ئینجا لێرەدا پێویستە ئاگاداری ئەم چەند راستیی‌یە بین:**

أ- ئامانج و مەبەستی هەق و، بەبیٚ گرتنەوەی ریٚی هەق و رەچاوکردنی شیٚوازی شەرعیی‌و راست، وەدەست هیٚنرانی مەحالە، ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ...﴾[1].

کەواتە: هەرکەسیٚك ناتوانیٚ لەریٚی شەرعیی‌یەوە بەرەو ئامانج بچیٚ، وا چاکترە سەری خۆی نەئیٚشیٚنیٚ، چونکە سەرەنجام لەجیاتی پاداشت سزا وەردەگریٚ‌و رەنج بەخەسارو شەرمەزار دەبیٚ‌و دەبیٚتە ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ﴾[2].

ب- ئامانج و مەبەستی راست و شەرعیی، هەمیشە وەسیلەو شیٚوازی پاك و شەرعی دەخوازیٚ‌و پەلکیٚشی دەکات! کەواتە: وەسیلەو شیٚوازەکانی کاروبارو چالاکی‌یەکانتان بکەنە درووشم و نیشانەو تەرازووی هەڵسەنگاندنی ئامانج و مەبەستەکانتان.

ج- رەچاوکردنی ریٚگاو شیٚوازی شەرعیی‌و رەوا لەکاروباردا، پیٚویستی بە وردبینیی‌و دووربینیی‌و خۆراگریی‌و پشوو دریٚژییش هەیە، بۆیە بە ئینسانی هەڵەشەو پەڵەشەو پشوو کورت و کورت بین ناکریٚ.

ئینجا ویٚرای گرتنەبەری ریٚ‌و شیٚوازی شەرعیی‌یانەو راست، خۆرازاندنەوەش بەسیفەت و رەوشتە بەرزو پەسەندەکانیش، فاکتەریٚکی دیکەی یەکجار گەورەو گرنگە بۆ بەرەکەتداربوون و بەرهەمداربوونی زانیاری‌یەکەمان و کردو کۆشەکەمان، جیٚی سەرنجیشە کە خوای کاربەجیٚ لەنیٚو هەموو سیفەتە بەرزو بیٚویٚنەکانی پیٚغەمبەرەکەیدا ﷺ بەرەوشتی مەزن مەدح و ستایشی کردوە: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾[3]، چونکە خوای پەنهان بین دەزانیٚ کە جیاوازی نیٚوان ساغیی و ساختەیی‌و راست و درۆ، قسەو قاڵ و گاڵە گاڵ و خۆکردنە توورەکەو هەمبانەی زانست نیە، بەڵکو رەوشتی رەندو پەسەندو ئاکارو سیفەتی شیرین و سەنگینە، چونکە زۆر کەس دەتوانیٚ میٚشکی بە زانراوان (معلومات)و زاری بە وتاران (خُطَب) قەڵەباڵغ بکات، بەڵام ئیمانداری

---

١- الأعراف:٥٨.

٢- الغاشية: ٣ .

٣- القلم: ٤.

راست و دینداری ساغ نەبێ، ناتوانێ وەك خوا حەز دەكات و شەرع فەرمان دەكات، رەفتارو هەڵس وكەوت بكات!

كەواتە: هەتا دەتوانن هەوڵ بدەن كە زانراوو شارەزاییەكانی نێو مێشكتان ببنە قەناعەت و بچنە نێو دڵ و دەروونتانەوەو لە (قالْ) بۆ (حالْ) تەحویل بن و لە زانینەوە بگۆڕین بۆ توانین.

**٧- بەبێ بەكارهێنانی حیكمەت و كارامەیی، بەتایبەت لەبواری بانگەوازدا گەلێك جار لەجیاتی سوودو كەڵك گەیاندن زیان دەگەیەنین و لەسەر كارەكەمان قەرزدار دەبینەوە، بۆیە (چۆن دەڵێی؟!) چی وای كەم نیە لە (چی دەڵێی؟!):**

ئەم ئامۆژگاری حەوتەمە هەرچەندە بەڕواڵەت زۆر دەشوبهێتە ئامۆژگاری پێشوو، بەلاّم لەڕاستیدا لەیەك جیان: چونكە لەهی شەشەم دا زیاتر لایەنی زانیاریو شەرعیی بوونم مەبەست بوو، لەمەشیان دا پتر مەبەستم لایەنی عەقڵیو وەستاییە، دیارە هەر كارو چالاكییەكیش هەم زانایی پێویستەو هەم داناییو، هەم شارەزایی ئایین (فِقْه الدین)و هەم شارەزایی واقیع (فِقْه الواقع)یش!

ئاشكراشە كە شارەزایی لە ئاییندا بەرهەمی قورئان و سوننەت زانین و زانستە شەرعییەكانیانەو، ئاشنابوونی واقیعیش زادەو بەرهەمی ئەزموون و جم وجووڵ و چالاكییە.

ئینجا بەكارهێنانی حیكمەت و لێزانییو داناییو وەستاییش زۆر شت دەگرێتەوە، بۆ نموونە:

أ- نابێ قسەیەك بۆ خەڵكی بكرێو مەسەلەیەكیان لەگەڵ باس بكرێ كە لە عەقڵیانەوە ناچێو بۆیان هەزم ناكرێ، عەلی كوڕی ئەبووطالب (خوا لێی رازی بێ) لەوبارەوە گوتوویەتی: (حَدِّثُوا النّاسَ بِما يَعْرِفُونَ، ودَعُوا مايُنكِرون، أتحبُّونَ أَنْ يُكَذَّبَ اللهُ ورسولُهُ؟!)[١].

---

١- رواه البخاري معلقا. واتە: بەجۆرێك خەڵك بدوێنن كە تێیبگەن و لەوە گەڕێن كە تێیناگەن! ئایا حەز دەكەن خواو پێغەمبەرەكەی بەدرۆ دابنێن.

هەروەها (ابن مسعود)یش لەبارەوە گوتوویەتی: (ماأنتَ بِمُحدِّثٍ قَوْماً حَدْيثاً لاَتبْلُغُـه عُقولُهُمْ إلا كان لِبَعْضِهِمْ فِتْنة)[1].

ب- نابێ لەنێو خەڵکی گشتیدا وردە بابەتـە خیلافییـەکان بوروژێنـدرێن و مشـت ومڕو کێشمەکێشـمیان لەسـەر بکرێ، چـونکە گومـان و دوودڵـی، یـان بـەلای کەمـەوە سەرئێشەیەکی بێ بەرهەمیان بۆ دروست دەبێ[2].

ئینجا با بۆ پەند وەرگرتنیش ئەم بەسەرهاتە بگێڕینەوە:

دەگێڕنەوە رۆژێك هەرکام لە (حسن)و (حسـین) (خـوا لێیـان رازی بـێ) لەمزگـەوتێ کابرایەك دەبینن کە بەشێوەیەکی هەڵەو ناتەواو دەست نوێـژ دەگرێ، ئـەوانیش چـونکە لەوکاتـەدا گـەنج و مێـرد منـداڵ دەبـن، حـەز ناکـەن راسـتەوخۆ پێـی بڵـێن کـە دەسـت نوێژەکەت هەڵەیە، نەبادا قسەکەیانیان لێ وەرنەگرێ! بۆیـە ئـەم حیکمەتـە بـەکاردێنن و دەڵێن: ئێمە مشت و مڕمانە کە ئایا دەستنوێژی کامەمان وەك هی پێغەمبـەری خوایـەﷺ جا بێزەحمەت تۆ وەرە ببە بەدادوەر (حَكَمْ)مان داخۆ دەست نوێـژی کامـەمان وەك هـی پێغەمبەر دەچێ؟! سەرەتا حەسەن دەستنوێژێکی پوخت دەگرێ وەك هـی بـاپیریﷺ، پاشانیش حوسەین بەهەمان شێوە! ئیدی کابرا کە ئەوە دەبینێ هەست دەکات ئـەو دوو کوڕە زۆر شارەزاو نەجیبن و لەفیتی خۆی دەگات و دەڵێ: کاکـە گیـان دەسـتنوێژەکانی ئێوە هەردووکیان وەك هی پێغەمبەری خوان، بەڵام تـا ئێسـتا مـن نـەمزانیوە دەسـتنوێژ بگرم!

جـا بـەهیوای ئـەوەی کـە گـەنج و خوێنـدەوارەکانی ئێمـەش، دوو ریحانەکـەی پێغەمبەری خواو سەروەری گەنجەکانی بەهەشت (ريحانتي الرسـول وسـيدي شـباب أهـل الجنة) بکەنە سەروەری خۆیـان و هـەم حیکمـەتی بانگـەوازو فێرکـردن و هـەم ڕەوشـت و ئەدەب و حورمەت و رێزگرتنیشیان لێـوە فێـربن و، نـە بـەبیانووی فێرکـردن و بانگـەوازو هەقبێژییـەوە ئـەدەب و رێـز فـەرامۆش بکـەن و، نـە بـەبیانووی رێـزو ئـەدەب و

---

1- رواه مسلم.

2- لەهـەرکام لەکتێبـەکانی (چـەند رێڕوونیـەك بـۆ ئیسـلامیەکانی کوردسـتان) و کتێبـی (خواپەرسـتیی ئیسـلامیی) بـەرگی یەکـەم: (بنچـینە گرنگـەکانی هـەڵس وکـەوتی شـەرعیانەو ژیرانـە لەگـەڵ وردە بابەتـە خیلافییەکاندا)، ئەم مەسەلەیە توێژراوەتەوە.

حورمەتگرتنی خەڵکیشەوە، بانگەوازکردن و شەرع خستنەڕوو و هەڤگوتن پشت گوێ بخەن و پەکی بخەن.

**٨- با لەکاتی فێرکردن و بانگەوازدا زیاتر ئەو بابەت و مەسەلانە باس بکەین و جەختیان لەسەر بکەین کە خەڵك پێویستی پێیانە، نەك خۆمان کەیفمان لێیانە:**

ئەمیش یەکێکە لەو تێبینیيانەی کە رەچاوکردنیان زۆر گرنگ و پێویستەو گەلێك کەس بێ ئەوەی بارودۆخ و پێداویستی خەڵکی لەبەرچاو بگرێ، خۆی چ مەسەلەیەکی بەلاوە گرنگ و بایەخ داربوو، دەیکاتە بنێشتە شینکەی سەرزاری هەرچەندە لەڕاستیدا شتێکی گچکەو لاوەکیيەو کەم بایەخیش بێت! جا جاری وا هەیە باس کردنی ئەو مەسەلەیە نەك هەر قازانج و خێری نیە، بگرە زیان و زەرەرێکی گەورەشی لێدەکەوێتەوە، یان بەهۆیەوە قازانج و بەرژەوەندی (مصلحة)یەکی گەورە تێدەچێ!

هەڵبەتە چاکترین دەستەبەرکەر (ضامِنْ)ی ئەو حیکمەت و بەرژەوەندیيەش ئەوەیە کە شەرعی خوا (شرع الله) بکەینە تەرازوو و پێوەر نەك طەبعی خۆمان و، ئەگەر شەرعیش تەرازوو بێت، لەجیاتی رەچاوکردنی کەیف و ئارەزووی خۆمان، سەرنجی رەزامەندیی خواو بەرژەوەندیيەو پێداویستی مسوڵمانان دەدەین.

بەڵێ لەکاتێك دا خەڵکی گەڕەك و دێیەك جارێ هیچ لەعەقیدەو ئیمان نازانن هیچ ماقووڵ نیە باس و خواسی سوننەت و بیدعەتیان بۆ گەرم بکرێ، یان لەسەر گەیشتن و نەگەیشتنی خێری قورئان خوێندن بەمردوو، هەراو کێشەیەك بەرپابکرێ ئەوسەری دیار نەبێ!

یان کۆمەڵ و کۆڕێك کەجارێ هیچ لەدۆستایەتی گرتن لەپێناوی خواداو دوژمنایەتی کردن لەبەر خوا (الموالاة في الله والمعاداة فی الله) نازانن و بەرچاویان روون نیە کە کێ دۆستیانەو کێ دوژمنیانە، یەکێك بێ زۆر بەحەماسەتەوە حیکایەتی خاوەن بیدعەتەکان (أهلُ البِدع)ی وەك (خوارج ومُرْجِئة ومُعتَزلة)یان بۆ بگێڕێتەوەو هەرچی بیڵێ نەیلێتەوە!

یان لـه حاڵێك دا كـه دانیشـتووانی شـوێنێك گـیرۆدەی چـەندان گونـاهی رواڵـەت و پەنهانی زل زلی وەك: شیرك و كوفرو نیفاق و حەسەدو بوغزو كینەو قەتڵ و زیناو دزیی‌و رێگریـی و مـەیخۆریی بـوون، یـەكێك بـێ مەسـەلەی دەرلینـگ هەڵپێچـان و لەبـەر یـەكتر هەڵنەستان و پەنجە جووڵاندنی كـاتی تـەحییات و بـەرسمێڵ كـردن و دەسـتكاریی ریش نەكردن و....هتد یان لێبكاتە پایەكانی ئیمان و ئیسلام!!

## ٩- دەمـارگیریی (التعَصُّب)و لاسـاكردنەوەی كوێرانـەی (التقلیدُ الأعْمـی)[١] لەهەر كەسێكەوە بێ‌و بۆ هەركەسێك بێ هەر هەڵەیە:

وەك پێشتر گوتمان هەق و راستی موتڵەق و تەنیاو تەنیا لە قورئـان و سـوننەتدایە، چونكە لەزانیاری بێ سنووری خـوای پـەروەردگارەوە هـاتوون، كەواتـە: دەمـارگیریی بـۆ بیروڕاو بۆچوونی زاناو پێشەوایان و خۆ تەسلیم كردنـی موتڵـەقیان هەڵەیـەو پەشـێمانیی بەدواوەیە، هەڵبەتـە ئەمـەش لەگـەڵ رێـزو ئـەدەب نوانـدن بەرانبـەر بـەزاناو پێشـەوایانی ئیسلامدا، دژو پێچـەوانە نیـە، چـونكە بـەبێ هەڵـەو پەڵـەو (مَعْصـوم) نـەزانینی زانایـان، شـتێكی هـەق و رەوایـەو سـەرجەم زانـاو پێشـەوایانمان لەسـەری پێكهـاتوون و مالیـك گوتەنی[٢]: (كلُّ يُؤْخَذُ مِنْ قوله ويردُّ عليه إلاّ صاحِبَ هذا القَبْرِ) كـە مەبەسـتی پێغەمبـەری خوا ﷺ بووەو لەكاتی گوتنی ئەم قسەیەدا ئاماژەی بۆ گۆڕی موبارەكی كردوە.

جـا لێـرەدا جـێی سەرسـوڕمان ئەوەیـە كـە زۆر لـە خوشـك و بـرا گـەنج و خوێندەوارەكان، گلەیی‌و گازندەیان لەخەڵكی عەوام و زۆر لە مەلاو شێخەكانیش ئەوەیە كـە ئـەهلی لێكۆڵینـەوە (تحقیـق)نین و ئـەهلی تەقلیـدن و، هـەروا بێئاگایانـە شـوێن مەزەبەكان و زاناو پێشەوایانمان دەكەون!

كەچی خۆشیان هەمان شت دووپات دەكەنەوە، بەڵام بە تۆختر! دەزانی بۆ؟!

---

١- پێویسـتە بگـوترێ كـە شـوێن كـەوتنی بابـای عـەوام بـۆ زانـاو پێشـەوایان و فـەتوا لێوەرگرتنیـان بەلاساكردنەوەی كوێرانە- كـە ئێمـە زەمـی دەكـەین- دانـانرێ، چونكە ئـەو كەسـە لـەڕووی بـاوەڕو متمانـەو بەرچاوڕوونی‌یەوە ئەوكارە دەكات، هەرچەندە بەپێی تواناش هەوڵـدان بۆ شـارەزایی زیـاترو هەڵسـەنگاندنی رایەكان پێویستە.

٢- بڕوانە: (كشف الخفا ومزيل الألباس عما أشتهر من الاحاديث على ألسنة الناس) للعجلوني، ج٢ ص١٥٥،١٧٦.

چـونکە زۆر لــەو گەنجــە دڵسـۆزانە لــە کاردانـــەوە (رَدُّ فِعْــل)ی دەمــارگیرییو لاساکردنەوەی خەڵکی بۆ مەزەبـە فیقهی‌یـەکان، دێـنن دەکەونـە شـوێن بـیروڕاو کتێـب و نامیلکەی– زۆرجـار فۆتۆکـۆپی کـراو– ی هەنـدێك لـە نووسـەرە هاوچـەرخەکان (الکُتّـابُ المعاصِرون)و بێئەوەی لەڕاستییو سـەلمێنراویی قسـەو بیروڕایەکانیشـیان بکۆڵنـەوەو، بگرە خـاوەنی ئـەو قسـەو بـیروڕاو تۆمارکراوانـەش بناسـن، زۆر بەئیشـکییو سـەختییو کەللەڕەقی ئەو قسەو بۆچوونە ئیجتیهادی‌یانەی وەك دەق (نَصّ)ی شـەرعیی وەردەگـرن و ددانیــان لەســەر رۆدەگـرن! بێئاگـا لــەوەی کـە دەمـارگیرییو لاسـاکردنەوە لەهــەر کەسێکەوە بێ، با گەنج و خوێندەوارو رۆشنبیریش بێ هەر خراپەو، بە موتڵەقیی تەسلیم بـوونی قسـەو بـیروڕای هــەر کەسـێکیش، زانـاو پێشـەوای پێشـین بـێ یـان نووسـەرو لێکۆڵەرەوەی هاوچەرخ، هەر ناشەرعییو هەڵەیە، هەڵبەتە دەمارگیرییو تەقلیدی گەنج و خوێندەوارەکان بەدوو پلەش خراپترە لەهی خەڵکەکەی دی:

**یەکەم**: خەڵکەکـە تەقلیـدی زانـاو پێشـەوایانی موجتەهیـدو ناسـراوو بـاوەڕپێکراو دەکەن، بەڵام ئەوان هی چەند نووسەرو دانەرێك کـە بـەزۆری وانـین، یـان بـەلای کەمـەوە ناسراوو متمانە پێکراو نین.

**دووەم**: ئەوان خۆیان بەخوێندەوارو رۆشنبیرو شارەزا دەزانـن و، خەڵکەکـە خۆیـان بەنەزان و سادە! هەرچەندە بەداخەوە زۆر لـەو گەنجـە دڵسـۆزانەش هـەر نـەزانن، بـەلام نەك نەزانینێکی سادە (جهلٌ بسیط)، بەڵکو نەزانینی ئاوێتە (جَهْلٌ مُرکَّبٌ) واتـە: نـازانن و ناشزانن کە نازانن!!

کەواتە: با وریابین و دڵنیابین کە دەمارگیرییو لاساکردنەوە[1] لەهەر کەسێکەوە بـێ، و بۆ هەرکەسێك بێ هەریەك حوکمی هەیە هیچ کەس مافی ڤیتۆی نەدراوەتێ.

---

١- دیارە مەبەستم ئەوە نیە کە بڵێم (تقلید)کردنی بۆ پێشـەوایان لـە هەلومـەرجی خۆی‌داو بۆ ئـەهلی خـۆی شتێکی نارەوایە، چونکە زانایان یەکدەنگن- جگە لەچەند کەسێکیان کە (اجماع)یان پێ هەڵداوەشێتەوە- کـە تەقلید دروستە، بەلام نەك بەموتڵەقیی، خوای زانـاش فەرموویـەتی: ﴿ فَسْئَلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ النحل: ٤٣.

ئینجا پێویسته ئەو راستییەش بگوترێ: كه سەرجەم ئەو كەسانەی گیرۆدەی دەردی دەمارگیریی‌و لاساكردنەوە (التعصّب والتقليد) بوون، دڵ گچكەو بیر تەسك و چەشمەنداز لێڵ و كەم چیكڵدانەن، جا چ مەلاو شێخی بەساڵداچوو بن، چ گەنج و قوتابی ساواو كەم تەمەن، وە چ لەنێو بوغزی رێكخراوو كۆمەڵێك دابن، چ نەبن! چونكه بابای دەمارگیرو لاساكەرەوە، تەنیاو تەنیا له گۆشه نیگای خۆیەوە ئامادەی دیتنی هەقەو بەس ئەوەش بەهەق و راست دەزانێ كه بۆ خۆی‌و له دەلاقەی خۆیەوە دەیبینێ!

بۆ وێنە: بابایەكی مەلاو شێخی شافیعی مەزەب كه تێكرای ئایین و شەریعەتی خوا لەبازنەی بۆچوون و فەتوایەكانی ئیمام شافیعیدا (رەحمەتی خوای لێبێ) دەبینێ‌و لەو چوارچێوەیەدا كورتی هەڵدێنێ، بێگومان كاتێك قسەو رایەكی دیكەی غەیری مەزەبی شافیعی دەبینێ‌و دەبیستێ، دووچاری گرژبوون (تَشَنُّج) دەبێ‌و ئەگەر بشگوترێ رەنگە ئیمام شافیعی لەفلانه رایەیدا نەیپێكابێ! یەكجاری دەماری ملی هەڵدەستێ! هەروەها شوێن كەوتووانی دەمارگیرانەو لاساكەرەوانەی مەزەبەكانی دیكەش بەهەمان شێوە.

دیسان بابایەكی (سەلەفیی ناو)[1]یش كەپێی وایه ئیمان و عەقیدەو خوا بەیەككرتن (التوحيد) تەنیاو تەنیا ئەوەیه كه له (كتاب التوحيد)ی (محمد بن عبدالوهاب النجدي)دا (خوا لێی خۆش بێ) خراوەتەڕوو، ئەوە بێگومان هەركاتێك باسی بابەت و مەسەلەیەكی ئیمان و عەقیدەو خوا بەیەككرتن كرا، كەیان لەو كتێبەدا هەر نەهاتبوو، یان ئاماژەیەكی كەم وكورتی بۆ كرابوو، بۆ وێنە: خوا بەیەككرتن لەفەرمانڕەوایەتی (التوحيد في الحاكمية)دا، یان هاوبەش بۆ خوادانان لەفەرمانبەرێتیدا (الشرك بالله في الطاعة)، یان هێرش كردنە سەرو دژایەتی‌كردنی خاوەن كۆشكەكان (أصحاب القصور) كە لەم رۆژگارەدا چەند قاتی خاوەن گۆڕەكان (أصحاب القبور) فاكتەرو هۆكاری لەرێلادان و بێدین كردنی خەڵكن!! ئەوە ئەویش بەپێی یاسای (الناسُ أعداءُ ماجَهِلُوا) گرژومۆن دەبێ‌و پێی وایه لەخۆی بەولاوە هیچ كەس مافی باس كردنی (التَوحيد والشِّرْك)ی نیه!!

---

[1]– واتە: كەسێك كەناوی (سەلەفیی) لەخۆی ناوە، لەكتێبی: (رێگای صالح بوون...)دا چاپی سێیەم تیشك خراوەتە سەر ئەو مەسەلەیە، بڕوانە لاپەڕە: ٢٣٥تا٢٤١.

هەروەها هەركام لە شێخ و صۆفىو دەروێشێكیش كە هەق و راستی تەنیا لەرێبازو (طريقة)ەكەی خۆیان دا دەبینن و، ئیسلامییەكیش كە ئیسلام تەنیا لەلایەنەكەی خۆیدا دەبینێ! هەموو ئەمانە لەسۆنگەی دەمارگیریىو تەقلیدەوە گیرۆدەی دەردی دین لیْكچكە بوونەوەو تەنیا هەق لەخۆیدا دیتن و سەرگەردانیی دەبن.

بەپەسەندیشی دەزانم كە بە قسەیەكی بەنرخی (ابن تيمية) كۆتایی بەم خاڵی نۆیەمە بهێنم، گوتوویەتی: (وأنت تجدُ كثيراً من المُتَفَقِّهةَ إذا رأى المتصَوِّفة والمُتَعَبِّدَةَ لايَراهُمْ شيئاً ولايَعدُّهُمْ الاّ جُهَّالاً ضُلَّالاً، ولا يعتقدُ في طَريقهمْ منَ العِلْمِ والهُدى شيئاً، وترى كثيراً من التصوفة والمُتَفَقِّرةِ لايرى الشريعة ولا العلم شَيْئاً، بَلْ يَرى المَتَمَسِّك بِها مُنْقَطِعاً عن الله وأنه ليس عند أهْلِها مِما يَنْفَعُ عِندالله شَيْئاً).

وأنما الصَّوابُ: أنَّ ما جاءَ به الكتابُ والسنة مِنْ هذا و هذا: حَقٌ، وما خالَفَ الكتاب والسنة مِنْ هذا وهذا: باطلٌ)[1].

واتە: وە تۆ زۆر لەخۆ بەشەرعزانان دەبینی كاتێك صۆفىو خواپەرستەكان دەبینێ، بەهیچیان دانانێو هەر بەنەزان و سەرگەردانیان دەزانێ، وە پێی وایە كە رێبازەكەیان هیچ جۆرە زانست و هیدایەتێكی تێدا نیە.

هەروەها زۆر لەخۆ بەصۆفىزان و قەلەندەرەكان دەبینی، شەرع و زانستی پێشتێك نیە، بەڵكو پێی وایە هەركەسێك پێیەوە پابەند بێت ئەوە لەخوا دابڕاوە، وە خەڵكی شەرعزان و خاوەن زانست هیچی وایان پێ نیە كە لەلای خوا سوودێك بگەیەنێ.

بەڵام هەق و راستی هەر ئەوەیە كە:

هەرشتێك لەقورئان و سوننەت دا هاتبێ، لەمیش و لەویش ئەوە هەق و چاكەو هەر شتێكیش لەهەردووكیان دا پێچەوانەی قورئان و سوونەت بێ، ئەوە پووچ و بۆشە.

بەڵێ، ئا ئەوەیە هەڵوێستی شەرعیىو دادگەرانە كە زاناو پێشەوایانمان بۆ هەڵسەنگاندن و هەڵس وكەوت لەگەڵ كردنی سەرجەم كۆمەڵ و دەستەو توێژەكانی كۆمەڵگای مسوڵمانان رەچاویان كردوە، كە هەق و چاكەو خێری هەركەس و كۆمەڵ و لایەنێكیان بینیوەو قبووڵ كردوەو هەڵەو پەڵەو ناشەرعیی هەموو كەس و لایەنێكیشیان زانیوەو ڕەد كردۆتەوە.

---

[1] - بڕوانە: (إقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم) ج١ ص٧٩

**١٠- پایەو بنەڕەتەکانی ئیسلام، وەك: ئیمان و عەقیدەو ڕاست و دروست تێگەیشتن و چاك خواپەرستن و خووڕەوشت بەرزیی‌و فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لە خراپەو جەنگ و جیهاد... بکەنە تەرازوو و پێوەری موسوڵمانەتی، نەك وردە شتی وەك: ریش و سیواك و پۆشاك کورت بوون و پەنجە جووڵاندن و... هتد:**

بەڵێ، هۆ گەنج و لاوە دڵسۆزو خوێن گەرمەکانی ئیسلام! ئامۆژگاریی دەیەمم کە دەمەوێ ئاڕاستەتان بکەم ئەوەیە کە زۆر وریاو هۆشیار بن لە هەڵسەنگاندن[1] و نرخاندن و پۆلاندنی موسوڵمانانداو، هەرگیز نەچن ئەو وردە شتانە بکەن تەرازوو و پێوەر کە لەئایین و بەرنامەی خوادا شتی گچکەو لاوەکیی[2] و ئاسانن و، پایەو بنەڕەتە گەورەو گرنگەکانی ئیسلام فەرامۆش بکەن، کە لەڕاستیدا بەتارو پۆی[3] دینداریی‌و موسوڵمانەتی دادەنرێن و بەهەموو کەسیش ئەنجام نادرێن!

چونکە ئینسان دەبێ شتێك بکاتە پێوەرو تەرازووی ئەو کەسەی، یان ئەو شتەی کە هەڵی دەسەنگێنێ، کە چییەت (ماهیة)و کاکڵ و جەوهەری دەربخات! دەجا بێگومان حەقیقەت و جەوهەری ئینسانی موسوڵمان لەجۆرو چۆنیەتی ئیمان و عەقیدەی و تێگەیشتن (فَهْم)ی بۆ ئیسلام و خواپەرستیی (عبادة)ی و هەڵوێستی لەبەرانبەر چاکەو خراپەداو، خووڕەوشتی‌و ئامادەیی بۆ کۆچکردن (هجرة)و جەنگ و جیهادو...هتددا دەردەکەوێ، نەك لەشێوەو بیچم و ئەندازەی ریشی‌و بەرگ و پۆشاکی‌و سیواك کردنی‌و پەنجە لەتەحییاتدا جووڵاندنی‌و دەست زۆر لەپشتەوەی سینگ گرتنی‌و...هتد، چونکە بابای موسوڵمان بە بنەڕەت و پایەو ئەرك و کارە گەورەو گرنگەکانی موسوڵمانەتی دەناسرێ، نەك بەوردە شت و ئیشە گچکە لاوەکییەکانی!! ئاخر هەموو کەس دەتوانێ شتی گچکەو ورد ئەنجام بدات، بەڵام لەڕاستیدا کەم کەس وەك پێویست کارو ئەرکی گەورەو گرنگی بۆ ئەنجام دەدرێ.

---

١- نامیلکەیەکم بۆ داهاتوو لەبەردەستە بەناوونیشانی: (تەرازووی موسوڵمانەتی).

٢- لاوەکی: جزئي، فرعي، ثانوي، کەواتە: مەبەست بەکەم سەیرکردنی ئەو شتانە نیە!

٣- تاروپۆ: ڕایەڵ و تێوەدان، مەبەست پێکهێنەرە سەرەکییەکانی شتێکن.

**كەواتە: خوشك و برا خۆشەويستەكانم!** نەچن هەركەسێكتان بينى بۆ هەڵسەنگاندن و لەمەحەك دانى مسوڵمانەتى‌يەكەى هەر بەوەندە وازبێنن كە سەرنجى ريش و سمێڵ[1] و دەلينگى شەرواڵەكەى بدەن و، پاشان بەئەندازەى درێژيى‌و پانيى ردێنى‌و كورت كردنەوەو هەڵپێچانى دەرقاچەكانى نمرە (درجة)ى ئيمان و تەقواى بۆ دابنێن!!

چونكە دڵنيابن بەم جۆرە هەڵسەنگاندن و لەمەحەك دانە، تووشى گەلێك هەڵەى كوشندەو هەڵسەنگاندنى بێ‌مانا دەبن، چونكە وەك پێشتر گوتم ريش هێشتنەوەو بەر سمێڵ كردن و...هتد زۆر ئاسانن و بەهەموو كەس دەكرێن و، بەوپێ‌و دانگە زۆر باباى سيخوڕو جاسووس و بەكرێ‌گيراوى كوفر خۆيمان بەموسوڵمانێكى چاك وپاك و رێ‌و شوێنى سەلەفى صالح گرتوو پێ دەفرۆشى‌و، پاشانيش نامەردانە گورزو زەبرى خۆى دەوەشێنێ![2]

بەڵكو بۆ هەڵسەنگاندن (تقييم)ى مسوڵمانەتى خەڵك و لەمەحەك دانى پارێزكاريى‌يان، با ئايەتەكانى قورئان و فەرمايشتەكانى پێغەمبەرى خواﷺ بكەينە پێوەرو تەرازوو و ئاوێنە، جا ئەوكاتە- مەگەر چۆن- دەنا بەسەهوو ناچين و فێڵمان لێناكرێ، بۆ وێنە:

أ- سەرەتاى سوورەتى (المؤمنون) كە پێناسەى ئيمانداران دەكات:

﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ .... ﴾ .

ب- وە ئايەتەكانى كۆتايى سورەتى (الفرقان)، كە پێناسەى بەندە پەسەندو هەڵبژاردەكانى خواى بە بەزەيى دەكەن:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ

١- ئەگەر ئافرەتيش بێ سەرپۆش و پۆشاكەكەى.

٢- حاڵەتى لەوجۆرە زۆر هەيە لەكوردستان و غەيرى كوردستانيش دا.

جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمْ يُسْرِفُواْ وَلَمْ يَقْتُرُواْ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴾

ج- وە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە تێیدا پێناسەی مسوڵمان و بڕوادار دەکات: (المسلم مَنْ سَلِمَ المسلمون من لِسانِهِ ويدهِ، والمؤمِنُ مَنْ أمِنَهُ الناسُ على دمائِهِمْ وأمْوالِهِمْ..)[١].

د- وە فەرموودەی پێغەمبەری خواﷺ کە تێیدا سێ نیشانەو بەڵگەی شیرنایەتی ئیمان چێژتن دەخاتەڕوو: (ثلاث مَنْ كُنَّ فيه وَجَدَ بهنَّ حَلاوة الإيمان: أنْ يكون الله ورسولُهُ أَحَبَّ إليه مما سِواهُما، وأن يُحِبَّ المَرْءَ لايُحِبُهُ إلاّ للهِ، وأن يَكْرَهَ أن يَعُودَ في الكفرِ بَعْدَ أنْ أنْقَذَهُ اللهُ مِنْهُ كما يكرَهُ أنْ يُقْذَفَ في النار)[٢].

شایانی باسیشە کە لەئەنجامی کردنە پێوەرو تەرازووی ئەو وردە شتانەدا، وەك چۆن بەهۆی خەڵکی فێڵبازو ساختەچیەوە دووچاری هەڵەو فێڵ لێکران دەبین و گەلێك لە دوژمن و ناحەزانی دڵڕەش و دەمامك بەستوو، بەپیاو چاك و دۆست دادەنێین، لەلایەکی دیکەشەوە دووچاری گەلێك جۆرە ستەم و بێدادیی (الظلم والجور) دەبین سەبارەت بەزۆر لە مسوڵمانان و بەگشتیو زاناو پێشەوایانیشیان بەتایبەت!

با بەچەند وێنە هێنانەوەیەك بۆتان روون بکەمەوە:

**یەکەم:** شتێکی ئاشکراو مشت و مڕ هەڵنەگرە کە پێغەمبەری خواﷺ ریش (لحية)ی هەبووەو هێشتویەتەوە، بۆیە زۆربەی هەرەزۆرو بگرە تێکڕای زانایانی ئیسلام ریش هێشتنەوەیان بەسوننەت[٣] داناوە، جا زۆربەیان تاشینییان بەحەرام و هەندێکیشیان بەناپەسەند (مکروه) یان داناوە[٤]، بەڵام ئایا ئەگەر برایەکی مسوڵمان یان تەنانەت

---

١- رواه مسلم.

٢- متفق عليه.

٣- سوننەت بەماناو چەمکە (أصول الفقه)ییەکەیو مانا (فقه)ییەکەی (تطوع وندب)ەکە بەرانبەر فەرز (واجب)ە، بەڵام لەزاراوەی زانایانی (سنة وحديث)دا سەرجەم سوننەت و رێبازی پێغەمبەرﷺ دەگرێتەوە، کە ئێمە لێرەدا بەماناو چەمکی دووەمی بەکارمان هێناوە.

٤- بڕوانە: کتێبی (خواپەرستی ئیسلامیی) بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، لاپەڕە ٢٤٧و ٢٤٨.

مامۆستاو زانایەکمان بینی، کە ریشیان تاشیبوو و نەیان هێشتبووەوە، ئایا ئەو بێ ردێنیەیان لێبکەینە عەیب و هەڵەیەکی وا زل کە چاکەو خێرو کردەوە باشەکانیان بشواتەوە؟! هەڵبەتە هەیە بەوجۆرە رەفتار دەکات، بەڵام بێگومان هەڵوێستەکەی هەڵەو بێویژدانیە! ئایا بابایەکی وەك (سید قطب)و (مەلا سەعید نورسی)و (کاك ئەحمەد موفتی زادە) کە هەر کامێکیان زاناو پێشەوایەکی گەورەو لێهاتووی ئەم سەدەیە بوون و ریشیشیان نەهێشتۆتەوە، هەر لەبەرئەوەی ردێنیان نەبووە- کە بێگومان پێچەوانەی[1]

---

١- لێرەدا بەپێویستی دەزانم بۆ ئەوەی خوێنەرانی بەڕێز لەبەرانبەر ئەو گەورە پیاوانەدا دووچاری بەدبینیو گومانی خراپ بردن نەبن، ئەم چەند دێرە کورتە بنووسم لە وەکالەتی ئەو زانا بەڕێزانە کە بێگومان ئەگەر خۆیان نووسیبایان گەلێك چاکتریان دەنووسی:

هەرچەندە ئێمە هەرکەسێك هەڵەو کەم وکوڕییەکی لێببینین بێپەرواو بێ‌ژێر لێوخستن دەیڵێین، وەك لەم مەسەلەیەشدا هەروامان کردوە گوتوومانە.

وە بێگومان بێجگە لە پێغەمبەری خواﷺ هیچ کەسێك لە هەڵەو کەم و کووڕیی پارێزراو نیەو، ئینسان هەرچەندە زاناو پایە بەرزبێ، هەر ڕێی تێدەچێ تووشی هەڵەو پەڵەببێ.

بەڵام سەبارەت بەو سێ زانا بەڕێزە کە ناوم هێناون (خوا لێیان خۆش بێ)و پلەو پایەیان بەرزتر بکاتەوە، کە ریشیان نەهێشتۆتەوە، وێڕای ئەوەی گوتمان ئەم حاڵەتانەش رێیان تێدەچێ، دیارە هەم بۆ ئەوان هەم بۆ هەر کەسێکی دیکەی وەك ئەوانیش:

١- دەگونجێ هەندێکیان ئەو رایەی بەشێك لە زانایانیان هەبووبێ کەردێن هێشتنەوە بەس بە سوننەت دەزانن و، سوننەتیش بەهاتنە رێی زیان و (مفسدة)ێك کە زەرەری لەخێری سوننەتەکە زیاتربێ، یان کەوتنە بەر مەترسی تێچوونی بەرژەوەندیی (مصلحة)یەك کە قازانجی لەهی سوننەتەکە پتربێت، حوکمەکەی دەگۆڕێ.

٢- یان هەندێکیان ئەو رایەی چەند زانایەکیان هەبووبێ کە پێیان وایە ریش هێشتنەوە لە ئەسڵ دا نەرێت و عادەتێکی چاکەو، بەگۆڕانی عورف و باوی خەڵکی حوکمەکەی دەگۆڕێ.

٣- یان عوزری تەندروستیی (صحي)یان هەبووبێ، وەك حەساسیەت و نەخۆشی پێست.

٤- یان عوزری پاساوی دیکەیان هەبووبێ، ئەوەتا مامۆستا مەلا سەعیدی کوردی نۆرسی لەوبارەوە وەك لە (کلیات رسائل النور) دا لەچەند جێیەك دا هێناویەتی، سێ وەڵامی داونەوە لەبەرانبەر پرسیاری: (بۆچی ریش ناهێڵیەوە؟)دا:

أ- ریش تاشین بۆ کەسێك حەرامە کە هەیبێ و بیتاشێ، بەڵام کەسێك کە هەر لەسەرەتاوە نەیبووبێ حەرام نیەو، منیش هەر لەسەرتاوە ریشم نەبووە.

ب- ئەگەر ردێنم هێشتبایەوە جەندرمەکانی ئەتاتورك دەیان تاشیو واشیان کردبایە لەخەفەت و مەراقان دەمردم.

سوننەتە– ئەو هەموو خزمەت و جوامێریی‌و فیداکارییەی کە بوویانە، نا دیدەی بگرین؟!

بەڵگە نەویستیشە کە من لێرەدا بێڕێزیی ئەو گەورە پیاوانە ناکەمە بەڵگەو بیانووی ڕیش نەهێشتنەوە– وەك هەندێك لەشوێن کەوتووەکانیان دەیکەن، چونکە شتێکی روونە کە رەفتارو ئاکاری پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵگەیە لەسەر خەڵکی نەك بەپێچەوانەوە!! بەڵام من دەمەوێ بەئێوەی خۆشەویست– ئەی خوشك و برا گەنج و خوێندەوارەکان– بڵێم: هەر هێندە گرنگیی‌و بایەخ بەشتێکی گچکەو لاوەکیی– لەچاو شتی دی– وەك ڕیش هێشتنەوە بدەن، کە خواو پێغەمبەر ﷺ لە قورئان و سوننەتدا ئەمیەتیان پێداوەو، کارێك مەکەن لەبەر هەبوونی ریش ئاگاتان لە (بێ ئیشی) زۆر کەس بڕێ‌و، لەبەر بێ ڕیشیش (ئیش)ی گەلێك کەس بەکەم سەیر بکەن!

ئینجا ئەگەر بێت و ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە لەبارەی: زانست (علم)، یان پارێزکاریی (تقوى)، یان نوێژکردن، یان جەنگ و جیهاد، یان فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە، یان رەوشت و خوو بەرزو جوان، یان...یان..هتد‌ەوە هاتوون و باسی گەورەیی‌و گرنگی‌یان و پلەوپایەی خاوەنەکانیان و پاداشتی بەرزیان کردوون، لەگەڵ ئەو دەقانەدا بەراورد (مقارنة)بکەین کە لەبارەی ریش هێشتنەوەوە هاتوون، دەبینین جیاوازییەکە یەکجار زۆرە!!

**دووەم:** جگەرە کێشان ئەگەر رۆژگاری زووش بەهۆی نەدۆزرانەوەی زیانەکانی‌یەوە مشت ومڕی زانایانی هەڵگرتبێ کە ئایا حەرامە یان نا؟! بێگومان ئێستا حوکمەکەی رۆشن بۆتەوە کە پیس و زیانبەخش و حەرامە[1]، بەڵام ئایا جگەرەکێشان لەلایەن هەندێك کەسەوە دەبێتە پاساوی ئەوە کە بەچاوێکی کەم بایەخ تەماشای دینداریی‌و

ج– ئەگەر ریشم هێشتبایەوە قوتابی‌و هاوەڵەکانیشم پێیەوە پابەند دەبوون و لەحاڵێکی واش دا لەتورکیای ئەوسا (ئێستاش) تووشی چەرمەسەریی زۆر دەبوون.

منیش دەڵێم: رەنگە ئیشەکەیان لەسەر ریشەکەیان دانابایەو قازانجیان سەری مایەیانی خواردبایەو سەرەنجام نەڕیش بووایەو نەئیشیش بووایە!

١- لەنامیلکەی: (پێشمەرگەی ئیسلام یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟!) باسی حوکمی جگەرەکێشانمان کردوە.

خواپەرستیی‌و موسوڵمانەتیی بکرێ‌و، لەژێر سایەی شوومی تەمومژی دووکەڵی جگەرەدا زەڕبی سفر بکرێن؟!

ئایا جگەرەکێشان و سوود (ربا) خۆریی، یان جگەرەکێشان و نوێژچواندن، یان جگەرەکێشان و درۆو غەیبەت و قسەهێنان و بردن، یان جگەرەکێشان و دڵ ئێشاندنی دایك و باب، یان جگەرەکێشان و جنێوگوتن و زمان پیسیی، یان جگەرەکێشان و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی (قطع صلة الرحم)، یان جگەرەکێشان و هەقی دراوسێ جێبەجێنەکردن،...یان..یان..هتد پێکەوە دەچنە نێو تەرازووەوە؟! بێگومان نەخێر، چونکە هەرکام لەم گوناحانە چەندان دەقی بێ‌پێچ و پەنای قورئان و سوننەتیان لەسەرن و هیچ کەسێکیش مشت ومڕی لەسەر حەڕمیی‌یان نەکردوە، دەجا مادام وایە با مل کەچی شەرعی خوابین، نەك طەبعی خۆمان و وەك چۆن بەهیچ کام لەو گوناحە زلانە زۆر لە مسوڵمانانی دەوروبەرمان لەبەرچاو نابێزرێ‌و بەدیتنیان گرژومۆن نابین و بەدەنمان داناهێزرێ، با بۆ جگەرەکێشەکانیش هەر هێندە قەڵس و نارەحەت بین کە گوناحی جگەرەکێشان داخوازیی دەکات، نەك هەرکەسێك جگەرەی کێشا، پێمان وابێ هیچ خێری پێوە نەماوە بۆ ئیسلام و موسوڵمانان!!

کۆتایی ئەم خاڵی دەیەم و کۆتایی‌یەش بەم چەند بڕگەیە دێنم:

١- لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئایەتەکانی قورئان وەك خوا فەرموویەتی لەڕاستیی دادگەریی‌دا تەواویان کردوە:﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا .... ﴾[1] ، وە بەپێی تەرازووی زانیاری بێ سنووری خوا لەهەر بابەت و مەسەلەیەك دەدوێن: ﴿ اللَّهُ الَّذِي أَنزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ .... ﴾[2] ، بۆیە با بیکەینە تەرازووی هەڵسەنگاندنمان بۆ هەر بابەت و مەسەلەیەك کە قورئان- هەروەها سوننەتیش- چەندەی گرنگیی‌و بایەخ پێدابێ‌و، چ ئەندازەیەك لەپانتایی بۆ روونکردنەوەی تەرخان کردبێ، دیارە پێویستە لە واقیعیش دا هەر هێندە بێ‌و تێیدا کەم و زیاد نەکرێ! جا بەگوێرەی ئەم بنچینەیە بێ،

---

١- الأنعام: ١١٥

٢- الشورى:١٧

زۆر ئاشکرایە کە پایەو بنەڕەتـەکانی وەك ئیمـان و تـەقواو تەزکیـەو ڕەوشـتی پەسـەندو جەنگ و جیهـادو برایـەتیو هاوکاریی....هتـد چـەندن و چۆنن و، وردە بابەتـەکانی وەك ریش هێشتنەوەو سیواك کردن و دەلینگ هەڵپێچان و...هتدیش چەندن وچۆنن!!

٢- بۆ ناسینی خەڵك و دیاری کردنی ئەندازەو ڕێژەی دینداریيو مسوڵمانەتیيان، دەبـێ سەرنجی عەقڵ و دڵیان بدەین، چونکە ئینسان بەعەقڵ و دڵ لەئاژەڵ و چوارپـێ جیایـەو، بەو شتەش کە لەعەقڵ و دڵیاندا جـێگیر دەبـێ لەیـەکتر جیـا دەبنـەوەو بـەرزیيو نزمیـی (تفاضل)یان لەنێواندا پەیدا دەبێ! جانتایەك بێنەبەر چـاوت کـە پـڕە لـە زێـڕو گەوهـەرو مرواریيو، یەکێکیش کە پڕە لەکەل وپەل و شمەکی بێسوود، یان شتی پـیس و بۆگـەن، بەڕواڵەت هەردووکیان جانتان، بەڵام بەنێوەڕۆکیان هێندەی زەویيو ئاسمان لەیـەك دوورو جیان!!

بەڵێ ئینسانەکانیش بەکاکڵ و جەوهەریان لەیـەك جیادەبنـەوەو، بـا ئێمـەش زیـاتر لـەکاکڵ و جەوهەریانـەوە ڕابمێـنین، نـەك لـە دیکـۆرو ڕواڵـەتیان، دیـارە هـەر کاکـڵ و جەوهـەری ئینسانەکانیشـە کـە جێگـای سـەرنجی خـوای کاربەجێیـە، وەك پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: (إن الله لا يَنْظُـر إلى صُـورِكُمْ وأَجْسـامِكُمْ ولكِـنْ يَنْظُـر إلى قُلـوبِكُمْ وأعمالِكُمْ)[١]. هەڵبەتە مەبەستیشمان ئەوە نیە کـە دیکـۆرو ڕواڵـەتیش پشـت گـوێ بخـرێ، نەخێر، بەڵام با هەر شـتە بەقـەدەر خـۆی تەماشـا بکرێو لەشـوێنی شایسـتەی خۆیـدا دابنرێ.

٣- هەرکاتێك بەتەرازووی خوا دینداریيو موسوڵمانەتی خـەڵکیمان هەڵسـەنگاند، ئـەوە هەمیشە دادگەرانەو هاوسەنگانە ڕەفتار دەکەین و خۆمان گـیرۆدەی ڕەفتـارو هەڵوێسـتی نادادگەرانـەو کـرچ و کاڵانـەی سـەیرو سـەمەرە ناکـەین، وەك ئـەوەی کـە لـە هەنـدێك مسوڵمانی سادەو فەقیرحاڵ دەبینرێن، کە:



١- رواه مسلم.

* بەرانبەر بە قەبرپەرستان[1] (القُبُوريُّون) زۆر توندو تیژو بەبڕشتن، بەڵام لەبەرانبەر قەصرپەرستان (القصوريّون)دا یەکجار نەرم ونۆڵ و بێهەڵوێستن! لەگەڵ ئەوەشدا کە زیان و خراپەی قەصرپەرستیی لەم رۆژگارەدا لەگەڵ هی قەبرپەرستیی قیاس ناکرێن و، هەتا بەهۆی خاوەن قەبرێکەوە چوار صۆفیو دەروێش و عەوام دووچاری شیرك دەبن، لەسۆنگەی نەخشەو پیلانی خاوەن قەصرێکەوە هەزاران کەس و بگرە میللەتێك سەرگەردان و ماڵوێران دەبن.

* زۆر بەگەرم و گوڕییو بێخاترانەو بوێرانە هێرش دەبەنە سەر بیدعەتە وردیلەکانی وەك: فاتیحە بۆ مردوو خوێندن لەکاتی تازیەو سەرەخۆشییداو، صەڵەواتی دوای بانگ و، بەدەنگی بەرزو بەکۆرس زیکرو تەسبیحات کردنی دوای نوێژە فەرزەکان، بەڵام کەم و زۆر باسی بیدعەتە گەورەو زلەکانی وەك: حوکم کردن بەغەیری ئەوە کە خوا ناردوویەتە خوار (الحكم بغير ماأنزل الله)و، خۆبەدەستەوەدان و وابەستەیی سیاسی بۆ رۆژئاواو ئەمەریکاو، دیکتاتۆریەت و، حوکمی بنەماڵەییو خێڵەکیی میراتیو...هتد ناکەن و ناکەن!!

* چەندان باس و لێکۆڵینەوە تەرخان دەکەن بۆ توێژینەوەو روونکردنەوەی مەسەلەیەکی وەك: خاڵ کوتان (وشم)و موو هەڵکێشان، بەڵام بەلای ئەوەدا ناچن کە ئایا حوکمی لێدان و پێدادان و خەڵك کوتان و، مل هەڵکێشان چییەو چۆنە؟!



[1]- مەبەستمان ئەو کەسانەیە کە لەجیاتی لەخوا پاڕانەوەو رووتێکردنی و پشت پێبەستنیو هاوار لێکردنی، روو دەکەنە مەزارگەی پیاوچاکان و صالحان و دووچاری چەندان جۆرە گوناح و هەڵەو پەڵەو شیرکی گەورەو گچکەش دەبن.



## پوختەی قسان:

با نە بەدیتنی چاکەیەك یان چەند چاکەیەکی گچکە لەکەسێکدا زۆر خۆشحاڵ ببین و بۆی بڕووخێین، وە نەبەدیتنی خراپەو هەڵەیەك یان چەند هەڵەیەکی گچکەش لە کەسێك دا زۆر لێی ناڕەحەت بین و بوروژێین! چونکە نە بەگوڵێك بەهار دێو نە بەگوناحێکیش کابە کەچ دەبێ.

وە با وەك خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەططاب (خوا لێی ڕازی بێ) وردو وریاو بەسەلیقە بین لەناسینی خەڵکدا، کە دەگێڕنەوە ڕۆژێکیان گوێی لەیەکێك دەبێ مەدحی یەکێك دەکات کە هێندەو هێندە صالح و پارێزکارە! ئەویش لەکابرا دەپرسێ: کە ئایا دەیناسی وا مەدحی دەکەی؟! دەڵێ: بەڵێ دەیناسم! ئەویش دەڵێ چۆنی دەناسی! ئایا سەفەرت لەگەڵ کردوە کە لەسەفەرێدا خوو ڕەوشتی مرۆڤ دەردەکەوێ؟! دەڵێ: نەء، دەڵێ: ئەدی مامەڵەت لەگەڵ کردوە کە دەستپاکیی‌و (ورع)ی ئینسانی تێدا دەردەکەوێ؟! دەڵێ: نەخێر، دەڵێ: ئەدی دراوسێت بووە کە لە دراوسێیەتیدا ئینسان نهێنیی‌و پەنهانییەکانی یەکتر شارەزا دەبێ؟! دەڵێ: نەخێر، دەڵێ: کەواتە نایناسی، ڕەنگە لە مزگەوتێ بینیبت لە نوێژیدا سەری لەقاندبێ! دەڵێ: بەڵێ، دەڵێ: نەخێر بەوەندە نایناسی!

وە با بۆ ناسینی خۆمان و خەڵك و هەڵسەنگاندنی دینداریی خۆمان و خەڵکیش پایەو بنەڕەتە گرنگ و گەورەکانی ئیسلام بکەینە پێوەرو تەرازوو، نەك شتی گچکەو لاوەکیی، بۆ ئەوەی لە هەڵسەنگاندنماندا بەهەڵەدا نەچین و کەسانێکی باش، بە هەڵەیەکی گچکەو چەند وردە عەیب و خراپەیەك بەخراپ لەقەڵەم نەدەین و، کەسانێکی خراپ و بۆشیش، بەچەند چاکەیەکی گچکەو دیاردەو هەڵس وکەوتێکی لاوەکیی بەصالح

و چاکەکار دانەنێین، تاقە دەستەبەرکەر (ضـامِنْ)ی ئـەو ئامانجـەش ئەوەیـە کـە ئـایین و شەرعی خوا بکەینە تەرازوو، نەك عورف و بۆچوون و طەبعی خۆمان.

خواش بەکەرەم و بەخششی خۆی هـەقمان وەك خـۆی پێشـان بـدات و یارمـەتیمان بدات پێیـەوە پابەنـد بـین و، ناهەقیشـمان وەك خـۆی پیَبناسـێنیَو یاریـدەشمان بـدات خۆمانی لیَدوور بگرین.

## ١١- چـــەند ئـــەدەب و رەوشـــتێکی پێویســـت بـــۆ قوتابیـیـــانی زانســـتە شـەرعیىیەکان، لـە هەرسـێك بـواری پەیوەنـدی لەگـەڵ: (خـۆ)و (زانسـت)و (مامۆستا)دا:[1]

**خوێنەرە بەرێزو خۆشەویستەکان!** خوا پشتیوان بیّ لەم خاڵی یازدەیەمـەدا هـەوڵ دەدەین گرنگترینی ئەو ئەدەب و رەوشت و ئاکارە بەرزو پەسەندانە بنووسین کـە هـەموو مسوڵمانێك بەگشتیو بەتایبەت فەقێو قوتابیىیانی زانستە شـەرعیىیەکان پێویسـتیانن و مەرجن بۆ ئەوەی بەرەکەت و پێز بکەوێتە زانسـتەکەیانەوە، لەهەرسـێك بـواری هـەڵس و کەوت لەگەڵ (خود)و (زانست)و (مامۆستا)دا.

### یەکەم: لەبواری پەیوەندی لەگەڵ (خۆ)دا:

### ١- ئـیخلاس و بـۆ خـوا سـاغ کردنـەوەی نیـازو مەبەسـت و خۆپاراسـتن لەڕیابازیی:

بێگومان نیازو مەبەست و هاندەری ئەنجام دانی هەرکارێك بە بناغە (أساس)ی ئـەو کارە دادەنریَو لەوبارەوە ئایەتی خواو فەرموودەی پێغەمبەری پێشەواﷺ یەکجار زۆرن، بۆ وێنە: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ ... ﴾[2] ، وە خـوای بـەرزو مـەزن

---

١- بۆ نووسینی ئەم باسە سوودێکی باشم لەکتێبی: (معالم فی طریق طلب العلم) وەرگرتوە، کە (عبدالعزیز بن محمد بن عبدالله السدحان) نووسیویەتی، خوا پاداشتی بداتەوە.

٢- البینة: ٥

سبحانەو وتعالی رای گەیاندوە کە ئیخلاص و تەنیا خوا پێمەبەست بوون، مەرج و مایەی هیدایەت و سەر راست کردنی خوایە بۆ بەندەکان: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾[1].

وە زاناو پێشەوایانی پێشینمان زۆر گرنگی‌یان بە مەسەلەی نیەت داوەو چاك لێی خەفتاون ئەوەتا (سفيان الثوري) لەوبارەوە گوتوویەتی: (ماعالجْتُ شَيْئاً أشدَّ عليَّ مِنْ نِّيتي[2]) واتە: هێندەی بەنیەتمەوە ماندوو بووم، بەهیچ شتێکەوە ماندوو نەبووم!

دیارە ئینسانیش بە ئەندازەی نیازو مەبەست ساغی‌و پاکیی لە ریابازیی‌و خۆدەرخستن (حُبُّ الظُّهور)و سینگ رەپێش کردن، دوورو پارێزراو بێ، چونکە کە دڵنیابووی خوا دەتبینێ، دەربەستی دیتن و نەدیتنی ئەم و ئەو نابێ!

## ٢- لەخۆ داهێنانە دی بەندایەتی (تحقيق العبوديه) بۆ خوا:

دیارە ئامانج و مەبەستی زانستە شەرعیی‌یەکان بەندایەتی بۆ خوا کردن و لێ نیزیك بوونەوەیەتی، بۆیە پێویستە ئەهلی عیلم، چ قوتابی بن چ مامۆستا، بە خواپەرستیی‌و بەندایەتی چاك و ساغ و بێخڵتە کردنیان بۆ خوا بناسرێن و لەخەڵکی دیکە جیابکرێنەوە، دیارە مەبەستیشمان لەخواپەرستیی‌و بەندایەتی کە بە (ئەوپەڕی بەگەورە گرتن و خۆشویستن و مل بۆ کەچکردنی خوا) پێناسە کراوە،ماناو چەمکی راستەقینەو فراوانی وشەی ناوبراوە، بەو شێوەیەی کە لەبابەتی یەکەمی بەرگی یەکەمی کتێبی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا ڕوونمان کردۆتەوە.

## ٣- پاراستنی کات و تەمەن لە بەفیڕۆچوون و زایەبوون:

ئاشکرایە کە تەمەنی ئینسان دەستمایە (رأس المال)یەتی و هیچ کەسێکیش بەبێ دەستمایە هیچ مامەڵەو بازرگانی‌یەکی بۆ ناکرێ!

جا با سەرنجی چەند قسەیەکی نەستەقی زانایانی پێشینمان بدەین داخۆ لەوبارەوە چی‌یان گوتوەو، بەرهەمی هەندێکیشیان ببینین داخۆ چی‌یان کردوە:[1]

---

١- العنكبوت: ٦٩

٢- بڕوانە: (تذكرة السامع والمتكلم) لابن جماعة ص٦٨، لە (معالم في طريق طلب العلم) ص١٩.

أ- (الحسن البصري) ڕەحمەتی خوای لێبێ گوتوویەتی: (یا ابنَ آدم! إِنَّما أَنْتَ أَيّامٌ، كُلَّما ذَهَبَ يَوْمٌ ذهبَ بعْضُك)، ئەی ئادەمیزاد! تۆ بەس چەند ڕۆژێکی، هەر ڕۆژێکت دەڕوات هەندێکت لێ دەڕوات!

ب- (خلیل بن أحمد الفراهیدی)یش گوتوویەتی: (الوقْتُ ثلاثة أقْسامٍ: وقْتٌ مضی عنك فلَنْ يَعُودَ، و وقْتٌ أنت فيه فانظر كيف يخرجُ عنك، ووقْتٌ أنت مُنْتَظِرُهُ وقَدْ لاتبلغُ إِليْهِ) واتە: کات سێ بەشە: کاتێك لێت گوزەراوەو ناگەڕێتەوە، وە کاتێك کە ئێستە تێیدای، سەرنج بدە چۆنی بەسەر دەبەی! وەکاتێك کە چاوەڕێی دەکەی‌و ڕەنگە پێی نەگەی!

ج- (أبو جعفر محمد بن جرير الطبري) ئەگەر بێت و ئەو لاپەڕانەی نوسیوونی بەسەر ڕۆژەکانی ژیانی‌دا دابەشن بکەی، لەو ڕۆژەوە کە لەدایك بووە هەتا مردوە، هەموو ڕۆژێکی (٦٠) لاپەڕەی دەگاتێ!

د- (الإمام النووي) کە تەنیا (٤٥) ساڵ ژیاوە! کەچی وێڕای ئەوەی ڕۆژانە (١٢)دەرسی گوتوونەوە، خاوەنی (المجموع: شرح المهذب)و (شرح صحيح مسلم)ە کە هەرکامێکیان (١٠-١٥)بەرگن، وە خاوەنی گەلێك کتێبی دیکەی گەورەو گچکەیە وەك: (تهذيب الأسماء واللغات)و (روضة الطالبين)و (رياض الصالحين)و (الأربعين)و (التبيان فی أداب حَمَلَة القرآن)و...هتد.

هـ- (عبدالله بن محمد: فقيه العراق) (٢٣)کەڕەت کتێبی (المُغْني)ی (ابن قُدامة)ی موتاڵا کردوە کە (١٠-١٥)بەرگی گەورەیە!

و- (الإمام إسماعيل الجرجاني) هەموو شەوێك (٩٠) لاپەڕەی بەخەتێکی وردو جوان دەنووسی!

دیارە بەبێ پاراستنی تاو (لحظة)ەکانی تەمەن و ڕژد (بَخيل) بوون لە خەرج کردنی کات دا، ئەنجام دانی ئەو کارە گەورەو گرنگانە مەیسەر نابێ‌و وێڕای ئەوەش بەرەکەتی تایبەتی خوا (جل جلاله)!

---

١- بڕوانە: (معالم فی طريق طلب العلم) ص٣٥وە ص٨٣تا٩٠.

## دووەم: لەبواری پەیوەندی لەگەڵ زانست دا:

### ١- بەدوای زانستدا گەڕان بەگچکەیی‌و لەسەرەتای تەمەنەوە:

بێگومان هەموو ئینسانێك بەرلەوەی گیرەو كێشەو سەرقاڵیەكانی ژیان و گوزەران و ماڵ وخێزان لەگەڵی دەستەو یەخەبن، زۆر چاكترو زیاتر دەرفەتی وەرگرتنی زانستی هەیە، هەر بۆیەش (عمر بن الخطاب)(خوا لێی رازی بێ) گوتوویەتی: (تفقَّهوا قَبْلَ أَنْ تُسَوَّدُوا)[1] ، واتە: لە ئایین دا شارەزابن بەر لەوەی بكرێنە گەورەو بەرپرس. هەڵبەتە ئەم قسەیەش ئەوە ناگەیەنێ كە ئینسانی بەتەمەنیش داوای زانست نەكات، بەلاّم بێگومان بەگچكەیی ئاسانترو بێگرفت ترە، (بخاري)یش (رەحمەتی خوای لێبێ) بۆ ئەوەی بەهەڵە ئەو قسەیەی خەلیفەی دووەم فام نەكرێ، گوتوویەتی: (وبَعدَ أَنْ تُسَوَّدُوا وقَدْ تَعلَّم أَصْحابُ النبيﷺ في كِبَرِ سِنِّهِمْ)[2]، واتە: وە پاش ئەوەش كە دەكرێنە گەورەش- هەر زانست پەیدا بكەن-، چونكە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ بەتەمەن گەورەیی زانیاریان وەرگرت.

ئینجا شایانی باسیشە كە ئەو زانستەی لە شلكی تەمەن دا وەردەگیرێ، زۆر لەدڵ و زەین دا چەسپاوترو دامەزراوتر دەبێ لەهی قۆناغی بەساڵ دا چوون، (الحسن البصری)یش لەوبارەوە جوانی گوتوە: (طَلَبُ الحديث فی الصِّغَرِ كالنَّقشِ في الحَجَرِ)[3] واتە: بەدوای فەرمایشتی پێغەمبەرﷺدا گەڕان بەگچكەیی، وەك نەخشی هەڵكەندراوی سەر بەرد وایە.

### ٢- رەچاوكردنی بنچینە (قاعدة)ی گرنگی (لەگرنگترەوە بۆ گرنگ چوون):

بەڵێ وەك پێشتریش لەخاڵی دووەمی ئەم بەشەدا باسمان كرد، وریا بوون لەپاراستنی ریزی لەپێشترەكان (ترتیب الأولويات) بۆ بابای داواكاری زانیاری (طالِبُ العِلْمْ) یەكجار پێویستەو بەبێ ئەوە تووشی مایەپووچی‌و بگرە زیانی گەورەش دەبێت،

---

١- رواه البخاري تعليقا مجزوماً به

٢- بڕوانە: (فتح الباري) ج١ ص١٩٩.

٣- بڕوانە: (جامع بيان العلم وفضيلة) ص٩٩.

جـا ئێمـه پێشـتر ئـەو مەسـەلەیەمان توێژیـەوە، بۆیـه لێـرە تـەنیا بەگێڕانـەوەی ئـەم بەسـەرهاتە پـڕ مانایـه وازی لێـدێنین: (ابـن جُـرَيْج) لەسـەرەتای داواکردنـی زانیاریـدا دەچێتە کۆڕی (عطاء بن السائِب) وە لە کۆڕەکەدا (أبو عُمَير)یش دانیشـتبوو کـه یەکێکـه لەپێشەوایان و پێی گوت: قورئانت خوێنـدەوە[1]؟! گـوتی: نـەء، گـوتی: دەبچۆ قورئـان بخوێنە ئەوجار بەدوای زانیـاری بکـەوە، دەڵـێ ماوەیـەك ڕۆیشـتم هـەتا قورئـانم خوێنـد، ئـەوجار هاتمـەوە لای (عطـاء)، کـه لەکاتـەدا (عبـدالله)ی لێبـوو، گـوتی: فـەڕزەکانی دەزانـی[2]؟! گـوتی: نـەء، گـوتی: دەبچـۆ فـەڕزەکانیش فێرببـە ئـەوجار بـەدوای زانیـاری بکەوە، دەڵێ: دیسان ماوەیەکیش چووم فـەرزەکان فێربووم، ئـەوجار هاتمـەوە، گـوتی: دەجا ئێستا زانیاری وەربگرە، دەڵێ: ئەوجار (١٧) ساڵان (عطاء)م گرت و بەرم نەدا.

### ٣- کارکردن بەزانست (العَمَلُ بالعِلْم):

کـارو ڕەفتـارکردن بـەزانیاری مایـەی پیـت و پێـز تێکـەوتنی زانیارییـەو، بەپێچـەوانەوەش هۆکـاری بێپێزییـەتیو مایـەی خەشـم و تـووڕەیی خـوای تۆڵـه ئەستێنیشـه، وەك فەرموویـەتی: ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾[3] (علـي بن أبي طالب) (خوا لێی ڕازی بێ) لەوبارەوە گوتوویەتی: (يَهْتِفُ العِلْمُ بالعَمَلِ فإنْ أجابَـهُ والاّ أرتَحَلَ). واتە: زانیاری بانگی کردەوە دەکات، جا ئەگەر وەڵامی نەدایەوە بار دەکات.

(عبدالله بن مسعود)یش (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: (كـان الرجُـلُ منّـا إذا تعلَّـمَ عَشْرَ آياتٍ لمْ يُجاوِزْهُنَّ حتـى يَعْرِفَ مَعـانيَهُنَّ والعَمَـلَ بِهِـنَّ) واتـە: پیاوێك لەئێمـه کـه دە ئایـەتان فێـر دەبـوو، لەسـەریان دەوەسـتا هـەتا واتاکانیـانی دەزانیـو ڕەفتاریشـی پێدەکردن.



١- دیارە مەبەست لەبەرکردنی قورئانە نەك تەنیا خوێندنەوەی ڕووت.

٢- مەبەست لە فەڕزەکان زانینی حەڵاڵ و حەرام و شتە بنەڕەتییەکانی ئیسلامەتییە.

٣- الصف: ٣

**٤- ڕەنج دان و شەونخوونیی‌و نائومێدنەبوون و کۆڵ نەدان:**

ئەمیش یەکێ دیکەیە لەڕەوشت و ئاکارە پێویست و بەمەرج گیراوەکان بۆ قوتابییانی زانیارییە شەرعییەکان و، وەك زانایان گوتوویانە: (العلْمُ لا يُعْطيك بَعْضَه حَتَى تُعْطيه كُلَّكَ). پێغەمبەری خواش فەرموویەتی: (إنَّما العلْمُ بالتَعَلُّم، وإنَّما الحِلْمُ بالتَحَلُّمِ ومَنْ يَتَحَرَّ الخَيْرَ يُعْطَهُ، ومَنْ يتَقْ الشرَّ يُوْقَهُ)[1].واتە: بێگومان فێربوونی زانیاری بەس بەخۆفێرکردنەو، هێمنییو مەندییش بەس بەخۆڕاهێنانە لەسەر هێمنیی، وەهەرکەسێك لەچاکە بخەفتێ دەیدرێتێو، هەرکەسێکیش خۆی لەخراپە بپارێزێ دەپارێزرێ.

وە بێگومان لە بەسەرهاتی (موسی) (سەلامی خوای لەسەر بێ)و بەندە صالحە زانیارییە تایبەت پێدراوەکەدا، کە زۆربەی زانایان[2] رایان وایە (خضر)ە، پەندی گەورە گەورە لەوبارەوە هەن: مووسا (سەلامی خوای لێ بێ) بەو پلەو پایەو تەمەنەوە کە دەبیستێ یەکێك هەیە زانیارییەکی لەلایە ئەو نایزانێ، یەکسەرو بێ دواخران نان و توێشەبەرە ئامادە دەکات وعەزمی جەزم دەکات کە بەهەر نرخێك بووە بیگاتێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا ﴾[3] ، وەیاد بکەوە کاتێك مووسا بە غولامەکەی گوت: واز ناهێنم – لەڕۆیشتن و سەفەر– تاکو دەگەمە شوێنی پێك گەیشتنی دوو دەریاکان، یان دەبێ رۆژگارێکی زۆر هەر بڕۆم و بڕۆم!

**٥- سووربوون لەسەر زۆر ئامادەبوون لەدەرسەکان دا و گێڕانەوەی دەرسە فەوتاوەکانی:**

زانایانی پێشینمان گوتوویانە: (العِلْمُ يُؤْتى ولايَأْتِي)، بۆیە لەسەر بابای داواکەری زانست (طالب العلْم) پێویستە کە هەرچۆن بووە نەهێڵێ هیچ دەرسێکی لەدەست بچێ، وە ئەگەر دەرسێکیشی فەوتا هەوڵ بدات بەهەر شێوەیەك بووە قەرەبووی بکاتەوە، لە

---

١– أخرجه الخطيب والدارقطني وهو صحيح.

٢– بڕوانە: (تفسير القاسمي) ج١١ص٧٥.

٣– الكهف: ٦٠

(الشَّعبی)یش گێڕراوەتەوە کە لەوەڵامی پرسیاری: ئەو هەموو زانیارییەت چۆن پەیدا کردوە؟! گوتوویەتی[1]: (بِنَفْيِ الأعْتماد، والسَّيرِ في البلاد، وصَبْرٍ كَصَبْرِ الحمار، وبُكورٍ كبُكورِ الغُراب) واتە: بەهۆی هەڵنەخزان و پاڵنەدانەوەو گەڕان بەوڵاتان داو خۆڕاگرییەك وەك خۆڕاگرییو تەحەمولی گوێدرێژو، بەیانی زووان وەخۆکەوتن، وەك هی قەلە بەلەکە...

## ٦- تۆمارکردن و نوسینی نوکتە گرنگەکانی دەرس و خاڵە جەوهەرییەکانی:

ئەمیش ئەدەب و ئاکارێکی بنەڕەتی قوتابییانی زانستە شەرعییەکان و هۆکارێکی گرنگی سەرکەوتن و بەمرادو مەبەست گەیشتنیانەو، زۆر جوانیش گوتراوە (قَيِّدوا العِلْمَ بالكتابة) زانست بەهۆی نووسینەوە ببەستنەوە.

هەڵبەتە ئەو نووسین و تۆمار (تَسْجيل) کردنەی نوکتەو خاڵە گرنگ و جەوهەرییەکانیش تایبەت نیە بەکاتی دەرس خوێندنەوە، بەڵکو لەکاتی موتاڵاو کتێب خوێندنەوەشدا بەهەمان شێوە هەر گرنگ و پێویست و سوود بەخشەو، کەسێکیش تەجرەبەی کردبێ هیچ گومان و دوودڵیی لەڕاستیی ئەم قسەیەدا نابێ: (ومَنْ جَرَّبَ مِثْلَ تجرِبَتِنا عَرِفَ مِثْلَ مَعْرِفَتِنا)...

## ٧- لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی قووڵ و فراوان و تەنیا بەدەرس خوێندن وازنەهێنان:

ئەمیش یەکی دیکەیە لە ئەدەب و رەوشتە گەورەو گرنگەکانی دەرس خوێن، چونکە لەڕاستیدا مامۆستا زیاتر دەرگاکەرەوەی زانستەو بابای خوێندکار دەبێ هەوڵ بدات بۆ خۆی بتوێژێتەوەو وردو قووڵ بێتەوەو بەملاولادا بگەڕێ و بسووڕێ و بەخۆڕاییش نەگوتراوە: (مَنْ جَدَّ وَجَدَ)، منیش دەڵێم: (مَنْ دَقَّقَ حَقَّقَ)وە (مَنْ تحصَّل وَصَلَ).

---

[1]- بڕوانە: (الرحلة في طلب الحديث) ص١٩٦.

## ٨- بەبێ زانیاری و شارەزایی‌و قسە نەکردن:

ئەمیش ئەدەب و رەوشتێکی یەکجار گرنگ و گەورەی ئەهلی زانستە چخوێندکار بن چ فێرکار (مُعَلِّمْ)و لەوبارەوە هەم ئایەتی قورئان و هەم قسەی‌زانایانی پێشین زۆرن بۆ وێنە: ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾[1].

واتە: بڵێ بێگومان پەروەردگارم تەنیا گوناهە ناقۆڵایەکانی قەدەغە کردوون، چ ئاشکرا بن چ پەنهان، هەروەها گوناه و دەستدرێژیی بەناهەق، وە کە هاوبەشێك بۆ خوا دابنێن هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردبێتە خوارێ، وە کە شتێك بەناوی خواوە بڵێن کە نایزانن.

وەك دەبینین بەبێ بەڵگەو زانیاری‌و شارەزایی قسەکردن لەبارەی ئایینی خواوە لەڕیزی گوناهە زلە درێوە ئاشکراو پەنهانەکان و تاوان و ستەم و دەستدرێژیی و هاوبەش بۆ خوا دانان...دا دانراوە! بگرە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان رایان وایە کە لەهەموو ئەو خراپەو تاوانانە بەپیسترو بەدتریش دانراوە، چونکە دەڵێن: خوای کاربەجێ ئەو شتانەی لەخوارەوە بۆ سەرێ (مِنَ الأدْنى إِلى الاعْلى) واتە: لەخراپەوە بۆ خراپتر، باس کردوە!!

### زانایانیش لەوبارەوە زۆر شتیان گوتوە، بۆ وێنە:

أ- (إبن جماعة) گوتوویەتی:[2] (إِذا سُئِلَ عَمّا يَعْلَمَهُ، قالَ: لاأعْلَمَهُ، أولا أدْري، فَمِنَ العِلمِ أنْ يقول: لاأعْلَمُ، وعن بَعْضِهِمْ: (لاأدْري نِصْفُ العِلْمِ).

واتە: هەرکاتێك دەربارەی شتێك پرسیاری لێ‌کرا کە نایزانێ، دەڵێ: نایزانم، یان ئاگام لێی نیە، چونکە لەزانیاری‌یە، کە (بەشتێك کە نایزانێ)، بڵێ: نایزانم، وە هەندێکیان گوتوویانە: (نازانم) نیوەی زانیاری‌یە.

---

١- الأعراف: ٣٣

٢- بڕوانە: (معالم في طريق طلب العلم) ص٢٠٥.

ب- هـەروەها ابـن عبـاس (خـوا لێیـان رازی بـێ) گوتوویـەتی:[1] (إذا أخْطـأ العـالِمُ (لاأدْري) أُصـيْبَتْ مَقاتِلُـهُ) واتـە: هـەرکاتێك بابـای زانـا (نـازانم)ی لەبیرچـووەوە، ئـەوە کاریکراوە!

ج- (أبو حامد الغزالي)یش (رەحمەتی خـوای لێبـێ) لـەوبارەوە جوانی گوتـوە[2]: (لوْسكتَ مَنْ لايَعْرِفُ قلَّ الإختِلافُ وَمَنْ قَصُرَ باعُـهُ وضـاقَ نَظَـرهُ عـن كـلامِ عُلمـاءِ الأُمـةِ والإطلاع عليه، فمالَهُ ولِلتكلُّم فيما لايَدْرِيْهِ والدخولِ فيْما لايَعْنيهِ؟! وحَقُّ مثل هذا أن يَلْـزَمَ السُكوتَ).

واتە: ئەگەر هاتباو ئەو کەسەی کە نازانی بێدەنگ بووبایە، راجیایی (إختلاف) زۆر کەم دەبۆوە، ئینجا ئایا کەسێك کە توانای بەسەر تێگەیشتنی قسەی زانایانی ئوممەت دا ناشکێو بۆی دەرك ناکرێ، بۆچی دەبێ قسە لەشتێك بکات کەنایزانێو خۆی لەشتێك هـەڵقورتێنێ کـە پەیوەنـدی پێیـەوە نیـە؟! ئاشـکرایە کـە بابـای وا لەسـەری پێویسـتە بێدەنگ بێت.

د- جارێکیان پیاوێك دەربارەی مەسـەلەیەك پرسـیاری لـە (عمـرو بـن دینـار)کرد، ئەویش وەڵامی نەدایەوە! کابرا گوتی: لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە شتێکم لەدڵدایە وەڵامـم بدەوە، ئەویش گوتی: (إنْ يكُنْ في نَفْسِك مِنْها مِثْلُ أبي قُبَيْسٍ، أحَبُّ إليَّ مِنْ أن يكون فـي نَفْسي مِنْها مِثْلُ الشَّعْرةِ) ئەگەر لەبارەیەوە هێندەی کێـوی (أبـو قبـیس)ت لەدڵـدا هـەبێ، لەلام خۆشترە لەوەی کەمن لەبارەیەوە هێندەی (موو)یەکم لەدڵ دا هەبێ.[3]

### ٩- دەست هەڵنەگرتن لە داواکردنی زانست و هەوڵی بەردەوام بۆ زیادکردنی:

هەرچـەندە پێشـتریش ئاماژەیـەکمان بـۆ کـردوەو لەبەشـی سێیەمیشـدا لـەخاڵی سێیەمدا تیشکێکمان خستۆتە سەری، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئـەمیش بەرەوشـت و ئاکارێکی بنەڕەتیی ئەهلی عیلم دادەنرێ، لێرەشدا دیسان شتێکی لێوە باس دەکەین:

---

١- هەمان سەرچاوە، ص٢٠٥،٢٠٦.

٢- بڕوانە: (الحاوي للفتاوي) ج٢ص١١٦، للسيوطي.

٣- بڕوانە: (الآداب الشرعية) ج٢ص٦٤، ابن المفلح.

خوای پەروەردگار بەپێغەمبەری سەروەری پێغەمبەرانی (سەلامی خوایان لەسەر بێت) فەرمووە: ﴿...وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾[1] ، واتە: وە بڵێ پەروەردگارم زانستم بۆ زیاد بکە!

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (مَنْهومانِ لايَشْبَعانِ: طالِبُ عِلْمٍ وطالِبُ دُنْيا)[2].

واتە: دوو ئارەزوومەند تێر نابن: داواکەری زانیاریو داواکەری ماڵی دونیا.

ئینجا با تەماشایەکی قسەو حاڵ و باڵی هەندێك لەزانایان بکەین لەوبارەوە:

أ- یەکێك لە (سوقراط)ی پرسی: ئەو هەموو زانستەت چۆن دەستکەوتوە؟! ئەویش لەوەڵام دا گوتی: لەسۆنگەی ئەوەوە کە بارتەقای ئەو ئاوە کە تۆ خواردووتەوە (زەیت)م[3] بەکارهێناوە!

ب- وە پرسیار لە (عبدالله بن المبارك المـرْوَزي) کرا: کە ئەگەر دوای مردن زیندووکرابایەوە چیت دەکرد؟! ئەویش گوتی: (أطلبُ العلم حتى يأتيني مَلَكُ الموتِ مَرَّةً ثانيةً) واتە: دوای زانیاری دەکەوتم هەتا بۆ جاری دووەم فریشتەی گیان کێش دەهاتە لام.[4]

ج- وە کاتێك پرسیار لە (الإمام البخاري)کرا لەبارەی چارەسەری لەبیرچوونەوە (نسیان)وە گوتی: (مداومة النظر فی الكتبِ) بەردەوام بوون لەسەر تەماشاکردنی کتێبان[5].

د- وە (ثعلب) کە یەکێکە لەپسپۆڕانی زمانی عەرەبی دەربارەی (إبراهيم الحربي) گوتوویەتی[6]: (ما فَقَدْتُ إِبراهيم الحَربي مِنْ مَجْلسِ نَحْوٍ أو لُغَةٍ خمسين سنة) بۆ ماوەی پەنجا ساڵ هیچ کۆڕێکی رێزمان یان زمانی عەرەبی نەبووە کە (إبراهيم الحربي) تێیدا بەشدار نەبێ!

---

١- طه: ١١٤

٢- رواه البزارُ وصَحَّحَهُ الألباني فی (صحيح الجامع) ج٥ ص٣٧٤.

٣- ئەوکات زەیت لەجیاتی نەوت و مۆم بەکارهێنراوە بۆ رووناکی بەخشین.

٤- بڕوانە: (معالم فی طريق طلب العلم) ص٢٨٠.

٥- هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

٦- هەمان سەرچاوە، ص٢٨١.

## سێیەم: لەبواری پەیوەندی لەگەڵ مامۆستادا:

### ١- ئەدەب و ڕێزلێگرتنی تەواویو پێ لەنەزانینی خۆنان و دان بەزانایی ئەودا هێنان:

بەڵێ ئەمە سەرەکیترین و گەورەترین ڕەوشت و ئەدەبی پێویست و گرنگی قوتابیو فەقێیە لەگەڵ مامۆستاو پێشەوایەکەیدا، چونکە پایەو مەقامی مامۆستایەتی یەکجار بەرزو باڵایەو بابای زاناو پێشەوا لەگەیاندنی زانیارییە شەرعییەکاندا جێگری پێغەمبەری خوایەﷺ، بۆیە پێویستە هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەکانی پێغەمبەرﷺ (خوا لێیان رازی بێ) لەخزمەت پێغەمبەردا چۆن بوون، قوتابییانی زانستە شەرعییەکانیش لەگەڵ مامۆستایەکانیاندا ئاوابن، مەگەر لەو شتانەدا کە تایبەتن بەپێغەمبەرەوەﷺ.

ئینجا بەڕاستی مووسا (سەلامی خوای لەسەر بێ) چاکترین سەرمەشق (أُسْوة)ی قوتابییان و بەدوای زانست دا گەڕاوان (طُلاّب العِلْم)ە لەبواری ئەدەب و ڕێزو حورمەت گرتن لە مامۆستا، با سەرنج بدەین لەگەڵ مامۆستایەکەی (خضر)دا چی گوتوە: ﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴾[١]. واتە: ....جا (مووسا و غوڵامەکەی) بەندەیەك بەندەیەك لە بەندەکانمانیان دۆزییەوە کە لەلایەن خۆمانەوە بەزەییمان پێبەخشیبوو، وە زانیارییەکی تایبەتمان فێرکردبوو. مووسا پێی گوت: ڕێم دەدەی شوێنت بکەوم! بۆ ئەوەی بەشێك لەو زانیارییە بەسوودەی کە فێرت کراوە فێرمی بکەی؟! (بەندە ساڵحەکە) گوتی: ئاخر تۆ ناتوانی لەگەڵم دان بەخۆت دا بگری!

جا چۆن لەبەرانبەر شتێك دا کە پێی شارەزانی خۆت ڕادەگری؟ (مووسا)گوتی: بەڵێن بێ ئەگەر خوا بیەوێ بەخۆڕاگریی دەمبینی، وە سەرپێچی لەهیچ فەرمانێکت

١- الکهف: ٦٥ – ٧٠

ناکەم. (بەندە صاڵحەکە)گوتی: جا مادام شوێنم دەکەوی (بۆ وەرگرتنی زانست) ئەوە هەتا بۆ خۆم لەبارەی شتێکەوە بۆت نەدوێم پرسیارم لەبارەیەوە لێمەکە!

وەك لەم ئایەتەدا دەبینین ئەم ئەدەبە بەرزانەی وەرگرتنی زانست و قوتابێتی لەمووسا پێغەمبەردا(سەلامی خوای لەسەر بێ) دەبینرێن:[1]

أ- ئایا رێم دەدەی شوێنت بکەوم؟! ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ﴾ کە ئەوپەڕی خۆ بەکەمگرتن و ئاتاجی پێشاندان و داواکاریی (إلْتِماس)ی تێدایە!

ب- کە فێرم بکەی....﴿عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ﴾، کە دان هێنان بەنەزانیی خۆو زانیاریی و شارەزایی مامۆستای تێدایە بەڕاشکاوییو بەبێ قۆرت و پێچ و منجەمنج!

ج- بەشێك لەو زانیارییەی کە فێرت کراوە﴿مِمَّا عُلِّمْتَ﴾کە دان هێنانە بەوەدا زانیاری مامۆستا زۆر لەوە پترە کە قوتابییەکە هەمووی بۆ وەربگیرێ، چونکە (مِنْ)ی سەر وشەی (مِمَّا) بۆ (تَبْعیض)ە.

د- لەو زانیارییەت کە بەکەڵکەو راست و نیشانە پێکەوە﴿ رُشْدًا ﴾[2]کە دان هێنانە بەوەدا ئەو زانیاریی و شارەزاییەی لای مامۆستایە زانیارییەکی راست و دروست و جێی متمانەیە!

هـ- پاشان کە بەندە خواپەرستەکە پێی رادەگەیەنێ کە رێی وەدەست هێنانی ئەو زانیارییە تایبەتییەی لای وی رێیەکی دژوارو زەحمەتەو رەنگە نەتوانێ لەگەڵی دان بەخۆدا بگرێو تەحەممول بکات! مووسا (سەلامی خوای لێ بێ) زۆر بەئەدەب و رێزەوە سێ شتی دیکە دەخاتەڕوو:

و- گفتت پێ دەدەم کە خۆڕاگربم ﴿سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا﴾، دیارە خۆڕاگرییش لەگەڵ مامۆستادا گەلێك شت دەگرێتەوەو تایبەت نیە بەشتێك و دوو شتەوە.

---

1- بڕوانە: (تفسیر القاسمی) ج١١ ص٦٢،٦٣.

2- ﴿ رُشْدًا ﴾یان (مفعول به ثانٍ) یان (مفعول لأجله) یان (حال)ە.

ز- ئەگەر خوا بیەوێ ﴿إِن شَآءَ ٱللَّهُ﴾، چونکە بەبێ ئیرادەو ویستی خوا هیچ شتێك ناکرێو نابێو نایەتەدی.

ح- وە سەرپێچیی هیچ فەرمانێکت ناکەم﴿وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا﴾، چونکە مادام وتابی نەزانێو مامۆستا شارەزاو زانابێ، دەبێ هەندێك شت ئەگەر سەریشی لێی دەرنەچێ لەقسەی دەرنەچێ! بەڵام بەمەرجێك ناشەرعییەکی ئاشکرا نەبێ![1]

## ٢- چاك گوێ بۆ مامۆستاگرتن و قسە پێنەبڕینی:

ئەمیش ئەدەب و رەوشتێکی دیکەی گەورەو بنەڕەتییە لەقوتابیانی زانستە شەرعییەکاندا، بەرانبەر مامۆستاو فێرکەران (مُعَلِّمین)یان و، نابێ باباى قوتابیو فەقێ لەکاتی دەرس گوتنەوەی مامۆستادا خۆی بەهیچ شتێکەوە خەریك بکات و دەبێ هەموو بەدەنی ببێتە گوێو چاو!

جا باسەرنجی کۆڕو مەجلیسی دەرسی یەکێك لەزاناو پێشەوایانی پێشینمان بدەین داخۆ قوتابیو دەرس خوێنەکانی لەوبارەوە ئەدەب و ئاکاریان چۆن بووە:

(أحمد بن سنان) گێڕاویەتەوە لەبارەی کۆڕی دەرسی (عبدالرحمن بن مهدي)یەوە گوتوویەتی:[2] (هیچ کەس لەکۆڕی (عبدالرحمن)دا قسەی نەکردوە، وەقەڵەم تیژ نەدەکرا، وەهیچ کەس زەردەخەنەی نەدەکرد، وەهیچ کەس بەپێوە رانەدەوەستا، وەك باڵندەیان لەسەر سەر هەڵنیشتبێ (خۆیان نەدەجووڵاند) یان وەك لەنوێژدابن، وە هەرکاتێك یەکێکی دیتبایە پێکەنیبایە یان قسەی کردبایە، پێڵاوەکانی لەپێدەکردو کۆڕەکەی بەجێدەهێشت!)

دیسان قسە پێنەبڕینی مامۆستاو دەرس بێژیش یەکی دیکەیە لە ئەدەب و رەوشتە بەرزەکانی داواکەرانی زانیاری شەرعیی (طُلاَّب العِلْم الشرعي)، چونکە قسە پێبڕین و قسە لەنێو قسە داکردنی هەرکەسێك پێچەوانەی ئەدەب و رێزەو، بەتایبەتی بەرانبەر

---

١- هەربۆیەش (موسا) (سەلامی خوای لێبێ)، لەبەرانبەر هەرسێك رەفتارە بەرواڵەت ناشەرعییەکاندا نارەزایی دەربڕیوە.

٢- بڕوانە: (معالم في طريق طلب العلم) ص٦٢.

بەزاناو پێشەوایان، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە کەدەبێ ڕێزو حورمەتی تەواو لەزانایان بگیرێ، فەرموویەتی: (لَيْسَ مِنّا مَنْ لَمْ يُجِلَّ كبيرَنا ويَرْحَمْ صَغيرَنا ويَعرِفْ لعالِمنا حَقَّهُ)[1]، واتە: هەرکەسێك ڕێز لەبەساڵداچوومان نەگرێو بەزەیی بەگچکەمان نەیەتەوەو مافی زانایەکانمان نەزانێ و قەدریان نەگرێ)، ئەوە لەئێمە نیە.

هەربۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکیان کە لەگەرمەی وتاردان دا بووەو عارەبێکی دەشتەکیی پرسیاری کاتی هاتنی قیامەتی لێدەکات و دەڵێ: (مَتى السّاعةُ؟!)، ئەویش بۆ تەمبێکردن و ئەدەب دادانی هەتا وتارەکەی تەواو ناکات وەڵامی ناداتەوەو پاشان دەفەرموێ: (أَيْنَ أراهُ السائِلُ عن السّاعةِ؟!)، وە (بخاري)یش ئەو فەرموودەیەی لە (الجامع الصحيح)ەکەیدا لەژێر ناوونیشانی: (باب: مَنْ سُئِلَ عِلْماً وهو مَشْتغِلٌ في حديثِهِ فأتَمَّ الحديثَ)دا هێناوە.[2]

### ٣- ڕێزو ئەدەب نواندن لەکاتی پرسیارکردندا:

ئەمیش یەکی دیکەیە لەڕەوشت و ئاکارە بەرزو پەسەندەکانی ئەهلی زانست بەتایبەت قوتابی لەگەڵ مامۆستایدا، لەوبارەشەوە حەز دەکەم ئەم سەرگوزشتە خۆشە بگێڕمەوە:[3]

(الذهبي) گێڕاویەتەوە کە جارێکیان ئیمام مالیك دەرس دەڵێتەوەو پرسیارێکی لەبارەی (فَرائِضْ)ەوە لێ دەکرێ، ئەویش بەپێی ڕای (زيد بن ثابت)وەڵام دەداتەوە، (إسماعيل ابن بنت السدي)یش دەڵێ (علي وابن مسعود) (خوا لێیا ڕازی بێ) ڕایان چیە؟!

مالیکیش ئاماژە دەکات بەپاسەوانەکان کە بیگرن و (اسماعيل)یش ڕادەکات و نایگەنێ! پاشان پاسەوانەکان بەمالیك دەڵێن: کتێب و مەرەکەبەکەی کەلێی بەجێماون چیان لێبکەین؟! ئەویش دەڵێ: بەنەرمیو ئارامیی بیهێننەوە، جا کاتێك بەدوایدا دەچن لەگەڵیان دەگەڕێتەوە، مالیك پێی دەڵێ: خەڵکی کوێی؟ دەڵێ: کووفە، دەڵێ:

---

١- رواه أحمد والحاكم ورواه الترمذي بلفظ قريب منه.

٢- بڕوانە: (فتح الباري) ج١ ص١٧١.

٣- بڕوانە: (سِيَرُ الأعلام النبلاء) ج١١ص١٧٧.

ئەدی ئەدەبت لەکوێ بەجێهێشتوە؟! دەڵێ: بەس بەمەبستیی بەهرە وەرگرتن وتووێژم لەگەڵت کرد، ئەویش دەڵێ: بێگومان (علي و عبدالله بن مسعود) نکوولّیی لەپایەو فەزڵیان ناکرێ، بەڵام خەڵکی ئەم وڵاتە (لەو مەسەلەیەدا)لەسەر ڕای (زید بن ثابت)ن، وە هەر کاتێکیش لەنێو کۆمەڵێك بووی‌و شتێکی تازەی کەپێی ئاشنانین بۆیان بخەیەڕوو، ئەوانیش هەڵوێستێکت پێشان دەدەن کە حەزی لێناکەی!

## ٤- بەهرە وەرگرتن لەرەوشت و هەڵسوکەوتی مامۆستا وێڕای زانستەکەی:

بێگومان زانایان و مامۆستایان لەخۆدا درەوشێنەرەوەو بەرجەستەکەری زانستەکەیانن، بۆیە لەسەر قوتابییەکان پێویستە کە لەدەرس خوێندن لەلای مامۆستایان، تەنیا ئامانجیان وەرگرتنی زانیارییەکەیان نەبێ، بەڵکو هەوڵ بدەن لە ئەدەب و رەوشت و ئاکاریشیان بەهرەمەند ببن، چونکە دەگونجێ زانیاری (علم) لە کتێبانیشدا دەستگیر ببێ، بەڵام ئەدەب و رەوشتی بەرزو جوان، بەزمانی حاڵ و رەفتار نەبێ وەك پێویست نازانرێ‌و وەك گوتراویشە: (لَيْسَ الخَبَرُ كالمُعايَنَة).

هەر بۆیەش زاناو پێشەوایانی پێشین زۆر کەس کەچۆتە خزمەتیان زیاتر مەبەستی ئەوە بووە لەڕووی ئەدەب و رەوشت و ئاکارەوە تەماشایان بکات و لێیان بەهرەمەند ببێ، ئەوەتا (الأمام السمعاني)دەڵێ[1]: دەوری (٥٠٠٠)کەسێك ئامادەی کۆڕو مەجلیسی (الأمام أحمد) دەبوون، بەڵام تەنیا (٥٠٠) کەسیان دەرسەکەیان دەنووسییەوەو ئەوانی دیکە بەس رەوشت و ئەدەبی لێوە فێردەبوون.

هەروەها (أبوبكر المطوعي) گوتوویەتی[2]: (١٢) ساڵان هاموشۆی کۆڕی (أبو عبدالله)م کرد کە کتێبی (المُسْنَد)ی بەکوڕەکانی دەگوت و هیچم نەدەنووسی بەڵکو بەس تەماشای ئەدەب و ئاکارو ڕەوشتیم دەکرد.



١- بروانە: (سِيَرُ الأعلام النبلاء) ج١١ص٣١٦.

٢- هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

**٥- بەئەدەب و ڕێزەوە ناوی خوای بەرزو مەزن و پێغەمبەرﷺ و هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) زاناو پێشەوایان (خوا لێیان خۆش بێ) هێنان:**

ئەمیش ئەدەب و رەوشتێکی دیکەی گرنگی ئەهلی عیلمە کە لەکاتی ناوهێنانی خوای پەروەردگاردا چاکتر وایە ڕێزو حورمەتی زۆر بەکاربهێنرێو مەگەر چۆن دەنا ناوی (خوا) بەتەنیا نەهێنرێو یان بەیەکێك یان زیاتر لەصیفەتەکانی وەسف بکرێ وەك: خوای پەروەردگار، خوای بەخشندە، خوای بەرزو مەزن...هتد، یان یەکێك لەم وەصفانەی لەگەڵ بگوترێ: (تبارك وتعالى، سبحانه وتعالى، جل جلاله..هتد).

هەروەها لەکاتی ناوهێنانی پێغەمبەری خوادا (رسول الله) موحەممەد کوڕی عەبدوللا ﷺ، یان هەر پێغەمبەرێکی پایەبەرزی دیکەی خوادا (سەلامی خوایان لێبێ) ڕستەی: (صلى الله عليه وسلم) یان (صلى الله عليه وآله وسلم) بگوترێ، وە بەهیچ شێوەیەك بە رەمزو پیت وەك (ص) یان (صلعم) یان (د.خ) نەنووسرێو نەگوترێ.

وەلەکاتی ناوهێنانی هاوەڵان (أصحاب)ی پێغەمبەردا (خوا لێیان رازی بێ) یەکێکیان یان زیاتر ڕستەی: (رضي الله عنه)، (رضي الله عنها) یان ( رضي الله عنهم)... هتد بگوترێ یان بنوسرێ، بەگوێرەی حاڵ و کات و شوێن.

وە لەدەمی ناوهێنانی یەکێك لەزاناو پێشەوایاندا ڕستەی: (رحمه الله) یان (رحمة الله تعالى عليه– عليها) بگوترێ یان بنووسرێ.

شایانی باسیشە کە هەرکام لەو شتانە دەگونجێ بەزمانی عەرەبی یان کوردی یان هەر زمانێکی دیکەش بن و گرنگ ئەوەیە هەمان واتا بگەیەنن.

**١٢- رەوشت و ئەدەبە بەرزەکانی فەقێو قوتابییانی زانستە شەرعییەکان لەبواری پەیوەندیو هەڵسوکەوت لەگەڵ نیزیکەکان و کۆمەڵگادا:**

**خوا پشتیوان بێ ئەم خاڵی دوازدەیەم و کۆتاییە لەدوو برگەی سەرەکییدا دەنووسین:**

**یەك: ئەدەب و رەوشتەکانی قوتابییانی زانیارییە شەرعییەکان لەبواری پەیوەندیو رەفتار لەگەڵ کۆمەڵگادا.**

**دووو: ئـەدەب و رەوشـتـەكانی قوتابیـیـانی زانیاریـیـە شـەرعییـیەكان لـەبواری پەیوەندیو رەفتار لەگەڵ نیزیكانیان دا.**

جـا لەسـۆنگەی ئـەوەوە كـە هـەڵس و كـەوت و رەفتـار لەگـەڵ (نیزیكـان)یش دا دەكەوێتە جوغزی هەڵس و كەوت و رەفتار لەگەڵ (كۆمـەڵگا)وە، هـی كۆمـەڵگا (مجتمـع) پێش دەخەین:

## یـەك: ئـەدەب و رەوشـتـەكانی فـەقێو قوتابیـیـانی زانیاریـیـە شەرعییـیەكان لەبواری هەڵس و كەوت لەگەڵ كۆمەڵگادا:

### ١- سینەی ساف و دڵی ساغ و سەلامەت:

دیارە هەموو موسوڵمانێك پێویستە سینە ساف و بێكینەو غەرەزبێ، چونكە خـوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ٨٨ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ﴾[١] ، ئەو رۆژەی كـە سـامان و كـوڕان سـوودیان نیـە. (بـۆ قوتـاركردنی ئینسـان) مەگـەر كەسـێك بەدڵێكی ساغەوە بێتە لای خوا.

بەڵام بێگومان سینە سافییو دڵسافیی بۆ ئەهلی زانست كەدەیانەوێ دڵ و مێشـكی خـەڵكی رۆشـن و پـاك و چـاك بكـەن زیـاتر پێویسـتە، وەك گوتراویشـە: قسـە لـەكوێی قسـەكەرەوە بێـت دەچـێتە ئـەو شـوێنەی دوێنـراو (مُخاطَـبْ)یشـەوەو، ئاشكراشـە كـە سەرچاوە هەتا روونترو سازگارتر بێت، ئاوەكەیشی وەك خۆی دەبێت!

### ٢- خۆ بەكەم گرتن (تواضع):

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ اللهَ أوحى إِلَيَّ أن تَواضَعوا حتىَّ لايَفْخَر أحدٌ على أحدٍ ولا يَبْغِيَ أحدٌ على أحدٍ)[٢] ، واتـە: خـوا پێـی راگەیانـدووم كـە: خۆتـان بەكـەم بگرن، هەتا هیچ كەس شانازیی بەسەر كەس دا ناكات و هیچ كـەس دەسـتدرێژیی ناكاتـە سەر كەس.

---

١- الشعراء: ٨٨ - ٨٩

٢- رواه مسلم.

(ابن القيم)يش ئاوا پێناسەی (تواضع)ی کردوه[١]: (التواضع: انكِسارُ القَلْبِ للَّهِ وخَفْضُ جَناحِ الذُّلِّ والرحمةِ للخَلْقِ، حتى لايَرى له على أحدٍ فَضلاً، ولايرى لـه عند أحدٍ حقاً بل يَرى الحق له عليهِ) واته: خۆبەکەمگرتن: ملکەچ بوونی دڵە بۆ خواو باڵی نەرم و نیانیی‌و بەزەیی شۆڕکردنە بۆ خەڵکی، هەتا وای لێدێ خۆی پێ لەکەس چاکتر نابێ، وە هەقی خۆی بەسەر هیچ کەسەوە نابینێ بەڵکو خۆی بەقەرزداریان دەزانێ.

## ٣- هێمنی‌و نەرم و نیانی:

ئەمیش یەکی دیکەیە لەئەدەب و رەوشتە پەسەندەکانی ئەهلی عیلم و حیلم لەگەڵ خەڵکیدا، خوای لێبوردەو بەخشندە لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾[٢]. واته: ئەوەی ئاسانە وەری بگرەو فەرمان بەچاکە بکەو پشت لە نەفامان بکە، وە هەرکات لەشەیتانەوە خوتخوتەیەکت توش بوو، ئەوە پەنا بەرە بەر خوا بێگومان ئەو بیسەری زانایە.

(ابن كثير) لەتەفسیری ئەم دوو ئایەتەدا گوتوویەتی[٣]: هەندێك لەزانایان گوتوویانە: خەڵکی بەگشتی دوو جۆرن:

أ- چاکەکار (محسن) ئەوە ئەوەندەی بەئاسانی لەچاکە بۆی دەکرێ لێی وەربگرەو زیاد لەتوانای لێی داوا مەکەو سەغڵەتی مەکە.

ب- خراپەکار (مسيء)ئەویش فەرمانی پێبکە بەچاکەو ئەگەر هەر لەسەر گومڕایی خۆی رۆیشت و لەسەر نەفامیی بەردەوام بوو پشتی تێبکەو ئیهمالی بکە، بەشکم ئەوە پیلانەکەی بپووچێنێتەوە.



١- بڕوانە: (معالم في طريق طلب العلم) ص١٦٦،١٦٧.

٢- الأعراف: ١٩٩ - ٢٠٠

٣- بڕوانە: (تفسير ابن كثير) ج٢ ص٢٨٩،٢٩٠.

منيش دەڵێم: ئەگەر هەر بەردەوامیش بوو، یان حاڵەتێکی هەڵچوونت بۆ دروست بوو، ئەوە بێگومان خوتخوتەو دنەدانی شەیتانەو پەنای لێ بەخوا بگرە، چونکە خوا هەم بەفێڵی وی زاناو ئاگادارەو، هەم بۆ پاڕانەوەو پەنا پێبردنی تۆش بیسەرە.

دەگێڕنەوە[1] جارێك پیاوێك لەگەڵ (الأحنف بن قیس)دا دەبێتە مشت و مڕی و بە (الأَحْنَفْ) دەڵێ: ئەگەر قسەیەکم پێ بڵێی دە قسان دەبیستی! (الأَحْنَفْ)یش دەڵێ: بەڵام ئەگەر تۆ دە قسەشم پێ بڵێی قسەیەکم لێ نابیستی!!

## ٤- روو گەش بوون و قسە خۆش بوون لەگەڵ خەڵکیو سینگ فراوانیی و لێزانیی بۆ چارەسەری گرفت و ناڕەحەتییەکانیان:

ئەمیش یەکی دیکەیە لە ئەدەب و رەوشتە گەورەو گرنگەکانی ئەهلی عیلم لەگەڵ خەڵکیداو پێشینە چاکەکانمان وا بوون، بۆیە چاك و خراپ و دوورو نیزیك لێیان بەهرەمەند بوون.

بۆ وێنە: لەوەسفی ئیمام مالیك دا گوتراوە: (كان الإمام مالك رحمه الله تعالى يأتي المَسْجِدَ فَيَشْهَدُ الصَّلَوات والجمعةِ والجنائزِ ويَعودُ المَرْضى ويَجْلِسُ في المَسْجِدِ فَيَجْتَمِعُ إليه أصْحابُهُ) واتە: ئیمام مالیك (رەحمەتی خوای لێبێ) عادەتی وابوو دەچووە مزگەوتیو پێنج نوێژە فەرزەکان و جومعەو نوێژی جەنازانی دەکرد، وە سەردانی نەخۆشانی دەکردو لەمزگەوتێ دادەنیشت و هاوەڵەکانی لەدەوری کۆدەبوونەوە.[2]

هەروەها لە وەسفی (عمرو بن الحارث المصرى)دا گوتراوە: (كان يَخْرُجُ مِنْ دارهِ فَيرى الناسَ صُفوفاً يَسْأَلُونَهُ عن القرآنِ والحديثِ والفقه والشعرِ والعربية والحساب)[3].

واتە: عادەتی وابوو کەلەماڵێ دەچووە دەرێ، دەیبینی خەڵك بەچەند ریزێك وەستاون دەربارەی قورئان و سوننەت و شەرع و شیعرو زمانی عەرەبی و ژمێرە پرسیاریان لێدەکرد.



---

١- بڕوانە: (سِيَرُ الأعلام النبلاء) ج٤ص٩٣.

٢- هەمان سەرچاوە ج٨ص٦٤.

٣- هەمان سەرچاوە ج٦ص٣٥٣.

٥- خۆپاراستن لەهەموو ئەو شتانەی کە زیان بەپیاوەتیی‌و جوامێریی (مروءة)[1] دەگەیەنن:

ئەهلی زانست چ مامۆستا بن چ قوتابی پێویستە لەلووتکەی پیاوەتی‌و شەهامەتدا بن وە خۆیان و لە وردو درشتی ئەو شتانە بپارێزن کە پێچەوانەی جوامێریین و زیانی پێدەگەیەنن.

جا بێگومان ئەو شتانەش کە زیان گەیەنەر (مخل)ن بەپیاوەتیی‌و جوامێریی زۆرو جۆراوجۆرن و عورف و باوی خەڵك و کۆمەڵگاش دەوری زۆری هەیە لەدیاریکردونیانداو، هەندێکیان لەکات و شوێن و ژینگەکەیەوە بۆ یەکی دیکە دەگۆڕێن.

(الامام الشافیعی)یش لەوبارەوە جوانی گوتوە[2]، (رەحمەتی خوای لێبێ): (واللهِ لَوْ عَلِمْتُ أن الماء البارِدَ يَثْلِمَ مِنْ مُروُتي شيئاً ما شَرِبْتُ إلا حاراً) واتە: بەخوا ئەگەر بزانم ئاوی سارد هیچ لەکەسایەتیی و پایەم کەچ دەکات، تەنیا ئاوی گەرم دەخۆمەوە.

٦- راپەڕاندنی کاروباری خەڵک‌و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانیان:

بەدەم خەڵکەوە چوون و بەتەنگەوەبوونیان و دەستبار بۆ گرتنیان، یەکێکە لەڕەوشت و ئەدەبە گەورەکانی هەر مسوڵمانێك بەگشتی‌و بەتایبەت ئەهلی زانست، کە بێگومان دەبێ دڵسۆزترینی خەڵکی بن بۆ خەڵکی.

پێغەمبەر لەوبارەوە فەرموویەتی: (إشْفَعوا تُؤْجَروا)[3]، واتە: تکاو داوا بۆ خەڵکی بکەن پاداشتتان دەدرێتەوە.

(نووي) (رەحمەتی خوای لێبێ) لەکتێبی (الأذكار)دا گوتوویەتی[4]: (يُستحبُّ الشفاعة إلى وُلاةِ الأمْرِ وغيرهم مِنْ ذي الحقوق، مالم تكنْ في حَدٍ أو في أمْرٍ لايَجُوزُ تَرْكُهُ... ففيه حَثٌّ على الشفاعة و دلالة على عِظَمِ ثوابِها والأمْرُ للنَّدْبِ ورُبَّما يَعْرِضُ لَهُ مايُصَيِّر الشفاعة واجبة) واتە: سوننەتە داواو تکا بۆ خەڵکی لەلای کاربەدەستان و هەر خاوەن

---

١- وشەی (مروءة) لەکوردیدا، هەرکام لە: (کەسایەتیی)، (پلەپایە)، (پیاوەتیی) (جوامێریی) دەگرێتەوە.

٢- بڕوانە: (مناقب الشافعي) للرازي ص٨٥.

٣- رواه البخاري.

٤- بڕوانە: (فیض القدیر) ج١ص٥٢٥.

مافێکی دیکەش، بەڵام بەمەرجێك نەبێتە مایەی وەستاندنی سزایەکی دیاریکراوی شەرعیی، یان نەکردنی شتێك کە پێویست بێ بکرێ...جا ئەم فەرموودەیە هاندانی بۆ تکارکردنێ تێدایە، وە پێشانی دەدات کە پاداشتی چەند گەورەیە، بەڵام لێرەدا فەرمانەکە بۆ سوننەتەو جاری واش هەیە شتێك دێتە گۆڕێ کەتکاکردنەکە پێویست دەکات.

هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (مَنْ نَفَّسَ عن مؤمنٍ كُرْبةً مِنْ كُرَبِ الدنيا، نَفَّسَ الله عنهُ كُرْبةً مِنْ كُرَبِ يوم القيامةِ، ومَنْ يَسَّر على مُعسرٍ يسَّر الله عليه في الدنيا والآخرة...)[1]. واتە: هەرکەسێك خەمێکی دنیا لەبڕوادارێك بڕەوێنێ، خوا خەمێك لەخەمەکانی ڕۆژی قیامەتی لێ دەڕەوێنێ، وە هەرکەسێك گرفتی بابایەکی گرفتار ئاسان بکات، خوا گرفتی دونیاو قیامەتی بۆ ئاسان دەکات...

## ٧- بڵاوکردنەوەی زانست بەپێی بۆ لوان و بەکارهێنانی شێوازی روون و ئاسان و خەفتان لەتێگەیاندنی بەرانبەر، نەك دەرخستنی زانیاریو شارەزایی خۆ:

خوای پەروەردگارو کاربەجێ فەرمانی بەپێغەمبەرانی پایە بەرزی کردوە (سەلامی خوایان لەسەر بێ) کە بەڕوون و راشکاویی خەڵك بدوێنن و راستیەکانی ئایینی خوایان تێبگەیەنن:﴿ ....وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾[2].

زاناو پێشەوایانی پێشینیشمان لەگەڵ زانیاری قووڵ و ڕۆچوویان دا شێوازیان یەکجار روون و ئاسان و بێگرێو گۆڵ بووە، بەپێچەوانەی شێوازی زۆر لەزانایانی پاشین کە زیاتر ویستوویانە زانایيو شارەزایی خۆیان بخەنەڕوو![3]

---

١- رواه مسلم.

٢- النور: ٥٤

٣- بۆ وێنە: تەفسیری (البیضاوي)و (مختصر المعاني)ی (التفتازاني)و (جمع الجوامع)، (السبكي) سێ نموونەی ئەو جۆرە کتێب و بەرهەمانەن، دیارە ڕستەی: (کە زیاتر ویستوویانە زانیاریو شارەزایی خۆیان بخەنەڕوو) لەگەڵ (إخلاص)یان دا ناکۆك نیە، بەڵام (إصابة)ی تێدا نیە.

(الأصمعي) گوتوویەتی[1]: (كنتُ إذا سَمِعتُ أبا عمرو بن العَلاءِ يتكلَّمُ ظَنَنْتُـهُ لايَعْـرِفُ شَيْئاً كان يتكَلَّمُ كلاماً سهْلاً) واتە: کاتێك گوێم لـە (أبـو عمـرو بـن العـلاء) دەبـوو قسـەی دەکرد پێم وابوو هیچ نازانێ، زۆر بەڕوونیی و ئاسانی قسەی دەکرد.

شایانی باسیشە کە (أبو عمـرو بـن العـلاء) مامۆسـتای قورئـان خوێنـەکان و زمـانی عەرەبیش بووە![2]

## ٨- وریـابوون لەپڕوپاگەنـدەو واتـە وات (قيـل و قـال)و بەرەنگاربوونـەوەی شەرعیـیانە:

ئـەمیش ڕەوشــت و ئاکـارێکی دیکـەی پەسـەندو پێویسـتی قوتابیـیـانی زانیاریـیـە شەرعیـیەکانە، کە لەبەرانبەر قسەو قسـەلۆك و بانگەشـەکاندا زۆر هۆشـیارو بێدار بـن و بەدوای هـەموو فیکەیـەك نەکـەون و لەچـاڵی هـەر پڕوپاگەندەیـەك نەکـەون، پێغەمبـەری خواش فەرموویەتی: (كَفى بالمَرْءِ كَذِباً أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ ماسَمِعَ)[3]، واتە: ئینسان ئەوەندەی درۆکردن بەسە کە هەرچـیـەك بیستی باسی بکات و بیگێڕێتەوە، جا بێگومـان هـەرجۆرە بانگەشە (دعايە)یەك هۆشیاریی لەبەرانبـەردا پێویسـتە، بـەڵام ئەگـەر بێـت و پەیوەنـدی بەزاناو پێشەوایان و ئەهلی زانستەوە بێ، پێویست ترە، چـونکە بێگومـان مـادام زانایـان پلەپایـەیان بــەرزترە: ﴿...يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾[4]، دیـارە لێوریـابوونی ڕێـزو حورمەتیشـیان گـرنگترو پێویسـت تـرە، زۆر جوانیش گوتراوە: (إن لحوم العلماء مسمومة).

ئینجا ئاشکرایە کە قسەو زمان جووڵاندنیش بەباری خێرو شەڕدا، زۆرسێنایەو هیچی تێناچـێ، بـەڵام بێگومـان شـوێنەوارو کاریگـەریی، چـاك یـان خراپـی یـەکجار زۆرەو زۆر حەیف و گوناح وستەمیشە کە زاناو پێشەوایەکی ئیسلام بەچەند وشەو رستـەو تـەعبیری بابایـەکی نـەزان یـان دڵـڕەش یـان بەهەڵەداچـوو برینـدار بکرێـو، لەبەرچـاو خـەڵکی

---

١- بڕوانە: (سِيَرُ الأعلام النبلاء) ج٦ص٤١٠.

٢- هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٤٠٧.

٣- رواه مسلم

٤- المجادلة: ١١

ببێزێنرێـو، کەسـانێکی زۆر لـەزانیاری و بەرهـەمی سوودبەخشـی بێبـەش (محـروم) بکرێ!![1]

## ٩- شێوازی بەرزو جوان لەکاتی وتووێژو مشت و مڕدا:

ئەهلی عیلم پێویستە لەدەمی موناقەشەو وتووێژدا چەندان ئـەدەب و یاسـای گـرنگ ڕەچاو بکەن، چونکە لەکاتی تێك گیراندا ئینسـان زۆر وریـا نـەبێ گیرۆدەی هەڵـەو پەڵـە دەبێ.

ئەمەش چەند ئەدەب و یاساو ڕەوشتێك، کـە پێویسـتە ئـەهلی عـیلم لـەدەمی گفـت وگۆو مشت ومڕی زانستیـیانەدا ڕەچاویان بکەن:

أ- دەبێ تاکە ئامانج و پاڵنەری ڕەزامەندیی خواو ئاشکرابوونی هەق و ڕاستیی بێت.

ب- پێویستە دەربارەی ئەو بابەتـەی کـە لێیـەوە دەدوێن و شـارەزایی هـەبێو تفـەنگ بەتاریکیـیەوە نەنێ.

ج- پێویســتە بــەر لەدەســت پێکردنــی موناقەشــەو لەمیانــە (خلال)ی‌ــداو پــاش تەواوبوونیشی، ڕووحی برایەتیو خۆشەویستیو ڕێز لەیەکترگرتن بڵاو بکرێتەوە.

د- دەبێ خۆی کۆنترۆڵ (ضبط)بکات و لەهەڵچوون و توڕەبوون و قسـەو تـەعبیری زبـرو ڕووشێنەر خۆی بپارێزێ.

هـ- پێویستە هـەرکاتێك بەرانبەرەکـەی هـەقی لـەلا دەرکـەوت، بـێ سـێو دوو لام وجـیم بیسەلمێنێو مەدح و ستایشیشی بکات و لێی مەمنوون بێت.

و- هـەرکاتێك بەسـەر بەرانبەرەکەیـدا سـەرکەوت و دەرکـەوت کـە هـەقی لەلایە، نـابێ بەهیچ شێوەیەك لەخۆی بایی بێت و خۆی هەڵکێشێو بەرانبەرەکەی تەریق بکاتەوە.

---

[1]- چەند بێجێو ناقۆڵاو دوور لە ئەدەبە کەڵەپیاوی وەك (حسن البنا) بە (مبتدع)و، بلیمەتی وەك (أبو الأعلى المودودی) بە (رافضي)، ناوبنرێن و بە (في ظلال القرآن)ی (سید قطب) بگوترێ (في ضلال)! وە نووسەری وەك (یوسف القرضاوي) بە (الکلب العاوي) دابنرێ!!

تێبینی: (إسکات الکلب العاوي) ناوی بەشێکە لـەکتێبێکی (شـیخ: مقبـل بـن هـادي الـوادعي) کـە دژی (أسـتاذ یوسف القرضاوي)یـەو بەرپەرچی هەنـدێك لەبیروڕایـەکانی دەداتـەوە، جـا بێگومـان قسـە لەسـەر یـەکترکردنی زانایان هەر بووەو شتێکی ئاسایییە، بەڵام ناوو ناتۆرەو جنێودان پێچەوانەی ئەدەبی سەلەفی صالحە!!

ز- هەركاتێك بەرانبەرەكەی هەقی سەلماندو وەریگرت و گەڕایەوە، دەبێ زۆر سوپاسی بكات و مەدح و ستایشی بكات و حورمەت و ڕێزی لەلای زیاد بكات.

ح- دەبێ هەركاتێك هەڵەو لاوازییەك لەقسەو بەڵگەكانی خۆیدا بینی كە بەرانبەرەكەی هەستی پێنەدەكرد، یان بەڵگەیەكی دەزانی بۆ بیروڕای بەرانبەرەكەی كە ئەو نەیدەزانی، یەكسەر بیخاتەڕوو و نەهێڵێ هەواو ئارەزووی بەسەر ویژدان و ئیمانیدا زاڵ بێ.

ط- هەركاتێك هەستی كرد كە بەرانبەرەكەی نایەوێ هەق بدۆزێتەوەو هەرچۆن بێ هەر لەسەر قسەو رای خۆیەتیو هیچ ناسەلمێنێ، دەرگای وتوویژو مشت و مڕ دابخات و كۆتایی پێ بهێنێ، مەگەر بەرانبەرەكەی بابایەكی نامسوڵمان یان خاوەن بیدعەت بێت و پێویست بێ دەمكوت و بێ قسە بكرێ، ئەوە حوكمێكی دیكەی هەیە.[1]

## دوو: ئەدەب و ڕەوشتەكانی قوتابییانی زانیارییە شەرعییەكان لەبواری پەیوەندیو ڕەفتار لەگەڵ نیزیكانیان دا:

مەبەستم لە (نیزیكان) لێرەدا ئەم چوارەن:

١- دایك وباوك

٢- هاوسەرو خێزان

٣- هاوەڵ ودۆست

٤- قوتابییەكان



جا با بەكورتی تیشك بخەینە سەر چۆنیەتی پەیوەندی و هەڵس وكەوتی خوێندكارو فەقێی زانستە شەرعییەكان لەگەڵ هەركامێكیان دا:

### ١- دایك و باوك

دیارە لەبارەی ڕێزو حورمەت گرتنی باب و دایك و دڵڕاگرتنیان و بەقسەكردنیان، دەقی قورئان و سوننەت زۆر زۆرن، بۆ نموونە:

---

١- بڕوانە: (معالم في طريق طلب العلم) ص ٢٣٩تا٢٤٤، بەتۆزێك دەستكارییەوە لێم وەرگرتوە.

أ- ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا﴾[1].

واته: وه پەروەردگارت بڕیاری داوه کە جگە لەوی (هیچ شتێك) نەپەرستن، وه چاکە لەگەڵ باب و دایکتان دا بکەن، جا ئەگەر هات یەکێکیان یان هەردووکیان لەلات بەساڵداچوون ئەوه پێیان نەڵێی (ئۆف)[2] وه تێیانەوه مەخوڕه، وه بەڕێزەوه قسەیان لەگەڵ بکە. وه باڵی گەردن کەچ‌یان لەڕووی بەزەییەوه بۆ شۆڕبکەوەو بڵێ: پەروەردگارم رەحمیان پێبکە، وەك چۆن بەگچکەیی بەخێویان کردووم.

ب- (عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: قلت يا رسول الله أي العمل أفضل؟! قال: الصلاة على وقتها، قلت: ثم أي؟! قال: بر الوالدين، ثم أي؟ قال: الجهاد في سبيل الله...)[3].

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ چاکە لەگەڵ باب و دایکی پاش نوێژکردن لەکاتی خۆیدا، بەچاکترین کردەوه داناوەو خستوویەتە پێش جەنگ وجیهادیشەوه.

ج- (عن عبدالله بن عمرو بن العاص (رضي الله عنه) قال: قال رجل للنبي ﷺ: أُجاهِدُ؟ فقال النبي ﷺ: لك أبوان؟ قال: نعم، قال: ففيهما فجاهد)[4].

واته: پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ گوت: جیهاد بکەم؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: باب و دایکت هەن؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دەجا لەوان دا جیهاد بکە. (کە مەبەست خزمەت کردنیانە).

## ئینجا با سەرنجێکی هەڵوێست و رەوشتی زانایانیش بدەین لەوبارەوه:[5]

---

١- الإسراء: ٢٣ - ٢٤

٢- وشەی (أُف) لەزمانی عەرەبیدا بە (کلمة ضجر): وشەی بێزاری دەربڕین، تەفسیرکراوه، لەزمانی کوردیش دا هەر بەتەعبیری (ئۆف!)و بۆ هەمان مەبەست بەکاردێ.

٣- رواه البخاري ومسلم.

٤- متفق عليه.

٥- بڕوانە: (معالم في طريق طلب العلم) ص٢٣٢تا ٢٣٥.

* کاتێ دایکی (إیاس بن معاویة) مرد، گریا، پێی گوترا: بۆچی دەگری؟! گوتی: دوو دەرگای ئاوەڵام بەرەو بەهەشت هەبوون، ئێستا یەکیان داخرا.

* وە (حیاة بن شریح)کە یەکێکە لەپێشەوایەکانی مسوڵمانان جاری وا هەبوو دادەنیشت بۆ زانیاری فێری خەڵکی کردن و دایکی دەیگوت: (حیاة) هەڵسە (جۆ)ی بدە بەمریشکەکان! یەکسەر هەڵدەستاو دەرسەکەی بەجێدەهێشت!

* وە (محمد بن المکندر) گوتوویەتی: (عمرة)ی برام شەوی بەشەونوێژ بەسەربردو منیش لاقی دایکمم دەشێلا، بەڵام شەوەکەی خۆم بەهی وی ناگۆڕمەوە.

* وە (الذهبي) ماوەیەك لەلای یەکێك لەزانایان ماوەتەوەو پاشان گەڕاوەتەوە ماڵ و گوتوویەتی: گفتم بەبابم داوەو سوێندم بۆ خواردوە کە چوار مانگ زیاترم پێ نەچێ دەترسم دڵی لێم بئێشێ!

کەواتە: با قوتابییانی زانستە شەرعییەکان بەر لەهەموو کەس بزانن کە هەق و مافی باب و دایکیان زۆر گەورەو قورسەو نابێ وابزانن هەر لەبەرئەوەی سەرگەرمی فێربوونی زانستن، لەهەموو هەق و مافەکانی دیکەی خەڵکی عەفو کراون! بەڵکو دەبێ بزانن ئەرکیان گرانترە.

## ٢- هاوسەرو خێزان:

پاش دایك و باب هەقی هاوسەرو خێزان لەهی هەموو کەس لەپێشترەو پێویستە قوتابی زانستەشەرعییەکان – ئەگەر ئەرکی ماڵ و خێزانی بەملەوە[١] بوو بوو– زۆر ئاگاداری هەق و مافەکانیان بێت بەتایبەت لەڕووی فێرکردن و پەروەردەکردونیانەوە، خوای دادگەریش لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَا ﴾[٢]، واتە: وە فەرمان بەخێزانت بکە بەنوێژکردن و لەسەریشی خۆڕاگرو پشوو درێژبە ... هەروەها فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ... ﴾[٣]،

١- ئەگەر ناچاری نەبێ وا باشە هەتا زانیاریو شارەزاییەکی باش پەیدا نەکات خۆی گیرۆدەی ئەرکی قورسی ماڵ و خێزان و بەڕێوەبردن نەکات.

٢– طه:١٣٢

٣– التحریم: ٦

واتــە: ئــەی ئەوانــەی ئیمانتــان هێنــاوە! خۆتــان و خێزانتــان لــەئاگرێك بپــارێزن کــە سووتەمەنیيەکەی مەردوم و بەردە..!

### ٣- هاوەڵ و دۆست:

دیارە بناغەی پەیوەندی رەفتار لەگەڵ دۆست و رەفیق و برادەر بریتییە لەبرایەتیی (الأُخُـوَة)، برایەتییەك کەلەسەر بناغەی ئیمان بنیات نراوە: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾[1] ، جا پێویستە بابای خوێندکاری زانیاری شەرعیی زۆر بەجیددیی هەق و مافەکانی برایەتیی ئیمانیی لەگەڵ تێکڕای مسوڵمانانیدا جێبەجێ بکات، بەڵام بەتایبەت دۆست و هاوەڵەکانی کە بێگومان هاوڕێ وتابیيەکانی لەپێش هەموویانەوەن.

دیارە هەق و مافەکانی برایەتیی (أخوة)یش زۆرو جۆراوجۆرن، بەڵام پێم وایە یەك ڕستە هەموویان کۆدەکاتەوە، کە بریتیە لە:

((قازانج و زیان و خۆشیيو ناخۆشیی براو خوشکانت پێ وەك هی خۆت بێ))

ئنجا ئەم بنچینەیەش لەفەرموودەیەکی بەپێزی پێغەمبەری بەڕێزﷺ وەردەگیرێ کە فەرموویەتی: (لايُؤْمِنُ أحدكُمْ حتى يُحِبَّ لأخيهِ مايحب لِنَفْسه)[2].

واتـە: یـەکێکتان ئیمـان نـاهێنێ، تـاکو چـی بـۆ خـۆی پێـی خۆشـە بـۆ براکـەی (وخوشکەکەی)یشـی پێـی خـۆش نـەبێت ئینجـا دیـارە چـەمکی پێچـەوانەی (مفهـوم المخالفة)یشی هەر ڕاستە: (یەکێکتان ئیمان ناهێنێ تاکو چی بۆخۆی پێی ناخۆشە بۆ براو (خوشك)یشی پێی ناخۆش نەبێ).

شایانی باسیشە کە نەخۆشی ئیرەیی (الحسد) پیسترین و بەزەڕترین نەخۆشیيو دەردە کە تووشی درەختی برایەتیی دێت و کرمۆڵی دەکات.

بۆیە پێویستە قوتابیيو خوێندکارانی زانستە شەرعیيەکان زۆر ئاگاداری خۆیان بن و گیرۆدەی ئەو دەردو نەخۆشیيە پیس و کوشندەیە نەبن، هەرکاتێك توشیش بوون

---

١- الحجرات:١٠

٢- متفق عليه عن أنس (رضي الله عنه).

هەوڵ بدەن بەزوویی خۆیانی لەچنگ قوتاربکەن و بەیەکێك یان زیاتر لەم ڕێیانە خۆیان چارەسەر بکەن:

أ- دووعا بۆکردن و بۆ پاڕانەوەی بابای حەسوودیی پێبراو (الشخص المحسود)بە پەنهانیی (عن ظهر الغیب)، چ شتێکی بۆ دونیاو دواڕۆژی بەباش و پەسەندی دەزانێو بۆی لەخوا داوا بکات.

ب- تۆبزیی لەخۆی بکات- واتە بابای حەسوود (حاسد)- کە بە چ شتێك لەلای بابای حەسوودیی پێبراو خۆشەویست دەبێ، لەقسەو ڕەفتار لەگەڵی ئەنجام بدات.

ج- باس کردنی سیفەتە باشەکانیو سەردان و هاموشۆکردنی.

د- ڕێگا نەدات هیچ کەس لەکۆڕو مەجلیسی ویدا باسی بکات و زەمی بکات.

ه- ڕێز لێگرتنیو پێش خۆخستن و ڕاوێژپێکردنی.

جا بێگومان لەسەرەتاوە هەرکام لەم شتانە قورس و زەحمەتن، بەڵام دوایی وردە وردە ئاسان دەبن و زۆرجاریش دەرمانی تاڵ و ناخۆش دەبێتە مایەی چارەسەرو بنبڕکردنی دەردو نەخۆشیو، پاشان وێڕای تاڵییو تفتیی و ناخۆشیشی شیرین و خۆش دێتە بەرچاو!

## ئەمەش چەند هەڵوێستێکی زاناو پێشەوایانمان لەو بوارەدا[1]

* (إمام أحمد) جارێکیان باسی (إسحاق بن راهویە)ی کرد، مەدحی کردو گوتی: (لَمْ يَعْبرْ الجِسْرَ الى خُراسان مثلُ إسحاق، وإنْ كان يُخالِفُنا في أشياءَ، فأنّ النّاسَ لَمْ يزلْ يُخالِفُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً)، (ڕەحمەتی خوا لە ئەحمەدو ئیسحاق بێت).

* (عمر بن الخطاب) (خوا لێی ڕازی بێ) جاری وا هەبوو پرسیاری لە (علي بن أبي طالب) (خوا لێی ڕازی بێ) دەکرد لەگەڵ ئەو هەموو پلەوپایەو زانستەشیدا! وە (ابن القیم) لە (الروح)[2]دا باسی کردوە کە دەربارەی سێ مەسەلان پرسیاری لە (علي) کردوە.

* (سعد بن أبي وقاص) و (خالد بن الولید) (خوا لێیا ڕازی بێ) دەمەقاڵەیەکیان بوو بوو، کابرایەك چووە لای (سعد)و بەخراپە دەربارەی (خالید) دوا، ئەویش پێی گوت: (مَهْ! إنَّ مابَيْنَنا لَمْ يَبْلُغْ دِيْنَنا) وس بە: ئەوەی لەنێوانماندایە نەگەیشتۆتە دینمان!

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ص١٠١تا ١١٠.

٢- بروانە کتێبی (الروح) ج١ص٢٣٥.

* جارێكیان یەكێك لەو زانایانەی كە زۆر دژایەتی (ابن تیمیة)ی دەكرد مردو پیاوێك هاتە لای وەك موژدە پێی ڕاگەیاند كە فلانە كەس مردوە! ئەویش لە كابرا توڕەبوو گوتی: (أَتُبَشِّرُني بِمَوتِ مُسْلِمٍ؟! هذا لایرضی بهِ الله، ولا مَنْ كان فیه حُبٌ للإسلام والمسلمین)، ئایا موژدەی مردنی مسوڵمانێكم دەدەیە؟! ئەمە نەخوا پێی ڕازییە، نەهەركەسێك كە ئیسلام و موسوڵمانانی خۆش بوێن، پاشان (ابن تیمیة) چووە ماڵی ئەو زانا كۆچ كردوەو سەلامی لێكردن‌و پێی گوتن: من وەك بابتان وام -واتە بۆ هەر كارو پێویستییەكتان-.

## ٤- قوتابییەكانی:

بابای خوێندكارو داواكەری زانیاری شەرعیی (طالب العلم الشرعي) هەم وەك عیبادەتێك و هەم بۆ زیاتر لەدڵ و مێشك دا چەسپاندنی ئەو زانیارییەی كە وەریگرتوە، وا پەسەندە كە كەم و زۆر قوتابیی‌و فەقێی لەخۆی بەرە ژێری هەبن و دەرسیان پێبڵێ.

جا پێویستە لەگەڵ قوتابیی‌و شاگردەكانیدا ئەم ئەدەب و ڕەوشتانە ڕەچاو بكات:

أ- وێڕای دەرس و زانست پێگوتن، هەمیشەش سەرگەرمی ئامۆژگاریی‌و ئاڕاستەكردن و پەروەردەیان بێ.

ب- بەسەر هەڵەو كەم وكوڕییەكانیاندا بازنەدات و بۆیان ڕاست بكاتەوەو لێیان بپرسێتەوە.

ج- بەگوێرەی تواناو بۆلوانی ئاگاداری ژیان و گوزەرانیان بێت و بەدەمیانەوە بچێ.

د- لەماڵەكانیان سەردانیان بكات و هەواڵیان بپرسێ، بەتایبەت لەكاتی نەخۆشیی‌و گرفتێك دا.

هـ- زۆر وریا بێت لەو وردە شتانەی كە دەبنە مایەی كەم بوونەوەی هەیبەت و دابەزاندنی كەسایەتیی، وەك زۆر قسەی خۆش و نوكتە باس كردن!

و- بەدەم دەعوەتكردونیانەوە چوون.

ز- هاندانی بەردەوامیان لەسەر پەیداكردن و داواكردنی زانست و پێدا قووڵبوونەوەی.

ح- بەڕێزەوە گوێگرتن بۆ تێبینیی‌و پێشنیارو ڕەخنەكانیان و وەرگرتنی هەرچی هەق و ڕاستەو، ڕوون كردنەوەی ئەوەی كە ناڕاست و هەڵەیە.

**لەكۆتاییدا:**

حەز دەکەم وەك (ختامه مسك) کۆتـایی ئـەم باسـی (چـەند ئـەدەب و رەوشـتێکی پێویست بۆ قوتابىیانی زانسته شەرعییەکان) بەم قسەیەی (عبدالله بـن مسـعود) (خـوا لێی رازی بێ) بهێنم:[1]

(يَنْبَغي لِحامِلِ القُرآن أنْ يُعْرَفَ بلَيلِهِ اذا النّاسُ نائمونَ، وبِنَهارِهِ اذا النّـاسُ مُفْطِـرونَ، وَبَوَرْعِهِ اذا الناسُ يخلطـون، وبِتواضُـعِهِ إذا النـاسُ يَخْتـالُون، وبِحُزْنِـهِ إذا النـاّسُ يَفْرَحـونَ، وبِبُكائِهِ إذا النّاسُ يَضْحكون، وبِصُمْتِهِ إذا النـاّسُ يَخوضون).

واتە: پێویستە هەڵگری قورئان بەشەوگاری (کە شـەونوێژی تێـدا دەکـات) بناسـرێ لەکاتێکدا کە خەڵکی خەوتوون، وە بەرۆژگاری (کەتێیدا بەڕۆژووە) لەکاتێکدا کە خـەڵکی تێیدا بێ ڕۆژوون، وە بەخۆپاراسـتنی لەحـەرام لەکاتێکـدا کـە خـەڵکی (حـەڵاڵ و حـەرام) تێکەڵ دەکەن، وە بەخۆ بەکەمگرتنی لەکاتێکدا کـە خـەڵکی بـەفیزو کەشـخە دەڕۆن، وە بەغەم وپەژارەی لەکاتێکدا کە خەڵکی دڵخۆش و بەکـەیفن، وە بـەگریانی دا کـە خـەڵکی پێدەکەنن، وە بێدەنگیی لەکاتێکدا خەڵکی وەنێو (زەلکاوی) قسان دەکەون.

جا منیش هەر لەسەر ڕچەی (عبدالله) (خوای لێ‌رازی بێ) دەڕۆم و دەڵێم:

وە بەڕووگەشییو قسەوگفت خۆشیی لەکاتێکدا کە خەڵکی مۆن و مـرچ و ڕووگـرژن و جۆرەهـا وشـەو قسـەی بێنەزاکـەت دەپـرژێنن، وە بەچـاوتێرییو دەسـت کراوەیـو بەخشـندەیی لەکاتێکـدا کـە خـەڵکی دڵکـوێرو بەرچـاوتەنگن و چـنگ دەقووچـێنن، وە بەهێمنیو لێبوردەییو دڵگەورەیی لەکاتێکدا کە خەڵکی تەنگەپرێسکەو تـووڕەو تۆسـنن و دەپـرتێنن و دەبـۆڵێنن، وە بەئازایـەتییو خۆڕاگریـو نەلەخشـاویی، لەکاتێکـدا کـە خـەڵکی ترسـنۆکن و بەهەڵپـەن و دۆستانیشـیان دەتـۆقێنن، وە بەڕاپـەڕین و هەڵسـانیان لەحاڵێکدا کە خەڵکی لەنائومێدییان دەست لەئەژنۆیان وەردێنن، وە بەمشـوور خـواردن و بەخەمەوە بوونیان بۆ مسوڵمانان لەکاتێکدا کە خەڵکی هەر خەریکن پارەو مـاڵی زیـاتر وەدەست دێنن، وە بەهەقبێژییو دژی ناهەق بوون، لەکاتێکـدا کـە خـەڵکی هـەر لـەبیری ئەوەدان چۆن چۆنی ڕەزامەندییو ئافەرینی ئەهلی باتڵ و وەدەسـت بێـنن و لـەخۆیانیان نەڕەنجێنن!!

---

١- (معالم في طريق طلب العلم) ص٢٢٢.

# بەشی سێیەم

## چەند ڕێڕوونیی و پێشنیارێك بۆ زاناو پێشەوایانی بەڕێزمان



## خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!

لەم بەشەدا بەئەدەب و ڕێزو حورمەتەوەو بەداوای لێبوردن کردنەوە، ڕوودەکەمە زاناو پێشەوایانی ئیسلام و چەند ڕێڕوونییو پێشنیارێکیان ئاڕاستە دەکەم، لەبواری میراتگرایەتی پێغەمبەری خوا ﷺو پێشەوایەتیو سەرمەشقایەتیکردنی مسوڵمانان داو، هیوادارم بەسینگ فراوانییو دڵنیایی چاك (حسن اليقين)،یان لانی کەم گومانی چاك (حسن الظن)ەوە لێمیان وەربگرن و زانایانەو خۆیان ئاسایانە لێیان وردبنەوەو تێیان بفکرن.

هەڵبەتە نەهیچ کەسیش لەوە گەورەترە کە پێویستی بەڕاوێژو ئامۆژگاری مسوڵمانان هەبێو، نەهیچ کەسیش لەوە گچکەترە کەڕێی رادەربڕین و ئامۆژگاریکردنی لێگیرابێو، ئینسانیش هەتا پلەوپایەی بەرزترو ئەرکی قورسترو بەرپرسیارێتی زیاتر بێت، بۆ ڕێڕوونییو راوێژو ئامۆژگاریکران و دەستبار بۆگێران ئاتاج ترە، چونکە سەرکەوتن و ئامانج پێکانی بەرهەمدارترو خوانەکردە خلیسکان و لادانیشی بەزەرترو خەتەرترە !

## بێ سڵ کردنەوەو منجە منجیش دەڵێم:

بارکەوتنی مسوڵمانان چ لەسەر ئاستی ئوممەت و سەرجەم نیشتمانی ئیسلام و چ لەسەر ئاستی میللەتی کوردەوارییو کوردستانیش بەبارکەوتن و لێقەومانی زاناو پێشەوایان دەستی پێکردوەو، ڕاست کردنەوەو هەڵستاندنەوەی ئەو بارەش هەردەبێ لەمامۆستاو چاوساغانەوە دەست پێبکات !

دیارە مەبەستیشم لەزاناو پێشەواو مامۆستایان، توێژێکی تایبەت نیەو هەموو ئەو کەسانەم مەبەستە کە خاوەنی ئەو خەسڵەت و ئاکارو تایبەتمەندییانەن کە

میراتگرایەتی و جێگرایەتی پێغەمبەرانیان (سەلامی خوایان لەسەر بێ) لەسەر ڕاوەستاوە، وەك: زانیاری (العلم)و بڕوا پتەویی (الیقین)و توانا (القوة)و دەستپاکیی (الأمانة)و....هتد، چونکە واتاو چەمك و پێناسەی ڕاستەقینەی پێشەواو چاوساغ و میراتگرانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێ) لە قورئان و سوننەتدا لەسەر بناغەی ئەو خەسڵەت و ئاکارو تایبەتمەندییانە کراوە، کە ئاماژەم پێکردن، نەك لەسەر بنچینەی ناوونیشان و ڕواڵەت و دیمەن کە لەڕاستیدا زیاتر زادەو هەڵقوڵاوی واقیع و عورف و باوی کۆمەڵگان.

هەروەها کە دەڵێم بار ڕاستکردنەوەو هەڵستاندنەوەی ئۆممەت و میللەت دەبێ لەزاناو پێشەواو مشوورخۆرەکانی‌یەوە دەست پێبکات، مەبەستم ئەوە نیە کەخەڵك و کۆمەڵگا بەتەمای ئەوەن لەئیسلام بگەڕێن و چاوەڕێی هیممەت و عەزیمەتیان بن!

چونکە پێشەوا (إمام) بەبێ ئۆممەت هیچی پێناکرێ، وەك چۆن ئۆممەتی بێ ئیمامیش مێشی پێلەخۆی دەرناکرێ! بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە هەم ڕاستکردنەوەی چەمك و واتای لەئیسلام تێگەیشتن و، هەم ڕاستکردنەوەی ڕەفتارو ئاکارو دینداریکردنی مسوڵمانان و، هەم کاڵای دین بەبەر باڵای ژیندا کردنەوەو بەرپاکردنەوەی حوکم و سایەو سێبەری شەریعەت لەسەر سەری گەل و میللەت... دەبێ سەرەتا ئەو بەڕێزانە تێیدا پێشڕەوو ڕێنیشاندەرو ڕابەر بن و، لەخودی خۆیانەوە دەست بەپرۆسەی گۆڕانکاریی (عملیة التغییر) بکەن و خەڵك و میللەتیش وردە وردە بەدەوری خۆیانەوە جەم بکەن و، عەقڵ و هۆشیان بەتیشکی هیدایەت ڕۆشن و، دڵ و دەروونیان بەگڕو تینی تەنیا خواپەرستن و لەهەموو کەس و شتێك زیاتر خواو پێغەمبەر خۆشویستن، گەرم بکەن!

دڵنیاشم هەرکەسێك خۆی بۆ بگۆڕێ‌و کاری پێ لەخۆی بکرێ، کەم و زۆر کاریگەریی بۆ سەر خەڵکیش دەبێ، سەرنج بدە چۆن کوورەی پڕ لەئاگرو بڵێسە، ئاسنی ساردو ڕەش و ژەنگاوییو ڕەق و تەق، گەرم دەکاو نەرم دەکاو لەژەنگ پاکی دەکاتەوە بەڕەنگی سووری خۆی ڕەنگی دەکات!

بەڵام بەتەئكید هیچ كەس- مەلا بێ یان پادشا بێ یان گەدا- بەبیری تاریك و هەناوی ساردو سڕ هیچی بۆ لەگەڵ كەس ناكرێ، پێشینانیش جوانیان گوتوە: (ئاسنی سارد بەفوو گەرم نابێ).

خوا بەلوتفی خۆی زاناو پێشەوایەكانی مسوڵمانان والێبكات كە ئۆممەت و میللەت بەشانازیی پێكردن و رێزگرتن و خۆشویستنەوە چاویان لێبكات و، بەدڵنیاییو پشت ئەستورییەوە پەیڕەوییان لێبكات و، لەسنووری شەرعدا خۆییان تەسلیم بكات.

## ١- دەبێ زانایان وریا بن و بزانن كە میراتگرێتی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێ) چی دەگەیەنێ!

بەڵێ ئەی زانایانی ئیسلام و پێشەواو چاوساغانی مسوڵمانان! دەبێ هەركامێكتان كە خۆی بەمیراتگری پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) دەزانێ، ئاگاداربێو هۆشیاربێ، نەوەك خوانەكردە ناوونیشانەكەی لێ خەساربێ!

جا بێگومان میراتگرێتی پێغەمبەرﷺ زۆر شت دەگەیەنێ كە پێم وایە لەم سێ خاڵەدا كۆدەبنەوە:

أ- وەرگرتنی زانیارییو رێڕوونیی (العلم والهدایة)ی خواییو لەخۆدا درەوشاندنەوەو بەرجەستەكردنی كاكڵ و جەوهەری ئەو زانیاریو هیدایەتە بەجوانترین شێوە، كە دەتوانین بە بەندایەتی بۆ خواكردن (العبودیة لله)و خواپەرستیی (العبادة) تەعبیری لێ بكەین.

ب- بانگەوازكردنی خەڵك و سەرمەشقێتیو پێشەڕەوایەتی كردنیان بۆ بەندایەتی بۆ خواكردنیان و خواپەرستنیان، بەچەمك و واتای راستەقینەی قووڵ و فراوانی بەندایەتیو خواپەرستی[١]، كە سەرتاپای ئینسان و تێكڕای لایەنەكانی ژیان و گوزەران دەگرێتەوە.

---

١- لە كتێبی (خواپەرستی ئیسلامیی)، بەرگی یەكەم: (خواپەرستی بەگشتی)دا، بەقووڵیو فراوانیی چەمك و واتای وشەی (عبودیة)و (عبادة)مان توێژیوەتەوە.

ج- بەرپاکردنی ئایین و بەرنامەی خوا لەژیان و گوزەرانی کۆمەڵگادا، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ ﴾[1]

**کەواتە: زاناو پێشەوایانی ئیسلام بەئەندازەی ئەوە کە:**

١- زانیاریو شارەزاییان بەئایینی خوا هەیە، کە وەك گوتمان لەقورئان و سوننەتدا کورت هەڵاتوە، وە ئەو زانیاریو شارەزاییەیان لەخۆیان دا بەشێوەی ئیمان و کردەوەی چاك و طاعەت و تەقواو رەوشت و ئاکاری پەسەند، بەرجەستە کردوە.

٢- وە سەرگەرمی بانگ کردن و فێرکردن و پەروەردەکردنی خەڵك دەبن، بۆ کردنیان بە بەندەی راست و رەسەن و چاك و پاك و چاکەکارو وەفادار بۆخوا.

٣- وە هەوڵ دەدەن و تێدەکۆشن بۆ لەزەویدا چەسپاندنی حوکمی خواو بەرپاکردنی ئایینەکەیو کردنی بەکیان و قەوارەیەکی دامەزراوو تۆکمەو نەلەخشاو.

بەڵێ بە ئەندازەی ئەوە: بەمیراتگرو جێنشینی پێغەمبەران بەگشتیو پێغەمبەری کۆتایی بەتایبەتی دادەنرێن و، بەپێچەوانەشەوە بەپێچەوانەوەیە!

## ٢- میراتگرانی پێغەمبەرﷺ دەبێ زۆر لەهەوڵی ئەوەدا بن کەهەرچی زیاتر وەك میرات لێوەرگیراوەکەیان بچن:

**بەڵێ ئەی زاناو پێشەوا بەڕێزو سەنگینەکان!** مادام خۆتان بەجێنشین و میراتگر (وارث)ی پێغەمبەری خواﷺ دەزانن، دەبێ هەمیشەو دایم لەبیری ئەوەدا بن کە چۆن بکەن و چیبکەن، زیاترو چاکتر وەك میرات لێگیراوەکەتان دەچن! نەك لەڕووی بەرگ و پۆشاك و خواردن و خواردنەوەو جۆری کەلوپەل و شمەکی ماڵ و حاڵ و گوزەرانەوە، کە بێگومان ئەو شتانە زیاتر شوێنکەوتووی کات و شوێن و زادەو هەڵقوڵاوی عورف و باوی خەڵك و میللەتن، بەڵکو لەڕووی چۆنیەتیو شێوەی لەئایین تێگەیشتن و ئیمان و عەقیدەو خواپەرستیو خووڕەوشت و هەڵسوکەوت و هەڵوێست و...هتدەوە.

---

١- الشورى: ١٣.

وه لەڕاستیدا بەئەندازەی وەك پێغەمبەرﷺ چوونمان، دەعوای میراتگربوونمان لیدەسەلمێنریو، هەتا چاکترو زیاتریش لەقورئان و سوننەت حالی بین و بەگوێرەیان بەرێوه بچین، باشترو پتر وەك پێغەمبەری پێشەوامان دەچین، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ ...وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُواْ... ﴾[1].

جا من لێرەدا بەئەدەب و شەرمەوه خۆم ناچار دەبینم کە ڕوو لەو بەڕێزانه بکەم کە خەڵك و جەماوەری مسوڵمان بەمیراتگرو جێنشینی پێغەمبەری خوایان دەزانیو ئومێدو هیوای ئەوەی پێیانه کە بەڕێبازی پێغەمبەرداﷺ پێشی بکەون، بڵێم:

مامۆستاو زانا بەڕێزەکان! ڕەجای برایانەو دڵسۆزانەتان لیدەکەم زۆر زۆر هۆشیارو بێدار بن، با لەدونیاو دوارۆژدا ئێوه قسەتان بەسەر خەڵکەوه هەبیو بەڵگەتان سواربیو، هەوڵ بدەن برۆبیانووی خەڵکی ببڕن و ئایین و بەرنامەی خوایان بەزمانی ڕەوانیو وتارو کردارتان بخەنه بەرچاوو گوێو، با خەڵك بەهۆی ئێوەوه ئایین و شەریعەتی خوا لەبەرچاو شیرین و دڵگیربیو، زیاتریش شیرینایەتی بەو پێغەمبەره پایه بەرزەدا بچێ کە ئێوه جێگرو میراتگرنی، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ... ﴾[2].

بەڵێ با وەك چۆن پێغەمبەری خواﷺ چاودێره بەسەر ئێوەوەو بەڵگەیه لەسەرتان و بیانوو بڕتانه، ئێوەش بەڵگەو چاودێربن بەسەر خەڵکەوه بیانوو بڕیان بن! ئەگەرنا خوانەکردە ئەگەر وەك پێویست نەبن، سەرەڕای ڕوو زەردی قیامەتیٚ، هەر لەدونیاشدا شەرمەزار دەبن و لەئاست لادان (انحراف)و سەرلێشێوانی خەڵکیش دا گوناهبار بەرپرسیار دەبن، چونکە خەڵکێك کە ئێوه بەلارو خواریيو بیٚ باریيو بیٚبەندو باریی ببینیٚ، مەگەر خۆی ئیمانێکی تەواوو شارەزاییەکی باشی هەبیٚ، ئەگەرنا ئیسلامیشی بەئێوەوه لەبەرچاو دەبێزریو، بەبیستنی ناوو باس و خواسی پێغەمبەریشﷺ لەجیاتی ئەوەی تەزووی شەرم و سام و ڕێزو خۆشەویستی بەجەستەدا بیو ڕێزو ئەدەب دڵ و

---

١- النور: ٥٤

٢- البقرة: ١٤٣

دەروونی دابگریّ، لەشی دادەهێزریّ! وە ئەو پەندەی بەسەردا دەچەسپیّ کە دەڵیّ: (زاری بەشیر سووتا بوو فووی لە (دۆ)ش دەکرد).

هیواداریشم کەزاناو پێشەوا ڕەسەنەکانی ئیسلام گلەییم لیّنەکەن کە پەندێکی دیکەی کوردی بۆ ئەو جۆرە کەسانە بهێنمەوە کە بەڕواڵەت لەبەرگ و دیمەنی پێشەوایەتی دان و ناوونیشانی: (زانایی‌و مامۆستایی)یان هەیە، بەلاّم حەیفیّ گورگی نێو پێستی مەڕن و هەتا بلێی بیّخێرو بەدفەڕن و، خەڵکێکی زۆر سادەو بیّئاگا، بەهۆی وانەوە لەخشتە چووەوەو سەرگەردان بووەو گیرۆدەی داوی ڕژێمە طاغووتییەکان و ڕێچکە شەیطانی‌یەکان بووەو بۆی دەرچووە!

چونکە ئەم خەڵکە عەوام و سادەیە هەر بەناوونیشان و بەرگ و رواڵەت و دیمەن و دیکۆر هەڵخەڵەتاوەو، ئەو جۆرە کەسانەی بەجێگرو میراتگری پێغەمبەری خواﷺ زانیوەو، وا حاڵی بووە کە هەرچی ئەوان بیکەن و بیڵێن ئەوە حەتمەن لەخواو پێغەمبەرەکەییان وەرگرتوە، بەوجۆرە هەرچی لێیان دیتوەو بیستوە، بەخودی ئیسلام و ڕێبازی بەرزی پێغەمبەری خوایان لەقەڵەم داوە! جا ئەو جۆرە بەناو زاناو مامۆستایانە لەگەڵ ئەو خەڵکە سادەو عەوامەدا ئەو پەندە کوردییەیان بەسەردا دەچەسپیّ کەدەڵیّ: (بەبۆنی کەبابەوە چوو بوو، بەلاّم کەر داغ کردن بوو!!).

بەڵیّ بەڕێزان! زاناو پێشەوایان و جێنشین و میراتگرانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بیّ) ئەگەر ڕاست و دروست بن، لەتێکڕای خەڵکی چاکترو بەرزترن، سەرنج بدەن چۆن خوای بەخشندە لەگەڵ خۆی‌و فریشتە چاك و پاکەکانی‌دا ناوی بردوون: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ... ﴾[1]، لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەرکی بەرزو پیرۆزی خۆیانیان جیّبەجیّ کردوەو شایەدییان- بەزمانی حاڵ و وتار- لەسەر یەکتایی خوا لەپەرستراوێتی‌دا (وحدانية الله في الألوهية)داوە!

بەلاّم لەحاڵێکیشدا کە تووشی لادان دەبن و دەکەونە شوێن هەواو ئارەزووەکانیان و لەترسان و لەبرسان ڕاستی‌یەکان (حقائق)ی ئایینی خوا دەشارنەوەو لەجیاتی

---

١- آل عمران: ١٨

ڕێپێشاندان، دەبنە مایەی سەرلێشێواندنی خەڵك، بەڵێ لەو حاڵەتەدا نەك هەر ڕێزو پلەوپایە بەرزو ناوازەکەیان دەدۆڕێنن، بەڵکو بەپەند دەچن و تووشی دەردێك دەبن کە هەرچی لەعنەتکەر (لاعن)ە لەعنەتیان لێبکات و خۆیان دەبەنەوە ڕیزی ئاژەڵان، بگرە لەکەودەنییدا وەك کەر (حمار)و لەپیسیدا وەك سەگ (کلب) تەماشا دەکرێن، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّـٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَـٰبِ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّـٰعِنُونَ ﴾[1].

واتە: بێگومان ئەو کەسانەی ئەو بەڵگە ڕۆشنانەو ڕێڕوونییەی کە ناردوومانننە خوارێ دەشارنەوە، پاش ئەوەی لە کتێب(ی خۆمان)دا بۆ خەڵکیمان روون کردوونەوە ئەوانە خواو هەرچی لەعنەتکەرە لەعنەتیان لێ دەکات.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ۚ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾[2]. واتە: وێنەی ئەوانەی کە تەوراتیان پێسپێررا بوو، پاشان کاریان پێنەکرد، وەك کەرێك وایە کە بارێك کتێبی هەڵگرتوون، ئەوە خراپترین وێنەیە بۆ کۆمەڵێك کە ئایەتەکانی خوا بەدرۆ دەزانن، وەخوا ڕێڕوونیی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات.

دیسان فەرموویەتی:

﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَـٰهُ ءَايَـٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَـٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَـٰهُ بِهَا وَلَـٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا ۚ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلْقَوْمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَانُوا۟ يَظْلِمُونَ ﴾[3]. واتە: وە هەواڵی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەوە کە

---

١- البقرة: ١٥٩

٢- الجمعة: ٥

٣- الأعراف: ١٧٥ - ١٧٧

ئایەتەکانی خۆمانمان پێدا بوون، بەڵام لەخۆی دارنین و شەیتانیش شوێنی کەوت و گرتیو چووە ریزی سەرگەردانانەوە. وەئەگەر ویستبامان بەهۆی ئایەتەکانەوە بەرزمان دەکردەوە، بەڵام بەزەوییەوە چەسپاو شوێنی ئارەزووی کەوت و وێنەی وەك سەگە، کە ئەگەر راوی بنێی هەر هەناسە بڕکەیەتیو ئەگەر لێشی بگەڕێی هەر پشووی سوارە ئەو (وێنە)یەش وێنەیە بۆ کەسانێك کەبڕوایان بەئایەتەکانمان نیە، دەجا بەسەرهاتەکانیان بۆ بگێڕەرەوە بەڵکو بیربکەنەوە، کەسانێکیش کە ئایەتەکانمان بەدرۆ دەزانن خراپترین وێنەیان هەیە، هەر خۆیشیان ستەم لەخۆیان دەکەن.

دیارە لە دوو وێنە هێنانەوەدا بە (کەر)و (سەگ) بۆ زانای لادەرو لاڕێو ئارەزووپەرست و دونیا ویست، زۆر شت جێی سەرنجە کە لێرەدا مەودامان نیە لێیان بدوێین، بەڵام دوو شت کە لەهەردووکیان دا دووبارەبوونەوە هەر دەبێ ئاماژەیان پێ بکرێ:

أ- لەهەردووك وێنە (مثل)ەکەدا گوتراوە کە ئەو وێنەیە خراپترین وێنەیە! ﴿بِئْسَ مَثَلُ ..﴾، ﴿ سَآءَ مَثَلًا ..﴾، بۆیەش من پێم وایە بابای زانا ئەگەر چاك و راست بێ لەهەموو کەس چاکترو ئەگەر لارو خواریش بێ لەهەموو کەس خراپترە، چونکە بەپێی تەعبیرە قورئانییەکەو بەسەرنج دانیو واقیعیش، دەزانرێ کە هیچ ژیانداریك لە (کەر) کەودەن ترو هیچ ئاژەڵێکیش لە (سەگ) پیستر نیە.

ب- لەهەردووك وێنەکەدا ئەو کەسانەی وێنەکانیان لەسەر هێنراوەتەوە لەسەرەتاوەو بەڕواڵەت بەئەهلی عیلم و زانا دانراون: (الذی آتیناهُ آیاتنا)، (الذي حُمِّلوا التوراة) بەڵام دوایی بەبێ بڕواو ئایین و ئایەتەکانی خوا بەدرۆزان (مُكَذِّب) لەقەڵەم دراون: ﴿ ..بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ..﴾[1] ، ﴿ سَآءَ مَثَلًا ٱلْقَوْمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ...﴾[2].

ئاشکراشە کە مەبەست لە بێبڕواییو بەدرۆ زانین (تکذیب) لێرەدا دەربڕینی زمانەیی نیە، چونکە خوای کاربەجێ بەس کردەوەو رەفتاریانی خستۆتەڕوو: (فانسلخ

---

١- الجمعة: ٥

٢- الأعراف: ١٧٧

منها...أخْلـد الى الأرض واتَّبـع هـواه...)، ﴿ ..ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا .. ﴾ [1] ، كەواتــە مەبەســت لەبێبڕوایی‌و بەدرۆزانین و بەهەڵەو ناتــەواو خستنە بەرچـاوی ئـایینی خـوا لەلایـەن زانـا لادەرو لارو نالەبارەکانەوە، ئەوەیە کە بەزمانی حاڵ و کردارو رەفتارو ئاکارو هەڵوێست و هەڵس وکەوتی ناشەرعی‌یانەو دونیا پەرستانەیان دەریدەبڕن و، ئەو سەوداو مامەڵەیەیە کە ئەهلی دونیاو سیاسەت و طاغووتەکان لەگەڵیان دەکەن و ئـایینی خوایـان بـەنرخێکی کەم – کە ئەگـەر هـەموو دونیـاش بـێ هەرکەمـە– لێدەکڕن! وەك خـوای بـەرزو مـەزن فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ [2].

**٣- نابێ زاناو پێشەوایان بەوەندە زانیاری‌یـەی کـە هەیانـە قەناعـەت بکـەن، بەڵکو دەبێ هەمیشە بەدوای زانیاری‌و شارەزایی زیاترو چاکتردا بگەڕێن:**

سێیەمین پێشنیارم بۆ ئێوەی بەرێزو پایە بەرز– ئەی زانایانی ئیسلام– ئەوەیە کـە قەت نەچن بەوەندە زانستەی کە وەرتان گرتوە وازبێنن، چـونکە خۆتـان دەزانـن زانسـت سەرەتای هەیە بەڵام کۆتایی نیەو، زانیاری‌یە شەرعیی‌یەکانیش بەتایبـەت کـە لـەزانیاری بێ وێنەو بێ سنووری خوای پەروەردگارەوە سەرچاوەیان گرتوە، یەکجار فراوان و قووڵن و بەردەوامیش لەفراوان بوون و قووڵبوونەوەو پەلهاویشتن دان، وەك (عمر بن عبـدالعزیز) (رەزاو رەحمەتی خوای لێبێ) گوتوویەتی: (تجِدُّ للنـاس أقْضـيةٌ بقـدَر مـا تَجِدُّ لهـم مـن القضايا)، واتە: بەئەندازەی ئەوە کە خەڵك مەسەلەیان بۆ پەیدا دەبن، یاساو بڕیاریشیان بۆ پەیدا دەبن.

ئینجـا ئێمـە دەبینین کـە خـوای پـەروەردگارو کاربـەجێ لـەهیچ شـتێکدا فـەرمانی بەپێغەمبەرەکەی ﷺ نەکردوە کە داوا لەخوا بکات بۆی زێدە بکات، مەگەر زانیاری! وەك

---

[1] – الجمعة: ٥

[2] – البقرة: ١٧٤

فەرموویەتی: ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴾[1] ، واتە: وە بڵێ: پەروەردگارم زانیارییم بۆ زیاد بکە.

کەواتە: ئەوە کە بەشێك لەمەلایەکانی[2] کوردەواریی پێیان وایە ئەوەندە زانستەی وەریان گرتوە، بەسیانەو چی دیکەیان پێویست نیە! بۆچوونێکی هەڵەیە، چونکە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ لە لووتکەی هەرە بەرزی زانستدا بووە، کەچی خوای کاربەجێ فەرمانی پێکردوە کە لێی بپاڕێتەوە زانیاری بۆ زیاد بکات! ئەدی ئێمەو مانان چی دەزانین لەچاو پێغەمبەری خوا تاکو قەناعەتی پێ بکەین و گۆچانی سەفەرو گەشت و گەڕانی زانیاری خواستن (طلب العلم) فڕێ بدەین؟!

پێم وایە هەرکەسێك بەدین و ژین دا قووڵ بووبێتەوەو باش لەقورئان و سوننەت و گۆڕانکارییەکانی ژیان و گوزەران ورد بوبێتەوە، دڵنیا دەبێ کە پێویستە هەمیشە لە بەدوادا گەڕانی زانست دا بێ، چونکە مادام (دین) کالای پڕ بەبالای (ژین)ەو ژیان و گوزەرانی ئینسانانیش بەردەوام و بێ پشوودان و سرەوتن لەگۆڕان و پەرەستاندن و جم وجووڵ دایە، دەبێ ئایینیش بەردەوام لەفراوان بوون لێك کێشرانەوەدابێ، تاکو فریای ژین و گوزەران و گۆڕانکارییەکانی بکەوێ و لێی بەجێنەمێنێ، ئینجا بەسەرنج دانی قورئان و سوننەتیش بۆمان دەردەکەوێ کە خوای کاربەجێش سروشتی ئیسلامی هەروا هەڵخستوەو یاساو دەستووورە گشتیو سەرەکییو نەگۆڕەکان (الأحكام الكلية وبأساسية الثابتة)ی بۆ لایەنە چەسپاوو نەگۆڕەکانی ئینسان و ژیان و، یاسا گچکەو وردە گۆڕاوەکان (الأحكام الجزئية المتغيرة)یشی بۆ لایەنە گۆڕان و بەسەردا هاتووەکانی ئینسان و ژیان، داناون.

---

١- طه: ١١٤

٢- جارێکیان لە مەجلیسێکدا عەرزی مامۆستا (مەلا)یەکم کرد کە فلان کتێبە کە تازە کەوتۆتە بازاڕ کتێبێکی باشەو ئەگەر بیخوێنینەوە سوودی لێدەبینی! کەچی جەنابی مامۆستا خوا لێی خۆش بێ توورەبوو گوتی: بەڕاستی ئەم قسەیەتم زۆر پێناخۆشە! گوتم: بۆچی؟! گوتی: ئاخر من مەلام مەلا! پێویستیم بەموتالای ئەو کتێبانە نیە! منیش گوتم: ئاخر چونکە مەلای لەخەڵکی تر زیاترت پێویستە، نەك بەپێچەوانەوە!

**٤- پێویسته بزانرێ كه بەرنامە (منهج)ی خوێندنی زانستە شەرعییەكان (العلوم الشرعية)كـە لەكوردستان و غـەیری كوردستانیش دا لەمێژە بۆتـە باو، كەم و كووڕیی زۆری تێدا بووەو هەیە:**

بـەڵێ مامۆسـتا بـەڕێزەكان! ئـەمیش راسـتییەكی دیكـەی گرنگـەو پێویسـتە لەبەرچاوتان بێ كـە ئـەو بەرنامـەو شـێوە دەرس خوێندنـەی ئێـوەو پـێش ئێـوەو بگـرە سـەدان سـاڵ لەمەوپێشـیش، كـەلێن و كـەم و كـووڕیی گـەورە گـەورەی تێـدا هـەن، كـە بێگومـان كاریگـەریی خراپیـان هـەبووەو هەیـە لەسـەر جـۆری تێگەیشـتن لەئیسـلام و چۆنیەتی پێشەوایەتی كردنیشتان![1]

جا بێگومان ئەو بابەتە پێویستی بەلێكۆڵینەوەیەكی تایبەت دەكات كە لەقـەرەی ئێرەدا نیە، بەڵام من لێرەدا هەروا بەخێرایی ئاماژە بەچەند شتێك دەكەم:

**یەك: زاڵبوونی بایەخ دان بەزانیارییە ئامڕازییەكان بەسەر قورئـان و سوننەتدا:**

دیارە ئەمە راستییەكی نكوولیی لێنـەكراوەو بابـای فـەقێ هـەر لەسـەرەتاوە ملـی پێدەبـەر (نحـو وصـرف)و پاشـان (بلاغـة ومنطـق) نـراوەو چـەندان كتێـب و نامیلكـەی جۆراوجۆری لەوبارەوە پێخوێندراوەو لەبەر (حفظ)یش كراوە، بێئەوەی جارێ هـیچ لای پێبەلای قورئان و سوننەتدا بكرێتـەوە! كـە لەڕاستیدا ئیسـلام هـەر لـەوان دایـەو هـەر ئەوانیش ئامانج و (بيت القصيد)ی خوێندنی زانستە شەرعییەكانن! بەڵام بەداخەوە لەو بەرنامـە (مـنهج) بـاوو رەواج پێـدراوەی قوتابخانـەو حوجرەكانـدا ئـەو راسـتییە مەزنـە فەرامۆش كراوەو ئامانج (هدف) بـەقوربانی هۆكـار (وسـيلة) كـراوە! هەڵبـەتە نـابێ هـیچ كەسیش بەهەڵە لەم قسەیەمان حاڵی بێو پێی وابێ من دەڵێم زانیارییـە ئامڕازییـەكان (العلوم الآلية) پێویست نین! بەڵكو وەك لەبەشی دووەمی ئەم كتێبە– لـەخاڵی سێیەم– دا خستومانەتەڕوو، ئەو جـۆرە زانسـتانە بـۆ تێگەیشـتنی قورئـان و سـوننەت پێویسـتن،

---

[1]– سوپاس بۆ خوا لـە كوردسـتان و غـەیری كوردسـتانیش دا دەسـت كـراوە بـەگۆڕینی بەرنامـەی خوێنـدنی زانیارییە شەرعییەكان و گەشەپێدانی و چاك كردنی.

بەڵام من دەڵێم با وەسیلە وەك خۆیو ئامانج (هدف)یش وەك خۆیو بەقەدەر خۆی گرنگیی‌و ئەمیەتیان پێ بدرێو لەبەر (العلوم الآلية)، (العلوم العالية) فەرامۆش نەكرێن، چونكە نرخ و بایەخی وەسیلە بەئەندازەی پێوەدەست هێنرانی ئامانجەوەیە !

**دوو: تەنیا سەرگەرم بوون بەموتالاو لێتێگەیشتنی بەرهەم و کەلەپووری زانایانی رابردوو و جێپێگرتنەوەو کردنی بەجێدار (بدیل)ی قورئان و سوننەت:**

لەسۆنگەی ئەوەوە کە بیرۆکە (فکرة)ی هەڵەی: (ماتَرَكَ الأوّلُ للآخرِ شَيئاً) بەسەر عەقڵ و هۆشی زۆربەی هەرەزۆری مامۆستا بەڕێزەکاندا زاڵ بووەو، پێیان وابووە کە ورئان و سوننەت هیچ شتێکی نەزانراوو تەفسیرو شەرح نەکراویان تێدا نەماوە! بەپێویست نەزانراوە کە بۆ وەرگرتنی هیچ کام لە زانیارییەکانی عەقیدەو (فقْه) (تزکیة)و...هتد، کات بەلێکۆڵینەوەو لێوردبوونەوەی قورئان و سوننەتەوە بەفیڕۆ بدرێ!! وە سەرەنجام بەرهەم و کەلەپووری زانایانی پێشوو و شێوەی لێتێگەیشتنیان بۆتە جێدار (بدیل)ی قورئان و سوننەت و ئەمان لەبەرنامەی خوێندنی زانیارییە شەرعییەکان (العلوم الشرعية) دوورخراونەتەوە، لەحاڵێك دا کە شەرعی خوا هەر ئەمانن!!

**سێ: زاڵبوون و جێپێلێژکردنی زانیارییە عەقڵییەکانی وەك (منطق)و (فلسفة) کە لەئەسڵ دا زادەی یۆنانییەکانن، بەزانیارییە شەرعییەکان:**

لەسەرەتاوە خوێندران و شارەزابوون لەقورئان و سوننەت بناغەو جەوهەری خوێندنی زانستە شەرعییەکان (العلوم الشرعية) بوو، بەڵام وردە وردەو بەکارتێکردنی (معتزلة)و (فلسفة)ی یۆنانیو...هتد، وەك چۆن لەلایەکەوە خەریك بوون بە بەرهەم و کەلەپووری زانایانی رابردووەوە جێی لێکۆڵینەوەو لێوردبوونەوەی قورئان و سوننەتی گرتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە زانیارییە عەقڵییەکان (العلوم العقلية)ی وەك فەلسەفەو مەنتیق و حیکمەت و فەلەك و..هتد، جێیان بەزانیارییە شەرعییەکان لێژکردو، وای لێهات زانایی و شارەزایی زاناو پێشەوایان، لەجیاتی ئەوەی ئاشنایی و شارەزایی بەقورئان و سوننەت بکرێتە پێوەرو تەرازووی پێوان و هەڵسەنگاندنی! تارادەیەکی زۆر زانیارییە عەقڵییەکان بوونە ئەو پێوەرو تەرازووە!

**چوار: کورت هەڵهێنرانی ئیمان و عەقیدە لەوردە[1] بابەتە خیلافییەکانیداو، سەرگەرم کردنی فەقێو قوتابی بەمشت ومڕو کێشەی نێوان (جبرية)و (قدرية)و (أشاعرة)و (ماتريدية)و (معتزلة)و...هتد:**

ئەگەر بگونجێ زانایان لەسەر بابەت و مەسەلەکانی (فِقْه) بەماناو چەمکی فراوانی کێشەو مشتومڕ بکەن، ئەوە بەهەر حاڵ، بەڵام لەبەر ئەوەی بابەتی ئیمان و عەقیدە لە قورئان و سوننەت دا هێندە باش و بەوردی روون کراوەتەوە، ئەگەر بێت و مسوڵمانان نەکەونە ژێر کاریگەریی تەوژمە فیکرییەکانی بێگانەو بەس لەقورئان و سوننەتەوە بۆی بڕوانن، تووشی هیچ کێشەو مشت و مڕێك نابن! کەچی زۆر بەداخەوە ئەو کێشەو بگرەو بەردەیەی کە لەبواری عەقیدەدا لەنێو مسوڵمانان دا بووە ئەگەر زیاتر نەبووبێ کەمتر نەبووە لەکێشەو راجیاییيان لەبواری (فِقْه)دا!

جا بەداخەوە زۆر لە مێژە کە ئەو کتێب و سەرچاوانەی کراون بە بەرنامەی خوێندن لەبواری عەقیدەدا، هەر ئەو کتێبانەن کە لەگەرمەی مشت و مڕی بێجێی زانایان دا لەسەر وردە بابەتە خیلافییەکانی بواری عەقیدەو مەسەلە تێخزێنراوەکانی ئەو بابەتە،

---

1- هەرچەندە رەنگە ئەو جۆرە کتێبانەو هاووێنەکانیان چ لەبواری عەقیدەو چ لەبوارەکانی دیکەی زانستە شەرعییەکان دا بۆ کات و رۆژگاری خۆیان، هەندێك ئامانجیان هەر هێنابنە دی، بەڵام بەتەئکید لەم رۆژگارەدا ئامانج ناهێننەدیو بگرە جاری واش هەیە زیانیش دەگەیەنن، وە من بۆ خۆم مەلاو فەقێی وام دیوە کە گوتوویەتی کتێبی (شرح العقائد) کە بە (العقيدة النسفية) ناسراوە سەری تێکداوم وازی پێ لەئیسلام هێناوم!! ئینجا عەیب و ناتەواوییەکی دیکەی گەورەی ئەو کتێب و سەرچاوانەی (علم الكلام) ئەوەیە کە تەنیا باسی ئیسپاتی بوونی خواو (خالقية وربوبية)ییان کردووەو مەگەر چۆن دەنا بەلای پەرستراوێتی (ألوهية)ی دا نەچوون! لەحاڵێك کە کێشەو مشت ومڕو تێك گیرانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) و گەلەکانیان هەر لەسەر پەرستراوێتی (ألوهية)ی خوا بووەو مەگەر چۆن دەنا هیچ گەل و میللەتێك لەسەر بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگارێتی خوا کێشەیان نەبووە، ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ... ﴾ الزخرف: ٨٧ ، ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ ﴾ الزخرف: ٩.

ئینجا شتێکی ئاشکرایە کە هەر رۆژگارو سەردەمە گیروگرفتی فیکریو فەرهەنگی تایبەتی خۆی هەیەو دەبێ زانایان چارەسەریان بکەن جا ئەگەر زانایانی پێشوو لەکتێب و بەرهەمەکانیان دا کێشەو گرفتەکانی رۆژگاری خۆیانیان چارەسەر بکەن، ئەگەرنا چارەسەری ئەوساکە کەمتر وایە بەکەڵکی دەردو کێشەی ئێستامان بێت، ئایا بەچەکی سەدەکانی نێوە راست جەنگی سەدەی بیست و یەکەم دەکرێ؟!

دانـراون! بۆیـە بـەهیچ جۆرێـك بابـای فـەقێو مـەلاش نـەیانتوانیوە كـە لـەو كتێـب و سەرچاوانەوە ئیمان و عەقیدەیەكی ڕاست و ڕەوان و بێگرێو گۆڵ وەربگـرن، ئـاخر تـۆو ویـژدانت چـۆن عەقیدەیـەكی ئیسـلامی قورئـانیو سـوننەتییانە لەكتێبـەكانی: (شـرح العقائـد)و (تهـذیب الكـلام)و (شـرح المواقـف) كـە نـاودارترین كتێبـەكانی (علـم الكـلام)و (عقيدة)ن، وەردەگری؟! ئایا جگـە لەكێشـەو دم بەدمـەی كۆمـەڵ و تـەوژم و تاقمـەكانی مسوڵمانان كە كـەمتر وابـووە ئاگـاداریی عەقیـدەی (أهـل السـنة والجماعـة) بـن، شـتێكی دیكەت دەكەوێتە بەرچاو؟!![1]

## پێـنج: لەئـەنجامی دەرگـای عـەقڵی خۆداخسـتن و پشـت بەپێشـینان و بەسـتن و بەچـاوی ئـەوان دیـتن و بـەگوێی ئـەوان ببیسـتن بـۆ تێگەیشـتنی ئـایین، دووچـاری بـەرەو دوا گەڕانـەوەو ئاگـا لەسـەردەم و ڕۆژگـار نـەبوون دەبین:

ئـەوە كـە پێشـینانمان بەتایبـەت سـێ وەچـەكان (القـرون الثلاثـة) كـە پێغەمبـەری خـواﷺ شـایەدیی چـاكتربوونی بـۆ داون: (خـير أمتـى قرنـى ثـم الـذين يلـونهم ثـم الـذين يلونهم)[2]. باشترو قووڵتر لـەقورئان و سـوننەت تێگەیشـتوون، ڕاسـتییەكەو سـەلمێنراوە، بەڵام ئەگەر ئاگاداری ئەم سێ ڕاستییەش نەبین خراپ بەهەڵەدا دەچین:

أ- پێغەمبەرﷺ تەنیا شایەدیی بۆ سێ پشت (جیل)ەكان داوە، كەواتە:مەرج نیە هەموو پشتەكانی تریش وابن و هەرچی ساڵێك پێش ئێمە ژیابێ، لەئێمـە باشـتر لەئیسـلام حـاڵی بووبێ!

ب- چاكتربوونی ئـەو سـێ وەچـەیە هەرچـەندە بـەر لەهـەر شـتێك ڕاسـت و تـرو قـووڵتر لەئیسلام تێگەیشتنیان دەگرێتەوە، بەڵام مەبەست ئەوە نیە كە وردەكارییەكانی دین و ژینی سەردەم و ڕۆژگاری دوای خۆشیانیان زانیـوە! بـەڵكو مەبەسـت ئەوەیـە كـە ئـەوان

---

[1]- زۆرێك لەو گەنج و خوێندەوارانەش كەپێیان وایە شوێن سـەلەفی صـاڵح كـەوتوون، دووچـاری هـەمان دەرد بوو، بەڵام بەجۆرێكی دیكە!

[2]- رواه البخاري ومسلم.

هێڵە سەرەکىیەکان (الخطوط العريضة)ی لەقورئان و سوننەت حاڵى بوونیان بۆ ئێمە دارشتوە.

ج- چاکتر تێگەیشتنى ئەوانیش بەگشتى لەقورئان و سوننەت ئەوەی لێنافامرێتەوە کە ئێمەومانانیش ناتوانین هیچ حاڵى بین، بگرە هەندێك شتیش لەقورئان و سوننەت هەڵبهێنجین کەپێشووەکانمان نەیانزانیوە!

کەواتە: مامۆستاو پێشەوایانى ئیسلام دەبێ زۆر وریا بن و بەبیانووی رێزو ئەدەب نواندن بەرانبەر بەرابردووان و لێ بەهرەمەند بوونیان، دووچاری دەردی بەرەو دوا گەرانەوەو لەچاخ و رۆژگاری خۆ بەجێمان نەبن، کە بێگومان کەم و زۆر ئەو دەردو نەخۆشىیەیان لەنێودا هەیەو کاریگەریىیەکى گەورەشى بووە لەوەدا کە نەتوانن وەك پێویست خەڵکى رۆژگارو سەردەمى خۆیان حاڵیى و ئیقناع بکەن و، خەڵکى رۆشنبیرو ئاگاداریش بەتوێژێکى دواکەوتوویان بزانێو، بەهەڵە بەهۆی ئەوانەوە ئەو ئایین و بەرنامەیەش کە نوێنەرایەتىو پێشەوایەتى دەکەن، بەدواکەوتوو بەجێماوی بزانن!

## شەش: رێورەسمى بەرێوەبردنى حوجرەو قوتابخانە شەرعیىیەکان و بەخێوکردنى فەقێو قوتابىیەکان زۆر هەڵەو ناتەواو بووە:

دیارە لێرەدا مەبەستم لەو شێوە بژێو پەیداکردنى فەقێیانە کە (راتبەی فەقێیان)ی پێدەڵێن و ئەگەر لێم زویر نەبن- چونکە خۆیشم ماوەیەك فەقێیەتیم کردوە- دەڵێم: لەراستیدا ئەو راتبەکردنە (سواڵ کردن)ێکى بەئەدەب بووە!

جا مامۆستا بەرێزەکان سەرنج بدەن!

ئایا فەقێیەك هەر بەشلکیىو لەدەمى سوختەیىیەوە بژێوی خۆی بە(راتبە) دابین کردبێو، هەمیشە چاو لەدەستى خەڵك و میللەت بووبێ، دەبێ کاتێك کە گەورە دەبێو پێدەگات و دەبێتە مەلاو ئیمام، لەبەرانبەر ئەو خەڵك و میللەتەدا هەست بەچى بکات!!

ئایا دەتوانێ بوێرانەو بێمنەتانەو سەربەرزانە بانگى هەقیان بەگوێدا بدات و ئەرکى فەرمان بەچاکەو نەهى لەخراپەیان لەگەڵ دا ئەنجام بدات!!

**بەپەسەندی دەزانم لێرەدا یەکێك لەبیرەوەرییە تاڵەکانی ژیانم بگێڕمەوە:**

لەساڵی ١٩٨١-١٩٨٢ کە لەدووی کۆلێژی (الشریعة والعلوم الاسلامیة) بووم لەئەنجامی بەشداریی نەکردنم لەیەکیەتی قوتابیان (اتحاد الطلبة)و مەشقی سوپای بەناو گەلیی (تدریب الجیش الشعبي)دا کە رژێمی بەعسی فەرزی دەکرد، لەرژێم قاچاخ بووم و رووم کردە کوردستانی ئێران و ...سەرتان نەئێشێنم چوومە[1] حوجرەیەکەوەو دەستم کرد بەفەقێیەتیو سەرجەم تەمەنی فەقێیەتیم شەش مانگی خایاند، دیارە لەنێو سیستەمی فەقێیەتی‌دا دەستوور وایە کە تەنیا سووختەو فەقێ گچکەو کەم تەمەنەکان دەچنە نان چنینەوەو ڕاتبەکردن و، بەندە لەسۆنگەی ئەوەوە کە بەزاراوی فەقێیەتی (مُستعدّ) بووم و ماددەکانی کۆتاییم دەخوێندن و ڕاتبەکردنم لەسەر نەبوو.

بەڵام رۆژێکیان زۆربەی فەقێیەکان لەحوجرە نەبوون و سەفەریان کردبوو، بۆیە بەناچاریی لەگەڵ فەقێیەکی گچکەدا چوومە (ڕاتبە)و ئەوە یەکەم جارو دواجاریشم بوو ڕاتبە بکەم، هەر لەگەڵ فەقێیەکەی هاوەڵم گوتی: (ڕاتبەی فەقێیان ڕەحمەتتان لێبێ)، کابانی ماڵەکە بەتووڕەییو بێزاریی دەربڕینەوەو بەدەستی خاڵی هاتە دەرگاو گوتی: ئەرێ ئەوە چ بوو ڕاتبەی فەقێیان هەر نەبڕایەوە، بڕۆن هیچمان نیە!!

ئیدی من و فەقێیەکە وەك شووڕکێکمان لە لووت درابێ، بێ قسە گەڕاینەوەو، کە هاتینەوە حوجرەش من بەفەقێیەکانم گوت[2]: کاکە گیان من لەمەودوا ئەگەر بەڕۆژوو نەبم، تەنیا دوو ژەم دەکەم! گوتیان بۆچی؟! گوتم چونکە من ئەو نان و بژێوەی بەڕاتبە پەیدا دەکرێ، مەگەر بەئەندازەی پشت پێوە ڕاوەستان (سَدُّ الرَّمَق) ئەگەرنا بەڕەوای نازانم بیخۆم، دیارە ئەو بڕیارەی خۆشمم بردە سەرێ.

---

١- لەدێی (بەردەڕەش)ی سەر بەشاری (بانە)ی کوردستانی ئێران، لەلای بەڕێز: مامۆستا مەلا محمدی بەردەڕەش، کە ئێستاش لەسەر دەرس گوتنەوە هەر بەردەوامە، خوا پاداشتی بداتەوەو سەربەرزی بکات.

٢- ئەو ڕەفیقە فەقێیانەم ئێستا هەموویان مەلان، کە: کاك (مەلا سید مصطفی)ی (زمزیران)و کاك (مەلا ئەحمەدی قەڵەڕەشێ)و کاك (مەلا عثمان)ی (مەزرا)یەو کاك (ملا حسن)ی (بێکەژ)یم چاك لەیادن، یادیان هەر بەخێربێو تەمەنیان پڕخێرو بێر بێ.

پێشنیاری خۆشم بۆ چارەسەری گیروگرفتی راتبەی فەقێیان لەبڕگەی حەوتەم دا دەخەمەڕوو.

## حەوت: چۆنیەتی دابین کردنی ژیان و گوزەرانی مەلا، لەگەڵ پلەوپایەو رێزو حورمەتی میراتگرانی پێغەمبەرداﷺ گونجاو نەبووە:

هەرچەندە بەپێی چەندان دەق و بنچینەی شەرعیی، هەرکەسێك خۆی بۆ ئەنجام دانی ئەرك و كارێكی مسوڵمانان و دابین كردنی بەرژەوەندییەکیان تەرخان بكات و بۆی لێ ببڕیێ، بەجۆرێك كە نەیپەرژێتە سەر دابین كردنی بژێوی خۆیو خێزانیو وابەستەكانی، لەسەر مسوڵمانان فەرزە كە مشووری بخۆن و پێداویستییەكانی دابین بكەن، بەپێی یاسای: (الغُنْمُ بالغُرْمِ)، بەڵام بەڕاستی ئەو شێوەو چۆنیەتییەی كە لەمێژە بۆتە (باو) شتێكی ناڕێك و نەگونجاوە، لەگەڵ كەسایەتی (شخصیة) بەرزی مامۆستایەتیو پێشەوایەتیدا! كە بەكورتی بریتیە لەوەی مامۆستا (مەلا) هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ خەڵكی ئەو شوێن و گەڕەك و گوندە مامەڵەو سەودا بكات و ڕێك بكەون داخۆ ساڵانە، یان مانگانە چەندو چیوچی دەدەنێ!!

لێرەشدا با قوڵە نەزیلەیەكی خۆم لەبارەی یەكەمین ئەزموونی (مەلایەتی) كردنمەوە بگێڕمەوە، تاكو مەبەست باشتر ڕوون بێتەوە:

ساڵی (١٩٨٦)بوو لەژێر فشاری دائیرەی ئەمنی ڕانیە، كە چەند جارێك پیلانی دەستگیركردنیان بۆ دانام، چونكە لەوتارو سەردان و كۆڕو مەجلیسەكانم بێ پەردە هێرشم دەكردە سەر ڕژێمی بەعس، گوندی (سەرسیان)ی سەر بەناحیەی (بنگرد)م بەجێهێشت و سەرێكی دێی (گەڵووی ماخۆبزنان)م دا كەلەوێ بەمەلایەتی دابمەزرێم، جا كەچووم، ریش سپییەكانی گوند زۆر خۆشحاڵیی خۆیان دەربڕیو بەرگەمی بەخێریان هێنام، پاش هەندێك قسەو باس گوتیان: جا مامۆستا فەرموو جەنابت قسەی خۆت بكە، داخۆ چۆن چۆنی دێیە لامان، چونكە قسە لەم سەرەوە خۆشە بكرێن! دیارە زانیم مەبەستیان ئەوەیە كە ئایا من چەندەیان ساڵانە یان مانگانە پارە لێداوا دەكەم و، چەند بار دارم بۆ بێنن و چیوچی دیكەش! منیش گوتم: براینە گوێ بگرن! من مادام لەم گوندەدا بم هەركات بانگیدا، دەچم بۆ مزگەوت و ئەگەر كەس هەبوو پێش بكەوێ،

ئەگەرنا خۆم ئیمامەتی دەكەم، هەروەها بۆ هەركام لەنوێژی جومعەو نوێژی مردوو و نوێژی تەراویح و جەژنەكان و صولْح و نێوبژییو....هتد بەهەمان شێوە، ئەگەر كەس هەبوو ئەگەرنا خۆم بەناچار دەبینم پێیان هەستم و وەك ئەركی سەرشانم هەر ئەنجامیان دەدەم، كەواتە سەوداو ڕێكەوتن و مەرج گرتنی پێویست نیە!

بەسەرسوڕمانەوە گوتیان: جا چۆن وادەبێ ماموستا؟! ئەدی بەچی دەژی؟!

گوتم: بژێویم لەسەر خوایەو ئەگەر لەبەر تەقواش خوا ڕۆزیم نەداتێ كە فەرموویەتی: ﴿...وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ..﴾[1]، ئەوە لەبەر ئەوەی زیندەوەرێكم ئەو خولْقاندوومی هەر دەم ژیەنێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا﴾[2].

بەڵێ ئاوا لەگوندی (گەڵوو)بوومە مەلاو بەكردەوەش قسەو بڕیاری خۆمم بردە سەرو، بەهیچ جۆرێك بەناوی (بەراتی مەلایەتی)و تەنانەت زەكات و سەرفترەشەوە هیچم وەرنەدەگرت، بەڵام خوا هەڵناگرێ خەڵكی دێش لەبەرانبەر من دا خۆیان بەخاوەنی هیچ نەدەزانیو هەرچی بەناوی دین و شەرعیشەوە پێم گوتبان، بێ سێو دوو وەریان دەگرت! خوا پاداشتیان بداتەوە هەر بەسەلامەت و سەربەرزیان بكات.

ئێستاش بابێمە سەر خستنەڕووی پێشنیارەكەم بۆ چارەسەركردنی كێشەی دابین كردنی ژیان و گوزەرانی مەلاو فەقێو بەڕێوەبردنی حوجرەو قوتابخانە شەرعییەكان.

ئاشكراشە كە زەكات دەدرێ بە هەشت جۆرە كەسان زوك لە ئایەتی (٦٠)ی (التوبة)دا هاتووە كە ئەوانیش دابەش دەبن بۆ دووجۆری سەرەكیی:

أ– كەسانێك كە پێویستییان بەماڵ و سامانی مسوڵمانانەو خۆیان لەبەر هەر هۆیەك بێ ژیان و گوزەرانی خۆیانیان پێدابین ناكرێ، كە هەركام لە: (فقراء ومساكین و في الرقاب و غارمین وابن السبیل) هەژاران و نەداران و كۆیلەو قەرزداران و ڕێبوار، لەوجۆرەن.



١– الطلاق: ٢ – ٣

٢– هود: ٦

ب– کەسانێك كە مسوڵمانان و كۆمەڵگا پێویستیی و ئاتاجیی پێیانەو كارو خزمەتێکی پێشکەش دەکەن کە پەکیان لەسەری کەوتوە، کە هەرکام لە: (العاملین علیها والمؤلفة قلوبهم وفي سبیل الله) کاربەدەست و مشوورخۆرانی زەکات و دڵڕاگیراوان و دڵخۆشکراوان و جەنگ و جیهادو بەرژەوەندییە گشتییەکانیش لەم جۆرەن.

دەجا بێگومان هەم مامۆستا (مەلا)یەکان و هەم قوتابیو فەقێیەکانیشیان مەگەر چۆن دەنا وەبەر هەردووك جۆرەکە دەکەون، چونکە لەلایەکەوە هەژارو نەدارو قەرزدارن و، لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی بەدوای زانیاری شەرعیدا گەڕان و بڵاوکردنەوەیەوە کە فەرزی کیفایەیە، کارەکەیان لەجوغزی( في سبیل الله )دایە[1] !

کەواتە: بۆچی مامۆستایانی بەڕێز کاروباری کۆکردنەوەو دابەشکردنی زەکات و وەك ئەرکێکی گەورەی شەرعیی بەئەستۆوە ناگرن و سەرپەرشتیی ناکەن و مووچە(معاش) و بژێوی بێمنەتانەی خۆیان و حوجرەو قوتابخانەو شاگردەکانیانی لێ دابین ناکەن[2] ؟!

دیارە ئەگەر مامۆستایان کارو تەگبیرێکی ئاوا لەخۆیان و قوتابییەکانیان بکەن، هەم لەکاتی هەبوونی دەوڵەت و قەوارەی ئیسلامییداو هەم لەکاتی نەبوونیشیدا – وەك واقیعی ئێستامان – لەهەموو کەس بێمنەت دەبن و بێجگە لەخوا چاوەڕێی لوتف و کەرەم بەخششی کەسی دیکە ناکەن.

هەڵبەتە وەقفەکان(أوقاف)یش کە بەدرێژایی مێژووی ئیسلام زاناو پێشەوایان کەلێنی باشیان پێیان پڕکردۆتەوە، سەرچاوەو داهاتێکی حەڵاڵ و زەڵاڵی زۆر باشن، بەڵام بەداخەوە هەم لە عێراق و غەیری عێراقیش دا لەمێژە ڕژێمە عەلمانییە طاغووتییەکان ئەوقافەکانیان لەخاوەنە شەرعییەکانیان زەوت کردون و بەکەیفی خۆیان هەڵسوکەوت و ڕەفتار(تصرف)یان تێدا دەکەن، و پێویستە زاناو پێشەوا

---

١- لەبەرگی سێیەمی (خواپەرستی ئیسلامیی) لەباسی (زەکات) دا، بەوردیی ئەو مەسەلانەم توێژیوەتەوە، بەتایبەت دەربارەی چەمك و واتای وشەی (في سبیل الله) باسێکی تێروتەسەلمان کردوە.

٢– دیارە لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کەمامۆستایان ببنە کاربەدەستی کۆکردنەوەو سەرەوبەرە کردنی زەکات (العاملین علیها)!! بەڵکو مەبەست ئەوەیە کەئەوان بەشێوەیەکی شەرعییو ڕاست مشووری لێبخۆن و لیژنەی بۆ دروست بکەن و، سەرپەرشتی کارەکە بکەن و بێگومان ئەگەر زەکاتیش چاك سەرپەرشتی بکرێ نەك هەر مەداری مامۆستایان و قوتابخانەو قوتابییەکانیان، بگرە گەلێك کەسی دیکەش ساز دەکات.

شەرعزانەکان لەبیری ئەوەشدا بن، کە چۆن چۆنی چارەو تەگبیرێکی ئەو ماڵ و سامانە داگیرکراوو زەوت کراوانەش بکەن و بیانگێڕنەوە دەستی خاوەنە شەرعییەکانیان و ئەو مەبەستە شەرعیو دیاریکراوانەی کە بۆیان وەقف کراون.

بۆیەش ئەم دوو بڕگەیەی(شەش)و(حەوت)م لەم خاڵی (٤)ەدا هێنان، کەباسی بەرنامە(منهج) دەرس و دەورو خوێندنی فەقێیەتیو مەلایەتییە، چونکە ئەمانیش هەر بەشێکن لەو بەرنامەو پەیڕەوەی کە فەقێو مەلا لەسەری ڕۆیشتوون و پێگەیشتوون و، بێگومان کاریگەرییەکی گەورەشیان لەسەر کەسایەتیان هەبووەو هەیە.

## ٥- زانایان دەبێ بەواقیع و ڕۆژگاری خۆیان ئاشنابن و زۆرباش شارەزای تەوژمە فیکرییو سیاسییەکانی سەردەمی خۆیان بن:

**بەڵێ مامۆستاو چاوساغەکانی موسوڵمانان!** ئەمیش مەسەلەیەکی زۆر گرنگەو کار هەربەوەندە پێك نایەت کە لەخودی ئایین دا شارەزابن، بەڵکو پێویستە بەواقیعی ژیان و گوزەرانیش ئاشنابن و بەبێ ئاشنابوونی واقیع (فقه الواقع) ناتوانن وەك پێویست سوود لەشارەزایی لەئایین (الفقه في الدين) وەربگرن، چونکە وەك چۆن ناسینی هەق گرنگە، ئاشنابوون بەو خەڵك و کۆمەڵگاو واقیعەش کەدەبێ هەقی تێدا ڕابگەیەنین و بچەسپێنین، هەر گرنگە[١].

ئینجا ئەگەر سەرنجی ژیانی زاناو پێشەوایانی پێشین (سلف) یشمان بدەین، دەبینین هەموویان زۆر شارەزاو هۆشیارو واقیع ناس بوون و، چاك چاك تەوژمە فیکرییو سیاسییە ئیسلامیو غەیرەئیسلامیەکانی ڕۆژگاری خۆیان و پێش خۆیشیان زانیوەو ناسیوە!

بۆوێنە: سەرنجی هەرکام (أبو الحسن الأشعري)[٢] و (أبو حامد الغزالي)[٣] و (إبن الجوزي)[١] و (شهرستاني)[٢] و (إبن حزم الأندلسي)[٣] و (إبن تيمية الحرّاني)[٤] بدە، چەند وردو

---

١- خاڵی یەکەم و دووەممان لەکتێبی (چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامیەکانی کوردستان) بۆ توێژینەوەی ئەو باسە تەرخان کردوە بەناوی: (چاکتر تێگەیشتنی دین و باشتر ئاشنابوون بەژین).

٢- لەکتێبی (مقالات الإسلاميين)ەکەیدا.

٣- لە (تهافت الفلاسفة) و (فضائح الباطنية) و (المنقذ من الضلال)ەکەی داو زۆربەی کتێبەکانی دیکەیدا.

وردو شارەزاو وریا بوون و چەند بەقوولّی، خەڵك و دۆست و دوژمن و پێڕو تاقمەكانی ڕۆژگاری خۆیانیان ناسیوە!

دیارە بێئاگایی مامۆستایان لەواقیع و ڕۆژگاری خۆیان و نەناسینی دۆست و دوژمنیش، چەندان زەرەرو زیانی جۆراوجۆری هەن و، گەلێك جاران بەهۆی نەشارەزایی و بێئاگاییەوە مامۆستایان فریودراون و لەوكونەوە گەزراون، شاعیریش جوانی گوتوە:

**عَرَفْتُ الشرَّ لاللشرِّ لكن لأتَّقيْـهِ          فَمَنْ لَمْ يَعْرِفِ الشرَّ من الناسِ يَقَعُ فيه**

ئاشكراشە هیچ كەس نالّێ دەبێ مامۆستایان هەموو شتێك بزانن و هەموو كەس بناسن! چونكە ئەوە مەحالّە، بەلاّم ماقوولّیش نیە زاناو پێشەوایەكی ئیسلام نەزانێ (دیموكڕاسیو سۆسیالیزم و ناسیۆنالیزم و لیبرالیزم و سوسیال – دیموكراسی و سیكۆلاریزم) چین؟! وەنەزانێ حیزبە عەلمانییەكانی سەرگۆڕەپانی كوردستان چۆن و لەچ هەل و مەرجێكدا دامەزرێنراون و سەركردەو مشورگێڕەكانیان كێن و چۆنن؟! هەروەها شتێكی نەگونجاوو نەشیاوە كە مامۆستایان و پێشەوایانی مسولّمانان ئاگایان لەحالّەت و بەرەوپێش چوون و گۆڕانكارییە گەورەكانی زانست نەبێ و كەم و زۆر سەرەدەرێكی لێنەكەن!

ئنجا با ئەم بیرەوەرییەشمتان بۆ بگێڕمەوە:

لەسالاّنی (١٩٨٢–١٩٨٣) كە لەڕژێم قاچاخ بووم، شەوێكیان لەئۆردوگای زۆرەملێی (بەستەستێن) و لە مزگەوتێكی لاچەپدا وتارێكم داو لەوتارەكەم دا باسی ماركسیزم–لینینیزم و (ماركس و لینین) یشم كرد، مەلایەك دوای من هەستاو هەندێك قسەی كردو سوپاسی منیشی كرد، پاشان گوتی: سەبارەت بەو دوو شەخسەوە كە فلاّنە كەس باسی كردن و زەمی كردن (واتە ماركس و لینین) ڕاستییەكەی من ئاشنایان نیم و نایانناسم، بەلاّم متمانەم بەقسەكانی ئەو هەیەو دیارە ئینسانی خراپ و بەدن، بۆیە

---

١– لە (تلبيس إبليس)ەكەی و (صيد الخاطر)ەكەیدا.

٢– لە (الملل والنحل)ەكەیدا.

٣– لە (الملل والنحل)ەكەیدا، كە لەگەلّ ئەوەی (شهرستانی) پێكەوە چاپكراون.

٤– لە (منهاج السنة النبوية) و (الجواب الصحيح لمن بدَّل دين المسيح) و (اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم) و زۆربەی كتێبەكانیدا.

منیش دەنگی خۆم لەگەڵ دەنگی فلآنەکەس دەخەم و دەڵێم خۆتانیان لێ بەدوور بگرن و شوێنیان مەکەون[1]!

**٦- دەبێ زانایان لەبەردەم هەقدا زۆر خۆ بەکەمگر (متواضع) بن و لەلایەن هەرکەسێکەوە شتێکی باشیان خرایە بەرچاو وەریبگرن:**

بێگومان بێجگە لەخوای پاك و بەرز هیچ کەس نیە کەهەموو شتێك بزانێو پێویستی بەئامۆژگاری و بیرخستنەوە و هاوکاریی کردنی هیچ کەس نەبێ! بۆیە پێویستە مامۆستاو پێشەوایانی ئیسلام لەبەردەم پێشنیارو تێبینی و بیرخستنەوە و تەنانەت ڕەخنەشدا، نەك هەر تووڕەو بێزار نەبن، بگرە بەسینگ فراوانییەوە هەرچی بەهەق و ڕاستیان زانی وەری بگرن و ڕێزی خاوەنەکەیشی بگرن، چونکە گوتراوە: (أُنْظُر الى ماقالَ، ولا تَنْظُرْ الى مَنْ قالَ) هەروەها چونکە (الحكمة ضالّة المؤمن أيْنَما وَجَدها فَهُوَ أحَقُّ بِها)[2] واتە: حیکمەت بزربووی بڕواداره لەهەرکوێیەك بیدۆزێتەوە لەهەموو کەس شایستەتریەتی.

بەتایبەت کەئێستا چین و وەچەی گەنج و خوێندەوارمان – سوپاس بۆخواو لێی بەزیادبێ – زۆر گرنگی بەقورئان و سوننەت دەدەن و، عەجایب نیە هەندێك شت لەقورئان و سوننەت بزانن، کە مەلایەك لەبەر هەرهۆیەك بێ نەیزانێ! جا لەحاڵەتی وادا هەم پێویستە گەنج و خوێندەوارەکە زۆر بەحورمەت و نەزاکەتەوە ئەو مەسەلەیە بخاتە بەرچاوو گوێی مامۆستا و، هەم ئەویش بەسوپاس و پێزانین و خۆ بەکەم زانینەوە لێی وەربگرێ و عومەرانە – خوا لێی ڕازی بێ – بڵێ: (رَحِمَ اللهُ امْرَئاً أهدى إليَّ عيوبي)، واتە: خوا بەزەیی بەهەر کەسێکدا بێتەوە کە کەم و کوڕییەکانی خۆمم بەدیاریی بۆ دەنێرێ.

نەك خوانەکردە ئەم ئایەتەی بەسەردا بچەسپێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴾[3]، واتە: وەکاتێك پێی بگوترێ: پارێز لەخوابکە! دەمارزلی گوناهباریی دەیگرێ...

---

١- مامۆستا وای دەزانی دوو کەسی زیندووی هاوچەرخن!

٢- رواه الترمذي.

٣- البقرة: ٢٠٦

**٧- ئەوەندەی بگونجێو بلوێ پێویستە زانایانی ئیسلام بۆ ژیان و گوزەران چاویان لەدەستی خەڵك نەبێو پشت بەخوا ببەستن و لەسەر پێی خۆیان بوەستن:**

هەرچەندە لەخاڵی چوارەمیشدا ئاماژەم بەم مەسەلەیە کرد، بەڵام بەپەسەندم زانی ئەم خاڵی حەوتەمەشی بۆ تەرخان بکەم، دیارە وەك پێشتر گوتم هەرکەسێك بەکارو ئەرکێکی مسوڵمانانەوە سەرقاڵ و دەست گیراو بێو دەرفەتی دابین کردنی ژیان و گوزەرانی نەبێ، لەسەر موسوڵمانان – چ وەك دەوڵەت ئەگەر هەبێو چ وەك کۆمەڵ و کۆمەڵگاش – پێویستە، مشووری بخۆن و خەمی ژیان و گوزەرانی لەبەر بخەن، جا چ لە زەکات دابین بکرێ، چ بەهەرشێوەیەکی دیکەو لەهەر سەرچاوەیەکی دیکەی شەرعییەوە.

بەڵام بەڕاستی ئەگەر مامۆستایان و پێشەوایان، بۆیان بلوێ بەڕەنجی شان و ئارەقەی نێوچاوانیان بژێوی خۆیان دابین بکەن، کارێکی یەکجار گەورە دەکەن و خزمەتێکی مەزن بەخۆیان و پەیام و بەرنامەکەیان دەکەن، هەربۆیەش ڕستەی: ﴿ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾[1]، ویردی سەر زمانی سەرجەم پێغەمبەرانی خوا(سەلامی خوایان لێ بێ) بووەو هەرکام لە (نوح و هود و صالح و لوط و شعیب) فەرموویانەو، خوای پەروەردگارو بەخشەر بەپێغەمبەری کۆتاییشیی فەرمووە، کە بیفەرموێ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴾[2] واتە: بڵێ: من هیچ جۆرە کرێو پاداشتێکیان لێ داوا ناکەم و من لەزەحمەت دەران – بەهۆی ئەرك خستنە سەر شانتانەوە – نیم.

دیسان هەربۆیەش پێشەوا پێشینەکان و زانا ڕەسەنەکانمان خوا لێیان خۆش بێ مەگەر چۆن دەنا مووچە (معاش) و تەنانەت دیاریی و بەخششی دەستەڵاتدارانیان وەرنەگرتوەو، هەرکامێکیان کاروکاسبییەکی گونجاوی بۆخۆی ڕەچاو کردوە، یان

---

١- الشعراء: ١٠٩.

٢- ص: ٨٦.

بەژیانێکی یەکجار سادەو زاهیدانە قەناعەتی کردوە، سەرنج بدە ناوو شۆرەتیان تاکو ژیان و کارو کەسابەتیانت بۆ ڕوون بێتەوە، کە هەرکام لەم شۆرەتانە هی زانایەك یان چەند زانایەکی ناوداری ئیسلام بووە:

الجَصّاص: گەچ فرۆش

البزَّاز: قوماش فرۆش

الزّجاج: ڕمب دروستکەر، یان ڕمب فرۆش

الوَرّاق: قاقەز فرۆش، یان قاقەز دروستکەر



التّمّار: خورما فرۆش

الدَّقّاق: ئارد فرۆش

الزيّات: ڕۆن فرۆش

النَّحّاسْ: مسگەر

هەڵبەتە ئێمە لێرەدا حاڵەتی گشتی باس دەکەین، ئەگەرنا خوا بەزۆر شێوە بژێوو ڕۆزیی خەڵکی دابین دەکات و، گرنگیش ئەوەیە ئینسانی مسوڵمان بەتایبەت بابای زاناو پێشەوا ڕێزو حورمەت و کەسایەتیی پارێزراو بێو بۆ تۆزە ژیانێك و پاروەنانێك، خۆی ناشیرین و مێزەرەکەی لێخن نەکات.

### ٨- دەبێ زانایان یەکجار وریاو هۆشیاربن و ئاگایان لەخۆیان بێ، لەلایەن ئەهلی دونیاو سیاسەتەوە (إستغلال) نەکرێن و نەکرێنە داردەست:

هەمیشە ئەهلی کوفرو نیفاق و ئەهلی سیاسەت و دونیاو تفاق، لەهەوڵی ئەوەدان کە ڕووی ناشیرین و دزێوی خۆیان بەهۆی نیزیکیی و ڕەفیقایەتی و پشتگیرییکردن و فەتوا بۆ دەرکردنی زاناو پێشەوایانەوە جوان بکەن و خەڵك و جەماوەر چەواشە بکەن و لەخشتە ببەن، کە ئەها خەڵکینە فلانە زاناو مامۆستایەمان لەگەڵەو پشتگیرییان دەکات و دووعامان بۆ دەکات! دەبزانن کەئێمە پیاوی چاکین و لەسەر ڕێی ڕاستین!

جابێگومان ئەو هەوڵ و تەقەللای دەلای خۆکردنی مامۆستاو زانایان و بەکارهێنانیان، شتێکی تازە نیەو عادەتی لەمێژینەو دێرینی ئەهلی حوکم و سیاسەتی لارو ستەمکارانە بووەو، لەگەڵ پێغەمبەرانیشدا (سەلامی خوایان لەسەربێت) هەر لەئارادا

بووه وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ۖ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴾[1].

ئنجا شتێکی ئاشکراشه که مامۆستایان و هەر موسوڵمانێکی دیکەش بەئەندازەی دامەزراویی ئیمانیان و خواخۆشویستن و سام و شەرم لێکردنی و، دونیا بەکەمگرتن و دوارۆژ هەڵبژاردن و، بەکورتی بەئەندازەی چاو لەپێغەمبەر ﷺ کردن و شوێن پێهەڵگرتنی، لەبەرانبەر ڕەشەباو گەردەلوولی ترس و تەماعی ئەهلی دونیادا خۆڕاگرو نەلەخشاو دامەزراو دەبن، وەك خوای کاربەجێ ئامۆژگاری پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ لەوبارەوە بەم شێوەیە کردوە: ﴿ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ وَمِنْ ءَانَآئِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴾[2]، واتە: دەجا لەبەرانبەر ئەوەدا کەدەیڵێن خۆڕاگربە، وەبەر لەخۆرهەڵاتن و پێش ئاوابوونی بەستایش کردنەوە پەروەردگارت بەپاك بگرە، هەروەها لەکاتەکانی شەوگارداو لەم لاو لای ڕۆژگاردا بەپاکی بگرە بەڵکوڕازی بێ – لەپاداشتی خوا –. وەچاوت مەبڕە ئەو جوانیی و زرق و بەرقەی ژیانی دونیا کە بەهەندێکیانمان داوە، تاکو بەوە تاقیيان بکەينەوە، وەبێگومان ڕۆزیی و بەخششی پەروەردگارت چاکترو بەردەوام تریشە. وەفەرمان بەماڵ و خێزانت بکە کە نوێژبکەن و لەسەری پشوو درێژبە، ئێمە بژێوی تۆ دەدەین و هیچ بژێوت لێ داواناکەین، وە سەرەنجامیش هەر لەگرەوی پارێزکاران دایە.

باشترین دەستە گیرەی خۆگرتن و نەکەوتن و نەخلیسکان و چاکترین دەستەبەرکەر (ضامن)یش لەوبارەوە، بریتیە لەدونیا بەکەمگرتن (زهد) و قەناعەت کردن و ساچاندن بەژیان و گوزەرانێکی سادەو ئاسان، هەزار ڕەحمەتیش لەئیمام شافیعی بێت کە لەبارەی

---

١– الإسراء: ٧٣.

٢– طه: ١٣٠ – ١٣٢.

سادەپۆشیی و سادە ژیان و لەهەمان کات دا نـەفس بـەرزیی و عیززەتمەنـدیی خۆیـەوە: گوتویەتی:

عَلـيَّ ثيـابٌ لَـوْ تُبـاعُ جَمِيْعُهـا بِفَلْـسٍ لكـان الفَلْـسُ أكْثَـرا
وفيهِنَّ نَفْسٌ لَوْ تُقاس بِبَعْضها نُفوسُ الورى كانَ أجلَّ وأكـبرا

واتە: ئـەو جل و بەرگانـەی لەبـەر مـن، ئەگـەر بەفلسـێك[1] بدرێن، ئێسـتا فلسـەکە زیاترە! بەڵام ڕووحێکیان تێدایە ئەگەر ڕووحی تێکڕای خەڵکی لەگەڵ هەندێکیدا بخرێنـە تەرازووەوە، ئەو بەشەی ڕووحم لەهەموویان شکۆدارترو گەورەترە!!

دیارە ئەو خۆبەگەورەگرتن و ڕێـز و حورمـەتی خۆپاراسـتنەش[2]، لەبەرانبـەر ئـەهلی دونیاو تەماعدا یەکجار شیرین و پەسـەندو دڵگـیرەو گوتراویشـە: (لِكُـلِّ مَقـامٍ مَقـالٌ ولكـل ميدانٍ رجالٌ).

## ٩- نابێ بەهیچ شێوەیەك زاناو پێشەوایانی ئیسلام ئەو فێڵەیان لێبکرێ کە لەگەڵ ئیسلامیـیەکان و جم وجۆڵی ئیسلامیـیدا بەشـەڕبدرێن و بەگژ برایەکانی خۆیاندا بکرێن:

**بەڵێ ئەی زانایانی ئیسلام و پێشەوایانی موسوڵمانان!** هیچ کات و بـەهیچ پاسـاوو بیانوویەك و بەفیت و دەست لەپشت دانی هیچ کەس و لایـەنێك، هەرچـەندە بەڕواڵـەتیش خۆی بەپـەرۆش و بەدڵسـۆز پێشـان بـدان، ئامـادە مـەبن کـە بەگـژ ڕەوت و کاروکـاروانی ئیسلامیيدا بکرێن و لەدژایەتیيـاندا بـەکاربهێنرێن، چـونکە (تفـی بـەرەو سـەرێ هـەر بـۆ خاوەنی دەگەڕێتەوە) و زۆریش حەیفە بە (برا) برا لەنێو بـبرێ و (ڕۆڵـە) بەدەسـتی بـابی بکوژرێ‌و، ئینسان بەدەستی خۆی خەرمانی خۆی پێبسووتێنرێ!

---

١- بێگومان ئەوکاتە نرخی (فلس) وەك ئێستا نەبووەو شتێکی کردوە، بەڵام کەم بووە.

٢- هەروەها ئیمام شافیعی گوتوویەتی: خواردنەوەی ئاوی ساردیش کەسایەتیم برووشێنێ خۆمی لێدەپارێزم و نایخۆمەوە! بەڵێ ئیمام و پێشەوا دەبێ ئاوابێ، نەك لەهەرجێیەك تەماعێکی لێبوو، بێ پەروا سەری لەڕێدا بێ!!

ئاشكراشە كە ئەوكەسانەی پیرو گەنج و، حوجرەو قوتابخانەو، مەلاو ڕۆشنبیر لەیەكتر بەردەدەن، لەگەڵ هەموویان دا درۆ دەكەن و ئەو جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەیەی كە خۆیان زات ناكەن یان حەزناكەن بیكەن، دەیانەوێ هەر بەخودی مسوڵمانان خۆیان، دژی ئیسلام و كاری ئیسلامیی بیكەن!

**بەڵێ هۆ زانا بەڕێزو دڵسۆزەكانی ئیسلام!** ئێوە ئەو گەنج و لاوو كوڕو كاڵەی كە لە مزگەوت و ماڵەكانی خوادا كۆدەبنەوە، بەهی خۆتان و خۆشتان بەهی ئەوان بزانن و هەرچۆن بووە، پێكەوە هەڵبكەن و یەكتر تەحەممول بكەن، تاكو خوا پشتیوان بێ ئەوانیش زیاتر تێدەگەن و پێدەگەن و، ئێوەش چاكتر دەرفەتتان بۆ دەڕەخسێ پێرادەگەن، كە وەك پێویست ئەركی پیرۆزی پێشەوایەتی و مامۆستایەتییان لەگەڵ دا ئەنجام بدەن و ڕێكترو قووڵتر پەروەردەیان بكەن!

وەبشزانن و دڵنیاش بن كە هەرجۆرە تێك گیران و كێشەو بێشەیەكی نێوان ئێوەو ئیسلامییەكان جگە لەناحەزانی ئیسلام كە دەبنە تەماشاچی (متفرج) تان، هیچ كەس لێی بەهرەمەند نابێ، براوەو دۆڕاویشی تێدا نابێو هەموو لایەك دۆڕاودەبن و، بەمەرەدی مەلای مەزبوورەش دەچن، كە لقە درەختێكی دەبڕییەوە خۆی لەسەری وەستابوو و ئاكامیشی دیارە چۆن بوو!

### لەكۆتاییدا دەڵێم:

أ- خۆتان بەپزیشك و حەكیم و گەنج و قوتابییەكانیش بەنەخۆش[1] دابنێن و لەجیاتی قسەپێكوتن و لێخوێندن، چارەسەریان بكەن و دەستیان بەسەردا بێنن.

ب- لەدڵسافیی خۆتانەوە مەڕواننە خەڵكی و وامەزانن هەرچی خەمخۆریی خۆی بۆ ئیسلام پێشان دا، ڕاست دەكات! بەڵكو هەیە لەگەڵ مەڕێ شینێ دەگێڕێ و لەگەڵ گورگیش گۆشت دەخوات!!

١- واتە ئەوانەیان كە هەڵەو كاڵییەكیان هەیە، ئەگەرنا گەنجی واهەیە گەنجینەی ئیسلامەو هەركەسێك قسەو پێشنیارە چاكەكانی لێوەرنەگرێ، یان بێوێژدان یان نەفامە.

تەماشا بکەن چۆن فیرعەون خۆی بەدڵسۆزو خەمخۆری ئایینی خەڵکی میسر پێشان دەدات! لەحاڵەتێك دا کە نەك هەر بڕوای بەئایین نیە، بەڵکو لافی پەروەردگاریێتیو پەرستراویێتی لێدەدات: ﴿أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى﴾[1]، ﴿لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَهًا غَيْرِي لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ﴾[2]، بەڵێ فیرعەونی خۆ بەپەروەردگارو پەرستراوزان بۆ چاوبەستەکێو چەواشەکردنی خەڵکی، ئەوەندە خۆی بەدڵسۆزو بەپەرۆش بۆ (دین) پێشان دەدات، کە ئامادەیە پێغەمبەری خوا(مووسا)ی(سەلامی خوی لەسەر بێ) لەسەر بکوژێ! ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَنْ يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ﴾[3].

بەڵێ وادیارە دڵسۆزی فیرعەونانەش بۆ ئایین هەیە، بەلام حەیفێ دڵسۆزییەکە بەڕاددەیەکە بگاتە پێغەمبەر کوشتنیش[4]؟؟!!

## ١٠- پێویستە زاناو پێشەوایانی ئیسلام هەوڵ بدەن تێکەڵیی و تەفاعولی چاکترو زیاتریان لەگەڵ سەرجەم چین و توێژەکانی میللەت دا هەبێ، بۆئەوەی کاریگەریی زیاتریان لەسەریان هەبێ:

دوورە پەرێزییو کەنارگیریی لە میللەت و کۆمەڵگا ئەگەر بۆ هەموو کەس بگونجێ بۆ بابای چاوساغ و پێشەوا ناگونجێ، جائەگەر زانایان بیانەوێ بەکردەوە ببنە مشوورخۆرو پێشڕەوی خەڵك و جەماوەر، نابێ لەخەڵك و جەماوەرەکەیان بێئاگابن و بگرە دەبێ هێندە لێیان نێزیك و لەگەڵیان تێکەڵ بن، کە ئاگاداری هەموو هەست و خواست و کارو کردەوەیەکیان بن، تاکو بەخێرو شەڕیان بزانن و، بزانن لەسەرچی دەست خۆشییان لێبکەن و، لەسەر چیش لۆمەو سەرکۆنەیان بکەن.

---

١- النازعات: ٢٤.

٢- الشعراء: ٢٩.

٣- غافر: ٢٦.

٤- لەبەشی چوارەمی کتێبی: (سۆزی نەتەوایەتیو بیری ناسیۆنالیزم)دا بەناوی: (مسوڵمانیەتیو کوردایەتی لەنێوان ئیسلامییو عەلمانییەکان دا) (١١) کورتەباس هەن کەم و زۆر پەیوەستن بەم بابەتەوە، بڕوانە چاپی سێیەم.

ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە ئەگەر بێت و زانایان و مشوورخۆرانی ئیسلام، لەکاتی خۆشییو ناخۆشییو ئێش و ژان و موعانات و گرفتارییەکانی ژیان و گوزەران دا، لەگەڵ خەڵك و میللەت نەبن و، بگرە لەپێشیانەوە نەبن خەڵکیش بەبرا گەورەو مشوورخۆرو سەرو سێبەری خۆیانیان نازانن! پێشینانیش گوتوویانە: (بۆیە پێت دەڵێم خاڵە، کە چۆلەکانم بۆ بگری!). دیسان لەلایەکی دیکەشەوە مامۆستایان و زانایان ئەگەر لەهەموو بوارەکانی ژیان و گوزەران دا لەگەڵ خەڵك و میللەت تێکەڵ نەبن و هەڵس وکەوت نەکەن و ڕاستییەکانی قورئان و ڕەوشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەخۆیان دا بەرجەستە نەکەن و پێشانیان نەدەن، چۆن چۆنی دەگونجێ ببنە پێشەواو پێشڕەوو سەرمەشقی خەڵکی؟! ئاخر ئایین و بەرنامەی خوا چەندە بەزمانی وتارو ئامۆژگاری (الخطبة والموعظة) دەخرێتەڕوو، حەوت هێندەش بەزمانی کردارو ڕەفتار پێشان دەدرێ، وە هەمیشە دەبێ ڕاستە شەقامی خوا لەکۆمەڵێکی چاك و پاك و هەڵبژاردەو خواپێداودا بەرجەستە ببێ بۆئەوەی هەق (حق) وێڕای بیستران بشبینرێ، هەربۆیەش لەسوورەتی فاتیحەدا دوای ئایەتی: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ ئایەتی: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ هاتوە، تاکو بزانرێ کەخوای کاربەجێ بەرنامەی خۆی بۆ ئەوە نەناردوە کەتەنیا هەقێکی تیۆریی (حق نظري) نێو تویی کتێبان بێ، بەڵکو ناردوویەتی کە واقیعێکی زیندوو و بەرجەستەی نێو جەرگەی مەیدانی ژیان وگوزەرانی ئینسانان بێ!

**١١- پێویستە زانایانی ئیسلام لەنێو خۆیان دا چاکترین و پتەوترین برایەتییان هەبێ، بەڵام لەسەر بناغەی ئیمان و زانیاری و پارێزگاریی، نەك لەسەربناغەی دەمارگیریو مەسلەك گەرایی:**

زاناو پێشەوایانی ئیسلام لەهەموو کەس چاکتر دەزانن کەبرایەتیی و یەکڕیزیی و یەکدەنگیی و یەکڕەنگیی لەئیسلام دا، چەندە گرنگەو چەند پێویستە، بۆیەش لەسەریان پێویستە کە لەهەموو کەس زیاتر ئاگایان لەهەق و مافەکانی برایەتیی بێت لەنێو خۆیان دا وەك ئەهلی عیلم بەتایبەتی و، لەگەڵ تێکرای ئەهلی ئیمان و ئیسلام دا بەگشتی.

ئاخر ئەگەر ئەهلی زانست و پێشەوایانی مسوڵمانان ڕێز، لەیەکتر نەگرن و قازانج و زیانی یەکتر بەهی خۆیان نەزانن و پێکەوە ڕێك وپێك و تەباو كۆك و برا نەبن، دەبێ کێ ئامۆژگاریيان بکات و فێریان بکات؟!

**یاعلماءَ الاسلام یا مِلْحَ البَلَدَ ماذا یُصْلِحَ المِلْحَ إذا المِلْحُ فَسَدَ؟!**

ئنجا بەڕاستی زەم و غەیبەتی یەکترکردن و کینەو بوغزو غەرەزو یەکتر شکاندن لەهەموو کەس و لەهەموو کۆمەڵ و توێژێك هەر ناشیرین و ناقۆڵایە، بەڵام لەزانایانی ئیسلام و پێشەوایانی مسوڵمانان یەکجار دزێوو ناقۆڵاو بێمانایە! بۆیە پێویستە مامۆستاو پێشەوایان لەبرایەتی و پێکەوەبوون و تەبایی نێوانیان دا، سێ ڕاستی گەورەو گرنگ فەرامۆش نەکەن:

**یەك:** پێویستە ئەو برایەتیو پێکەوەبوون و پشتگیریی یەکتر کردنەیان – وەك برایەتیی هەر کۆمەڵ و توێژێکی دیکەی موسوڵمانان – تەنیاو تەنیا لەسەر بناغەی ئیمان و تەقواو پابەندیی بەشەریعەتەوە بێو، هیچ شتێکی دیکەی تێکەڵ نەبێ.

**دوو:** دەبێ ئاگاداری خۆیان بن و لەبرایەتیی و پێکەوەبوون و پشتگیریی یەکتر کردنەکەیان دا، گیرۆدەی دەردی دەمارگیریی (تَعَصُّبْ) و مەسلەك گەرایی و بەناهەق و ناشەرع یەکتر سەرخستن و بەرگریی لەیەکترکردن نەبن.

**سێ:** دەبێ وریابن و برایەتیی و پێکەوەبوون و پشتگیریی یەکترکردنەکەیان نەبێتە مایەی دابڕانیان لەخەڵك و میللەتی مسوڵمان و سەرەنجام وەك حیزب و کۆمەڵ و توێژێکی تایبەتیيان لێبێ! وەك ئەو حاڵەتەی کە لەنەصرانیيەکان دەبینرێ کە زاناکانیان چین (طبقة)ێکی سەربەخۆو تایبەتییان پێك هێناوە، کە زۆر شتیان لە توێژەکانی خەڵك و میللەت جیایەو، لەسۆنگەی ئەو خۆجیاکردنەوەو خۆ لەکۆمەڵگا دابڕینەشەوە زاراوەی (رجال الدین) (پیاوانی ئایین) سەری هەڵداوە![1]

---

١– بەداخەوە لەنێو شیعەی ئێرانیش دا زاراوەی (روحانیەت) واتاو چەمکی (رجال الدین) دەگەیەنێو لەنێو سەرجەم شیعەش دا زانایانیان دام و دەزگاو دارایی و داب و نەریتێکی تایبەتیو جیایان هەیە!! کەبۆتە مایەی پەیدابوونی (حساسیة) و ڕەخنەو گلەیی سەرجەم چین و توێژەکانی میللەتیان.

چونكه بێگومان ئەو جۆرە شتانە لەئیسلام دا جێیان نابێتەوە، ئیسلامێك كەوێڕای ڕێزو حورمەت دانانی زۆری بۆ زانایان و پسپۆڕو شارەزایانی شەریعەت، بەهیچ جۆرێك ڕێگا نادات، وەك چین و توێژێكی تایبەت و سەربەخۆ لەخەڵك و كۆمەڵگا دابڕێن [1] و بەخەڵكێكی تایبەت ناوبرێن، هەربۆیەش تەنیا جارێكیش خوای كاربەجێ لەقورئان دا زانایانی بەجیا نەدواندوەو، هەموو دواندن (خطاب)ەكانی قورئان بۆ ئەهلی ئیسلام بەناوونیشانی ئیمانەوەن، كە بناغەی برایەتیی‌و سەنگی مەحەك و جوغزو بازنەی كۆكردنەوەیانە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾!.

هەڵبەتە لەخەڵك جیاكرانەوەو دابڕانی زاناو پێشەوایانیش، پێش خەڵكەكە بۆ خۆیان و پێش خۆیشیان بۆ ئایینەكەیان زیانی هەیە، چونكە ئەوان بەبێ خەڵك و میللەتەكەیان كەمینە (أقلية)ن و بەتەنیاو بەبێ هاوكاریی و دەستبار بۆ گرتنی خەڵكیش هیچیان بۆ ناكرێ‌و، ئیسلامیش زیانێكی گەورەی لێدەكەوێ‌و زەبرێكی گرچووبڕی پێدەكەوێ، كە خەڵك و میللەت وابزانێ بەرانبەر بەئایین و شەریعەتی خوا بەرپرسیار نیە! وەك بەداخەوە لەڕابردوودا تاڕادەیەكی زۆر لەكوردستان و غەیری كوردستانیش دا ئیسلام ئەو زەرەرو زیانەی لێكەوتوەو ئەو زەبرەی پێكەوتوە!

---

١– پێم وایە بەرگ و پۆشاكی تایبەت و جیاش كە هیچ دەقێكی شەرعیی لەسەر نیە كاریگەرییەكی زۆری هەیە لەسەر دروست كردنی پەردەو دیواری نەفسی لەنێوان مەلاو جەماوەرداو، چاكتر وایە زاناو پێشەوایانی هەر میللەتێك بەرگ و پۆشاكی میللەتەكەی خۆیان بپۆشن، مادام ئەو بەرگ و پۆشاكە پێچەوانەی ئادابی شەرعیی نەبێ، دیارە پێغەمبەری خواش ﷺ هەروای كردوەو بۆیەش بابای نەشارەزا پرسیویەتی: (أيكم رسول الله؟!) كامەتان پێغەمبەری خوایە؟ چونكە نەبەرگ و پۆشاك و نەشوێنێكی تایبەتیی لەمەجلیس دا نەبووە كەپێی بناسرێ!! مەحوی شاعیریش لەو بارەوەو لەوەسفی كۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیدا جوانی گوتوە:

بەنووری عەكسی پێغەمبەر ئەوەندە مونعەكیس بووبوون
غەریبی تازە هاتوو دەیوت: ئەم پێغەمبەرستانە

بەڵام ئاگادار بن من نەمگوتوەو ناشڵێم: (پۆشینی جل و بەرگی مەلایەتی ناشەرعییە) بەڵكو گوتوومە: (چاكتر وایە ...) وەناشڵێم كەبەرگ و پۆشاكی تایبەتی مەلایان – هەروەها شاڵی سەوزی سەیدو شێخ و كەشیدەی زەردی حاجییانیش – گیروگرفتێكی وایە بەلاچوونی كاری ئیسلام پێك دێ!! نەخێر وانیە، بەڵام بەناوی ئایینەوە شت زیادكردن و داهێنانیش هەمیشە زەرەرو زیانی هەیەو لەسەری قەرزدار دەبینەوە.

**١٢- نابێ میراتگرانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێ) لێبگەڕێن ڕژێم و حیزب و سەرۆك عەشیرەت حوکم و سیاسەت و، شێخ و طەریقەتیش لایەنی مەعنەویی‌و ڕووحانیەتیان لێزەوت بکەن و، سەرەنجام عیلمێکی بێ حوکم و بێ ڕووحیان پێبمێنێ:**

ڕێڕوونیی و پێشنیاری دوازدەیەم و کۆتاییم بۆ ئێوەی بەڕێزو خۆشەویست، ئەی زاناو پێشەوایانی ئیسلام و مسوڵمانان، لەهەر بەرگ و پۆشاك و دیمەنێك دان! ئەوەیە کە:

مادام ئێوە میراتگری پێغەمبەری خوان ﷺ ئەویش نەحیکمەتی بێ حوکم و نەعیبادەتی بێ سیاسەتی بۆ بەجێ نەهێشتوون! چونکە هەم خۆی‌و هەم چوار خەلیفە ڕاشیدینەکانیشی، حوکم و حیکمەت و عیبادەت و سیاسەت و بازاڕو مزگەوت و زانست و ڕەوشت و پارێزکاریی و فیداکاریی و دینداریی و دونیاداریی و... هتد یان پێکەوە گرێداون!

مادام وایە ئێوەش نابێ قبووڵ بکەن لەلایەکەوە دەستەڵاتداران (حکوومەت، حیزب، ئاغاو میرو بەگ، ڕیش سپی عەشرەت) لایەنی حوکم و سیاسەت و مشوورخۆریی کۆمەڵگاو میللەتتان لێزەوت بکەن و واتان لێبێ (لەدانووان ئاویشتان بەدەست نەبێ)[1]، وە لەلایەکی دیکەشەوە شێخ و پیر[2] بەناوی تەریقەت و تەصەووفەوە، لایەنی ڕووحیی‌و مەعنەویی‌و عاطیفی خەڵك و میللەتی مسوڵمانتان لێ زەوت بکەن و، لەدڵ و دەروونەوە

---

١- ئەو پەندە بۆ کەسێك بەکاردێ کەهیچی بەدەست نەبێ.

٢- ئاشکرایە شێخ، ئەگەر بەڕاستی شێخ و (مرشد) بێت وەك (عبدالقادري گەیلانی) و (مولانا خالد) و کاك ئەحمەدی شێخ و شێخی بورهانیی‌و... هتد، ئەوە زاناو ئەهلی زانستن و بەرلەوەی شێخ بن مامۆستان و هەر مامۆستایی‌و زانایی‌یەکەیان وای لێکردوون شایستەیی ڕێنمایی (إرشاد) کردنی مسوڵمانانیان هەبێ‌و، لەڕاستی‌دا هەرئەوانەش زاناو پێشەوای ڕاست و تێرو تەواون، بەڵام ئێمە مەبەستمان ئەو جۆرە پیرو شێخانەیە کەلەجیاتی دینداربن دونیادارن و، کارو مەسلەکە زیاتر وەك کەسابەت و دوکانداریی‌و خۆژیاندن دەچێ‌و، لەدین و شەرعیش بێ هەواڵن و ئەگەر ئەوپەڕی گومان چاکیی (حسن الظن) یان لەگەڵ بەکاربێنن دەبێ بڵێین: فەقیرحاڵن!!

ئەو خەڵکە بەخۆیان و دام و دەزگاکانیانەوە گرێ بدەن و شەتەك بدەن و، واتـان لێبـێ هیچ کەس گوێتان لێ نەگرێو (کەس بەرپەتان نەپێوێ)!

**بەڵێ مامۆستایانی بەڕێزو زاناو پێشەوایانی میللەتی مسوڵمان!** حاڵـەتی ئاسـایی‌و سروشتی میللەت و کۆمەڵگایەکی موسوڵمان ئەوەیە کە زاناو چاوساغەکانی‌و میراتگرانـی پێغەمبەرەکەی ﷺ بەواقیعی ڕابەرو پێشەواو مشوورخۆری هەمەلایەنـەو هەمـەکارەی بـن، نەك هەرکەسێك لەولاوە هات خۆی لەخەڵك و میللەت بکاتە (کوێخا) و دەمڕاست!

بەڵام مامۆستاو زانـا بـەڕێزەکان! لێـرەدا ڕاسـتی‌یەکی زۆر گـرنگ هەیـە نـابێ لێـی بێئاگـابن: بۆیـە ئـەم خـاڵی دوازدەیەمـەمان خسـتە کۆتایی‌یـەوە چـونکە تـەنیا کاتێـك دێتەدی‌و وەك ئامانج (هدف)ێك (تحقیق) دەبێ، کە ئەو ڕێڕوونیی و پێشنیارانەی لەیازدە خاڵی پێشوودا ڕابـوردن ڕەچـاو بکـرێن و جێبـەجێ بکـرێن و، مامۆسـتاو زانایـان بتـوانن بەکردەوەو لەدونیای واقیع دا ببنە پێشـەواو مشـوورخۆری خـەڵك و میللـەت و، سـەرجەم پێکهێنەرەکان (مقوِّمـات) و فاکتـەرەکان (عوامـل) ی ڕابەرایـەتی و بـرا گـەورەیی کردنـی مسوڵمانان لەخۆیان دا بێننەدی و، بەکردەوە بتوانن هەم لەڕووی زانستیی و فەرهـەنگیی و هەم ڕووحیی و ئەخلاقیی و هەم کۆمەلایەتیی و سیاسی‌یەوە پێشڕەو و ڕێنیشـاندەری مسوڵمانان بن و سەرپـەرشتی‌یان بکەن، جا ئەوکاتە بێئەوەی خۆیـان بڵـێن و داوابکـەن، خـەڵك و کۆمـەڵگا لێیـان کۆدەبێتـەوەو دەوریـان دەدات و، داوای پێشـکەوتن و مشـوور لێخواردن و سەرپەرشتیی کردنیان لێدەکات!

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستیشـمان ئـەوە نیـە کـە زانـاو پێشـەوایان بەرچـاوی خـەڵك و میللەت ڕۆشن نەکەنەوەو ڕاستی‌یەکانی ئیسـلامیان تێنەگەیـەنن، لەهـەر بارێکـەوە بـێ، بـەلام بێگومـان بـەبێ شایسـتەیی‌و لەبارانـدا هـەبوون، نـە خـەڵکیش قەناعـەتی دێـت و نەهیچیش دەکرێ.

سـەرنج بـدەن خـوای پـەروەردگار لـەبارەی پێشـەوایەتی (إمامـة) ئیبراهیمـەوە (سـەلامی خـوای لێ بـێ) چـی فـەرمووە: ﴿ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي

جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ ﴾[1]. واتـه: وەیادبكـەوە كاتێك پەروەردگاری ئیـبڕاهیم ئیبڕاهیمـی بـە (جێبـەجێكردنی) چـەند فـەرمانێك[2] تـاقی كردەوەو ئەویش بەتەواویی ئەنجامی دان، – خواش فەرمووی: من دەتكێڕم بەپێشەوا بۆ خەڵكی، – ئیـبڕاهیم – گـوتی: ئـەدی لـە وەچـەكەم! فـەرمووی: سـتەمكاران شایسـتەی وەرگرتنی بەڵێنی من نین – كە ببنە پێشەوا –.

وە سـەرنج بـدەن چۆن خـوای كاربـەجێ دوو خەسـڵەتی بـەرزو گـەورەی (صـبر) و (یقین) ی كردوونەتە پاساوی هەڵبژاردنی هەندێك لە (بني اسرائیل) لەڕۆژگاری خۆیـان دا، بـۆ پلەوپایـەی پێشـەوایەتی: ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ فَلَا تَكُن فِي مِرْيَةٍ مِّن لِّقَائِهِ وَجَعَلْنَاهُ هُدًى لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴾[3].

دیارە هەربۆیەش زانایان گوتوویانە: (بالصبر والیقین، تُنالُ الإمامـة في الـدین) واتـە: بەخۆڕاگرییو بڕوا پتـەویی پێشەوایەتی لەئایین دا دەستگیر دەبێ.

چونكە ئینسان دوو جۆرە هێـز (قـوة) ی هـەن، كـە بەیەكـەمیان هـەق و ڕاسـتیی و چاكیی كەشف دەكات و دەناسێ، كە پێی دەگوتێ: (القوة العلْمیة) یان (القـوة النظریـة)، وە بەدووەمیشیان ئـەوەی لەهـەق و ڕاسـتییو چـاكە زانیویـەتی، بـەكردەوە جێبـەجێی دەكات و بەرجەستەی دەكات، ئـەمیش هێـزی كردەیـی (القـوة العملیـة) ی پێدەگوترێ، جاهێزی یەكەمیان بەگەیشتن بەپلەی (یقین) دەگاتە قۆناغ و لووتكەی كامـڵ بـوون (قمـة الكمال)، وە دووەمیشیان بەهۆی وەدەسـت هێنـانی خەسـڵەتی خـۆڕاگریی (صـبر) یـەوە

١– البقرة: ١٢٤

٢– هەندێك لەتوێژەرەوانی قورئان وشـەی (كلمـات) یـان بـەگوتنی (سـبحان الله والحمـد الله و ولاالـە الا الله والله أكبر) تەفسیر كردوە، بـەڵام ڕاسـتییەكەی ئەوەیـە كـە مـن نووسـیومەو توێـژەرەوانی دیكـەش وایـان گوتـوە، لەوەسفی (ابراهیم)یش دا وتراوە: (إن ابراهیم علیه السلام جعل بدنه للنیران وولده للقربان وقلبه للـرحمن ومالـە للضیفان)، كەواتە: كەسێك شایستەی پێشەوایەتییە لـەئایینی خـوادا كـە لەبەرانبـەر خـوادا دەسـتی لـەخۆیو هەرچی هەیەتی هەڵگرتبێو بۆ خوا ساغ و یەكلابووبێتەوە.

٣– السجدة: ٢٣ – ٢٤

بەھەرسێك جۆری: خۆڕاگریی لەسەر فەرمانبەرییو لەبەرانبەر سەرپێچی و لەئاقار بەلاو گرفتارییدا (الصبر على الطاعة وعن المعصية وعلى المصيبة)، دەگاتە چڵەپۆپەی تێرو تەواوی خۆی، جا خوا بەکەرەم و بەخششی خۆی تۆفیق و ھیدایەتی زاناو چاوساغانی ئیسلام بدات، کە وێڕای زانیاری قووڵ و فراوان، بەھۆی طاعەت و تەقواو تەزکیەو زیکرو فیکرو ھێزی مەعنەوییەوە، دڵ و دەروون و ڕووحیان ھێندە بەھێزو کێشندە (جاذبة) بێت و، لەئەنجامی ھۆشیاریی و بێداریی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئەزموون و شارەزایی چالاکی و مشوورخۆری سیاسی و خەبات و تێکۆشانی بێوچانی نێو کۆمەڵگا، کەسایەتییان ھێندە متمانەدارو باوەڕپێکراوو پشت پێبەستراوو دڵ پێخۆشکراوبێ، کە لەھیچ ڕوویەکەوە کەلێن و بۆشایی بۆ خەڵکی دی ناشایست نەڕەخسێ، بەناھەق خۆیان لەخەڵکی مسوڵمان بکەنە دەمڕاست و سەرکردەو پێشەواو مامۆستاو پێشەوایانیش بکەونە پەراوێزی کۆمەڵگاوە.

آمین

 بەشی چوارەم 

# چەند نموونەیەکی پڕشنگدار لەهەڵوێستی جوامێرانەی هەندێك لەزاناو پێشەوا ڕەسەنەکانمان:

## ڕێ خۆشکردن

**خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!** خوا پشتیوان بێ لەم بەشی چوارەمەدا وەك (لەهەر باغەی گوڵێك) کۆمەڵێك قسەو کردەوەی جوامێرانەو بوێرانەی ژمارەیەك لەزاناو پێشەوا ڕەسەنەکانی ئیسلام بەنموونە دێنینەوە، چونکە خوای کاربەجێ لەسووڕەتی (الفاتحە)دا دوای: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ یەکسەر فەرموویەتی: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾، چونکە هەمیشە ڕێبازو ڕاستە شەقامی خوای پەروەردگار بەدرێژایی مێژوو لە کۆمەڵێکی خواپێداو﴿ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾، دا خۆی نواندوەو تاقەڕێی دەرکەوتن و درەوشانەوەی هەق (حق)یش هەر ئەوەیە کە لەبەرەو کۆمەڵی هەق دا بەرجەستە بێت و دەربکەوێ و بەدەست و بازوو و خەبات و خوێنی ئەوان بەسەر (باطل)دا سەربکەوێ.

بۆیە ئێمەش پاش ئەوەی لەبەشی سێیەمدا ڕامان گەیاند کە پێویستە زانایانی ئیسلام و پێشەوایانی مسوڵمانان چۆن بن، لەم بەشی چوارەمەداو لەبەر ڕۆشنایی هەڵوێستی چەند زانایەك و قسەو ڕەفتاری شەرعییانەو پێشەوایانەیان دا، ئەو پرەنسیپ (مبدأ)انەی کە خستوومانەڕوو بەبەرجەستەیی‌و لەتابلۆو دیمەنی زیندوو و واقیعیدا پێشان دەدەین، تاکو دەربکەوێ کە زاناو پێشەوا ڕەسەن و ڕاستەقینە میراتگرەکانی پێغەمبەرﷺ هەموو ئەو خەسڵەت و ئاکارە بەرزو پەسەندانەی کە قورئان و سوننەت بۆیانیان دیاری کردوون، لەخۆیانیان دا هێناونە دی و پێش زمانی وتار بەزمانی کردارو ڕەفتار، دینداریی ڕاست و مسوڵمانەتیی ڕاستەقینەیان پێشانی خەڵکی داوەو

بۆیــان بوونەتــە سەرمەشــق و پێشــڕەو، وەك چــۆن پێغەمبــەری خــواش ﷺ پێشــڕەوو سەرمەشقی ئەوان بووە:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَـٰكُمۡ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدًاۗ ... ﴾[1]

بەڵام پێویستە لەم ڕێ خۆشکردنەدا ئاماژە بەچەند شتێك بکەین:

١- ئــەو زانــاو پێشــەوایانەی کــە بەنموونــە هێناومانتــەوە لەزۆربــەی توێــژە گرنگــەکانی کۆمەڵگای ئیسلامیین و تایبەت نین بەتوێژو مەسلەکێکی دیاری کراوەوە، چونکە زانایەتی (العالمیة) لە ئیسلام دا، وەك لەبەشی یەکەم دا تیشکمان خستۆتە سەری‌و پێناسەمان کردوە، جگە لە پسپۆڕیی و شارەزایی لەقورئان و سوننەت و خۆڕازاندنەوە بەو خەسڵەت و ئاکارانەی کە بۆ پێشەوایان بەمەرج گیراون، هیچ مەرج و بەند (شرط وقید)ێکی دیکەی لەسەر نیە، جا لەونموونانــەدا کــە هێناومانتــەوە، هــەم بابــای حــوکمڕان و، هــەم پێشــەوا (إمام)ی میحراب و، هەم موجتەهیدی سەر مەزەب و، هەم شێخ و ئوستادی پەروەردەو تەزکیەو، هەم بانگەوازی دانا (الداعي الحكيم) و، هەم نووسەری توانا (المؤلف القدير) و، هەم ڕۆشنبیری ئەدیب و بلیمەت و، هەم وتاردەرو دەرسبێژی زەبردەست و... هتد یان لەنێودان.

٢- ئــەو زانایانــەی بەنموونــە هێناومانتــەوە یــەکی تــەنیا هەڵوێســتێك یــان چــەند هەڵوێستێکمان لێ گێڕاونــەوە، نــەك ســەرجەم هەڵوێســتە ســەربەرزانەو جوامێرانــەکانیان، کەواتە باوانەزانرێ کەهەرچی هەیانبووە باس کراوە!

٣- وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، ئەو زاناو پێشەوایانەی کە لێرەدا ناویانمان هێنـاوە تەنیا گوڵبژێرێکی زاناو پێشەوایانی ئیسلامن نەك تێکڕایان، وە لەڕاستیدا زاناو پێشەوای لەو بابەتەمان یەکجار زۆرن.

٤- ئــەو قســەو ڕەفتارانــەی کــە لێیانمــان گێڕاونــەوە، وەك هەڵوێســتێکی جوامێرانــە، جۆراوجۆرن، بــەڵام ســەرجەمیان لەبازنــەی جوامێریی‌و بــوێریی و هەقبێــژیی و پابەنــدیی

---

١- البقرة: ١٤٣

بەشـەرعەوەدا کۆدەبنـەوەو، ئاشکراشـە کـە جـۆرو چـۆنیەتی هەڵوێسـت نوانـدنی زانـاو پێشەوایان، کات و شوێن و هەل و مەرج و قۆناغ و پێداویستی مسوڵمانان دیاریی دەکات، وەك گوتراوە: (لكلَ مَقامٍ مَقالٌ).

٥- مەبەسـتمان لەخسـتنەڕووی ئـەو هەڵوێسـتە بـەرزو جوانانـەی زانـاو پێشـەوا ڕەسـەنەکانی ئیسـلامیش، ئەوەیـە کـە چـەمك و واتـای زانـای ئیسـلام و میراتگرانـی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) چاکتر ڕۆشن بێتـەوە، تـاکو هەرکەسـێك بیـەوێ بیانکاتـە سەرمەشـقی خـۆی بەرچـاوی ڕوون بێـت، ئنجـا هـەروەك چـۆن پێغەمبـەری سـەروەری مرۆڤایـەتی موحەممـەدی کـوڕی عەبـدوللا ﷺ بۆیـە بەسـەرهات و سەرگوزەشـتەی پێغەمبەرانی پێشووی بۆ گێڕراونەوە، تـاکو بیانکاتـە سەرمەشـقی خـۆی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ... ﴾[1]، زانـاو مامۆسـتایانی ئێسـتاو هـەر ڕۆژگـارێکی دیکەش، پێویستە وێڕای پێغەمبەرانی خواو بەتایبەت گەورەو سـەروەریان (محمـد) ﷺ، ئەو زاناو پێشەوا ڕاستەقینانەش کە ڕابردوون بکەنە چاوساغ و پێشڕەوی خۆیـان، ئەگـەر نا لاف لێدانی ڕووتی:[2] شوێن کەوتنی پێشینەی چاك (إتباع السـلف الصـالح) و، دەعـوای بێشایەدیی:[3] ڕێـزو حورمـەت گـرتن لەپێشـەوا پێشـووەکان (إحـترام الأئمـة المتقـدمين)، بەتـەنها نـەك هـەر هـیچ دادێکـی خاوەنـەکانیان نـادەن، بگـرە لەسەریشـیان دەکـەون و پێشیان ناشیرین دەبن، وەك گوتراوە:

**وكُـلٌّ يَـدَّعي وَصْـلاً بِلَيْلَـى ‌ ‌ ‌ ‌ ولَيْلَــى لا تُقِــرُّ لَهُــمْ بِــذاكا**

چونکە شوێن پێهەڵگرتنی پێشینەی چاکمان و ڕێزو ئەدەب نواندن بەرانبەر بەزاناو پێشەوایەکانمان، خوا لێیان خۆش بـێ و بەچـاکترین شـێوە پاداشـتیان بداتـەوە و پلـەو پایەیان بەرزو بەرزتر بکاتەوە، بەوە دەبێ کە ئێمەش هەوڵ بدەین ئـەو ئاکـارو ڕەفتـارە بەرزانەی ئەوان لەخۆمان دا بێنینەدیو هەڵوێستە پڕشنگدارەکانیان دووبارە بکەینەوە.

---

١- الأنعام: ٩٠

٢- گەلێك گەنج و لاومان هەن لەشوێن کەوتنی سەلەفی صالح تەنیا ناو لەخۆنانیان پێبڕاوە!

٣- زۆر مەلاو بەناو پێشەوامان هەن هەر بەقسە ڕێزو حورمەت لەزاناو پێشـەوا پێشـووەکان دەگـرن و لـەئاکارو ڕەفتارو هەڵوێستەکانی وان زۆر دوورن!

## ئەو زاناو پێشەوایانەی کە هەڵمان بژاردوون

خوێنەرە بەڕێزەکان! لەم بەشەدا کە گەورەترین بەشی ئەم کتێبەیەو بۆ خستنەڕووی گوڵبژێرێك لەهەڵوێستی پڕشنگداری زاناو پێشەوایانی ئیسلام تەرخانمان کردوە، ئەم زانا بەڕێزانەمان هەڵبژاردوون:

١- حەسەنی بەصرایی

٢- عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی (زین العابدین)

٣- عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

٤- زەیدی کوڕی عەلی (ئیمام زەید)

٥- سوفیانی ثەوری

٦- ئەبوو حەنیفە (الامام الأعظم)

٧- ئیمام جەعفەری صادیق

٨- ئیمام مالك

٩- ئیمام شافیعی

١٠- ئیمام ئەحمەد

١١- ئەبولحەسەنی ئەشعەریی

١٢- ئیمام غەزالی

١٣- شێخ عەبدولقادری گەیلانی

١٤- ئیمام نەوەوی

١٥- شێخ ئەلعیز کوڕی عەبدولسسەلام

١٦- شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمییە

١٧- مامۆستا مەلا سەعیدی نۆڕسی

١٨- شێخ ئەمجەدی زەهاویی

١٩- مامۆستا حەسەنولبەننا

٢٠- مامۆستا ئەبولئەعلای مەودوودیی

٢١- مامۆستا سەیید قوطب

ئنجا وەك لە (ڕێخۆشكردن)یش دا باسمان كردوە، دووبارەی دەكەینەوە كە هەموو ئەو زاناو پێشەوایانەی نووسیومانن، هاووێنان (أمثال)ی زۆریان هەن و، ڕەنگە هاووێنەی وایان هەبێ لەهەندێكیان بەرجەستەتریش بێت، بەڵام بەهەرحاڵ ئێمە ئەمانەمان دیاریی كردوە كە هەڵوێستەكانیان وەك لەهەر باغەی گوڵێك و گوڵبژێرێك لێرەدا تۆمار بكەین، جا چ لەسۆنگەی ئەوەوە بووبێ كە بە بەرجەستەترمان زانیبن، وە چ لەبەرئەوە بووبێ كە ئەو جۆرە هەڵوێستانەی ئێمە پێویستمان بەخستنەڕوویان بووە لەمانەدا درەوشاوەتر بووبێ، وە چ لەبەرئەوە بووبێ كە ئاسانتر دەستمان لەو سەرچاوانە گیربووبێ كە ژیان و بەسەرهات و هەڵوێستەكانی ئەمانیان تێدا تۆمار كراوە! كە بێگومان هەركام لەم سێ هۆكارەش كەم و زۆر دەوریان بووە.

ئنجا بەپێویستی دەزانم كە لێرەدا ئەگەر تەنیا بەناوهێنانیش بێ ئاماژەیەك بەو زاناو پێشەوایانە بكەم كە لەدوای ڕۆژگاری (إبن تيمية)وە هاتوون، هەتا پێش سەدەی چواردەیەمی كۆچی و كەم و زۆر دەوریان بووە لەپارێزگاریی كردنی كۆمەڵگای ئیسلامیی، لەلادان و سەرلێشێوان، بەڵام دیارە ئەوانیش هەر گوڵبژێر دەكەین:

١- (أبو إسحاق الشاطبي) خاوەنی هەردووك كتێبی نایابی: (الموافقات) و (الإعتصام).

٢- (عبدالرحمن ابن خلدون) خاوەنی كتێبی ناوداری: (المقدمة).

٣- (ابن الوزير اليماني) خاوەنی كتێبی: (العواصم والقواصم في الذب عن سنة أبي القاسم).

٤- (ابن حجر العسقلاني) خاوەنی كتێبی بەرجەستەی: (فتح الباري: شرح صحيح البخاري).

٥-(السيوطي) خاوەنی دەیەها كتێبی جۆراوجۆر لەسەرجەم بوارەكانی زانستە شەرعییەكان دا.

٦- (سيد أحمد السرهندي) ناسراو بە (الإمام الرباني ومجدِّد الألف الثاني) و خاوەنی كتێبی (مكتوبات).

٧- (محمد بن علي الشوكاني) خاوەنی تەفسیری (فتح القدير) و (نيل الأوطار).

٨- (الشاه ولي الله الدهلوي) خاوەنی کتێبی (حجة الله البالغة) و (إزالة الخفاء عن خلافة الخلفاء).

٩- (الشيخ محمد بن عبدالوهاب النجدي) خاوەنی: (کتاب التوحيد) و چەندان کتێب و نامیلکەی دیکە.

١٠- (مولانا خالد الکردي الشهرزوري) کە (مرشد) ی چەندان زانای بلیمەت بووە کە ( الآلوسي) خاوەنی تەفسیری (روح المعاني) و (إبن عابدين) خاوەنی (حاشية ابن عابدين) دووانیانن.

هەروەها بەپێویستی دەزانم کەناوی ژمارەیەك لەو زاناو پێشەوا بەرجەستەو خاوەن هەڵوێستانەش بێنم کە لەگەڵ هەردووك زانای بەڕێز (مامۆستا مەلا سەعیدی نورسی) و (شێخ ئەمجەدی زەهاویی پشدەریی) دا هاوچەرخ (معاصر) بوون و، هەشیانە ئەگەر لەوان هەڵکەوتووتر نەبووبێ کەمتریش نەبووە، بەڵام ئێمە بۆیە ئەو دوو پێشەوا مسوڵمانە کوردەمان هەڵبژاردوون کە هەڵوێستەکانیان بخەینەڕوو، چونکە:

**یەکەم:** ئەو دوو بەڕێزە لەچاو برایەکانی دیکەیان کەمتر ناسراون و، ئەوانی دیکە، بەتایبەت هەندێکیان هەر زۆریان لەسەر گوتراوەو نووسراوە.

**دووەم:** هەڵوێستەکانی ئەو دووانە زۆر جوامێرانەو درەوشاوەن و بۆ مەبەستی ئێمە لەم نووسینەمان زۆر گونجاوو پڕ بەپێست و شایستەن.

**سێیەم:** هەردووکیشیان (کورد)ن و بێگومان هەقیان بەسەر گەلەکەیانەوە زۆرە.

ئەو زاناو پێشەوا هاوچەرخانەش، بۆیە ناوهێنان و ئاماژە پێکردنیان بەپێویست دەزانم، چونکە کەم و زۆر کاریگەرییان هەبووە لەسەر هۆشیاریی و بێداریی ئەم دواییەی جیهانی ئیسلامیی و ڕاپەڕین و جم وجۆڵە ئیسلامییەکان بەهەموو جۆرو شێوەکانیانەوە، وەبێگومان دیسان ئەوانیش هەر گوڵبژێرن و تەنیا خۆیان نین، ئەمانەن:

١-(السيد جمال الدين الأفغاني) هۆشیارکەرەوەی مسوڵمانان لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمی زایینی و دوا دوای سەدەی سێزدەیەمی کۆچیی و سەرەتای سەدەی چواردەیەمدا.

٢-(سلطان عبدالحميد الثاني) دوایین ڕەمزی خیلافەتی ئیسلامییەو، خاوەنی هەڵوێستی جوامێرانەی ئامادەبوون، بۆ دەست بەرداربوونی خەلیفایەتی و مل نەدان بۆ تەسلیم کردنی خاکی (فلسطين) بەجوولەکە.

٣- (عبدالرحمن الكواكبي) خاوەنی کتێبی (طبائع الإستبداد ومصارع الإستعباد).

٤-(الشيخ محمد عبده) چاکخوازی کۆمەڵایەتی (المصلح الإجتماعي) ناسراوو قوتابی (الأفغاني).

٥-(الشيخ رشيد رضا) خاوەنی دامەزراوەی مەنار (مؤسسة المنار)ی ناودارو قوتابی (محمد عبده).

٦- (عبدالحميد ابن باديس) زاناو پێشەوای گەورەی جەزائیریی.

٧- (الشيخ محمد جمال الدين القاسمي) خاوەنی تەفسیری (محاسن التأويل) ناسراو بە (تفسير القاسمي).

٨- (الأمير شكيب أرسلان) ناسراو بە (أمير البيان) مێژووزان و ئەدیبی زەبردەست.

٩-(الأستاذ محمد إقبال اللاهوري) شاعیرو بیریار (مفكر)ی ئیسلامیی زەبردەست.

١٠- (محمد أمين الجكني الشنقيطي) خاوەنی تەفسیری (أضواء البيان) و چەندان کتێبی دیکە.

١١- (الاستاذ مالك بن بني) نووسەرو هزروان (مفكر) ی ناوداری جەزائیریی.

١٢- (الشيخ ناصرالدين الألباني) فەرموودەناسی ناودارو خاوەنی چەندان کتێب و نامیلکە.

١٣- (الشيخ تقي الدين النبهاني) دامەزرێنەری حیزبی (التحرير) و خاوەنی چەندان کتێب و نامیلکەی ئیسلامیی.

١٤- (الدكتور علي شريعتي) خاوەنی چەندان کتێب و هۆشیارکەرەوەی مسوڵمانانی ئێرانی.

١٥- (الأستاذ سعيد حوى) خاوەنی (الأساس في التفسير) و (الأساس في السنة) و چەندان کتێبی دیکە.

١٦- (الدكتور عبدالله عزام) زانای موجاهیدو بووژێنەرەوەی ڕووحی جیهادو فیداکاریی لەنێو زۆر لە گەنج و لاوەکانی عەرەب دا.

١٧- (أبو الحسن الندوي) زاناو بانگەوازكاری مێژووزانی هەڵكەوتووی هیندستان كە خاوەنی دەیان كتێبی گرنگ و كاریگەری ئیسلامییە وەك: (ماذا خسر العالم بأنحطاط المسلمين) و (رجال الفكر والدعوة في الاسلام).

خوا بەكەرەمی خۆی لەهەموو ئەم زاناو پێشەوایانە لەهاو وێنەكانیشیان خۆش بێت و بەچاكترین شێوە پاداشتیان بداتەوە و پلەو پایەیان بەرزبكاتەوە.[1]

## ١- حەسەنی بەصرایی (رحمه الله):

حەسەنی بەصرایی (الحسن البصري) كە هەركام لەبابی (يسار) و دايكی (خيرة) كۆيلە بوون و ئازادكراون، لەساڵی (٢١)ی كۆچی لەشاری مەدینە هاتۆتە دونیاوە و لەساڵی (١١٠) كۆچی دوایی كردوەو، لەڕۆژگاری خۆیدا بەگەورەترین زاناو پێشەوای مسوڵمانان دانراوەو لەئەنجامی فەرمان بەچاكە كردنیو نەهی لەخراپەكردنی لەگەڵ كاربەدەست و دەستەڵاتداران دا سام و هەیبەت و ڕێزو حورمەتێكی تایبەتی هەبووە،[2] جائێمە لێرەدا تەنیا یەكێك لەهەڵوێستەكانی دەخەینەڕوو:[3]

(عمر بن هبيرة الفزاري) دوای ئەوەی لەلایەن (يزيد بن عبدالملك)ەوە كرا بە (والي) عێراق و پاشان (خراسان)یشی خرایەسەر، لەدوای هەركام لە (الحسن البصري) و (محمد بن سيرين) و (الشعبي) نارد، لەساڵی (١٠٣) ی كۆچی داو پێی گوتن:

بێگومان (يزيد) خەلیفەی خوایەو بەسەر بەندەكانیەوە كردوویەتە جێنشین، وەخوا بەڵێنی لەبەندەكانی وەرگرتوە كە فەرمانبەریی بكەن، ئەویش پەیمانی لەئێمەومانان وەرگرتوە كەگوێڕایەڵی و فەرمانبەریی (سمع وطاعة) ی بكەین، وە خۆشتان

---

١- بێگومان هیچ كام لەم زانایانە لەهەڵەو كەم وكوڕیی حاڵی نەبووە و كورد گوتەنی: (بەندە بێعەیب نابێ) ئێمەش پێویستە هەم لەچاكەكانیانەوە فێری چاكە بین و هەم لەهەڵەو پەڵەكانیشیان دەرس و پەند وەربگرین، بەڵام عادەتی مێشە ڕەشە (ذباب)مان نەبێ كە هەر بەدوای شتی پیس و خاڵی ڕەش دا دەگەڕێ.

كەسانێكیش كە (جمال الدين الفغاني) و (محمد عبده) بەكرێگیراوی كوفرو (حسن البنا) بە (مبتدع) و (ابوالأعلى المودودي) بە (رافضي) و (في ظلال )ی شەهید سید قطب بە (في ضلال) دادەنێن و ناودەبەن!! لێرەدا هەر دەرفەتی ئەوەم هەیە دووعای شیفایان بۆبكەم!

٢- بڕوانە: (إقتضاء الصراط المستقيم...) ابن تيمية، ج١ص١٠٢، پەراوێزی (محقق).

٣- بڕوانە: (رجال الفكر والدعوة في الاسلام) أبو الحسن الندوي، ج١ص٦٦تا٧٢.

دەبینن کە چ کارێکی بەمن سپاردوە، جا جاری وایە کارێکم پێ دەسپێرێ و منیش ئەوەی پێم دەڵێ – هەرچۆنێکی بێ – ئەنجامی دەدەم، جا ئایا ئێوە ڕاتان چییە؟!

جا هەرچی (إبن سیرین) و (شعبی) بوون بە تەقیە (تقیّة) وە قسەیان کرد، ئنجا (إبن هبیرة)! ڕووی کردە حەسەن و گوتی تۆ چی دەڵێی؟! ئەویش گوتی: إبن هبیرة! خَفِ الله في يزيد ولا تخَفْ يَزِيْدَ في الله! ان الله يَمْنعك مِنْ يزيد، وانَّ يزيدَ لا يَمْنَعُكَ مِن الله. وأوشَك أنْ يَبْعَثَ اليك مَلَكاً فَيُزيْلُك عن سَريرك ويُخْرِجُك مِنْ سعَةِ قصْرِك الى ضيقِ قبْرِك ثم لايَنجيك الاّ عَمَلُكَ.

ياإبن هُبَيرة! إن تعْصِ الله فأنما جَعَل الله هذا السُّلطانَ ناصراً لدين الله وعبادهِ فَلا تركبنَّ دين اللهِ وعِبادهِ لِسُلْطانِ الله. فأنه لا طاعة لِمَخلُوقٍ في مَعصيةِ الخالِقِ).

واتە: ئەی (إبن هبیرة)! لەبێ فەرمانیی کردنی (یزید) دا لەخوا بترسە، نەك لەبێ فەرمانی کردنی خوادا لە (یزید) بترسی! چونکە خوا لە یەزیدت دەپارێزێ، بەڵام یەزید لەسزای خوات ناپارێزێ، وە نیزیکە خوا فریشتەیەکت بنێرێتە لاو لەسەر تەختەکەت لات بەرێ، وە لەکۆشکە فراوانەکەتەوە بەرەو گۆڕی تەنگت وەدەرت بنێ، پاشان جگە لە کردەوەت هیچ شتێك قوتارت ناکات، ئەی (إبن هبیرة) ئەگەر سەرپێچیی خوا بکەی، ئەوە بزانە کەخوا ئەو حوکمڕانەی داناوە تاکو پشت و پەنای ئایینەکەی و بەندەکانی بێت، جا وریابەو نەکەی حوکمی ئایینی خواو هەقی بەندەکانی بۆ ئەو حوکمڕانە پێشێل بکەی، چونکە بێگومان لەسەرپێچیی کردنی بەدیهێنەردا نابێ فەرمانبەریی دروست کراوان بکرێ!)

ئنجا (إبن هبیرة)ش خەڵاتی کردن و هی حەسەنی دووقات کرد، جا (شعبي) بە (إبن سیرین)ی گوت: ئێمە نەرمییمان بۆ کێشا بۆیە ئەویش سووکی بۆ کێشاین!



## ٢- عەلی کوڕی حوسەین (زین العابدین) رضي الله عنهما:[١]

(علي بن الحسين بن علي بن أبي طالب) خوا لەخۆیو باباوباپیری و دایك و نەنکی ڕازی بێت، شۆرەتی (زين العابدين)ی هەبووەو لەساڵی (٥٠) یان (٣٣)ی کۆچی لەشاری (مدینه) لەدایك بووەو لەساڵی (٩٤) یان (٩٢) هەر لەویٚ کۆچی دوایی کردوە، یەکێکە لەزاناو پێشەوا بەرجەستەکانی چین (طبقة)ی (تابعين) و زانای پایە بەرز (الزهري) گوتوویەتی: (لَمْ أُدْرِكْ بالمدينةِ أفْضَل مِنْهُ) لەمەدینەدا هیچ کەسم نەبینیوە لەوی چاکتر بووبیٚ.

شایانی باسیشە کە (زين العابدين) تاقە کوڕی (حسين بن علي بن أبي طالب)ە، خوا لێیان ڕازیبیٚ کە بۆتە مایەی وەچە لیٚکەوتنەوە (بقاء نسل)ی پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕیٚی (حسين)ەوە، چونکە لەکارەساتی شوومی (كربلاء) و لەچەنگ قەتڵعامی سوپاو جەندرمەکانی (يزيد بن معاوية) لەکوڕەکانی حوسەین تەنیا عەلی (زين العابدين) دەرباز بوو!

هەربۆیەش (زين العابدين) هەمیشە مات و مەلوول و دڵتەنگ بووەو زۆر گریاوەو ئاخ و داخی هەڵکێشاوە، جا جاریٚکیان لەوبارەوە پرسیاری لیٚدەکەن، کەبۆچی هێندە خەفەتبارو دڵتەنگە؟! ئەویش لەوەڵام دا دەڵیٚ: (يعقوب) سەلامی خوای لیٚبیٚ هێندە بۆ (یوسف)ی کوڕی(سەلامی خوای لیٚ بیٚ) گریا هەتا چاوەکانی سپی بوون، لەحاڵێك دا کەدەشیزانی نەمردوە! بەڵام من (١٠-١٥) کەسم لەبنەماڵەی خۆم بینی کە پێش نیوەڕۆیەك سەربڕران! جائایا قەت غەم و پەژارەیان لەدڵم لادەچیٚ؟!

جا ئێمە تەنیا ئەم سیٚ هەڵوێستە لەباغی هەڵوێستەکانی ئەو کەڵە پێشەوایەی خانەدانی پێغەمبەری خوا ﷺ گوڵبژێر دەکەین:

**یەك:** (نَوَوي) لە کتێبی (تهذيب الأسماء واللغات)دا هێناویەتی کە (شيبة بن نعامة) گوتوویەتی: (لما تُوفِّي علي بن الحسين وجَدوهُ يُقوِّتُ مائة أهل بيتٍ بالمدينة في السِّرِّ).

---

١- بۆ نوسینی ئەم باسە پشتم بەم دوو سەرچاوەیە بەستوە: (تهذيب الأسماء واللغات) للنووي، القسم الاول/ ج١ص٣٤٧، وە: (تأريخ المذاهب الإسلامية)ی محمد أبو زهره، ص٦٥٠ تا ٦٥٢.

واتە: کاتێك عەلی کوڕی حوسەین (خوا لێیان ڕازیبێ) کۆچی دوایی کرد خەڵکی زانیان کە مەسرەفی (١٠٠) ماڵی بەپەنهانی لەمەدینەدا کێشاوە!!

سەرنج بدەن و بەراوردی ئەم هەڵوێستە مەردانە و جوامێرانەیەی (زین العابدین) بکەن لەگەڵ خێرو چاکەکردنی مسوڵمانانی خێرخوازی ئەم ڕۆژگارە، کەهی وایان هەیە چەند دینارێك دەکاتە خێر، ئەهلی گەڕەك و گوند هەموویان پێی دەزانن! بەڵام عەلی کوڕی حوسەین: کوڕی نەوەی پێغەمبەری خواﷺ، نەك ماڵێك و دووان بەڵکو سەد ماڵ و خێزانی بەخێو کردوە، بەڵام کە مردوە و کەلێنی دەرکەوتوە پێی زانراوە! دەك هەزار ڕەزاو ڕەحمەتی خوات لێبێ بەڕاستی شۆرەتی (زین العابدین)ت لایقە!

**دوو:** جارێکیان کەنیزەکێك بە مەسینەیەك ئاو لەدەستی (زین العابدین) دەکات بۆ دەستنوێژگرتن و مەسینەکەی لەدەست دەکەوێتە خوارێو ڕووی بریندار دەکات، ئەویش بەگلەییەوە سەری بۆلا هەڵدەبڕێ! کەنیزەك (جاریة)ەکەش دەڵێ خوای بەرز فەرموویەتی: (والكاظمين الغيظ) – ئەوانەی تووڕەیی خۆیان قووت دەدەنەوە –، ئەویش دەڵێ: دەجا ئەوە ڕقی خۆمم کپ کردەوە، ئەوجار دەڵێ: (والعافين عن الناس) – ئەوانەی چاوپۆشی لەخەڵکی دەکەن – دەڵێ: خوالێت ببووری، ئەوجار دەڵێ: (والله يُحبُّ المحسِنين) – خوا چاکەکارانی خۆش دەوێ – ئەویش دەڵێ: دەبڕۆ لەڕێی خوادا ئازادبە!!

**سێ:** لەڕۆژگاری (زَيْن العابدين) دا شیعەکان کە لەسەرەتاوە لەگەڵ جەماوەری مسوڵمانانی ناسراو بە (أهل السنة والجماعة) تێکەڵ بوون و جیانەبوون ئەوەندە هەیە مەیلی زیاتریان بەلای (عەلی)و کوڕو نەوەکانیدا هەبوو – خوا لێیان ڕازیبێ – وە کەم و زۆر لایەنگرییان دەکردن، وردە وردە کۆمەڵێك لەنێویان دا سەریان هەڵدا کە دواتر بە (غلاة الشيعة) و بە (رافضة) ناسران.

جا جارێکیان کۆمەڵێك لەوانە دێنە لای و قسە بە دوو وەزیرە بەڕێزەکەی پێغەمبەری خواﷺ (ابوبكر الصديق) و (عمر الفاروق)(خوا لێیان ڕازیبێ) دەڵێن! ئەویش بۆ دەمکوت کردن و تەمبێ کردنیان لێیان دەپرسێ:

ئایا ئێوە لەو کەسانەن کەخوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی:

﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ... ﴾[1]؟! دەڵێن: نەخێر، دەڵێ: ئەدی لەوكەسانەن كە خـوا لەبارەیانـــەوە فەرموویـــەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ ... ﴾[2] ؟! دەڵێن نەخێر.

ئەوجار پێیان دەڵێ: دەجا ئەوە خۆتان شایەدییتان لەسەر خۆتان دا كە نەلەئەوانن و نـە لەئـەوانن – مهـاجرون وأنصـار–، وەمنـیش شـایەدیی دەدەم كـەئێوە لەكۆمـەڵی سێیەمیش نین، كە خوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَـٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ... ﴾[3]!!

ئنجا دەری‌كردن و پێی گوتن: (فقوموا عَنّي لا باركَ اللهُ فيكم ولا قَرَّب دُورَكُمْ.. أَنْتُمْ مُسْتَهْزِئونَ بالإِسْلامِ ولَسْتُمْ مِنْ أَهْلِه) واتە: دەهەستن خوا بـەزیادتان نـەكات و ماڵـەكانتان لەئێمەوە نیزیك نەخات... ئێوە گاڵتە بە ئیسلام دەكەن و ئەهلی ئیسلام نین!

دیارە مەبەستی ئەو كەڵە پێشەواو زانایەی بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ ئـەوە بـووە كـە خوا مەدح و ستایشی سێ كۆمەڵە مسوڵمانی كردوە:

١- كۆچكەرانی ڕاست (المهاجرون الصادقون).

٢- پشتیوانانی سەرفراز (الأنصار المفلحون).

٣- شوێن كەوتووانی وەفادار (التابعون الأوفياء).

جـا ئـەو كەسـانە كـە بەرانبـەر بـە ئەبووبـەكر و عومـەر (خـوا لێیـان ڕازی‌بـێ) بـێ ئەدەبی‌یان كردوە، خۆیان پێیان لێناوە كە لەڕیزی (المهاجرين والأنصار) دا نین و، (زین العابدین)یش پێی ڕاگەیاندوون، كە لە كۆمەڵی سێیەمیش نین، كە بەڕێزو وەفاداریی‌یـەوە دووعای خێر بۆ هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەكەن!

---

١- الحشر: ٨

٢- الحشر: ٩

٣- الحشر: ١٠

## ٣- عومەری کوڕی عەبدولعەزیز(رحمه الله):

(عمر بن عبدالعزيز) كە زۆربەی مێژووناسان بەیەكێك لەخەلیفە ڕاشیدەكانی دادەنێن و لەساڵی (١٠١)ی كۆچیدا لەتەمەنی (٣٩) ساڵی و چەند مانگێك دا مردوەو هەموو ماوەی خەلیفایەتی‌یەكەی (٣٠) مانگ، **واتە** دوو ساڵ و شەش مانگ بووە، بەڵام لەماوەی ئەو دووساڵ و نیوەدا شۆڕش و گۆڕانكاریی‌یەكی كردوە كە ئێستاشی لەگەڵ بێ خەڵكی پێی سەرسامن!

**ئەمەش گوڵبژێرێكی هەندێك لە هەڵوێست و ئاكارو ڕەفتارەكانی:**[1]

### یەك: دەست پێكردنی شۆڕش و گۆڕانكاریی لەخود (ذات) دا:

عومەر خوا لێی خۆش بێ، بۆ گێڕانەوەی كۆمەڵگاو میللەتی مسوڵمان بۆ سەر ڕاستە شەقامی ئیسلام، كە ماوەیەك بوو ئەمەوییەكان بەرەو نەفامێتی (جاهلية) یان بردبۆوە لەزۆر ڕووەوە، لەخۆیەوەو لەماڵ و خێزانی‌یەوە دەستی پێكرد:

أ- سەرەتا هەموو ئەو پارەو پوول و كەل وپەل و شمەكانەی كە نەرێتی ئەمەوی‌یەكان وەك میراتێك بۆی بەجێ‌هێشتبوو، گێڕانیەوە بۆ (بيت المال).

ب- **هەروەها** سەرجەم كەنیزەك (جارية)ەكانی ناردنەوە لای كەس وكارو وڵاتی خۆیان.

ج- وە كۆڕو مەجلیسەكانی كەوەك هی ئیمپراطورەكانی ڕۆم و فارسیان لێ‌كرابوو، گۆڕینی و گێڕانیەوە سەر حاڵەتی ئیسلامیی خۆیان، ڕاوەستان (قيام)ی قەدەغە كرد، وە خۆی لەسەرەتاوە سڵاوی دەكرد، وە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن هاتنە ژوورەوەی موباح كرد.

د- هەرچی خانوو و بەرەو زەوی و زاری بووی، هەروەها خشڵ و زێڕو زیوی (فاطمَه)ی خێزانیشی، گێڕایەوە بۆ (بَيْت المال).

هـ- هەم لەڕووی بەرگ و پۆشاك و هەم خواردن و خۆراكی خۆی و خێزانی‌یەوە بە سادەترین ئەندازەو شێوە مەداری دەكرد، تەنانەت جاری وابوو بۆ نوێژی جومعە

---

١- بڕوانە: (رجال الفكر والدعوة في الاسلام) ج١ص٣٢ هەتا٦٢.

دواکەوتوە تاکو تاقە پۆشاکەکەی کە شۆڕڕاوە وشك دەبێتەوە، وە گەلێك جار منداڵەکانی تەنیا نیسك و پیواز، پێخۆریان بووەو..هتد.

## دوو: پاککردنەوەو ڕاست کردنەوەی دام و دەزگاکانی حوکمڕانیی:

أ- سەرەتا چەند (والـي)و کاربەدەستێکی ستەمکار کەخەڵك و میللەت بەدەستیانەوە ئاه و ناڵەیان بوو لایدان و گۆڕینی.

ب- پاشان دەستی کرد بەلابردنی هەموو ئەو بێدادییانە (مظالم)ی کە بەدرێژایی حوکمڕانیی ئەمەوییەکان کەڵەکەیان کردبوو، بۆ ئەم مەبەستەش خەڵات و بەخششێکی(١٠٠) هەتا(٣٠٠) دیناری دانابوو بۆ هەرکەسێك کە کێشەو گرفتێکی تایبەتی یان گشتی دین و ژینی مسوڵمانانی بۆ بێنێ بۆ چارەسەرکردنی!! کە دەقی نامەکەشی لەو بارەوە ئەمە بووە: (أما بعدُ، فأيّما رجُلٍ قَدِمَ إِلَيْنا في رَدِّ مَظْلَمةٍ أو أَمْرٍ يُصْلِحُ الله بِهِ خاصاً أو عاماً مِنْ أمر الدين، فَلَهُ ما بَيْنَ مائةِ دينارٍ الى ثلاثة مئة بقدر مايُرى من الحِسْبَهِ وبُعْدِ السَّفرِ..)[١].

ت- هەروەها هەموو ئەو باج و گومرگ و سەرانە جۆراوجۆرانەی کە بەستەم خرابوونە سەر هاووڵاتیان بە هەموو چین و توێژەکانیانەوە، لایبردن، مەگەر ئەوەی شەرع ڕێی بدات و خەڵك لەتوانایان دا هەبێ.

**بۆ وێنە**: یەکێك لە والییەکانی سکاڵای بۆ لا دەکات کە ئەگەر بێت و هەموو ئەوانەی (أَهْلُ الذِمَّة) کە مسوڵمان دەبن، سەرانە (جزية) یان لەسەر لابچێ، مەترسی ئەوە هەیە (بيت المال) هیچی وای تێدا نەمێنێ، بۆیە پێشنیار دەکات کە هەرچەندە مسوڵمانیش ببن با سەرانە هەربدەن! ئەویش لە نامەیەك دا بەرپەرچی ئەو پێشنیارە سیاسییە ناشەرعییە دەداتەوە و ڕستەیەکی بۆ دەنووسێ کە پێویستە بە ئاوی زێڕ بنووسرێ و بەڕاستی کاکڵ و جەوهەری (الخلافة الراشدة)ی تێدا دەدرەوشێتەوە: (إِنَّ الله جَلَّ ثناؤُهُ بَعَثَ محمداً ﷺ داعياً ولَمْ يَبْعَثْهُ جابْياً)[٢].

---

١- بڕوانە: (سيرة عمر بن عبدالعزيز) لابن عبدالحكم، ص١٤١.

٢- بڕوانە: (كتاب الخراج) لأبي يوسف، ص٧٥.

پ- پاشان كارێك دەكات كە عادەتی دەست بڵاویی و زیادەڕۆیی لەنێو سیستەمی حوكمڕانیی و ژیان و گوزەرانی كاربەدەستاندا لابەرێ و فێری دەست پێوەگرتن و میانەڕەویی (إقتصاد)یان بكات، بۆئەوەی ماڵ و سامانی (بیت المال) كە هی سەرجەم مسوڵمانانە بەفیڕۆ نەڕوات، ئەوەتا لە نامەیەكیدا كە وەڵامی یەكێك لە كاربەدەستەكانی دەداتەوە، كە داوای قاقەز (قرطاسیة)ی زۆری كردوە! فەرمانی پێدەكات كە دەست پێوەبگرێو بەخەتی وردو دێڕی پڕو كورت و پوخت بنووسێ بۆئەوەی بەبێ هوودەو بەقسەی زۆرو بۆر باری شانی (بیت المال)ی مسوڵمانان قورس نەكرێ: (... فأذا جاءَك كتابي هذا فأرِقَّ القَلَمَ، وآجمع الخط، وأجمع الحوائج الكثيرة في الصحيفة الواحدة، فأنه لا حاجة للمسلمين في فضلِ قولٍ أضرَّ ببيت مالِهِمْ، والسلام عليكم)[1].

## سێ: گرنگیی دان بەزانستە شەرعییەكان و ڕێز لێگرتنی زانایان و دەستبار بۆ گرتنیان:

أ- عومەری كوڕی عەبدولعەزیز(ڕەحمەتی خوای لێبێ) بەدان پێداهێنانی زاناو پێشەوایانی ئیسلام یەكێك بووە لە زانا ڕەببانییە ڕۆچووەكان (العلماء الربانيين الراسخين) و (الذهبي) لەكتێبی (تذكرة الحفاظ)دا گوتوویەتی:[2] (كانُ يقْرَنُ بالزُهريّ في علْمِهِ) واتە: لەزانیاری دا لەگەڵ (الزهري) دەچووە تەرازووەوە!، وە (مجاهيد) گوتوویەتی:[3] (أتَيْناهُ لِنُعَلِّمَهُ فَما برِحْنا حتَى تَعلَّمْنا مِنْهُ) واتە: چووینە لای كە زانیاری فێربكەین، كەچی بەجێمان نەهێشت هەتا ئەو ئێمەی فێركرد!

وەئەگەر لەبەر سەرقاڵییەكان و ئەرك وكاری خەلیفایەتی نەبووایە یەكێك دەبوو لەپێشەوا بەرزەكان و شەرعزانە زەبردەستەكان.

---

١- بڕوانە: (سيرة عمر بن عبدالعزيز) لأبن عبدالحكم ص٦٤.

٢- بڕوانە: (تذكرة الحفاظ) ص١٠٦. واتە: خوای بەرزو مەزن موحەممەدﷺ ی بە بانگخواز ڕەوانە كردوە نەك ماڵ كۆكەرەوە.

٣- هەمان سەرچاوەی و لاپەڕە.

ب- كارێكی یەكجار گەورەو خزمەتێكی زێدە بەرچاوی كە لەوبارەشەوە كردی ئەوەبوو كە (أبوبكر محمد ابن حزم) - كە یەكێك بووە لەپێشەوا لێهاتووەكانی ئەو ڕۆژگارە - ی ڕاسپارد كە فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خواﷺ كۆبكاتەوەو بۆی نووسی:[1] (أنظر ماكان مِنْ حديث رسول اللهﷺ فاكْتُبْهُ فأني خِفْتُ دروسَ العِلْمِ وذهاب العُلماءِ)، هەروەها نامەی بۆ سەرجەم والیەكانی نووسی كە هەمان كاربكەن: (انظروا الى حديث رسول الله ﷺفأجْمَعُوهُ)[2].

ت- كارو خزمەتێكی دیكەشی ئەوەبوو كە مووچە (معاش) ی بۆ زانایان بڕیەوە تاكو بۆ بڵاوكردنەوەی زانست دەست بەتاڵ (مُتَفرِّغ) بن لەو بارەوە (محمد بن الحكم) ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە:[3]

عومەری كوڕی عەبدولعەزیز (يزيد بن أبى مالك) و (الحارث بن محمد) ی ناردنە بیابان و لادێیەكان تاكو ڕێبازی پێغەمبەرﷺ فێری خەڵكی بكەن، وە مووچەی بۆ بڕینەوە، جا (یزید) وەری گرت، بەڵام (حارِثْ) وەری نەگرت و كاتێك عومەر بیستیەوە گوتی: (مانَعْلَمُ بِما صَنَعَ يَزيدُ بأساً، وأكْثَرَ الله فينا مِثلَ الحارِثِ) واتە: پێمان وانیە هەڵوێستی (یەزید) (كە مووچەی وەرگرتوە) شتێكی تێدا بێ، بەڵام خوا هی وەك (حارث)مان بۆ زۆر بكات!!

## چوار: گرنگیی و بایەخ دانی بە بانگەوازو خەڵك بانگ كردن بۆ ئیسلام:

عومەر خوا لێی خۆش بێ هەر بەوەندە وازی نەهێنا كە یاساكانی شەریعەت لەنێوخۆی كۆمەڵگای ئیسلامیدا جێبەجێ (تطبيق) بكات، بەڵكو گرنگییەكی زۆریشی بەبڵاوكردنەوەی ئیسلام بانگەوازكردنی خەڵكی نامسوڵمان دا، وە بەهۆی ساغیی و ڕاستیی خۆیەوە و چاك بەڕێوەبردنی حوكمی ئیسلامییەوە كاریگەرییەكی گەورەی

---

١- بڕوانە: (تأريخ أصبهان) لأبي نعيم.

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- بڕوانە: (سيرة عمر بن عبدالعزيز) ص١٦٧.

کردە سەر خەڵکی نامسوڵمانیش و زۆر لە میللەتان لەڕۆژگاری ویدا و بەهۆی نامەکانی و بانگەوازییەوە مسوڵمان بوون.

(البلاذري) لەکتێبی (فتوح البلدان)دا گوتوویەتی:

(وە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نامەی بۆ پاشاکانی هیند (ملوك الهند) نووسی، بانگی کردن بۆ ئیسلام و بۆ فەرمانبەریی کردن کە لەبەرانبەردا هەر بیانکاتەوە بە پادشا، وە لە ئەرك و ماف دا وەك باقی مسوڵمانان بن، دیارە پێشتریش ناوو شۆرەتی ئەویان پێگەیشتبوو، جا مسوڵمان بوون و ناوی عارەبانیان لەخۆیان نا).

هەروەها لە ڕۆژگاری ئەودا زۆر لەگەلی (بَرْبَرْ) و خەڵکی (مغرب) مسوڵمان بوون، دوای ئەوەی نامەی بۆ نووسین و والی (مغرب) کە (إسماعیل بن عبدالله بن أبی المهاجر)ی ناوبوو، لە کۆڕو مەجلیسەکانیان دا بەسەریدا خوێندنەوە.

دیسان زۆر لە پادشاو دەسەڵاتدارەکانی (ماوراء النهر)یش بەهەمان شێوە بەنامەو بانگەوازی وی هاتنە نێو ئیسلامەوەو باج و (خراج)ی لەسەر لابردن.[1]

یاخوا هەزاران ڕەزاو ڕەحمەتی خوات لێبێ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز!



١- بڕوانە: (الإسلام والحضارة العربية) محمد كرد علي، ج٢ص١٨٩.

## ٤- زەیدی کوڕی عەلی (ئیمام زەید) رحمة الله تعالى عليه:[١]

ناوی: (زيد بن علي بن الحسين بن علي بن أبي طالب)، خـوا لێیـان ڕازیبێ لەسالّی (٨٠)ی کۆچی لەشاری (مدینـة) لـەدایك بـووەو لەسالّی (١٤٢) لەسـەردەمی حـوکمڕانێتی (هشام بن عبدالملك بن مروان) و لەجـەنگێکی ڕەوای نابەرابـەردا شـەهید کراوەو، بنیـات نەری مەزەبی زەیدیی (المذهب الزيدي)یەو، یەکێکە لـەزاناو موجاهیـدە هەڵکـەوتووەکانی بنەماڵەی بەڕێزی پێغەمبەری خواﷺ .

جا ئێمە لەژیان و بەسەرهاتی ئـەو زانـاو سـەرکردە ڕەنـدو ئاکار پەسـەندەش ئـەم چەند هەڵوێستە جوامێرانەیەی گوڵبژێر دەکەین:

**یـەك:** (هشـام بـن عبـدالملك) مەترسـی زۆری لـە (زیـد) هـەبوو و خسـتبوویە ژێـر چـاودێرییەکی تونـدەوەو هـەر بەوەندەشـەوە نەوەسـتاو ویسـتی لەبەرچـاوی خـەڵکی سووکی بکات و وای پێشان بدات کە لەگەڵ خزمەکانیدا ناکۆك و ناتەبایـە، جـا ئـەوەبوو زەید لەگەڵ هەندێك لەکوڕەکانی مامی (حسن بن علي بن أبـي طالـب) دا خوا لێیـان ڕازیبێ لەسەر وەقف (وقف)ێکی (علي بن أبى طالب)(خـوا لێـی ڕازیبـێ) کێشـەو مشـت ومڕیـان هەبوو، کە ئایا دەبێ کامیان سەرپەرشتیی بکات، جا ئەوەبوو کە (هشام) والی (مدینـە)ی ئاگادار کرد –ناوی (خالد) بوو– کـە هەرچۆن بـووە دەبـێ کـارێکی وابکـات کێشـەکەیان ببەنە لای وی و ئەویش بە ئانقەست درێژەی پێبـدات و بیـوەخرێنێ تـاکو ببنـە بنێشـتە خۆشکەی سەر زاری خەڵکی!

دیارە (زید) دەیزانی (هشام) و (خالد) چییان لەبن سەردایە، بۆیـە لـەکاتێك دا کـە والی خەڵکی مەدینەی هـەموو لـە مزگـەوت کۆکردبـووەوە، تـاکو تەماشاچـی مشـت ومـڕو هــەرای نێــوان زەیــدو بنەماڵــەی مــامی بــن، وە (عبــدالله) چــوو کــە لەنوێنەرایــەتی بنەماڵەی(حسن) خوا لێی ڕازیبێ قسەبکات! زەید بـانگی کـردو گـوتی: (لاتَجْعَـلْ یـا أبـا محمد! أعْتَقَ زَیْدٌ ما یَمْلِكُ إن خاصَمَك الى خالِدٍ أبداً) واتە: بـابی موحەممـەد پەلـە مەکـە! هەموو کۆیلەو کەنیزەکەکانی زەید ئازاد بن، ئەگەر هەرگیز کێشـەیەکت لەگـەڵ بباتـە لای

---

١- بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لە (تأريخ المذاهب الإسلامية)ی محمد أبو زهرة، وەرگرتـوە بڕوانـە ص: ٦٥٢ – ٦٦١.

خالید! ئنجا ڕووی کردە خالید و گوتی: (أَجَمَعْتَ ذُرية رَسول الله لأمْرٍ ماكان يَجْمَعُهمْ عليه أبوبكرٍ ولا عمرُ؟!)

واتە: بۆچی وەچەو بنەماڵەی پێغەمبەری خوات بۆ کارێك خڕ کردوونەوە کە هیچ کات ئەبووبەکرو عومەر بۆ ئەوە کۆیان نەدەکردنەوە؟!

بەوجۆرە زەید نەخشەو پیلانێکی گڵاوی (هشام)ی هەڵوەشاندەوە، والیش هیچ چارەی نەما ئەوە نەبێ کە هەندێك خەڵکی سووکەڵەو نەفامی لەزەید هان دا کە جنێوی پێبدەن! بەڵام زەیدی ڕەوشت بەرزو زانای نەلەخشاو هیچ خۆی شلوێ نەکرد و بەهێمنیی پێی گوتن: (إنّا لانُجيْبُ مِثلكَ) ئێمە وەڵامی بابای وەك تۆ نادەینەوە!!

**دوو:** (هشام بن عبدالملك) بەهەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا زەید سەغڵەت و نارەحەت بکات، بۆ وێنە:

جارێکیان کە زەید دەچێتە عێراق و دەگەڕێتەوە مەدینە، والی مەدینە کە ئەوکاتە (خالد بن عبدالله القسْري) دەبێ، پێشوازیی دەکات و ڕێزو حورمەتی دەگرێ و لەسەر ئەوە خالید لادەدرێ و والییەکی دیکەی لەشوێن دادەنرێ و ئەو والییە بەناهەق زەیدو خزمەکانی تۆمەتبار دەکات، کە خالیدی کوڕی عەبدوڵلای قەسری ماڵ و سامانی بەئەمانەت لەلاداناوە و بەو تۆمەتە زەیدو خزمەکانی ڕاپێچی عێراق دەکرێن، تاکو لەو بارەوە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکرێ!

لەسۆنگەی ئەوەوە زەید ڕەحمەتی خوای لێبێ ناچار دەبێ بۆ کەمکردنەوەی ئەو هەموو گوشارو سەغڵەت کردنانەی خۆیو خزمەکانی بچێتە شام بۆ سەردانی هیشام تاکو سکاڵای حاڵ و باڵی خۆی لەلا بکات!

بەڵام کە دەچێت هیشامی بێتام و نەفام بەمەبەستی زەلیل کردنی ڕێی نادات بچێتە لای! ئنجا زەید وەرەقەیەکی بۆ دەنووسێ کە مۆڵەتی بدات و هیشامیش هەر لەخوار قاقەزەکەی خۆیەوە بۆی دەنووسێتەوە: (إرْجعْ الى مَنزِلكَ في المدينةِ) بگەڕێوە ماڵەکەی خۆتان لە مەدینە! ئنجا دوای چەندجارێك هەوڵ و تەقەللا سەرەنجام ڕێی دەدات بچێتە ژوورو کە دەشچێتە ژوورێ ڕێزی ناگرێو لەشوێنێکی ئاسایی کە چۆڵە دادەنیشێ و یەکسەر دەڵێ:

(يا أمير المؤمنين! لَيْسَ أحدٌ يكْبُرُ عنْ تَقْوى الله، ولا يَصْغُرُ دون تَقْوى الله) واته: ئەی فەرماندەی بڕواداران! هیچ کەس هێندە گەورە نیە کە پارێز لەخوا نەکات و، هیچ کەسیش لەوە گچکەتر نیە کە پارێز لەخوا بکات!!

هیشامیش دەڵێ: (أُسْكُتْ لا أُمَّ لك! أنْتَ الذي تُنازِعُكَ نَفْسُك في الخلافةِ، وأنْتَ ابنُ أمةٍ؟!!) بێدەنگ بە دایکت نەمێنێ! تۆی کە کەڵکەڵەی خەلیفایەتیت لە کەللەدایە لە حاڵێك دا کە دایکت کەنیزەك بووە؟!!

ئەویش مەردانە وەڵامێکی ددان شکێنی دەداتەوەو دەڵێ: (أنَّه لَيْسَ أحَدٌ أوْلى بالله ولا أرْفَعُ درجةً عِنْدَهُ مِنْ نَبيّ بَعَثَهُ وقد كان إسْماعيلُ ابن أمة وأخوهُ ابن صَريحةٍ فاختارَهُ الله وأخرج منه خير البشر، وما كان على أحدٍ منْ ذلك إذا كان جَدُّهُ رسولُ الله ﷺ وأبوه علي ابن أبي طالبٍ كرمَّ الله وَجْهَهُ![1]) واته: بێگومان هیچ کەس لەخوا لەپێشترو لەلای پایە بەرزتر نیە لە پێغەمبەرێك کە ناردوویەتی، دەجا دایکی ئیسماعیل کەنیزەك و برایەکەی – واتە ئیسحاق – دایکی ئازاد بووە، کەچی خوا ئەو (ئیسماعیل)ی هەڵبژاردو چاکترین ئینسانی لەپشتێ دەرهێنا – کە موحەممەدە ﷺ – ئنجا بابایەك کە باپیری پێغەمبەری خوایە ﷺ و بابی عەلی کوڕی ئەبوو طالیبە خوا ڕووی بەڕێز بکات، ئەو مەسەلەیە (کە دایکی کەنیزەکە) زیانی لێنادات.

ئنجا هیشامیش هیچی پێنامێنێ و دەڵێ: بڕۆ دەرێ! ئەویش دیسان نێرانەو بوێرانە وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: (أخْرُجُ، ثم لا أكونُ إلاّ حَيْثُ تكْرَهُ) دەڕۆمە دەرێ، بەڵام چۆنت پێناخۆشە وادەکەم!

**سێ:** پاش ئەوەی زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی خوا لێیان ڕازیبێ هیچ چارەو دەرەتانێکی نەماو وەچەی ئومەییە (بني أُمَيّة) لەسەر تەنگەتاوکردن و سووکایەتیی (إهانة) پێکردنی، بەردەوام بوون و هیشامی بەناو خەلیفەی مسوڵمانانیش

---

١- هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر ئەوە نیە کە (علي بن أبي طالب)(خوا لێی ڕازی بێ)بە گوتنی (کرم الله وجهه) وە (عليه السلام) یان وشەی (إمام) خستنە پێشیەوە، لەهاوەڵانی دیکەی پێغەمبەر ﷺ جیا بکرێتەوە، بۆیە چاك وایە ئەویش وەك ئەوانی دی خوا لێیان ڕازیبێ هەر (رضي الله عنه) ی بۆ بەکاربێت، بڕوانە: (تفسیرابن کثیر) ج٣ص٥٣٩.

وەك لەبڕگـەی دووەم دا خسـتمانەڕوو سـكاڵا (شـكوى) یەكـەی نەپرسـی، نـاوی خـوای لێهێناو درووشمی یان سەركەوتن یان شەهیدیی (إما النَّصْرُ وإما الشَّهادة)ی بەرزكردەوەو مردنێكی عیززەتمەندانەی بەسەر ئەو ژیانە پڕ مەینەتیو زەبوونانەیەدا هەڵبژاردو بڕیـاری ڕاپەڕین و شۆڕشـیدا، دژی حـوكمڕانیی دیكتاتۆرانـەی ئەمەوییـەكان و بـۆ چەسـپاندنی شەریعەت و قوتاركردنی ئوممەت چاكی لێ بەلادا كرد، جا با گوێ لەمێژووزانی ناودار (ابن الأثير) بگرین داخۆ لەوبارەوە چۆنی نووسیوەو ئامـانجی زەیـد لەڕاپـەڕین و شۆڕشـەكەی چیبووەو چۆن چۆنی بەڵێن و پەیمان (بيعة وعهـد)ی لەخـەڵكی وەرگرتـوە: (ابـن الأثـير) نووسیویەتی كە زەید بەم شێوەیە بەیعەتی لەخەڵكی وەردەگرت:[1] (إنّا نَدْعوكم الى كتـاب الله وسُنة نَبيه ﷺ وجهادِ الظالمين والدفع عن المُستَضعفين وإعطاء المحـرومين وقَسْـم هـذا الفيئ بين أهْلِه بالسّواء ورد المظالِم ونصر أهل الحق.. أتُبايعون على ذلك؟!)

واتە: ئێمە بانگتان دەكەین بۆلای كتێبی خواو ڕێبازی پێغەمبەرەكەی ﷺ وە جـەنگ كردن دژی ستەمكاران و بەرگریكردن لە چەوسێنراوان و بەخشین بـەبێ بـەش كـراوان و دابـەش كردنـی ئـەم (فئ)ە بەسـەر خاوەنەكانیدا بەیەكسـانیی و ئەسـتاندنەوەی هـەقی ستەم لێكراوان و سەرخستنی ئەهلی هەق، جا ئایا لەسەر ئەوە پەیمان دەدەن؟!

جا ئەگەر گوتبایان: بەڵێ، ئەوە دەستی دەخستە نێو دەستیان و دەیگوت:
(عليكَ عَهْدُ الله وميثاقُهُ وذِمَّتُهُ وذمة رسُولِه لَتَفيَنَّ بَبيْعَتي ولَتُقـاتِلَنَّ عَـدوّي ولَتَنْصَـحَنّ لي في السرِّ والعَلانيةِ).

واتە: بەڵێن و پەیمانی خوات لەسەربێ و ئۆباڵی خواو پێغەمبەرەكەیت بەئەستۆ كـە دەبێ ئەم بەڵێنـەم جێبـەجێ بكـەیو جـەنگ لەگـەڵ دوژمنەكـەم بكـەی و بەپـەنهانیی و ئاشكرا دڵسۆزم بی. ئنجا ئەگەر بەیعەتكەرەكە گوتبای: بـەڵێ، ئـەوە دەسـتی بەدەسـتی ویدا دەهێناو دەیگوت: (اللّهُمَّ اشْهَدْ) خوایە شایەد بە!

جـا سـەرەنجام (١٥٠٠٠) لەخـەڵكی كووفـە بەیعـەتیان دایـەو پاشـان شـیعەی شـارو شوێنەكانی دیكەش پێیانەوە لكان، هەتا ژمارەیان گەیشتە(٤٠٠٠٠) كەس!!

---

[1] - بڕوانە: (الكامل في التأريخ) ج ص، وە (تأريخ المذاهب الأسلامية) ص٦٥٧ ، ٦٥٨.

دیاره گەلێك لە پێشەواو ڕیش سپیەیانی (أهل البیت) زەیدیان ترساندو ئاگاداریان کردەوە کە خەڵکی کووفە جێی متمانە نین، بەڵام چونکە بڕیاری دابوو مردنێکی عەزیزانە بەسەر ژیانێکی زەلیلانەدا هەڵبژێرێ، لەسەر بڕیاری خۆی هەر مکوڕ بوو، وە سەرەتای مانگی (صفر)ی (١٢٢)یان بۆ هێرش و پەلامار دیاری کردبوو.

هیشامیش کە هەمیشە ترسی ڕاپەڕین و هەڵسانی زەیدی لەدڵ دابوو و سیخوڕو جاسووسی زۆری بەملاولادا بڵاوکردبۆوە، هەر کە هەواڵی خۆ ئامادەکردن و بەیعەت لەخەڵك وەرگرتنی زەیدی پێگەیشت، والی کووفەی ئاگادار کردەوە کە هەرچۆن بووە زەید بدۆزێتەوەو پاشان (أمان)ی پێبدات و ئەگەر قبووڵی نەکرد تەسلیم بێ! لەگەڵی بجەنگێ.

جا لەکاتێك دا کە سوپای (بني أمية) خۆی ئامادەکردو دەستی بەهێرش کردنە سەر زەیدو کۆمەڵەکەی کرد، بەڵێ لەکاتێکی ئاوا ناسك و دژواردا، زەید هەر هێندەی خۆش بوو هەتا پەیمان دەرە عێراقیەکانی بانگ کرد کە دەست پێبکەن و پشتگیریی بکەن! وەك هەڵوێستی پێشوویان لەگەڵ (حسین)ی باپیری خوالێی ڕازی بێ، کەوتنە بڕوبیانوو هێنانەوەو خۆدزینەوە! بەڵام بیانووی هەرە گەورەیان کە هەموویان لەسەری یەکدەنگ بوون ئەوەبوو کە لەم گفت وگۆیەی خوارەوەدا کە لەگەڵ زەیددا کردیان دەردەکەوێ:

گوتیان: خوا ڕەحمەت پێ بکات! دەربارەی (ابوبکرو عمر) چی دەڵێی ڕات چیە؟!

گوتی: خوا لێیان ببوورێ، نەم بیستوە هیچ کەس لە بنەماڵەی (أهل البیت)ی من حاشایان لێبکات و لەچاکە بەولاوە دەربارەیان ناڵێم.

گوتیان: ئەدی کەوایە بۆچی داوای تۆڵە کردنەوەی (أهل البیت) دەکەی؟!

گوتی: قورسترین قسە کە لەبارەی ئەوانەوە کەناوتان هێنان بیکەم، ئەوەیە کەئێمە خۆمانمان بۆ جێنشینایەتی پێغەمبەرﷺ پێ شیاوتر بوو، بەڵام خەڵکەکە هەقی ئێمەیان نەداو ئێمەیان پاڵ پێوەنا [1]، بەڵام ڕەفتارەکەیان نەگەیشتۆتە ڕاددەی کوفر... ئنجا ئەو

---

١- خوا لە زەید ببوورێ هیچ بەلگەیەکی ڕاستی قورئان و سوننەت لەوبارەوە نیەو مەحاڵیشە هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزو فیداکارو پارێزکارەکانی پێغەمبەر ﷺ هەقی بنەماڵەکەی زەوت بکەن! دیارە بەهەڵەداچوونی زەیدو هەندێك لە خزمەکانیشی ماقووڵترە لە بەهەڵەداچوونی سەرجەم هاوەڵان!

کەسانەش کرانە گەورەو کاربەدەست و دادگەریش بوون و بەپێی قورئان و سوننەتیش بەڕێوەچوون!

گوتیان: **کەواتە** بۆچی دژیان دەجەنگی (واتە دژی بەنی ئومەییە)؟!

گوتی: جاخۆ ئەمانە (واتە بەنی ئومەییە) وەك ئەوان نین، ئەمانە (ئومەوییەکان) ستەم لەخەڵك و خۆیشیان دەکەن، منیش بانگەواز دەکەم بۆلای کتێبی خواو ڕێبازی پێغەمبەرەکەیﷺو، زیندووکردنەوەی سوننەتەکان و نەهێشتنی بیدعەتەکان، جا ئەگەر خۆڕاگر بن بۆ ئێوەش و بۆ منیش چاکترە، وە ئەگەر لاملییش بکەن ئەوە من بەسەرتانەوە چاودێر نیم!

لەئاکام دا: (فَرَفَضُوه وانْصرفوا ونَقَضُوا بَيْعَتَهُ وأَعْلَنوا أن الإمام هو جَعْفَرُ الصّادِق) واتە: پێی ڕازی نەبوون و وازیان هێناو بەڵێنەکەییان هەڵوەشاندنەوەو ڕایان گەیاند کە (جعفر الصادق) پێشەوایانە!

ئنجا کە هێرشەکانی سوپای ئومەویی سەخت تر بوون هەرچەندە مانگێکی مابوو بۆ کاتی دیاریکراو، بەڵام زەید بەناچاریی جاڕی داو بانگی شوێن کەوتووەکان (أتباع)ی بە درووشمی (یامنصور یا منصور) کرد، بەڵام تەنیا(٤٠٠) کەسی بە دەنگەوە هات! هەرچەندە زۆر بانگیکردن و پێی گوتن:

(أُخْرجُوا من الذُّل الى العزِّ، أُخْرجُوا الى الدينِ والدنيا، فأنكم لَسْتُمْ في دِيْنٍ ولا دُنْيا)، واتە: ڕاپەڕن لەزەبوونیی و ژێر دەستەییەوە بەرەو عیززەت و سەربەرزیی، ڕاپەڕن و هەڵسن بۆ دین و دونیاتان، چونکە ئێوە نەدینتان هەیە نەژین!

بەڵام کەسی بەدەنگەوە نەهات و ئنجا کە زانی بەرەو تێشکانە گوتی:

(أخاف أنْ يكونوا قَدْ فعلوها حُسَيْنيةً، أما والله للأقاتِلَنَّ حتىَّ المَوْتِ)[1] واتە: دەترسم هەڵوێستەکەی لەگەڵ حوسەینیان دووبارە کردبێتەوە! ئاگاداربن بەخوا هەتا مردن دەجەنگم!

سەرەنجام شەڕ گەرم بوو، زەید ژمارەی سوپایەکەی هێندەی جەنگاوەرانی جەنگی (بدر) بوو، سوپای ئومەوییەکانیش زۆر زۆر بوو و بەردەوامیش ئیمدادی بۆ دەهات!!

---

١- بڕوانە: (البداية والنهاية) لأبن كثير، ج٩ص ٣٣٠، وەبڕوانە: (تأريخ المذاهب الأسلامية)ص٦٥٩.

بـەلام لەگـەڵ ئـەوەش دا لەسـەرەتاوە ئـەو سـوپا وابەسـتەو دابەسـتە زۆرەی ئومەوییەکان بەرگەی هێرش و پەلاماری زەیدو هاوەڵەکانی نەگرت و لـەقۆڵی ڕاستەوە شـکاندیان و پاشەکشـەیان پێکـردن و(٧٠) کەسیشـیان لێکوشـتن، ئنجا کـە سـوپای هیشامی ئومەویی ئەوەیان بینی، دڵنیـابوون کـە بەشـەڕی شمشـێر بەڕوەستیان نایـەن، بۆیە تاکتیکی جەنگیان گۆڕی و دەستیان کردە تیر بارانیـان و تیرێك بـەر تـەوێڵی زەیـد کەوت، وەلەکاتی دەرهێنانەوەی تیرەکەدا زەید کۆچی دوایی کردو ئـاوا مەردانـە شـەهید بوو، کت ومت وەك شەهیدکرانی حوسەینی باپیری کـە ئـەویش دوای ئـەوەی هـیچ کـەس جورئەتی نەکرد لەشەڕی دەستەویەخەو تەن بەتـەن دا بـۆی بچێتە مەیـدانێ ترسنۆکانە لەدوورەوە بەتیر شەهیدیان کرد!

ئنجا لەهەموویشی ناخۆشتر و دڵتەزێن تـر ئـەوە بـوو کـە (هشـام بـن عبـدالملك بـن مروان بن الحکم) هەڵوێست و ڕەفتاری ناشیرین و بڵحانەو نامەردانەی (یزید بن معاویـة) و (عبیدالله بن زیاد)ی کە لەگەڵ (حسین بن علـی) خـوا لێیـان ڕازیبـێ، (سـید شـباب أهـل الجنة) کردیان لە ئەتك و سووکایەتیی بەجەستەی بێ ڕووح کردن، وە بیر مسوڵمانانی بێ هەڵوێست! هێنایەوە و خودی خۆی ئەمری کرد کە تەرمی خوێناویی زەیـد لـە گۆڕەکـەی دەربهێننـەوەو ماوەیـەکی زۆر لـە زبڵـدان (کناسـة)ی کووفـە هـەڵیان واسیو، پاشـانیش سووتاندیان و خۆڵەمێشەکەیشیان وەبەر (با)داو بڵاویان کردەوە!!

خوا لەزەید خۆش بێت و ڕازیبێو ڕازیشـی بکـات و پلەوپایـەی بـەرزتر بکاتـەوەو، تووڕەیی و تۆڵەو نەفرینی خوای دادگەرو تۆڵە ئەستێنیش لەسەر هـەموو ئەوانـەوەبێ کـە لــەپێناوی دونیــاو تــەماع و هێشــتنەوەی کورســی و دەســتەڵاتی ناشــەرعییانەو طـاغووتانـەیان دا بەسـتەم و ناهـەق خـوێنی دۆسـتانی خـوا دەڕێـژن و سـووکایەتیی و بێحورمـەتییان پێدەکـەن: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِٱلْقِسْطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴾[1]. واتـە: بێگومـان

---

١- آل عمران: ٢١ – ٢٢

ئەوانەی بڕوایان بەئایەتەکانی خوا نیەو بەناهەق پێغەمبەران دەکوژن و ئەو کەسانە دەکوژن کە فەرمان بە دادگەریی دەکەن لەخەڵکی، ئەوە موژدەی ئازارێکی بەئێشیان بدەیە. ئەوانە کەسانێکن کە لەدونیاو دوارۆژدا کردەوە (چاکە)کانیان هەڵوەشاونەوەو هیچ پشتیوان و یاریدەدەرێکیشیان نیە.

بەڵێ زەید کوژراو هەڵواسراو سووتێنراش و خۆڵەمێشەکەشی بەبادا درا هەر لەبەرئەوەی بە ئومەوییەکانی دەگوت: حوکم بە قورئان و سوننەت بکەن و چیدی بەناوی ئیسلامەوە دونیا مەخۆن و ستەم و زۆر لەخەڵکی مسوڵمان مەکەن و... هتد !

بەڵام ئایا دەستەڵاتدارانی ئومەویی پاش زەید چییان لێهات؟!

وەك چۆن خوێنی بەناهەق ڕژاوی حوسەینی باپیری لەڕۆژگاری شوومی یەزیددا بوو بەمایەی گوازرانەوەی حوکم و دەستەڵات لە بنەماڵەی (ابوسفیان)ەوە بۆ بنەماڵەی (مروان)،(١٠) ساڵیش دوای کارەساتی زەید و هاوەڵە وەفادارەکانی واتە لەساڵی (١٣٢)ی کۆچیدا، کۆتایی بەحوکمڕانیی و دەستەڵاتی ئومەوییەکان هات و عەبباسییەکان (العباسيون) هاتنە سەر حوکم و ئنجا وەك (المسعودي) لەکتێبی (مُروج الذهب)دا[1] هێناویەتی، عەبباسییەکانیش نەك هەر هی (هشام) بگرە گۆڕی زۆربەی دەستەڵاتدارە ستەمکارەکانی (بني أُمية)یان هەڵکەندەوەو تەرم و ئێسك و پرووسکەکانیشیان قەمچیکاری کردو سووتاندو.. هتد!![2].





١- بڕوانە: (مروج الذهب) ج٢ص١٨٢، وەبڕوانە: (تأريخ المذاهب الأسلامية)ص٦٦٠ – ٦٦١.

٢- هەرچەندە ڕەفتاری عەبباسییەکان کاردانەوە (رد الفعل) بووە، بەڵام بێگومان هەر هەڵەو ناشەرعییە.

## ٥- سوفیانی ثه وریی (رحمه الله):

(سفيان الثوري) كه له‌سالّى (٩٧)ى كۆچى له‌دايك بووه‌و له‌(١٦١)ى كۆچى له‌شارى به‌صرِا كۆچى دوايى كردوه، يه‌كێكه له‌پێشه‌وا به‌رزه‌كان و (يحي بن معين) و غه‌يرى ويش نازناوى (أمير المؤمنين فى الحديث) يان، بۆ به‌كارهێناوه.

جا ئێمه ته‌نيا دوو هه‌ڵوێست و يه‌ك وته‌ى سوفيان لێره‌دا تۆمار ده‌كه‌ين:

**يه‌ك:** خۆى گێڕاويه‌ته‌وه‌و گوتوويه‌تى:

له مينا (منى) چوومه لاى (أبو جعفر المنصور)– كه دووه‌مين حوكمڕانى چاخى عه‌بباسى‌يه‌كان بووه– پێى گوتم: چ پێويستى‌يه‌كت هه‌يه بيڵێ! پێم گوت: پارێز له خودا بكه!

تۆ سه‌رزه‌ويت پڕكردوه له بێدادى‌و سته‌م، سه‌رى نزم كرد، پاشان سه‌رى به‌رز كرده‌وه‌و گوتى: چ پێويستى‌يه‌كت هه‌يه پێمان بڵێ! پێم گوت: بێگومان تۆ ئه‌م پله‌و پايه‌يه‌ت به‌هۆى شمشێره‌كانى كۆچكه‌ران و پشتيوانان (المهاجرين والأنصار) چنگ كه‌وتوه، كه‌چى كوڕه‌كانيان ئه‌وه له‌برسان ده‌مرن! ده‌جا له خوا بترسه‌و هه‌ق و مافه‌كانيان بگه‌يه‌نه ده‌ستيان، ديسان سه‌رى نزم كرده‌وه‌و پاشان سه‌رى هه‌ڵبڕى‌و گوتى: چ پێويستى‌يه‌كت هه‌يه پێمان بڵێ، گوتم: عومه‌رى كوڕى خه‌تتاب( خوا لێى ڕازى بێ) حه‌جى كردو به خه‌زێنه‌داره‌كه‌ى گوت: چه‌نده‌ت خه‌رج كردوه؟! گوتى: ده پازده دره‌م، كه‌چى من لێره شتى وا ده‌بينم حوشتريش بۆيان هه‌ڵناگيرێ!

**دوو:** كاتێك (مَهْدي)- كه سێيه‌مين ده‌سته‌ڵاتدارى عه‌بباسى‌يه‌كانه- له‌سه‌رى پێويست كرد كه بێته (قاضي) شارى كووفه، دواى ئه‌وه‌ى ديوه‌خانى مه‌هدى به‌جێهێشت نامه‌كه‌ى دڕاندو پاشان خۆى شارده‌وه‌و هه‌موو شارانى لێگه‌ڕان و لێيان پشكنى، هه‌تا له‌سالّى(١٦١) له‌شارى به‌صرِادا له‌حاڵه‌تى خۆحه‌شاردان(إستخفاء)دا مرد!

**سیٚ:** (یحی بن یمان) گووتویەتی:[1]

گوێم لە سوفیان بوو دەیگوت: (العـالِمُ طبيـبُ الـدينِ والـدرهم داءُ الـدين، فـاذا آجْـترَّ الطبيب الدّاءَ اليه مَتى يُداوي غَيْـرَهُ ! !) واتـە: زانـای ئیسـلام پزیشـکی ئایینـەو پـارەش دەردی ئایینە، جا ئایا ئەگەر هات و پزیشك دەردی بۆ لای خۆی پـەلکێش کـرد، چۆن و کەی چارەسەری خەڵکی دەکات؟!

**تێبینـی:** بێگومان لێرەدا مەبەستی سوفیان پارەی حەڵاڵ و بەرهەمی ڕەنجی شان نیـە، بـەڵکو مەبەسـتی پـارەو تەماعێکـە کەلەسـەر حیسـابی دینـداریی‌و مسـوڵمانەتی‌و کەرامەتی مرۆڤ دەستگیر دەبیٚ‌و لەلایەن ئەهلی دونیاوە دیٚ!





[1] - ئەم دوو هەڵوێستەو ئەم وتەیەم لە کتێبی(العلمـاء وأمانـة الكلمـة)ی محمـد سـرور بـن نـایف زیـن العابـدین، ص٢٦،٢٧، وەرگرتـوون و سـاڵی لـەدایك بـوون و کۆچـکردنی‌و نازناوەکەیشـیم لـە کتێبـی:(اقتضـاء الصـراط المستقيم)ج١ ص١١٨، پەراوێزی (محقق) م وەرگرتوە.

## ٦- ئیمام ئەبوو حەنیفە(رحمه الله تعالی):[1]

ناوی(النعمان بن ثابت بن زُوطي)یە لەساڵی(٨٠)ی کۆچی لە کووفە لەدایك بووەو لەساڵی(١٥٠) لە بەغداد کۆچی دوایی کردوە، یەکێکە لە پێشەوا گەورەو شەرعزانەکانی ئیسلام و وێڕای زانایی بەهۆی کاسبیو بازرگانی کردنەوە دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتووش بووەو، لەڕیشەوە فارسەو باپیرە گەورەی لەپیاو ماقووڵ و خانەدانانی شاری(کابل)ی ئەفغانستانی ئێستا بووە.

جا ئێمە ئەم چەند هەڵوێستە پرشنگدارە لەژیان و بەسەرهاتی شکۆمەندانەی پێشەوای هەرەمەزن (الإِمام الأعظم)[2] گوڵبژێر دەکەین:

### یەك: عیبادەت و تەقوای ئەبوو حەنیفە:

ئەبوو حەنیفە وەك سەرجەم زاناو پێشەوا هەڵکەوتووەکانی ئیسلام زۆر خواپەرست (عابد)و پارێزکار(متقي)و خۆپارێز(وارِعْ) بووەو لەو بارەوە زۆر شتی سەیری لێگێڕاوەتەوە کەوا پێدەچێ هەندێکیان بەسەریانەوە نرابێ، بەڵام دیسان هەر بەڵگەو نیشانەی ئەوەن کە عیبادەت و تەقوایەکی نائاسایی هەبووە.

بۆ وێنە:

أ- (أبو عاصم النَّبيل) دەڵێ: ئەبوو حەنیفە پێی دەگوترا سینگی داکوتراو(الوَتَدْ) لەبەر زۆر نوێژکردنی.

ب- (زافر بن سليمان)یش گوتوویەتی: ئەبوو حەنیفە بەیەك ڕکات نوێژ کە هەموو ورئانی تێدا خەتم دەکرد شەوگاری دەبردە سەر[3].

ج- (أسد بن عمر)یش گوتوویەتی: ئەبووحەنیفە چل ساڵ نوێژی بەیانی بەدەستنوێژی نوێژی خەوتنان کردوە.

---

١- بۆ نوسینی ئەم باسە سوودم لەم دوو سەرچاوەیە وەرگرتوە:(تهذيب الاسماء واللغات)للنووي، القسم الاول، ج٢ص٢١٦تا٢٢٣، وە (تأريخ المذاهب الاسلامية)ص٣٤٨تا٣٧٤.

٢- ئەمە شۆرەت و نازناوی (أبوحنيفه)یە.

٣- ئەمە بەشتێکی دوورو نەگونجاو دەزانم و پێچەوانەی سوونەتیشە کە ڕکاتێك زۆر درێژو یەکێك زۆر کورت بێ!

د- (أبو يوسف)ی قوتابیشی دەڵێ: جارێکیان من لەگەڵ ئەبووحەنیفەدا دەڕۆیشتم گوێی لە پیاوێك بوو گوتی: ئەمە ئەبوو حەنیفەیە کە شەو هیچ ناخەوێ! ئەبووحەنیفەش گوتی: بەخوا نابێ بەجۆرێك باسم بکات کەوا نەبم و کردەوەیەکم پاڵداتە لا کە نەمبێ! ئیدی لەوە بەدوا هەموو شەوی بەنوێژو پاڕانەوەو لاڵانەوە دەبردە سەر.

(عبدالله بن المبارك)یش لەبارەی ئەو پێشەوا بەڕێزەوە گوتوویەتی: (مارأیت أَوْرَعَ من أبي حنیفة قَدْ جُرِّبَ بالسیاطِ والأموال) لە ئەبووحەنیفە خۆپارێزترم نەدیوە هەم بەقەمچی لێدران و هەم بەماڵ و سامانیش تاقی کرایەوە- و دەریش چوو-.

## دوو: دڵقایمیی‌و بوێریی ئەبوو حەنیفە:

ئەبوو حەنیفە پیاوێکی ئازاو بوێرو دلێرو دڵقایم بووەو، ئەو ئازایەتی‌و بوێرییەیەش لەگەلێك هەڵوێست و ڕەفتارەکانیدا دەدرەوشێتەوە:

١-عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك گێڕاویەتەوە کە ڕۆژێکیان لە مزگەوتێ دەبن و (مار)ێك دەکەوێتە خوارێ‌و دەچێتە کۆشی ئەبووحەنیفەو، خەڵکەکەی دەوروبەری هەموو ڕادەکەن، جگە لە ئەبووحەنیفە جگە لەوەی جبەکەی دەتەکێنێ‌و مارەکە فڕێ دەدات، هیچی دیکە ناکات و شوێنەکەی خۆی بەجێناهێڵێ.

٢- (ابن هبیرة) کە والی عێراق بووە لەڕۆژگاری ئومەوییەکاندا، داوا لە ئەبووحەنیفە دەکات کە ببێتە (قاضي) ئەویش قبووڵ ناکات، سەرەنجام(ابن هبیرة) سەد قەمچی لێدەدات هەر ڕۆژەی دە(١٠) قەمچی، بەڵام بێ سوود دەبێ‌و پاشان بەناچاری بەری دەدات.

ئنجا کاتێ بەردەدرێ دەڵێ: خەم خواردنی دایکمم پێ لە لێدانەکە ناخۆشتر بوو!

٣- هەروەها لە ڕۆژگاری عەبباسییەکانیش دا(أبو جعفر المنصور) دیسان تێی هەڵدەپێچێ کە پلەی (قاضي القضاة) بەئەستۆوە بگرێ، بەڵام ئەوەش قبووڵ ناکات. هەرچەندە چەندجارێك سوێندی لێدەخوات کە دەبێ بیکات، بەڵام ئەویش سوێند دەخوات کە نایکات! جا کاتێك(ربیع)ی پەردەدار (حاجِب)ی (المنصور) بەگلەییەوە پێی دەڵێ: چۆن سوێندەکانی (أمیر المؤمنین) دەخات؟! پێی دەڵێ، ئەو لەمن چاکتر دەتوانێ (کفارة)ی سوێندەکانی خۆی بدات! پاشان سجن دەکرێ‌و(نووي)یش

گوتوویەتی:[1] (والصحيحُ أنه تُوفِّي وهو في السجنِ) قسەی ڕاست ئەوەیە کە لەحەپسخانەدا مردوە!

لە ڕیوایەتێکی دیکەش دا هاتووە کە (أبو جعفر) کاتێك داوای لیٚکردوە ببێتە(قاضي) ئەبووحەنیفە گوتوویەتی: من بەکەڵکی قازیەتی نایەم! ئەویش گوتوویەتی: درۆ دەکەی! پاشان کە دووبارە داوای لیٚکردوە قبووڵی بکات ئەبووحەنیفە گوتوویەتی: ئەمیری بڕواداران حوکمی داوە کەمن بەکەڵك نایەم، چونکە پێی گوتووم درۆ دەکەی، جا ئەگەر درۆزن بم ئەوە بەکەڵکی قازیەتی نایەم و ئەگەر ڕاستیش بم، ئەوە پێم گوتوە کە بۆ ئەو کارە ناشێم!.

## سێ: ئەبووحەنیفە دیاریی‌و پارەی کاربەدەستان وەرناگرێ:

جارێکیان (أبو جعفر) بە ئەبووحەنیفەی وت: بۆچی دیاریی‌و هاوکاری من وەرناگری؟! ئەویش گوتی: ئەمیری بڕواداران شتێکی لەماڵ و سامانی خۆی نەداومێ‌و ڕەدم کردبێتەوە، بەڵکو(بیتُ مالِ المسلمين) پێ داوم و هیچ حەقیشم لە خەزێنەی مسوڵمانان دا نیە، چونکە نە جەنگاوەرم تاکو مووچەی موجاهیدان وەربگرم، وە نە منداڵی گچکە‌و هەتیویشم تاکو هی ئەوان وەربگرم، وە نەهەژاریشم تاکو هەقی هەژاران وەربگرم.

## چوار: بەخشندەیی‌و سەخاوەتی ئەبووحەنیفە:

(قيس بن الرَّبيع) گوتوویەتی:

ئەبووحەنیفە زۆر خۆپارێز‌و زۆریش شەرعزان بوو، وە زۆر سەخی‌و بەخشندە بوو بۆ هەرکەسێك پەنای پێهێنابایە، وە بۆ برایانی خۆی زۆر دەستبارگر بوو، بازرگان بوو کەل وپەلی دەنارده بەغدادو پاشان جل و بەرگ و پێداویستی زانایان و پێشەوایانی پێدەکڕین، وە ئەو پارەیەش کە دەمایەوە دەیدانێ‌و پێی دەگوتن پێداویستیەکانی خۆتانی پێبکڕن، وە بێجگە لەخوا ستایشی هیچ کەسێك مەکەن، چونکە بەخوا ئەوە هەر

---

[1] - بڕوانە: (تهذيب الأسماء واللغات) القسم الاول، ج٢ص٢١٨.

هی خوایەو لەسەر دەستی من دەتانداتێو بێجگە لەخوا هیچ کەس ناتوانێ رۆزی کەس بدات.

وە(أبو يوسُف) گوتوویەتی: (كان أبوحنيفة لايكادُ يُسْألُ حاجةَ الاّ قضاها) واتە: ئەبووحەنیفە عادەتی وابوو مەگەر چۆن دەنا هەر داواکارییەکی ئاراستە کرابایە جێبەجێی دەکرد.

## پێنج: عەقڵ و هۆشیاریی ئەبووحەنیفە:

(علي بن عاصِمْ) گوتوویەتی: ئەگەر عەقڵی ئەبووحەنیفە بەعەقڵی نیوەی خەڵکی دنیا هەڵبسەنگێنرێ، تا تەرازووی بەلادا دەکەوێ.

جا یەکێك لەو هەڵوێستانەی ئەبووحەنیفە کە عاقڵ مەندیی‌و هۆشیاریی وی‌یان تێدا دەردەکەوێ ئەوەیە کە کابرایەك هەبوو بەناوی (أبو العباس الطّوسي)و رای لەبارەی ئەبووحەنیفەوە خراپ بوو، جا رۆژێکیان ئەبووحەنیفە دەچێتە لای (أبو جعفر المنصور)و ئەو(أبو العباس الطّوسي)یە بۆ ئیحراجکردنی لێی دەپرسێ: ئەی ئەبوو حەنیفە! (أمير المؤمنين) ئەمرمان پێدەکات کە لەگەردنی پیاوێك بدەین و ئێمەش کابرا ناناسین! جا ئایا بۆمان هەیە کابرا بکوژین یان نا؟!

ئەبووحەنیفەش دەڵێ: جا ئەی (أبو العباس) ئایا (أمير المؤمنين) فەرمان بە شتی هەق و شەرعیی دەکات یان بە شتی ناهەق؟! ئەویش دەڵێ: بەڵکو فەرمان بەشتی هەق دەکات! ئەویش دەڵێ: دە مادام وایە پێویست ناکات بپرسی‌و یەکسەر بەدوای هەق بکەوە!

پاشان ئەبووحەنیفە لەبەر خۆیەوە دەڵێ: ئەم کابرایە ویستی بە کەلەبچەکرد بدات، بەڵام من ئەوم بەستەوە!

## شەش: ئەبووحەنیفە پشتگیریی شۆڕشگێڕانی (أهل البيت) دەکات لە دژی حوکمڕانە زۆردارە ئومەویی‌و عەبباسیی یەکان:

کاتێك لەساڵی (١٢٢)ك دا زەیدی کوڕی عەلی لەدژی (هشام بن عبدالملك) راپەڕی (أبوحنيفة) وتی: (ضاهأ خروجُهُ خُروجَ رسول الله ﷺ يوم بَدْرِ) دەرچوونی زەید وەك دەرچوونی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە جەنگی بەدردا.

ئینجا کەلێشیان پرسی: ئەدی بۆچی لەگەڵی نەچوویە دەرێ؟! گوتی: کۆمەڵێك ئەمانەتی خەڵکم لەلابوون زۆریش تەکلیفم لە (إبن أبي لَيْلى) کرد کە وەریان بگرێ بەلام قبووڵی نەکرد.

هەروەها دەڵێن گوتوویەتی: ئەگەر زانیبام کە خەڵکی پشتی بەرنادەن وەك پشتی باپیرییان بەردا لەگەڵی دەچووم، چونکە پێشەوایەکی هەقە، بەلام بەماڵ و سامان هاوکاری دەکەم، ئنجا ئەندازەی (١٠٠٠٠) درەمیشی بۆ نارد.[١]

هەروەها لەسەردەمی عەبباسیی‌یەکانیشدا لەساڵی(١٤٥)ك دا (أبوحنيفة) پشتیوانیی لە ڕاپەڕینەکەی (محمد بن عبدالله بن الحسن بن الحسن بن علي بن أبي طالب) کە بە (ذو النفس الزكية) ناسراوەو (ابراهيم)ی برای کرد، کە یەکەمیان لەمەدینەو دووەمیشیان لە بەصرا دەرچوون، بەلام ڕاپەڕین و شۆڕشی ئەوانیش وەك هی پێشووەکانیان بێئاکام بوو ئەوانیش شەهیدکران، خوا پاداشتیان بداتەوەو پلەو پایەیان بەرزو بەرزتر بکاتەوە.

شایانی باسیشە کە هۆکاری بنەڕەتی بەین تێکچوونی ئەبووحەنیفەو ئەبووجەعفەری مەنصووریش هەر ئەو هەڵوێستەی ئەبوحەنیفە بووە، بەلام بێگومان پێشەوای گەورەی وەك (نعمان بن ثابت بن زوطي) دەربەستی ئەو باج(ضَرْيبة)ە نیە کەلەسەر هەڵوێستەکانی دەیدات مادام لەسەر هەقەو لەپێناوی خوا دایە.

## حەوت: بەرنامە (منهج)ی ئەبووحەنیفە بۆ هەڵێنجانی یاسا شەرعیی‌یەکان و (إجتهاد):

لە ئەبوو حەنیفەوە گێڕراوەتەوە کە دەربارەی بەرنامەی ئیجتیهادکردنی خۆی گوتوویەتی:[٢]

(أخذ بكتاب الله، فأن لَمْ أجِدْ، فَبِسُنَّةِ رسول اللهﷺ، فأنْ لَمْ أجِدْ في كتاب الله تعالى ولا سنة رسول اللهﷺ، أخَذْتُ بقول أصْحابِه..آخذ بقول مَنْ شِئتُ منهم وأدَعُ مَنْ شئتُ

---

١- هەروەها لەساڵی (١٢٥)ك (يحى)ی کوڕی زەید لە خۆراسان ڕاپەڕینی کردو کوژرا، وەلە ساڵی (١٣٠)ك دا (عبدالله)ی کوڕی (يحى) لەیەمەن شۆڕشی بەرپا کردو ئەویش کوژراو ڕاپەڕینەکەی کپ کرایەوە، بڕوانە (تأريخ المذهب الاسلامية) ص٣٦٨،٣٦٩.

٢- بڕوانە: (تأريخ المذهب الاسلامية) محمد أبو زهرة، ص٣٧٥.

منهم ولا أخرج منْ قولهم الى قولِ غيرهم، فأما اذا أنتهى الأمرُ الى ابراهيم والشعبي وإبن سيرين والحسن والعطاء وسعيد بن المسيب.. فقومٌ أجتهدوا، فأجتهدُ كما أجتهدوا).

واته: (بۆ وەرگرتنی حوکمی شەرعیی) کتێبی خوا دەگرم، جا ئەگەر لەوێدا چنگم نەکەوت، سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەگرم، ئنجا ئەگەر نە لەکتێبی خوای بەرزداو نە لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ چنگم نەکەوت، قسەی هاوەڵەکانی دەگرم... تێیان دا هەڵدەبژێرم بەڵام هەتا رایەکی ئەوان هەبێ هی خەڵکی دیکە وەرناگرم، بەڵام کە نۆرە گەیشتە سەرە ئیبراهیم (النخعي)و شەعبیىو ئیبن سیرین و حەسەن و عەطاء سەعیدی کوڕی موسەیب، ئەوە ئەوانە کۆمەڵێکن ئیجتیهادیان کردوە جا منیش وەك ئەوان ئیجتهاد دەکەم.

بەڵام بەسەرنج دانی سەرجەم شوێنەوارەکانی ئەبووحەنیفە دەردەکەوێ کە بۆ (إجتهاد)کردنی بەگشتی پشتی بەم حەوت بنچینەیە بەستوە:

١- قورئان(کتاب الله تعالى).

٢- سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٣- قسەی هاوەڵان (أقوال الصّحابة) خوا لێیان رازی بێ.

٤- قیاس، کە بریتیە لە: [ گێڕانەوەو لکاندنی مەسەلەیەکی دەق لەسەر نەهاتوو بەمەسەلەیەکی دەق لەسەر هەبووەوە لەحوکمیاندا، بەهۆی هاوبەشییان لە(عیللەت)]دا.[1]

٥- بەچاك دانان (الإستحسان) کە بریتیە لە (کارنەکردن بەداخوازیی قیاسێکی ئاشکراو هەڵبژاردنی حوکمێکی دیکەی جیاواز بەهۆی تێك گیرانی رواڵەتی قیاسەکە لەگەڵ دەقێکی شەرعیی یان ئیجماع یان عورف یان بەرژەوەندییەکی ڕوون دا).

٦- یەکدەنگیی (الإجماع)، کە بریتیە لە: (یەکدەنگییو کۆك بوونی زاناو موجتەهیدەکانی ئوممەت لەچاخ و ڕۆژگارێك دا لەسەر حوکم و بڕیارێکی شەرعیی).

---

١- (القياس: هو الحاق أمر غير منصوص على حُكْمِه بأمر آخر منصوص على حُكْمِه لعلة جامعة بينهما). بڕوانە: (تيسير علم أصول الفقه) ص ١٦٠، عبدالله بن يوسف الجديع.

٧- باو(العُرف)، كە بریتیە لە: (كردەوەو رەفتاری مسـولْمانان بـە شـتێك كـە دەقێكـی قورئان و سوننەتی لەبارەوە نیە، بەلاّم عورف ئەگەر لەگەلْ دەقێكـی شـەرعیىدا دژ بـێ ئیعتباری پێناكریٚ).[١]

بەلْێ ئەوەیە ئەبووحەنیفەو رەفتـارو هەلْوێستە جوامێرانـەو درەوشـاوەكانی، كەلـە راستیدا هەم ئەمیش و هەم زاناو پێشـەوایانی دیكـەش كەسـایەتیو رەوشـت و رەفتـارو هەلْوێستەكانیان زۆر لەوە گەورەترن كە بتوانین لەدوو توێی چەند لاپەڕەیەك دا جێیـان بكەینەوە، هەر بۆیـەش ئێمـە هـەر لەسـەرەتاوە وشـەی (گولْبـژێر)مان بـەكارهێناوە وەك سەرباسـی ئـەو هەلْوێسـت و رەفتارانـەی ئـەو چـەند زانـاو پێشـەوایەی كـە بەنموونـە هێناومانەنەوە.

هــەزار رەزاو رەحمــەتی خــوای خــاوەن لــوطـف و كــەرەم لــە رووحــی بــەرزو یززەتمەندانەی (نعمان بن ثابِت)و تێكڕای قوتابیو شاگردە دلْسۆزو وەفادارەكانی، ئـەو كەلّە پیاوو شێرە پێشەوایەی كە وەصیەتی نێژران و بەخاك سپێررانیشـی هـەر ئـازادیو جوامێریىو عیززەتمەندییو لە خۆوە گرتوەو حوكمڕانـانی دیكتـاتۆرو بـەزەبرو زۆری پـێ سەغلّەت و تەنگەتاو كردوە.[٢]



---

١- بۆ پێناسەی هەركام لـە (الاستحسـان والاجمـاع والعـرف) كەلـە سـەرجەم كتێبـەكانی (اصـول الفقـه)یـش دا هاتوون، بڕوانە: (تأريخ المذاهب الاسلامية) ص٣٧٧.

٢- چونكە ئەبووحەنیفـە وەصـیەتی كـردوە كـە نـابێ لەگۆڕسـتانێك بنێـژرێت كـە زەوت (غصـب) كرابـێ یـان كاربەدەستانی تێدا تۆمەتباركرابن بەزەوت كردنی! بۆیە (أبو جعفر المنصور)یش گوتوویەتی: (مَنْ يَعْذِرُنِي من أبي حنيفة حيا وميتا؟!) بڕوانە: (تأريخ المذاهب الاسلامية)ص٣٧٤.

## ٧- ئیمام جەعفەری صادیق(رحمة الله تعالی علیه):[١]

ناوی: (جعفر بن محمد بن علي بن الحسين بن علي بن أبي طالب) (خوا لێیان رازی بێ)، دایكیشی (أم فَرْوة بنت القاسم بن محمد بن أبی بكر الصديق)ە (خوا لێیان رازی بێ)، لەساڵی (٨٠)ی كۆچی لەدایك بووەو لەساڵی(١٤٨) كۆچی دوایی كردوەو، یەكێكە لە زاناو پێشەوا هەڵكەوتووەكانی ئیسلام و نموونەی عیبادەت و رەوشت بەرزییو حیكمەت و بوێرییو غیرەت بووە.

ئەم چەند هەڵوێستەش لەباغی هەڵوێستە پڕشنگدارەكانی گوڵبژێر دەكەین:

### یەك: زانیارییو شارەزایی جەعفەری صادیق:

ئیمام جەعفەر (رەحمەتی خوای لێبێ) زانیارییو شارەزاییەكی قووڵ و فراوانی هەبووە، چونكە وێڕای زانیاری بابی (محمد الباقر) زانیاری هەركام لە (قاسم بن محمد بن أبی بكر الصديق) (خوا لێیان رازی بێت) كە بابی دایكی بووەو هەڵگری زانیاری (عائشة)ش بووە (خوا لێی رازی بێت)، وە زانیاری باپیر (علي: زين العابدين)یشی كۆكردۆتەوە.

ئەم بەسەرهاتەش رادەی زانیاریی ئیمام جەعفەر چاك دەردەخات:

لە (أبوحنيفە) گێڕراوەتەوە كە گوتوویەتی: (أبو جعفر المنصور) پێی گوتم: ئەی ئەبوو حەنیفە خەڵكی زۆر سەرسام بوون بەزانیاریی (جعفر بن محمد) جا هەندێك پرسیاری بەزەحمەتی بۆ ئامادە بكە!

دەڵێ منیش (٤٠) پرسیاری قورسم بۆ حازر كردو كاتێك پرسیارەكانم ئاراستە كردن لە وەڵامی هەرپرسیارێك دا دەیگوت: ئێوە راتان ئەوەیەو خەڵكی مەدینە ئاوا دەڵێن و ئێمەش ئەمە رامانە، جا جاری وا هەبوو رای وەك ئێمە یان مەدینەییەكان دەبوو، جاری واش هەبوو رای تایبەتیو جیاوازی هەبوو، هەتا هەر چل پرسیارەكەم تەواو كردن و

---

١- بڕوانە: (تهذيب الأسماء واللغات) القسم الأول, ج١ص١٤٩, ١٥٠, وە (تأريخ المذاهب الأسلامية) ص ٦٨٩تا ٧١٦, كە هەرچی لێرەدا هێناومە لەم دووانەم وەرگرتوە.

وەڵامـی هەموویانیدایـەوە، ئنجـا ئـەبوو حەنیفـە لەکۆتاییـدا دانـی بـەزانیاری ئیمـام جەعفەردا هێناوەو گوتوویەتی: (إِنَّ أَعْلَمَ الناسِ أَعْلَمُهْم بأختلاف الناس).[1]

## دوو: بەرپەرچ دانەوەی بۆ لادەران (رَدُّهُ على المنحرفين):

لە ڕۆژگاری ئیمام جەعفەری صادیق دا(خوا لێی خۆش بێ) شەپۆلی لادەران لە ڕێبازی بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ لەژێر پەردەی شیعایەتیو خۆشویستنی (أهل البيت)دا زۆر بەهێز بوو بوو و ڕێڕەو (إتجاه)ی ڕۆچووان (غُلاة)ی نێو شیعەگەریی زۆر پەرەیستاند بوو، بۆیە ئیمام جەعفەریش وەك باوو باپیرانی خۆی خوا لێیان ڕازی بێ زۆر مەردانەو بێ پەردانە بەرگریی (دفاع) لە ڕێبازی ڕەسەنی پێشینەی چاك (السَّلف الصالح) كردوەو پێشگیریی (مَنْع)یشی لەبیروبۆچوونە لادەرو داهێنراوەكان كردوە, جا پەسەندی دەزانم سەرەتا هەڵوێستێكی (محمد الباقر) ی بابی ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەو بارەوە نەقڵ بكەین، پاشان ئاماژەیەكیش بە هەڵوێستی خۆی لەو بارەوە دەكەین:

ئیمام موحەمەدی باقر ڕۆژێكیان ڕوودەكاتە (جابِرُ الجَعَفي)و پێی دەڵێ:[2]

(يا جابرُ بلَغَني أنَّ قَوْماً بالعراقِ يَزْعمُون أنَّهم يُحِبُّوننا وَيَتَناولون أبابكرٍ وعُمَر رضي الله عنها ويَزْعمُون أني أَمَرتُهُم بذالِكَ! فأَبْلِغْهُمْ أني الى الله منهم برىءٌ, والذي نفسُ محمدٍ بيَدِهِ لَوْ وُلِّيتُ لَتقرَّبْتُ الى الله تعال بِدِمائِهِمْ... لانالَتني شفاعةُ محمد ﷺ إنْ لَمْ أكُنْ أسْتَغفِرُ لَهُما وأترَحَّمْ عليهما إنَّ أعداءَ اللهِ لغافلون عنهما) .

واتە: ئەی جابیر! پێم گەیشتوە كە كۆمەڵێك هەن لە عێراق پێیان وایە كە ئێمەیان خۆش دەوێو قسەش بە ئەبووبەكرو عومەر دەڵێن (خوا لێیان ڕازی بێ)! وە پێشیان وایە كەوا من ئەوەم پێگوتوون! جا تۆ پێیان ڕابگەیەنە كە من لەلای خوا لێیان بەریئم, سوێند بەو كەسەی گیانی موحەمەدی بەدەستە، ئەگەر دەستەڵاتم هەبێ بە ڕشتنی خوێنیان خۆم لەخوا نێزیك دەخەمەوە... یاخوا ئەگەر داوای لێبوردن بۆ ئەوان (واتە ئەبووبەكرو عومەر) لەخوا نەكەم و داوای بەزەیی خوایان بۆ نەكەم بەر شەفاعەتی موحەمەدﷺ نەكەوم! بەڵام ئەوانەی دوژمنانی خوان ئەوانە ناناسن و لێیان بێئاگان!

---

١- بڕوانە: (تأريخ المذاهب الإسلامية) محمد أبو زهره, ص٦٩٣.

٢- هەمان سەرچاوە. ص٦٨٩

جا ئیمام جەعفەریش کە بێگومان لەسەر هەمان ڕێبازی بابیو بنەماڵە بەڕێزەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتوە, هەر هەمان هەڵوێستی بەرانبەر بەخەڵکی بەڕواڵەت شیعەو کۆمەڵی سەربە (أهل البیت) و لەڕاستیدا زەندیق و بێ بڕوا، یان لاڕێو هەڵخەڵەتاو هەبووە.

ئەوەتا لەکاتێك دا کە (محمد بن زَیْنَب الأجدع الأسدي) کە بە (ابو الخطّاب) ناسراوەو بەئەسڵ فارسە! دەست دەکات بەقسەی هەڵلەق و پەڵلەق و, زۆر لە فەرزەکان لەسەر شوێن کەوتووەکانی لادەبات و گەلێك شتی حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەکات! وەك (قاضي أبو حنیفة النعمان التمیمي) کە قاضي دەوڵەتی فاطیمی بووە[1] لەکتێبی (دعائم الأسلام)دا هێناویەتی, بەڵێ دوای ئەوەی ئیمام جەعفەری صادیق ئەو قسەو هەواڵانەی ئەو بانگەوازکەرە بەڕواڵەت (شیعي)یەی پێ دەگات بوێرانەو ڕاشکاوانە دەست دەکات بە بەرپەرچدانەوەی و بەرهەڵستی کردنی بانگەوازە ژەهراویەکەی، خاوەنی کتێبی (دعائم الاسلام) لەوبارەوە نووسیویەتی :[2]

(..... فَبَلَغ أَمْرَهُ جَعْفَر بن محمدٍ فَلَمْ يَقْدِرْ عليه بأكثر مِنْ أَنْ لَعَنَهُ وتبرَّأ مِنْـهُ، وجَمَـعَ أَصْحابَهُ فَعرَّفهم بذلك وكَتَبَ الى البُلدانِ بالبراءَةِ مِنْهُ واللَّعنَةِ عَلَيْهِ).

واتە:.... جا هەواڵی ئەو (أبوالخطاب)ە بە جەعفەری کوڕی موحەممەد گەیشت، بەڵام هیچی پێ لەگەڵ نەکرا ئەوەندە نەبێ کە لەعنەتی لێکردو خۆی لێبەریی کرد، وە هاوەڵەکانی خۆیشی کۆکردنەوەو ئەو مەسەلەیەی تێگەیاندن و پاشان نامەی حاشا لێکردنی و لەعنەت لێکردنی بۆ شارو وڵاتان نووسی.

هەروەها لە نامەیەکی دیکەیدا کە ئیمام جەعفەر بۆ یەکێك لەبانگەوازکەرانی سەربەخۆی نووسیویەتی، دوای ئەوەی ئەو بانگەوازکەرە لەنامەیەك دا حاڵو وەزعی ئەو پێڕو تاقمە لادەرو سەرگەردانەی بۆ دەنووسێ و ئاگاداری دەکاتەوە، پاش ئەوەی هەموو ئەو گوناح و هەڵەو لادانانە دەخاتەڕوو کە ئەو پێڕو تاقمە پێیانەوە گیرۆدە بوون، لەکۆتایی نامەو وەڵامەکەیدا نووسیویەتی:

---

١- لە ساڵی (٣٦٣)ك وەفاتی کردوە.

٢- بڕوانە: (تأریخ المذاهب الاسلامیة) ص٧٠٥، کەلە (دعائم الاسلام)ی وەرگرتووە.

(...ومَنْ قالَ بهِ فهو عندي مُشْرِكٌ بَيِّنُ الشِّرْكِ، فلا يَسَعُ أحداً أنْ يشكَّ فيه)[1]

واتە:... وە هەرکەسێك ڕای وابێ (کە نووسراوە) ئەوە بەلای منەوە هاوبەش بۆخوا دانەرێکی ئاشکراو ڕوونەو هیچ کەس ناتوانێ تێیدا لەگوماندا بێت.

## سێ: ئازایەتیی‌و بوێریی ئیمام جەعفەر:

**أ–** جارێکیان کابرایەك شایەدییەکی بەدرۆ لەلای (أبوجعفر) دژی (إمام جعفر) دەدات کە گوایا (ابن خنیس) پارەو سامانی بۆ خڕ دەکاتەوە! دیارە ئیمام جەعفەریش حاشا دەکات و ئامادەش دەبێ سوێندی بۆ بخوات، بەڵام ئەبوو جەعفەر مکووڕ دەبێ لەسەر ئەوە کە تەڵاقیشی بۆ بخوات، ئەویش ئامادە نابێ و پاشان کابرای شایەد دێنێتە ڕووی‌و لەسەر شایەدیی دانی بەدرۆی خۆی هەر سوور دەبێ، ئیمام جەعفەریش پێی دەڵێ: دەجا باشە ئاوا سوێندەکەت بخۆ: (أَبْرَأُ الى الله مِنْ حَوْلِهِ وقوَّتهِ وألجأ الى حَوْلي وقُوَّتي إني لصادق فيما أَقُولُ)، ئیدی کابرا کە بەو شێوەیە سوێندە دەخوات دەستبەجێ دەکەوێ‌و دەمرێ! (أبو جعفر المنصور)یش کە ئەوە دەبینێ دەترسێ‌و دەلەرزێ‌و پێشی دەڵێ: حەزدەکەی بەیانی بچۆوە بۆ شاری باپیرت (واتە مەدینە)، وە ئەگەر لێرەش لامان بمێنیەوە لە ڕێزلێگرتنت دا کەمتەرخەمی ناکەین، وە لەمەودوا قسەی هیچ کەس لەبارەی تۆوە وەرناگرین.

**ب–** دەگێڕنەوە جارێکیان (مێش)ێك زۆر بەدەوری دەم وچاوی ئەبووجەعفەردا دێت و دەچێ‌و بێزاری دەکات و ئیمام جەعفەریش لەوێ دەبێ، جا ئەبووجەعفەر ڕوودەکاتە ئیمام و پێی دەڵێ: ئەرێ ئەبوو عەبدوڵڵا خوا بۆچی مێشی دروست کردوە؟! ئەویش دەڵێ: (لِيُذِلَّ بهِ الجبابِرَةَ) بۆئەوەی ملهوڕەکانی پێ زەبوون بکات.

**ج–** هەروەها جارێکیان لەوەڵامی نامەیەکی (المنصور)دا کەبۆی نووسیوە: بۆچی سەردانمان ناکەی؟! بۆی نووسیوەتەوە:

(لَيْسَ لَنا ما نخافُك مِنْ أَجْلِه، ولا عندك من أمْرِ الآخرةِ مانَرْجوكَ لَهُ، ولا أنت في نِعْمَةٍ فَنُهنِّيك، ولانَراها نِقْمةً فَنُعَزِّيك) واتە: نەشتێکی وامان هەیە کە لەپێناویدا مەترسیمان

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ص٧٠٦.

لێت هەبێ، وە نەهیوایەکی دوارۆژیشمان پێت هەیە کە پێت بێتەدی، وە تۆ لەنیعمەتێك دانی کە پیرۆزباییت لێبکەین و، پێشمان وا نیە بەڵایەکت بەسەر هاتبێ تاکو سەرەخۆشییت لێبکەین.

وە لەدوایین نامەیدا کە لەوەڵامی نامەی (أبو جعفر)دا نووسیویەتی و دیسان داوای لێکردوە کە سەردانی بکات، نووسیویەتی: (.. مَنْ اراد الدنيا لايَنْصحك، ومَنْ ارادَ الأخِرةَ لايَصْحَبُكَ) ئەوەی وێڵی دونیا بێ دڵسۆزییت بۆ ناکات و، کەسێکیش عەودالّی دوارۆژ بێت هاوەڵییت ناکات!

**د–** وە جارێکیان گوێی لە کاربەدەستێك بوو قسەی بە (علي بن أبي طالب) گوت! ئیمام جەعفەریش بەرەنگاری بووەوەو بەرپەرچی دایەوەو پاشان گوتی: (ألا أنبئكم بِأخْلى الناس ميزاناً يوم القيامةِ وأبْينِهِمْ خُسْراناً! مَنْ باعَ آخِرَتُه بدُنيا غَيْرِه، وهو هذا الفاسِقُ).

واتە: ئایا هەواڵتان بدەمێ کە لەقیامەتێ لەهەموو کەس دەست خاڵیترەو زەرەرو زیانی لەهی هەموو کەس ئاشکراترە! کەسێکە کە دوارۆژی خۆی بەدنیای خەڵکی دەدات، ئەویش ئەم گوناحبارەیە!!

## چوار: بۆچی ئیمام صادیق دژی ستەم و ناشەرعییەکانی ئومەویی‌و عەبباسی‌یەکان ڕانەپەڕی؟!

ڕەنگە ئەم پرسیارە لەدڵ و مێشکی گەلێك کەسدا دروست بێ، کە ئایا مادام جەعفەری کوڕی موحەممەد خوا لێیان خۆش بێ ئەو کەسایەتی‌یە پاك و بەهێزو پێزەی بووە، بۆچی وەك خزمەکانی دیکەی کە لەمەیدان دا بەهێز لەگەڵ بەناو خەلیفەو کاربەدەستانی ئومەویی‌و عەبباسی‌دا ڕووبەڕوو بوونەتەوە، ئەویش لێیان ڕانەپەڕیوەو بەرەنگاریان نەبۆتەوە؟!![1]

جا من پێم وایە وەڵامەکەی هەر ئەوەیە کە بێگومان جەعفەری صادیق لە ئازایەتی‌و بوێریی ئەوانی کەم نەبووە، بەڵام واپێدەچێ ئەوان لەدووربینی‌و واقیع بینی‌و (فراسة)ی

---

١- برگەکانی (أ– ب– ج– د) م لە (تأريخ المذاهب الاسلامية) ص ٧٠٩،٧٠٨ و ٧١٥، وەرگیراون.

ئـەمیان کـەم بـووبێ! بەتایبـەتیش دوای ئـەوەی هـەرکام لـە (علـي بـن أبـي طالـب) و (حســين)ی کـوڕی (خـوا لێیــان رازی بــێ) (شـیعة)ی خۆیــان و خــەڵکی (کوفــة)یــان تاقیکردبۆوەو ئەزموونەکەیان ئاکامێکی تاڵی هەبوو، نەدەبوو ئەوانی دیکەش هەر هەمان رێگا بکوتنەوەو هەمان خەڵکی جەڕبێنراو بجەڕێننەوە!! چونکە: (مَنْ جرَّبَ المُجَرَّبَ حَلَّتْ بهِ الندامةُ).

هەرچەند بێگومان ئەو کەڵە پێشەواو سـەرکردە فیـداکارە راپەڕیوانـە پاداشـتی لای خوایان مسۆگەرە- بەگوێرەی نیەتی خۆیـان- وە بەتەئکیـد هەوڵەکانیشـیان کاریگـەریی گەورەیان هەبووە لە بێدارکردنـەوەی ویژدانی نووسـتوو، یـان شـڵەقاندنی گـۆمی مەنـدو وەسـتاوی کۆمـەڵگای بەشـرینقەی سـتەمو ناشـەرعیی سـتەمکاران بـەنج کـراودا، بـەڵام مەبەستمان ئەوەیە کە شـۆڕش و راپەڕینـەکانیان ئامانجـەکان (أهـداف)ی خاوەنـەکانیان وەك دەست کەوتێکی نیزیك، نەهێناونەدیو شکستیان هێناوە.

بەڵێ ئیمام جەعفەر (خوا لێی خۆش بێ) پێکاویەتی کە بەبێ هەل ومەرج رەخسـان و دابـین کردنـی پێداویسـتییەکان (تـأمین المُسْـتَلْزمات) ملـی لەبـەر شـۆڕش و راپـەڕین و بەرەنگاربوونەوە نەناوە، چونکە بۆ سەرگرتن و بەرگرتنی هەر هەڵسان و راپـەڕینێك تـەنیا هەبوونی ئیمام و سەرکردە (الامام والقائد) بەس نیەو، وێرای ئەوە پێویستە هەم خەڵك و کۆمەڵێکی یەك هەسـت و نەسـت و خـاوەن هەڵوێسـت و جـەڕبێنراوو متمانـە پێکـراویش هەبێو، هەم هەل و مەرج و واقیعیش لەبارو گونجاو بێت!

بەڵێ ئیمام جەعفەر صادیق ئازاو دلێرو بوێر بوو، بـەڵام دەشـیزانی دنیـا چ باسـەو واقیعی نیزیك و دەوروبەریو دووریشی چی تێدایـەو چـی تێـدا دەگـوزەرێ، هـەر بۆیـەش کاتێـك دەعـوەت کـرا کـە ببێتـە سـەرو پێشـەوای ئـەو بانگـەوازە شـیعایەتی (الـدَّعْوة الشیعیة)یەی کە زەمینەی بۆ دەوڵەتی عەبباسی خۆش کرد قبووڵی نەکردو گـوتی:[1] (انهـا لیست لنا) ئەو کارە بۆ ئێمە نیە!!

خوایـە پلەوپایـەی ئـەو ئیمامـە هەڵکـەوتوە بـەرزتر بکەیـەوەو بەچـاکترین شـێوە پاداشتی خۆیو نیزیکانیشی بدەیەوە.

---

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٧١٦.

## ٨- ئیمام مالیك (رحمة الله تعالى علیه):[1]

ناوی: (مالك بن أنس بن مالك بن أبی عامر الأصْبَحي) كەبە (امام دار الهجرة) ناسراوەو لەساڵی (٩٣)ی كۆچی لەدایك بووەو لەساڵی (١٧٩) لەمەدینەی پێغەمبەرﷺ كۆچی دوایی كردوە، یەكێكە لەزاناو پێشەوا بەرجەستەكانی ئیسلام و خاوەنی كتێبی ناوداری (المُوَطَّأ)ە كە دێرترین كتێبی فەرموودەو فیقهە.

جا ئێمەش لەژیانی ئەو پێشەوا ناوازەو هەڵكەوتووە ئەم چەند هەڵوێستە هەڵدەبژێرین و لێرەدا تۆماریان دەكەین:

### یەك: مالیك كەی بۆ دەرس گوتنەوەی فەرموودەو (فِقْه) دانیشتوە؟!

ئیمام مالیك دوای ئەوەی- پاش لەبەركردن و شارەزایی تەواو لەقورئان- هەركام لەزانستی فەرموودە(حدیث)و شەرع (فقه)و فەتوای بەتەواویی وەدەست هێنان ئەوجار بۆ فێركردن و دەرس گوتنەوە لەمزگەوتی پێغەمبەرداﷺ دانیشت و لەو بارەوە بۆ خۆی گوتوویەتی: (لَیْسَ كلُّ مَنْ أَحَبَّ أَنْ یجْلِسَ في المسجْد للحدیث والفِتْیا جَلَسَ، حتی یُشاوِرَ أَهْلَ الصَّلاح والفَضْلِ والجهةِ من المَسْجِد، فأن رأوهُ لذلك أهلاً جَلَسَ، وما جَلَسْتُ حتی شَهِدَ لي سَبْعونَ شَیْخاً من أهلِ العِلمِ أني مَوْضِعٌ لذلك).[2]

واتە: نابێ هەركەسێك حەزی كرد بۆ فەرموودەو فەتوا لەمزگەوتێ دابنیشێ، تاكو راوێژ بەخەڵكی خاوەن عیبادەت و چاكەو شایستەی نێو مزگەوت دەكات، جا ئەگەر پێیان وابوو شایستەیی ئەوەی هەیە با دابنیشێ،وە من هەتا حەفتا كەس لەوانەی خاوەن زانستن شایەدییان بۆ نەدام كە شیاوی ئەوەم بۆ ئەو مەبەستە لە مزگەوتێ دانەنیشتم.



---

١- هەرچی دەربارەی ئیمام مالیك هێناومانە لەم دوو سەرچاوەیە وەرمان گرتوە: (تهذیب الاسماء واللغات)ی نووي، القسم الاول، ج٢ص٧٥تا٧٩، وە: (تأریخ المذاهب الاسلامیة) ص٣٩٠تا ٤١٨.

٢- بڕوانە: (تأریخ المذاهب الاسلامیة) ص٤٠١.

بەڵێ عیبادەت و هەڵوێستی پێشینەی چاکمان (سَلَفُنا الصالِحْ) ئاوا بووەو با ئێمەش بەکردەوەو رەفتار شوێن پێشینەی چاکمان بکەوین ئەگەرنا قسەو شیعارو دەعوای بۆش و ناو لەخۆنانی جوان و خۆش، هیچی لێهەڵناوەرێ!

## دوو: شێوازی دەرس گوتنەوەی مالیکی کوڕی ئەنەس:

کۆڕی دەرسی ئیمام پڕبوو لە ویقارو حورمەت و رێزو هەیبەت و، بەهیچ جۆرێك قسەی گاڵتەو پێکەنین و شتی ئەملاولای تێدا نەبوو، بەتایبەت ئەگەر فەرموودەکانی پێغەمبەری ﷺ گوتبانەوە خۆی دەشۆریو بۆنی خۆشی لەخۆی دەداو پۆشاکی جوانی لەبەردەکردو کورسی‌یەکیان بۆ دادەناو بخووریان دادەگیرساند بە گەردن کەچی‌یو ئارامیی‌یەوە دادەنیشت، ئەوجا دەرسەکەی دەگوتەوە![1]

وە دەربارەی قوتابی‌یەکانیشی دەیگوت:

(حَقٌّ على مَنْ طلب العِلْمَ أَنْ يكون فيه وِقار وسكينةٌ وخَشيةٌ، وأَنْ يكونَ مُتَّبِعاً لآثار مَنْ مضى، ويَنْبَغي لأهل العِلْمِ أَن يُخْلوا أنفسهمْ مِن المزاح وبخاصةٍ اذا ذكروا العلم).

واتە: لەسەر قوتابی زانست پێویستە کە ویقارو ئارامیی‌و لەخواترسانی تێدا ببینرێ، وەدەبێ شوێن بەرهەم و شوێنەواری پێشینان بکەوێ، وە دەبێ ئەهلی زانست بەتایبەت لەکاتی باس کردنی زانیاریی‌دا، قسەی گاڵتەو جەفەنگیان نەبێ.

جا دیارە ئەوەی کە ئامۆژگاری قوتابی‌یەکانی پێ‌کردوە لە پێشەوە بۆ خۆی جێبەجێی کردوە، ئەوەتا گوتوویەتی: (مِنْ آدابِ العالِمِ ألا يضْحَك الا مُبْتَسِماً) خۆی لەماوەی (٥٠) ساڵ دەرس گوتنەوەدا تەنانەت جارێکیش بەدەنگ پێنەکەنیوە!![2]

## سێ: ئیمام مالیك شتێك کە نازانێ بەڕاشکاویی دەڵێ: نایزانم!

وەك پێشتر لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان کرد کە یەکێك لەئەدەب و رەوشتە بەرزو پێویستەکانی ئەهلی زانست ئەوەیە کە رستەی: (لاأدْري) نازانم، قەت فەرامۆش نەکەن لەبەرانبەر هەر باس و بابەتێك دا کە نایزانن، جا ئیمام مالیکی کوڕی

---

١- هەمان سەرچاوە، ص٤٠٢.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ٤٠٣، هەڵبەتە بەدەنگ پێکەنین هیچ ئیشکالی تێدا نیەو لەبازنەی رەوا (مباح)دایە.

ئەنەس ئەو ئەدەب و ڕەوشتەی زۆر بەچاکی ڕەچاوکردوەو لەوبارەوە چەند شتێکی لێگێڕاوەتەوە، بۆ وێنە: (نووي) (ڕەحمەتی خوای لێبێ) ئەم بەسەرهاتەی هێناوە.[1]

(عبدالرحمن بن مهدي) گێڕاویەتەوەو گوتوویەتی: ئێمە لەلای مالیك بووین کابرایەك هات گوتی: ئەی (أبو عبدالله) شەش مانگەڕێ هاتووم و پرسیارێکم هەیە خەڵکی ولاتەکەم پێیان دا ناردووم کە ئاڕاستەی تۆی بکەم! ئەویش گوتی: بپرسە، جا کە پرسیارەکەی کرد، گوتی: نایزانم! ئیدی کابرا کۆستی کەوت، وەك ئەوەی هاتبێتە لای کەسێك هەموو شتێك بزانێ! ئنجا گوتی: جا باشە ئەگەر گەڕامەوە لای خەڵکی شارو ولاتەکەم چییان پێبڵێم؟! گوتی: بڵێ(مالك بن أنس) پێی گوتووم: نایزانم!

## چوار: ئیمام مالیك ژیان و گوزەرانی چۆن بووە؟![2]

(ابن القاسم)ی قوتابی مالیك گوتوویەتی: (إنه كان لمالكٍ أربعمائة دينارٍ يَتَّجِرُ فيها فَمِنْها كان قِوام مَعيْشتهِ ) واتە: مالیك چوار سەد دیناری هەبوو بازرگانیو مامەڵەی پێدەکردو بەوە ژیان و گوزەرانی بەڕێوەدەچوو.

ئنجا شایانی باسیشە کە ئیمام مالیك لەسەر بناغەی ئەو بنچینە شەرعیە کە هەرکەسێك خۆی بۆ ئیش و کارێکی مسوڵمانان تەرخان (مُتَفَرِّغْ) کرد هەقی لەخەزێنە (بيت المال)کەیان دا هەیە، دیاریو هاوکاری خەلیفەکانی وەرگرتووەو هەم پێداویستیەکانی خۆیو هەم پێداویستیەکانی ژمارەیەك لەئەهلی زانستی چ مامۆستا بووبن چ قوتابی پێدابێن کردوە، وە(شافعي) (ڕەحمەتی خوای لێبێ) یەکێك بووە لەو قوتابیانەی کە دەوری (٩) ساڵان لەبن باڵی خۆی گرتوەو حاواندوویەتەوە.

هەروەها ئیمام مالیك لەڕووی خواردن و خۆراك و پۆشاك و جێگاو ڕێگاشەوە تاڕادەیەك خۆشگوزەران (مُرَفَّە) بووەو، هەمیشە بۆنخۆش و جوان پۆش بووەو، ئاشکراشە ئەمەش نە لە مالیك و نە لە هیچ کەسی دیکەش، مادام لەڕێی حەڵاڵەوەبێو لەسەر حیسابی دین و کەڕامەت و قیامەتی نەبێ، بەعەیب ناگیرێ چونکە پێغەمبەری خواو خەلیفە راشیدەکانیشی لەکاتی هەبوون دا خواردنی خۆش و پۆشاکی چاکیان

---

١- بڕوانە (تهذيب الاسماء واللغات) القسم الاول، ج٢ص٧٨.

٢ - بڕوانە: (تأريخ المذاهب الاسلامية) ص٤١١تا٤١١تا ٤١٣.

ڕەدنەکردۆتـەوەو خـوای پـەروەردگاریش فەرموویـەتی: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ؟ ﴾[1]

وە دەگێڕنەوە کە ئیمام مالیك (مۆز)ی زۆر پێخۆش بووەو لـەوبارەوە گوتوویـەتی: هیچ میوەیەك هێندەی مۆز بـەمیوەی بەهەشتیٚ ناچیٚ، هـەموو وەرزێکیش چ زستان چ هـاوین هــەر چــنگ دەکــەویٚ، خــوای بــەرزیش فەرموویــەتی: ﴿ ....أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا .... ﴾[2] ، واتە: درەختەکانی بەهەشت میوەو سێبەرەکانی بەردەوامە.

## پێنج: گرفتاریىو مەینەتیی ئیمام مالیك:

لەساڵی (١٤٦)ی کۆچیدا ئیمام مالیك لەگەڵ (أبـو جعفـر المنصـور)دا تێـك گـیراو دوچاری گیران و لێدران و ئەشکەنجە بوو هەتا شان(كَتْفْ)ی لەقولقوڵە چوو!

هۆکاری ئەو گرفتارییەش هەرچەندە هەندێك لەزانایان و مێژوونووسان گوتوویانە: ئەوە بووە کە ئیمام مالیك فەتوای داوە کـە نیکـاحی موتعـە (نِكـاح المُتعـة) حەرامـە، وە هەندێکیان گوتوویانە: ئەوە بووە کە گوتوویەتی: (عثمـان بـن عفـان) لـە (علـي بـن أبـی طالب) پایە بەرزترە! (خوالێیان ڕازی بیٚ)، بەڵام ڕاستییەکەی هیچ کام لەم دووانە نیـەو وەك زۆرێـك لـە مێژوونوسـان گوتوویانـە: هۆکارەکـەی ئـەوە بـووە کـە لەسـاڵی (١٤٥)دا هەرکام (محمد بن عبدالله بن الحسن بن الحسن بن علي بن أبی طالب) (خوالێیان ڕازی بیٚ) کەبـە (ذو الـنفس الزکیـة) ناسـراوەو (ابـراهیم)ی بـرای دژی ئـەبوو جەعفـەر دووەمـین حوکمڕانی عەبباسییەکان ڕاپەڕیون، جاکاتێك– وەك(ابن الاثير) لە (الكامل فی التأريخ)دا هێناویەتی– خـەڵکی مەدینـە چـوونەتە لای ئیمـام مالیـك و ڕاوێـژیان پێکـردوە کـە ئایـا پشتگیریی (ابراهیم و محمد)بکەن یان نا؟! گوتوویەتی: بـەڵیٚ پشـتگیرییان بکـەن، ئنجـا خەڵکەکەش گوتوویانە: ئاخر پەیمان و بەیعـەتی (أبـو جعفر)مـان لەگـەردن دایـە! ئیمـام

---

[1] – الأعراف: ٣٢

[2] – الرعد: ٣٥

مالیك فەرمووده‌ی: (لَيْسَ على مَسْتَكرهٍ يَمْينٌ)[1] یان بە بەڵگە بۆ دەهێنێتەوەو فەتوایان بۆ دەدات کە مادام بە تۆبزیی پەیمانتان لێوەرگیراوەو سوێندتان پێخوراوە گوناهبار نابن!

ئیدی پاش قسەو فەتوای مالیك، خەڵکی بەڵێشاو لەدەوری ئیبراهیم کۆبوونەوە، بەڵام وەك پێشتر باسمان کرد سەرەنجام راپەڕینەکەیان شکستی هێناو ئەوانیش شەهید کران![2]

## شەش: ئەدەب و خۆڕاگریی مالیك لەسەر نەخۆشیی:

کۆتایی هەڵوێستە هەڵبژاردەکانی ئیمام مالیك بەم هەڵوێستە سەرسوڕهێنەرەی دێنین: ئیمام مالیك کە لەسەرەتاوە دەرسەکانی لە مزگەوتی پێغەمبەردا بوون ﷺ دوایی دەرسەکانی بردەوەماڵەوەیان لەبەر نەخۆشییەك کە هیچ کەس نەیزانیوە چییە؟! وە کاتێکیش لەو بارەوە لێیان پرسیوە گوتوویەتی: (لَيْس كلُّ الناسِ يَذْكُرُ عُذْرَهُ) هەموو کەس عوزری خۆی باس ناکات!

بەڵام لەڕۆژی کۆچی دوایی کردنیدا دەڵێ:[3]

(لولا أني في آخر مِنْ أيامِ حياتي ما أخْبَرْتُكُمْ! مَرَضي سَلِسُ البولِ، كرهْتُ أنْ آتي مَسْجِدَ رسول الله بغير وضوءٍ كاملٍ، وكرِهْتُ أن أذكر عِلَّتي فأشْكو رَبي)!!

واتە: ئەگەر دوایین رۆژی ژیانم نەبووایە پێم نەدەگوتن! نەخۆشی یەکەم چڕکە میزەیە! حەزم نەدەکرد بەدەستنوێژی تەواوە نەبێ بچمە مزگەوتی پێغەمبەری خواوەو پێشم ناخۆش بوو باسی نەخۆشی یەکەم بکەم و سکاڵا لەنەخۆشی پەروەردگارم بکەم!!



---

[1]- واتە: کەسێك بە زەخت و زۆر سوێندی پێخورابێ، مولزەم نیە بە سوێندەکەیەوە.

[2]- بڕوانە: (الكامل في التأريخ) ج٥ ص٢٥١.

[3]- بڕوانە: (تأريخ المذاهب الاسلامية) ص٤١٨.

## ٩- ئیمام شافیعی (رحمة الله تعالى عليه):

ناوی: (محمد بن ادريس بن العباس بن عثمان بن شافع ابن السَّائب بن عبد يزيد بن هاشم بن عبدالمطلبْ)ه لەشاری (غَزَّة) لە (فلسطين) لەساڵی (١٥٠)ی كۆچی هاتۆتە دنیاوەو لەساڵی(٢٠٤) لەمیصر مردوە (خوا لێی خۆش بێ).

دیارە ئیمام شافیعی یەكێكە لە پێشەوا بەرجەستەكانی ئیسلام و بەدامەزرێنەری زانیاری (أصول الفقه) دادەنرێو خاوەنی دوو كتێبی یەكجار گرنگە كە یەكێكیان (الرسالة)یەكە (أصول الفقه)ەو ئەوی دیكەشیان (الأم)ە، كە(فقه)ە.

وە ئیمام شافیعی (رەحمەتی خوای لێبێ) لەعێراق شۆرەتی: (ناصر الحديث)یان (ناصرُ السُنَّة)ی پێدراوەو (الحسن بن محمد الزَّعفراني) گوتوویەتی: (كانُ أصحابُ الحديث رُقُوداً فأيْقظَهُمُ الشّافعي فَتيقظوا)، واتە: فەرموودەزانانن خەوتووبوون شافیعی بێداری كردنەوەو بێداربوونەوە.

جا ئێمە لەحەوت خاڵی گوشراودا هەڵوێستە پرشنگدارەكانی ئیمام شافیعی گوڵبژێر دەكەین:

### یەك: پشوو درێژیو خۆڕاگریی لەسەر بەدواداگەڕانی زانست:

هەرچەندە شافیعی بەهەتیویو هەژاریو دوور لەكەس وكار (اليُتْمُ والفَقْرُ والبُعْدُ عن الأهْل) پێگەیشتوە، بەڵام هەموو ئەو بەربەستانە نەیانتوانیوە ببنە پەرچ (مانع) لەڕێیداو سەرەنجام بە (٧) ساڵی قورئان و بە (١٠) ساڵیشی كتێبی(الموطأ)ی لەبەركردوەو، لەتەمەنی (١٥) یان (١٨) ساڵیدا گەیشتۆتە ئاستی فەتوادان!! بەڵێ (محمد بن ادريس) هێندە هەژار بووە پێستی فڕێدراوی كۆكردۆتەوەو لەسەری نووسیوە!![1]

وە شافیعی بەدوای زانست دا زۆربەی شارو وڵاتەكانی ئەوسا كە زانایانیان لێنیشتەجێ بوون گەڕاوە، وەك (مكة)و (يمن)و (بغداد)و (كوفة)و (أناضول)و (فلسطين) و (مدينة) وە سەرەنجام (مصر).

---

١- بڕوانە: (تهذيب الاسماء واللغات) القسم الاول، ج١ ص٤٦.

وە وەك لە شیعرێكیدا هاتوە گوتوویەتی:

سأضرب في طول البلاد وعرضها أنـال مـرادي أو أمـوت غريبـا

فـأن تَلِفَـتْ نفسـي فللـه دَرُّهـا وان سَلِمَتْ كـان الرجـوع قريبـا

واتە: بە درێژایی‌و پانایی وڵاتان دا دەڕۆم، یان بەئامانج دەگەم یان لـە غەریبایـەتی دەمرم، جا ئەگـەر فـەوتام ئـەوە شتێكی پەسـەندم كـردوەو، ئەگـەر سـەلامەتیش بـووم گەڕانەوە نیزیكە.

## دوو: گیرۆدە بوونی بەتاقیكرانەوەوەو سەربەرز دەرچوونی:

لـە سـۆنگەی ئـەوەوە كـە ئومەوییـەكان و عەبباسـیەكان لەسـەر بناغـەی نـەفامێتی‌و بـەمیراتیی حوكمڕانیـان دەكـرد، هەمیشـە لەخـەڵكی بەشەخصـییەت و بەرجەسـتە دڕدۆنـگ بـوون و لەسـێبەری خۆیـان دەسـڵەمینەوە، وەك عـادەتی هـەموو دیكتاتۆرەكان، بۆیە كاتێك شافیعی لەیەمەن و حیجاز ناووشۆرەتی پەیداكرد جاسووس و چڵكاو خۆرەكان كەوتنە راپۆرت لەسەر نووسینی‌و سەرەنجام شافیعی لەگەڵ ژمارەیەكی زۆر لەعەلەوییەكان[1]. زنجیر پێچ كراو بۆ بەغداد بۆلای (هارون الرشد) رەوانەكرا.

دیـارە عەلەوییـە كەلەپچـەكراوەكان دە كـەس دە كـەس براونەتـە لای هـاروون و ئەویش پاش پرسیارو وەڵامێكی كـورت فـەرمانی لـە گـەردەن دانـی داون!! هـەتا نـۆرە گەیشتۆتە سەر شافیعی‌و یەكسەر كە چۆتەلای ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ ... ﴾[2]، ئنجا پاش چەند قسەو باسێك هـاروون فـەرمان دەكات كە دەست و پێی بكەنـەوەو لەتەنیشـت خـۆی دایدەنیشـێنێ‌و دەیـەوێ هەنـدێك پارەی بداتێ!! بەڵام شافیعی نایەوێ‌و دەڵێ:

(كلا والله يا أميرَ المؤمنين لايراني الله عزَّ وجلَّ وقَدْ سوَّدْتُ وجْهَ مَوْعظتي بقبول الجزاءِ عنْها)، واتە: نـەخێر بـەخوا ئـەی فەرمانـدەی بڕواداران نـابێ خـوای بـەرزو مـەزن بمبینێ كەڕووی ئامۆژگاری كردنەكەم بەوەرگرتنی پاداشت لەبەرانبەردا، رەش كردوە!

---

١- مەبەست لە (العلويين) ئەوانە بوون كەبەڕەچەڵەك چوونەتەوە سەر (علي بن أبی طالب) (خواليێ رازی بێ).

٢- الحجرات: ٦

پاشان مۆڵەت وەردەگریو دەڕوات و، دوای ماوەیەك كۆچ دەكات بۆ میصرو لەوێ سەقامگیر دەبێت.

## سێ: ڕاكردنیو كۆچ كردنی بۆ میصر:

پاش ئەوەی بیرۆكەی قورئان دروستكراوە (القرآن مخلوقٌ) كەلەلایەن موعتەزیلەكانەوە خرایەڕوو، چووە مێشكی (مأمون)ەوەو ئەویش دەستی كرد بە ئەشكەنجەدانی زانایان لەسەر دان پێدانەهێنانی! شافیعی بارگەو بنەی خۆی بەرەو میصر پێچایەوە، چونكە ئامادە نەبوو دان بە بیدعەتێكی ئاوادا بهێنێ! بەڵێ ناچاربوو بۆ سەلامەت بوونی ئایینەكەی عێراق بەجێبهێڵێو بەرەو میصر بچێ، جا لەو بارەوە گوتوویەتی:

لقد أصبحت نفسي تتوق الى مصر ومن دونها أرض المهامة والقَفْرِ

فــوالله لاأدري أللفـــوز والغِنـــى أســـاق أم أســـاق الى القـــبر!

واتە: ئێستا نەفسم تامەزرۆی چوونە میصری هەیە كەلەڕێیدا بیابان و چۆڵەوانییەكی ئەستەم هەیە، جا بەخوا نازانم نەبەرەو سەرفرازییو بێنیازیی دەبرێم نەبەرەو گۆڕ!

## چوار: بەرنامەی شافیعی پابەندیی بەقورئان و سوننەتەوەو هەوڵدانی نەپساوەی بۆ زیاترو چاكتر تێگەیشتنیان:

شافیعی دەربارەی بەرنامە (مَنْهج)ی خۆی گوتوویەتی:[1]

((والعلم طبقات شتَّى:

الاولى: الكتاب، والسنة إذا ثَبَتتِ السُّنَّةُ.

الثانية: الاجماع فيما ليس فيه كتابٌ ولا سنة.

الثالثة: أن يقول بعض أصحاب النبيﷺ ولانعلم لَهُ مُخالفاً.

الرابعة: اختلاف اصحاب النبيﷺ فى ذلك.

---

١- بڕوانە: (الام) ج٧ص٢٦٥.

الخامسة: القياس على بعض الطبقات ولايُصار الى شيءٍ غير الكتاب والسنة وهما مَوْجودانِ وإنما يُؤخَذُ العِلمُ مِنْ أعْلى.[1]))

واتە: وە زانیاری چەند پلەیەکە:

**یەکەم:** کتێبی خوا، وەسوننەت مادام بە بەڵگە ئیسپات بووبێ کەڕاست (صحيح)ە.

**دووەم:** یەکدەنگیی زانایان لەسەر مەسەلەیەك کە قورئان و سوننەتی لەبارەوە نەهاتوون.

**سێیەم:** قسەیەك کەیەکێك یان هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ کردبیان وەقسەو رای دیکەی جیاوازی نەبن.

**چوارەم:** ئەو مەسەلانەی کە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ تێیان دا راجیایی (اختلاف)یان هەیە.

**پێنجەم:** قیاس کردنە سەر هەندێك لەو پلانەی زانیاری، وەدروست نیە هەتا بەڵگەی قورئان و سوننەت لەسەر شتێك هەبن، پەنابرێتە بەر بەڵگەی دی، چونکە زانیاری شەرعیی دەبێ لەسەروترەوە وەربگیرێ.

قسەش زۆر لە شافیعیەوە گێڕراونەوە لەوبارەوە کە قورئان و سوننەتی لەسەرووی هەموو شتێکەوە داناون، بۆ وێنە:

أ- (كلُّ ما قُلْتُ وقال النبيُّﷺخِلافَ قولي مما يَصِحُ فحديثُ النبيﷺأوْلى ولاتُقَلدوني).[2]

ب- (واذا وجَدْتُم في كتابي خِلافَ سنة رسول اللهِﷺ فقولوا بِسُنَّةِ رسول الله ﷺو دَعُوا ماقُلْتُ).[3]

ج- (إِذا صَحَّ الحديثُ فهو مَذْهَبي).[4]



١- بڕوانە: (الام) ج٧ص٢٦٥.
٢- بڕوانە: (المناقب) ج١ص٤٧٣ للبيهقي.
٣- بڕوانە: (المناقب) ج١ص٤٧٢.
٤- بڕوانە: (الرسائل المنيرية) ج٣ص٩٨.

وە ئیمام شافیعی هەمیشە ملکەچی بەڵگەی شەرعیی بووەو لەگەڵیدا سووڕاوە هەربۆیەش کەچووە بۆ میصرو زانیاریو شارەزایی فراوانتر بووەو ژینگەیو کۆمەڵگاش گۆڕاوەو جیاواز بووە، گەلێك لەبیروڕای پێشووەکانی خۆی گۆڕیون و بەوجۆرە لەزۆر مەسەلان دا شافیعی (خوا لێی رازی بێ) رای کۆن و رای تازە (القول القدیم والقول الجدید)ی هەیە.[1]

ئنجا شایانی باسە کە ئیمام شافیعیش وەك زۆر لە زاناو پێشەوایانی دیکە بەهۆی شوێن کەوتنی بۆ بەڵگەو تەقلید نەکردنەوە، رەخنەی لێگیراوەو بەوە تۆمەتبار (متهم) کراوە کە لەبەر دنیا وادەکات! بۆیە زۆر بەڕاشکاوییو بە بەڵگەی بەهێزەوە بەرپەرچی ئەو تۆمەتەی داوەتەوەو گوتوویەتی:[2]

(یقولون: انی إنَّما أُخالفُ أبا فُلانٍ رحمهُ الله للدنیا! وکیف یکون ذلك والدنیا معهم؟! وانما یریدُ الأنسانُ الدُّنیا لبَطْنه وفَرْجه وقدْ مُنْعْتُ ماألَذُّ من المطاعم ولاسبیل الی النكاحِ- یعني لِعلَّةِ البواسیر[3]- ولكن لَسْتُ أُخالِفُهُ الا لِخلافهِ سنن رسول اللهﷺ).

## پێنج: نەفس بەرزیو قەناعەتی ئیمام شافیعی:

ئیمام شافیعی وەك هەر زاناو پێشەوایەکی دیکەی خواناس و پارێزکار زۆر عیززەتمەندو یەکجار بەقەناعەتیش بووەو لەوبارەوە قسەی زۆرن بۆ وێنە:

رأیتُ القناعة رأس الغنی — فَصِرْتُ بِأذْیالها مُتَمَسِكْ
فَلاذا یَراني علی بابِهِ — ولاذا یراني بِهِ مَنْهمِكْ
فَصُرتُ غَنیاً بِلا دِرْهَمٍ — أمُرّ علی الناسِ شِبه الملِكِ

واتە: بینیم کە قەناعەت سەری دەوڵەمەندییو بێنیازییە بۆیە توند دەستەو دامێنی بووم. نە ئەم دەم بینێ لەبەر دەرگای بوەستم و، نەئەویش دەمبینێ بەدەوریدا بێم و بچم! بەهۆی قەناعەتەوە بەبێ پارە دەوڵەمەند بووم و، وەك پادشا بەلای خەڵکیدا رادەبوورم! دەك هەزار رەحمەت لەخۆت و باب و دایکت ئەی شافیعی!

---

١- بڕوانە: (المناقب) ج١ص٢٣٨.
٢- بڕوانە: (منهج الامام الشافعي فی اثبات العقیدة) ج١ص١٢٧، کەلە (المناقب) ج١ص١٧٢ وەریگرتوە.
٣- البواسیر، کۆی(باسور)ە، بەکوردی مایەسیریی پێدەڵێن.

## شەش: ڕەوشتی بەرزو جوانی ئیمام شافیعی:

شافیعی وەك هەر زاناو پێشەواو میراتگرێکی ڕەسەنی پێغەمبەری خواﷺ زۆر ڕەوشت بەرزو ئاکار پەسەند بووەو، بەسەرنج دانی شیعرە پڕ پەندو حیکمەتەکانیشی دەردەکەوێ چ پیاوێکی بەرزو بەڕێزو بەویقار بووە، بەڵام بەرلەوەی هەندێك لە شیعرەکانی لەوبارەوە بەنموونە بێنینەوە با ئاماژە بۆ چەند ڕەوشتێکی بەرزی بکەین.[1]

١- جارێ شافیعی هەتا بڵێی پیاوێکی خاوەن (إخلاص)و بۆ خوا ساغ بوونەوە بووەو رادەی ئیخلاصی شافیعی لەم قسەیەیدا دەردەکەوێ کە گوتوویەتی: (وَدِدْتُ أَنَّ الخَلْق تَعَلّموا هذا العلم على أنْ لايُنْسَبَ إليَّ مِنْهُ حَرفٌ) پێم خۆشە خەڵکی ئەم زانستەم لێوەربگرن، بەڵام پیتێکی پاڵ نەدرێتە لای من!!

هەروەها لەم قسەیەیدا کە گوتوویەتی: (وَدِدْتُ إذا ناظَرْتُ أحداً أنْ يُظهِرَ الله الحقَّ على يَدَيْهِ) حەز دەکەم کە موناقەشەم لەگەڵ یەکێك دا کرد خوا هەق لەسەر دەستی وی دەربخات!

٢- وەئیمام شافیعی پیاوێکی زۆر ڕاستبێژ بووەو لەو بارەوە گوتوویەتی: (ماكَذَبْتُ قَطُّ ولاحَلَفْتُ باللهِ لاصادِقاً ولاكاذِباً) هەرگیز درۆم نەکردوەو نەبەڕاست و نەبەدرۆش سوێندم بەخوا نەخواردوە.

٣- وە (محمد بن إدريس) (خوا لێی خۆش بێ) یەکجار سەخیو بەخشندە بووەو لەوبارەوە شتی لێگێڕراوەتەوە، بۆ وێنە:

(الحميدي) گوتوویەتی: شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە (صنعاء)ەوە هاتبوو بۆ مەککەو دە هەزار(١٠٠٠٠) دیناری پێبوو، چادرێکی لەدەرەوەی مەککە هەڵداو بەسەر خەڵکیدا بەشییەوە تا تەواو بوو.

٤- وە شافیعی زۆر جوامێرو خاوەن عیززەت بووەو خۆی لەو شتانە پاراستوە کە کەسایەتی (شخصية) ئینسان دەڕووشێنن، بەتایبەت کەسایەتی بابایەکی زاناو پێشەواو لەو بارەوە گەلێك شتی گوتوە، وەك لەبڕگەی (پێنج)دا ئاماژەیەکمان پێکرد، وەهەر

---

١- ئەو پێنج بڕگەیەم لەکتێبی: (تهذيب الاسماء واللغات)ی نووی وەرگرتوون، بڕوانە القسم الاول، ج٢ص٣٥تا٥٨.

لەوبارەوە گوتوویەتی: (لو عَلِمتُ أنَّ شُرْبَ الماءِ البارد يَنْقُصُ مِنْ مرؤتي لما شَرِبْتُهُ) وەك پێشتریش باسمان کردوە.

٥- وە ئیمام شافیعی لەبرادەرایەتیو هاوەڵایەتیدا زۆر چاکەکارو وەفاداربووە، بۆ وێنە:

(أبو أسعد) دەڵێ: شافیعی زۆر سەخیو بەخشەر بوو و کەنیزەك (جارية)ی شارەزاو کارامەی دەکڕی کەچاك بزانێ نان و چێشت ساز بکات و حەڵواو شیرینی دروست بکات، جا پێی دەگوتین: دەجا کەیفتان لەچییەو چیتان پێخۆشە بیڵێن چونکە کەنیزەکێکم کڕیوە هەرچی حەزی لێبکەن بۆتان ساز دەکات!!

ئەمەش چەند نموونەیەك لە شیعرەکانی لەبارەی هەندێك لەڕەوشتە جوانەکانەوە:

أ- بۆ وێنە: دەربارەی بێدەنگ بوون لەبەرانبەر بابای نەفام و کەم ئەدەب دا گوتوویەتی:

يُخاطِبُني السَّفيهُ بِكلِ قُبْحٍ فأكْرَهُ أنْ أكُونَ لَهُ مُجيْباً
يَزيدُ سفاهَةً فأزيدُ حِلْماً كَعودٍ زادَهُ الإحْراقُ طيْباً

واتە: بابای نەفام بەهەر وشەیەکی ناشیرینی دەمدوێنێ، بەڵام من حەز ناکەم وەڵامی بدەمەوە.

هەرچەندە ئەو نەفامێتی زیاد بکات، منیش هێمنیی زیاد دەکەم، وەك بخوور کە هەتا بسووتێنرێ بۆنی خۆشی زیاتر دەبێ.

ب- وە دەربارەی حەزکردن لەسەخاوەت و بەخشندەیی گوتوویەتی:

يالَهْفَ نفْسي على مالٍ أُفَرِّقُهُ على المُقِلين مِنْ أهْلِ المُروءاتِ
إنَّ اعتذاري الى مَنْ جاءَ يَسألُني ماليْسَ عندي لَمِنْ إحْدى المُصيباتِ

واتە: ئای چەند بەتاسەم بۆ ماڵێك کەبەسەر جوامێرانی دەست کورت دا دابەشی بکەم، بەڕاستی عوزر هێنانەوەم بۆ کەسێك کەشتێکم لێداوا دەکات کەبەدەستمەوە نیە بیدەمێ، یەکێکە لەبەڵاو گرفتەکانم!

ج- وە دەربارەی قبووڵ کردنی عوزری خاوەن عوزران ئەگەر راستیش نەکەن گوتوویەتی:

إِقْبَلْ مَعاذِيرَ مَنْ يَأْتِيك مُعْتَذِراً إِنْ بَرَّ عندك فيما قالَ أو فَجرا
لَقَدْ أطاعك مَنْ يُرْضيكَ ظاهِرُهُ وقَدْ أجلَّكَ مَنْ يَعْصيكَ مُسْتَتِرا

واته: هەركەسێك هاتە لات و عوزری بۆ هێنایەوە راست بكات یان درۆ عوزرەكەی قبووڵ بكە.

چونكە بێگومان كەسێك بەئاشكرا رازییت بكات، فەرمانبەریی بۆ كردوویی‌و ئەو كەسەش كەبەپەنهانیی سەرپێچیی‌و بێڕێزییت لەگەڵ دەنوێنێ، رێزو حورموتی گرتووی.

د- وە دەربارەی پشت بەخۆبەستن و داوای شت لەخەڵكی نەكردن، گوتوویەتی:

ماحَكَّ جِلْدَكَ مِثْلُ ظُفْرِكَ فَتَولَّ أَنْتَ جَميْعَ أَمْرِكَ
وإذا قَصَدْتَ لِحاجَةٍ فأقْصِدْ لَمُعْتَرِفٍ بَقَدْرِكَ

واتە: هیچ شتێك وەك نینۆكت پێستت ناخورێنێ، جا هەموو كارێكت هەر خۆت مشووری بخۆ.

ئنجا ئەگەر هەر ناچاریش بووی بۆ پێویستی‌یەك روو لەكەسێك بنێی، ئەوە روو لە كەسێك بكە كەقەدرت بزانێ.

## حەوت: قسەو هەست و نەستی شافیعی لەكاتی پێش سەرەمەرگ دا:

(المزني) كەناودارترین قوتابی شافیعی‌یە دەگێڕێتەوەو دەڵێ:[1]

لەنەخۆشی تێدا وەفات كردنی شافیعی‌دا(خوا لێی خۆش بێ) چوومە لای‌و پێم گوت: چۆنت رۆژكردۆتەوە ئەی مامۆستا؟!

ئەویش گوتی: بەوە رۆژم كردۆتەوە كە دنیا بەجێبهێڵم و لەبرایەكانم جیا ببمەوەو لەكاسەی مەرگ بنۆشم و بچمە خزمەت خواو بەكردەوە خراپەكانم بگەم، ئنجا بەخوا نازانم ئایا رووحم بەرەو بەهەشتە تاكو پیرۆزبایی لێبكەم؟! یان بەرەو ئاگرە تاكو سەرەخۆشی لێبكەم؟!

پاشان چاوی بریە لای ئاسمان و گریاو گوتی:

إليكَ إلهَ الخلقِ أرفَعُ رَغْبَتي وإنْ كنتُ ياذا المَنِّ والجُودِ مُجْرِما

---

١- بڕوانە: (منهج الامام الشافعي في اثبات العقيدة) ج١ص٣٩،٤٠.

ولما قسى قَلْبي وضاقَتْ مَذاهبي جَعَلْتُ الرَّجا مِني لَعَفْوكَ سُلَّما
تعَاظمني ذَنْبي فَلَما قَرَنْتُه بعَفْوك رَبي كان عفوك أعْظَما
وما زِلْتَ ذا عَفْو عن الذَنْبِ لَمْ تَزَلْ تَجودُ وتَعْفُو منَّةً وَتكرُّما
فَلَولاك لَمْ يَصْمُدْ لأبليس عابدُ فكيف وقَدْ أغْوى صَفيَّك آدَما
فأن تَعْفُ عنيَ تَعْفُ عن مُتَمَرِّدٍ ظلومٍ غشومٍ مايُزايلُ مَأْثَما
وإنْ تَنْتَقِمْ مني فَلَسْتُ بآيسٍ ولَو أد خَلْتَ نَفْسي بِجُرْمي جَهَنَّما
فَجُرْمي عظيم منْ قديمٍ وحادِثٍ وعفوك ياذا العَفْوِ أعلى وأجْسَما

واته: ئەی پەرستراوی خەڵکی ئاواتم بۆلای تۆ بەرز دەکەمەوە، هەرچەندە ئەی خاوەن چاکەو بەخشش تاوانباریش بم!

وەکاتێك دڵم رەق بوو و هیچ پەنام نەمان، ئومێدی خۆمم بەلێبوردنت کردە پەیژە.

هەرچەندە گوناحەکانی خۆمم پێ مەزن بوون، بەڵام کە لەگەڵ لێبوردنی تۆدا پەروەردگارم! بەراوردم کردن لێبوردنی تۆ مەزنتر بوو!

جا خۆتۆ بەردەوام هەر خاوەن بەخشین بووی بۆ گوناهان و بەردەوام هەر بەچاکەو بەخششی خۆتەوە خەریکی لێبوردن و بەخشین بووی!

وە بێگومان ئەگەر تۆ نەبووایەی هیچ خواپەرستێك خۆی بۆ ئیبلیس نەدەگرت، جا چۆن خۆ دەگرن، مەگەر هەر ئەو نەبوو ئادەم بەندەی هەڵبژاردەتی فریو دا؟!

جا خوایە ئەگەر بم بەخشی ئەوە لە بابایەکی یاخی ستەمکاری زۆردار کە هەمیشە سەرگەرمی گوناهانە خۆش دەبی.

وە ئەگەر تۆڵەشم لێ بستێنی ئەوە لێت نائومێد نیم هەرچەندە بەهۆی خراپەکانمەوە بشم خەیتە دۆزەخەوە.

بێگومان تاوانم لەکۆن و تازە زل زلن، بەڵام لێبوردنی تۆ ئەی خاوەن بەخشین بەرزترو گەورەترە.[1]

---

١- بۆ نوسینی ئەو حەوت خاڵە دەربارەی ئیمام شافیعی سوودم لەم سێ سەرچاوەیە وەرگرتوە، (منهج الامام الشافعي في اثبات العقيدة) ج١، وە (ديوان الامام الشافعي)، هەم لە پێشەکی (محقق)ەکەو هەم لە شیعرەکانی خۆشی کەلە خودی دیوانەکەیدا هاتوون، وە کتێبی (تهذيب الاسماء واللغات)ی نووي.

## ١٠- ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل(رحمة الله تعالى عليه):

(أحمد بن محمد بن حَنْبَل بن هلال بن أسد الشَّيْباني) لەساڵی (١٦٤) لە بەغداد لەدایك بووەو لەساڵی (٢٤١) هەرلەوێ کۆچی دوایی کردوە، یەکێکە لەپێشەوا بەرزو مەزنەکانی ئیسلام کەهەم شارەزای سوننەت و هەم (فِقه)یش بووە، وە خاوەنی چەند کتێبێکە کە ناودارترینیان (المسند)ە کەدەوری چل هەزار (٤٠,٠٠٠) دەقی سوننەتی تێدایە.

جا ئێمە لە ئیمام ئەحمەدەوە تەنیا هەڵوێستە ناوازەو ناودارەکەی کەلەبەرانبەر ئەو کێشەیەدا نواندی کەبە (فتنة خَلْق القرآن) ناسراوەو ئیمام ئەحمەد پاڵەوانەکەیەتی، دەگێڕینەوە، بەڵام پێش ئەوە لەدوو خاڵی کورتدا، ئاماژەیەك بەدوو خەسڵەتی بەرزی ئەو پێشەوا رەندە دەکەین، کە زانیاری (عِلْم)ی‌و دنیا بەکەمگرتن(زُهْد)ینی.

### یەك: زانیاری‌و شارەزایی ئیمام ئەحمەد:

ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەنبەل، بابی هەر بەگەنجی مردوەو دایکی سەرپەرشتی کردوە، هەر بەمنداڵی قورئانی لەبەرکردوەو فێری خوێندنەوەو نووسین بووە، پاشان رووی کردۆتە فەرمایشت (حديث)ی پێغەمبەرﷺ وەك خۆی گێڕاویەتەوە، یەکەمین کەس کە فەرموودەی لێوە نووسیوە ئەبوو یوسف بووە: (أولُ مَنْ كَتَبْتُ عنه الحديثَ أبويوسُفُ)، هەروا بەوەرگرتنی فەرمایشتەوە خەریك بووەو لەبەغداد ماوەتەوە، لەساڵی (١٧٩)وە هەتا (١٨٦)ی کۆچی، وە زۆر بەجیددیی‌و چالاکانە سەرگەرمی وەرگرتنی زانست بووە، وەك بۆخۆی گوتوویەتی: (جاری واهەبوو بەیانیان زۆر زوو دەچووم بۆ وەرگرتنی فەرمایشتەکانی پێغەمبەرﷺ دایکم پۆشاکەکەمی رادەکێشاو دەیگوت: باجارێ بانگ بدرێ‌و رۆژ ببێتەوە).

پاشان ئەحمەد لەساڵی (١٨٦) چووە بۆ (بەصرا)، دوایی چووە بۆ (حیجاز)، ئنجا (یەمەن)، پاشان (کووفە)، وەلەبەر بێپارەیی نەیتوانی بگاتە (رەی) وەك خۆی گێڕاویەتەوە: (ئەگەر پەنجا(٥٠) درەمم لابووایە دەچوومە لای (جرير بن عبدالحميد) کەوا دیارە ئەکاتە لەشاری (الري)بووە.

وەلەسالی (١٨٧) ئەحمەد ئیمام شافیعی لەحیجاز بینیوەو (فقه وأُصول الفقه)و (ناسخ و منسوخ)ی لێوەرگرتوە.

ئنجا هەروا بەم شێوەیە لەسسەر وەدەست هێنانی زانست، بەتایبەت زانیاری فەرموودە بەردەوام بووە، هەتا بۆتە پێشەوا (إمام) لەسوننەتی پێغەمبەردا ﷺ، عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەد گێڕاویەتەوە دەڵێ: گوێم لە (أبو زُرْعه) بوو دەیگوت: بابت هەزار هەزار (١٠٠٠٠٠٠) فەرموودەی لەبەر بووە!

وە (ابراهیم الحربي) گوتوویەتی: (رأیت أحمد أن الله جَمَعَ لَهُ عِلْمَ الأولین والآخرین)، (أبو عبیدة)یش گوتوویەتی: (ما رأیت رجلاً أعلَم بالسنةِ مِنْ أحمد)!

(شافعي)یش کاتێك بەغدادی بەجێهێشتوەو چووە بۆ میصر گوتوویەتی: (خَرَجْتُ مِنْ بَغْداد وما خَلّفْتُ بِها أفْقهَ وأتْقى مِنْ ابن حَنْبَل).

ئنجا ئیمام ئەحمەد لەتەمەنی چل (٤٠)ساڵیدا دەستی کردوە بەدەرس گوتنەوەو فەتوادان، وەکۆڕی دەرسەکانی یەکجار گەرم و بەشەوق بووەو نیزیکەی پێنج هەزار کەس (٥٠٠٠) بۆ بیستنی دەرسەکانیو پێنج سەد(٥٠٠) کەسیش بۆ نوسینەوەیان دادەنیشتن!! وە کۆڕی مەجلیسی دەرسی ئیمام ئەحمەد چەند ئیمتیازێکی هەبووە:

ویقارو ئارامیی (سکینة)و ڕێزلێگرتنی زانست و دووری لەقسەی نوکتەو گاڵتە، وە پێشخستنی هەژارو نەدار لەسەر دەوڵەمەندەکان، (الذهبی) لەوبارەوە لە(المروذي)یەوە نەقڵی کردوە کە گوتوویەتی: (لَمْ أرَ الفقیرَ في مَجْلِسِ أعَزَّ منه في مجلسِ أبي عبدالله، کان مائلاً الیهم مُقْصِراً عن أهل الدنیا، وکان فیه حِلْمُ، ولم یکُنْ بالعجول، وکان کثیر التواضُعِ تَعْلُوُهُ السَّکینة والوقارُ، إذا جلس في مَجْلِسه بَعْد العَصْر للفُتیا لایتکلَّمُ حتی یُسأل، وإذا خَرَجَ الى مَسْجِدِه لَمْ یَتَصَدَّرْ، یَقْعُدُ حیث انتْهی به المجلِسُ).

واتە: ئەوەندەی لەکۆڕی ئیمام ئەحمەددا هەژارم بەعیززەتمەندیی بینیوە لەهیچ شوێنێکی دیکەم نەدیوە، مەیلی لای ئەوانی دەکردو لەئەهلی دنیا خۆی دوور دەگرت، وە هێمن بوو پەلەپەلی نەدەکرد، زۆر بێفیزو دەمار بوو ئارامییو سەنگینی لێدەباری، کاتێك کە لەدوای نوێژی عەسر بۆ فەتوادان دادەنیشت، هەتا پرسیاری لێنەکرابایە

قسەی نەدەکرد، وەکاتێك کە دەچووە مزگەوتەکەی لەسەری مەجلیس دانەدەنیشت، بەڵکو لەکوێوە شوێنی بووایە دادەنیشت.

## دوو: دنیا بەکەمگرتنی ئیمام ئەحمەد:

ئیمام ئەحمەد ژیان و گوزەرانێکی یەکجار سادەو بەقەناعەتەوەی هەبوو، وەك پێشینە چاکەکان دەژیاو بەهیچ جۆرێك خەڵات و بەخشش و بەراتی دەستەڵاتدارەکانی وەرنەدەگرت[1]، بابی هەندێك کەل و پەلی شت چنینی بەمیرات بۆ بەجێهێشتبوو ئەوانەی بەکرێدەداو بەدەرامەتێکی کەمەوە دەیگوزەراند، جاری واش هەبووە کەناچار بووە (گوڵە وەچنی) کردوەو لەپەرێزان گوڵەگەنم و جۆو دانەوێڵەی بەجێماوی کۆکردۆتەوەو هێناویەتەوە، بگرە جاری واش بووە کە بەکرێ شتی بۆ خەڵکی نووسیوە، یان تەنانەت کۆڵکێشییەو حەمباڵیشی کردوە، لەحاڵێك دا کە پێشەوای مسوڵمانانیش بووە!! شایانی باسیشە کە ئیمام ئەحمەد ئەو دیارییەو خەڵاتانەی کە خەلیفەو کاربەدەستەکانی دەوڵەت بۆیان دەنارد بەحەرامی نەدەزانین، بەڵام دەیگوت: بەنارەوایی کۆدەکرێتەوەو هەق و مافی مسوڵمانانی تێدایەو چاویان لەدوویەتی، بۆیە خۆی لێدەپاراست.

جارێکیان بەمنداڵەکانی گوت: (لِمَ تَأْخُذونَهُ والثغورُ مُعَطَّلَةٌ غير مَشْحونةٍ والفيءُ غَيرَ مَقْسومٍ بين أهله؟!) واتە: بۆچی وەریدەگرن! لەحاڵێك دا کە سنورەکانی ئیسلام و سەنگەرەکانی لەبەرانبەر ئەهلی کوفردا بەتاڵن و ئامادەنین، وە(فیء[2])یش لەنێوان خاوەنەکانیدا دابەش نەکراوە؟!

بەڵام لەگەڵ ئەم ژیانە سادەو بەقەناعەت و دنیا بەکەم گرتنەوەیەشدا، ئیمام ئەحمەد پیاوێکی زۆر دڵ فراوان و نان بدەو سەخی بووەو لەبارەوە گوتوویەتی: (يُؤكَلُ الطعامُ بِثلاثٍ: مَعَ الإِخوانِ بالسّرور، ومَعَ الفقراء بالإِيثار، ومَعَ أَبْناءِ الدنيا بالمرؤة).

واتە: خواردن بەسێ جۆر دەخورێ: لەگەڵ برایان دا بەشادییەو خۆشیی، وەلەگەڵ هەژارو نەداراندا بە بەسەرخۆدا هەڵبژاردنەوە، وەلەگەڵ ئەهلی دنیادا بەپیاوەتییەو جوامێریی.

---

١- جاری واش بووە کەبەناچاریی وەری گرتوە، دەستبەجێ بەملاولادا بڵاوی کردۆتەوەو بەخشیویەتی.

٢- (فيء) ماڵێکە کەبەبێ جەنگ و کوشتار چنگ مسوڵمانان کەوتوە.

هەروەها گوتوویەتی: (لو أنَّ الدنيا تَقِلُّ حتى تكون فى مِقْدار لُقْمةٍ ثم أخذها أمرؤٌ مُسْلِمٌ فَوضَعها في فِمِ أخيه المُسْلِم ماكان مُسْرِفاً) واتە: ئەگەر دونیا هێندەی پاروویەك گچكە بێتەوەو پیاوێكی مسوڵمان بیگرێو بیخاتە زاری برایەكی مسوڵمانییەوە، ئەوە بەزیادەڕۆكەر دانانرێ.

## سێ: هەڵوێستی جوامێرانەی ئیمام ئەحمەد لەبەرانبەر كێشەی (بەدروست كراو دانانی قورئان)دا:

(مأمون)ی خەلیفەی عەبباسی لەساڵی(٢١٨)دا بڕیارنامەیەكی بۆ والی بەغداد دەركرد كە (اسحاق بن ابراهیم) بوو، كەسەرجەم قازییەكان و زانایان كۆبكاتەوەو هەركەسێك قەناعەتی وانەبێ كە قورئان دروست كراو (القرآن مخلوق)ە لایان بدات و هەر شایەدێكیش بڕوای بەو مەسەلەیە نەبێ شایەدیی لێوەرنەگیرێ!!

پاشان قۆناغ قۆناغ (مأمون) مەسەلەكەی خەست كردەوە، هەتا گەیشتە ئەوەی كە هەركەسێك قەناعەتی بەو مەسەلەیە نەبێ لەگەردنی بدرێو بكوژرێ! ئیدی والی دەستی كرد بەجێبەجێكردنی فەرمانی خەلیفە!! وە سەرجەم زانایانی كۆكردەوەو پێی گوتن كە ئەمری خەلیفە بەچییەو نامەكەشی بەسەردا خوێندنەوە، سەرەنجام سەرجەمی ئەو قازیو زانایانە كە والی كۆی كردبوونەوە هاتنەژێر باری ئەمری نالەباری خەلیفەی لارو لاسارو، چارو ناچار دانیان بەوەدا هێنا كە قورئان دروستكراوی خوایە، نەك سیفەتی بێوێنەو بێسەرەتای خوا، بەڵام چوار لەزانایان ئەوەیان نەسەلماند كە ئەمانەبوون:

١- أحمد بن حنبل

٢- محمد بن نوح

٣- سجادة

٤- القواريرى

دیارە(مأمون) فەرمانی كرد كە ئەوانە بخرێنە كۆت و زنجیرەوەو، هەر زوو(سجادة)ش تەسلیم بوو و دانیپێداهێناو قوتاری بوو! ڕۆژێك دوای ئەوەش (قواريرى)یش بەهۆی تەسلیم بوون و دان پیداهێنانییەوە بەرهەڵداكراو، مانەوە (أحمد بن حنبل) و (محمد بن نوح)و پاش كەلەبچەو زنجیرپێچ كران ڕەوانەی لای (مأمون)ی

کردن، بەلاّم ئەوان بەڕێوەبوون کە (مأمون) مردو (والی) بەغدادیش زۆربەی ئەو خەلّکە لەسەر ئەو کێشەیە گرتبوونی بەریەدان، وە (محمد بن نوح)یش لە گەڕانەوەیدا بۆ بەغداد وەفاتی کرد، بەو جۆرە ئیمام ئەحمەد بەتەنیا لە مەیدانیّ مایەوەو بەکەلەپچەکراویی گەیشتەوە بەغداد.

ئیمام ئەحمەد سەرەتا لە (دار عمارة)دا حەپس کرا، پاشان گوێزرایەوە بۆ حەپسخانەی گشتی: (سجن العامة)، وە سەرجەم دەوری سی (٣٠) مانگ لەسجنیّدا مایەوە، (حَنْبَل)ی کوڕی دەلّیّ: ئێمە لە سجن دا دەچووینە لایوکتێبی (الإرجاء)و چەند کتێبێکی دیکەشی لەویّدا بەسەردا خویندمەوە، وەبینیم بەکەلەپچەو کۆتەوە پێش نوێژیی بۆ خەلّکی حەپسخانەکە دەکرد، وەتەنیا لەکاتی خەوتن دا (پیّ)یان لە کۆت و زنجیر دەردەهێنا!!

ئێستاش باگویّ لە (ئەحمەد) (خوا لێی خۆش بیّ) بگرین داخۆ بەسەرهاتی خۆیمان چۆن بۆ دەگێڕێتەوە:

(کەشەوی چوارەم هات (مُعْتَصِمْ)[1] (رَبیْع)ی ناردەلام کە (الكبير أبو إسحاق)یان پیّدەگوت و فەرمانی پیّکردبوو کە بمباتە لای، جا کاتێك برامە لای (أبو إسحاق) گوتی: ئەی ئەحمەد بەخوا ئەم مەسەلەیە بەنرخی رووحت تەواو دەبیّ، ئنجا بڕیاری داوە- واتە: موعتەصیم- وە سوێندیشی خواردوە کە ئەگەر وەلاّمی نەدەیەوەو بۆی نەسەلمێنی بەشمشێر نەتکوژیّو بەردەوام لێدانت لەسەربیّ، وە لە شوێنێك بتکوژیّ کە خۆرو مانگی تێدا نەبینرێن!..جا کاتێك گەیشتینە ئەو شوێنەی کەبەدەرگای باخچە(باب البستان) ناسراوە، ولاخێك هێنراو بەکۆت و زنجیرەکانمەوە سوارکرام و هیچ کەسیشم لەگەلّ نەبوو بم گریّو چەند جارێك خەریك بوو لەبەر قورسی کۆت و پێوەندەکانم لەپەوڕوو بکەومە خوار، ئنجا هێنرام بۆ مالّی (معتصم)و خرامە ژوورێکەوەو دەرگام لەسەر داخرا، کات نیوە شەو بوو چراشی تێدا نەبوو، ویستم تەیەمموم بکەم بۆ نوێژ، دەستم کوتا دەفرێك ئاوو تەشتێك دانرابوون، دەست نوێژم گرت و نوێژم کرد، بۆ بەیانی

---

[1]- لەدوای (مأمون)ی برای ئەم بوو بە (خەلیفە)!!.

بەنـــەخوێنی شـــەرواڵەکەم دەرهێنـــاو کـــۆت و زنجیرەکـــانم پێبەســـتن بـــۆ هـــەڵگرتن و شەرواڵەکەشمم پێچایەوە.

نوێنەری (مُعتصِم) هات و گوتی: وەرە، دەستی گرتم و بردمیە لای لـەحاڵێك دا کـە بەندۆخینەکەم کۆت و پێوەندەکانم هەڵگرتبوون، ئەو دانیشـتبوو وە (إبـن أبـي دُؤاد)یـش لەوێ بوو و خەڵکێکی زۆری لەهاوەڵەکانی خڕکردبـووەوە، (معتصـم) پێـی گـوتم: نیزیـك ببەوە ئیدی هەروانیزیکی خستمەوە هەتا چوومە پەنای، ئنجا گوتی: دابنیشە، دانیشتم و کۆت و پێوەندەکانیش باریان قورس کردبووم! نەختێك راوەسـتام پاشـان گـوتم: مۆڵـەتم دەدەی بدوێم؟! گوتی قسە بکە، گوتم: خواو پێغەمبەرەکـەی بۆچـی بانگیـان دەکـرد؟! تۆزێك بێدەنگ بوو ئنجا گوتی: بۆ شایەتمان هێنان کە جگـە لـەخوا پەرسـتراوی دی نـین (شهادة أن لا اله الا الله)، گوتم دەجا من شایەتیی دەدەم کە جگە لەخوا هیچ پەرسـتراوی دی نین، پاشان گوتم: (ابن عبـاس)ی بـاپیرت گوتوویـەتی: کاتێـك نوێنـەری (عبـدالقیس) هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ئیمان (إیمان)ەوە لێیان پرسی، فەرمووی: دەزانن ئیمان چییە؟! گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: (شهادة أن لا اله الا الله وأن محمدا رسول الله وإقامِ الصَّلاةِ وإيتاء الزكاة، وأنْ تُعْطوا الخُمْسَ مِنَ المَغْنَمِ).

ئەحمەد دەڵێ- (معتصم) گوتی: ئەگەر لەدەست ئەو کەسەدا نەبووایەی کەلـەپێش منەوە بووە، هەقم بەسەرتەوە نەدەبوو.

ئنجا ئەحمەد باسی مشت ومڕی نێوان خۆیـو زاناکـانی سـەر بەکۆشـك!! دەکـات، پاشان دەڵێ:

ئەوجار (ابن أبي دؤاد) گوتـی: ئەی (أمیر المؤمنین) ئەگەر بۆت بسـەلمێنێ لـەلام لـە (١٠٠,٠٠٠) دینارو سەد هەزار دینارو...هتد زۆری ژماردن، خۆشەویست ترە، (معتصم)یش گوتی: بەخوا ئەگەر وەڵامم بداتەوە خۆم دەست و پێی دەکەمەوەو خۆم و سـەربازەکانم دەچینە لایـو لەپشتیەوە دەڕۆم!

ئنجا گوتی: ئـەی ئەحمـەد بـەخوا پەرۆشـتمە هێنـدەی هـاروونی کـوڕم پەرۆشـتمە، ئەوجار چ دەڵێی؟! منیش هەر دەمگوت: (أعْطوني شيئاً مـن كتـاب الله أو سُـنَّةِ رسـولِهِ) بەڵگەیەکم لەکتێبی خوا یان سوننەتی پێغەمبەرەکەی بۆ بێنن.

پاشان گوتیەوە: ئەی ئەحمەد! قسەیەکم لەمست بنێ هەر تۆزێ رێی تێبچێ تاکو خۆم دەست و پێت بکەمەوە، منیش گوتم: شتێکم لە کتێبی خوا یان سوننەتی پێغەمبەرەکەی بۆ بێنن، مەجلیس درێژەی کێشاو ئەو هەڵسا، منیش برامەوە شوێنی خۆم.

ئنجا کە شەوی سێیەم هات لەبەر خۆمەوە گوتم: رەنگە بەیانی وەزعی من یەکلایی بێتەوە. بۆیە بەو کەسەی کەلەگەڵم خراپ بوو پێم گوت: پەتێکم بۆ پەیدا بکە، ئەویش پەتێکی بۆ پەیداکردم و کۆت و پێوەندەکانم پێپێچانەوەو دۆخینەکەمم[1] لەشەرواڵەکەم هەڵکێشایەوە نەبادا لەکاتی لێدان و ئەشکەنجەدانم دا رووت ببمەوە!

ئنجا سبەینێی رۆژی سێیەم ناردیەوە شوێنم و برامە ژوورێ، خانوەکە جمەی دەهات شوێن بە شوێن بردیانم و بەلای کەسانێك دا تێپەڕ دەبووم کە شمشێرو کۆمەڵێکیش قەمچییان پێبوو کە رۆژانی پێشوو هێندە زۆر نەبوون، جا کە چوومە لای گوتی: دابنیشە، پاشان گوتی: بیدوێنن، وتووێژی لەگەڵ بکەن! ئەوانیش دەستیان کرد بە موناقەشە کردنم، ئەم قسەی دەکرد بەرپەرچم دەدایەوەو ئەو قسەی دەکرد وەڵامم دەدایەوە، وە دەنگم رەسەر دەنگیان کەوتبوو.....پاشان کە جیای کردمەوەو دوایی گێڕامیەوە گوتی: بێقەزابی ئەحمەد وەڵامم بدەوە تاکو بەدەستی خۆم بەرهەڵدات بکەم! منیش وەك پێشوو وەڵامم دایەوە، ئەویش نەفرینی لێکردم و گوتی: بیبەن رایکێشن و بەرگی لەبەر داڕنن! – دەڵێ– رایان کێشام و پۆشاکیان لەبەر داڕنیم.

ئەوجار بەدرێژیی باسی ئەشکەنجەدرانی خۆی دەکات، کە هێندەی لێدراوە هەتا بێهۆش بووەو بەو حاڵەش وەسەرپشتی کەوتوون، ئنجا کە هاتۆتەوە هۆش شۆربایان بۆ هێناوە، بەڵام چونکە بەرۆژوو بووە نەیخواردۆتەوەو رۆژووەکەی نەشکاندوە!

پاشان دەڵێ:

(ئەوجا هێنایانم بۆ ماڵی (اسحاق بن ابراهيم)و کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات، وە (ابن سماعة) پێش کەوت و پێش نوێژیی کرد، کە سەلامی دایەوە پێی گوتم: چۆن نوێژت کرد

---

[1]- بەنەخوێن، بەن دۆحین، دۆخین، دێخوون... هەموویان ناوی (تکة)ی عارەبین کەلە شەرواڵ هەڵدەکێشرێ بۆ ڕاوەستاندنو دانەکەوتنی.

كە خوێن بە پۆشاكەكەت دا دێتە خوار؟!) منیش گوتم: عومەریش (خوا لێی رازی بێ) نوێژیی كردو برینەكەشی خوێنی لێدەچۆڕا!)

شایانی باسە ئیمام ئەحمەد تێكڕای ئەو قامچییانەی كە لێیدراون لە(١٠٠٠) زیاتر بوون، وە لەرۆژگاری هەركام لە(مأمون)و (معتصم)و (واثق)دا هەر حەپس بووە، بەڵام لەسەردەمی (واثِق)دا بەسەر دەرس گوتنەوەی لێقەدەغەكراوەو لەماڵی خۆیدا دەست بەس بووە، وە سەرەنجام لە رۆژگاری حوكمڕانی (متوكل)دا كۆتایی بەمەینەتییو گرفتارییەكەی هاتوەو سەرەنجام دام و دەزگای حوكمڕانیی عەبباسییەكان لەبەردەم ئیرادەی پۆڵایینی ئیمام ئەحمەددا بەچۆك دا هاتوەو بەناچاری گەڕاوەتەوە[1] سەر رێبازی رەسەنی (أهل السنة والجماعة)و دەست بەرداری بیرۆكەی داهێنراوی (قورئان بەدروست كراو زانین) بووە كەلەلایەن (معتزلة)كانەوە داهێنرا كە ئەمانیش وەك تاقمەو پێڕەكانی (مُرْجِئة و خوارج و رافضة و ناصبةو جبرية قدرية) كۆمەڵێكی بیدعەتچیی بوون.

كۆتایی ئەم هەڵوێستە بوێرانەیەی ئیمام ئەحمەدیش، بەدوو قسەی زۆر بەنرخی دێنین:

١- لەوەڵامی مامیدا كە (اسحاق بن حنبل)ە كەوا دیارە داوای لێكردوە نەرمكێشییەك بكات و رزگاری بێ، گوتوویەتی: (يا عَمِّ إذا أجابَ العالِمُ تَقيَّةً والجاهِلُ يَجْهَلُ فَمتى يَتَبَّينُ الحقُّ؟!) واتە: ئەی مامی خۆم! ئایا ئەگەر بابای زانا (بەتەقیەوە) وەڵام بداتەوەو نەزانیش نەزانێ هەق كەی دەردەكەوێ؟!

٢- (يَحْيى بن مُعين) لەكاتی نەخۆشییەكەی ئیمام ئەحمەددا سەردانی كرد، بەڵام ئیمام ئەحمەد وەڵامی سەلامەكەی نەدایەوە! جا هەرچەندە (ابن معين) بە فەرموودەی خوا: ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ﴾[2] ، عوزری هێنایەوە، وە

---

١- دیارە تەنها لەم مەسەلەیەی (قورئان)دا نەك لەبوارەكانی دیكەدا كەهەر لەسەر رچەی هەڵەو ناشەرعیی بەردەوام بوون، هەتا لەساڵی (٦٥٦)ی كۆچیداو لەسەر دەستی سوپای مەغۆل بەسەركردایەتی (هۆلاكۆ) كۆتایی پێهات!.

٢- النحل: ١٠٦

بەفەرموودەکەی[1] (عمار بن ياسر) بەڵام ئەحمەد ڕووی لێوەرگێڕا، (یحی)ش گوتی: عوزر قبوڵ ناکات!!

جا کاتێك (یحی) چووە دەرێ، ئەحمەد گوتی: فەرموودەکەی (عمار) بە بەڵگە دێنێتەوە!! بەڵام فەرموودەکەی (عمار) دەڵێ: (بەلایان دا ڕەت بووم جنێویان بەتۆ دەدا، منیش گوتم نابێ پێی بڵێن و لێیان دام)، بەڵام ئێوە پێتان گوترا: (دەمانەوێ لێتان بدەین!)، (یحی)ش گوتی: (بەخوا لەژێر سایەی ئاسمان دا لەتۆ شارەزاترم لەئایینی خوادا نەدیوە!)[2]

بەڵێ ئەمە بووە کەسایەتیو هەڵوێستیو پرشنگداری ئیمام ئەحمەد لەبەرانبەر بیدعەتی بە(دروستکراو دانانی قورئان)داو ئەوە بووە پابەندیی ئیمام ئەحمەد بەقورئان و سوننەتی پێغەمبەری خواوەﷺ لێلانەدانیان لەژێر هیچ فشارێك دا، هەربۆیەش (علي بن المديني) کە یەکێك بووە لە پێشەوا گەورەکانی سوننەت و مامۆستای (بخاري)یشە گوتوویەتی: (ان الله أعزَّ هذا الدين بأبي بكر الصديق يوم الرِّدة وبأحمد بن حَنْبَلَ يوم المِحْنةِ)[3]، هەروەها هەربۆیەش لەکاتی مردن و بەخاك سپاردنی ئیمام ئەحمەددا دەوری (١٠٠٠,٠٠٠)ێك پیاو و (٦٠,٠٠٠) ئافرەت بەشداری نوێژی جەنازەکەیان کردوە.[4]





---

١- ئەو فەرموودەیەی کە (عمار) تێیدا باسی ئەشکەنجەدرانی خۆیو باب و دایکی دەکات و لەژێر فشاری ئازارو ئەشکەنجەدا چەند قسەیەك بەدڵی (مشرك)ەکان دەکات.

٢- بۆ نوسینی ئەو سێخاڵەی ژیانی ئیمام ئەحمەد سوودم لە: (رجال الفكر والدعوة) ج١، وە(العلماء وأمانة الكلمة) وەرگرتوە.

٣- بڕوانە: (ترجمة الامام أحمد) ص٧١.

٤- هەمان سەرچاوە ص٧٧، ٧٨، ٨٠.

## ١١- ئەبوولحەسەنی ئەشعەریی (رحمه الله تعالى):

(ابو الحسن: علي بن اسماعيل) لەوەچەی (أبو موسى الاشعري)یە (خوا لێی رازی بێ)، لەساڵی (٢٧٠)ی کۆچی لە بەصرا لەدایك بووەو، پاش مردنی بابی، دایکی مێردی بە (أبو علي الجبائي) کردۆتەوە کە لەوکاتەدا سەری موعتەزیلەکان بووە، وە (أبو الحسن الاشعري) لەساڵی (٣٢٤) کۆچی دوایی کردوەو لە بەغداد نێژراوەو لەکاتی بەخاك سپاردنیدا جاڕ دراوە: (اليوم مات ناصرُ السنه): ئەمڕۆ پشتیوانی سوننەت وەفاتی کرد.

لە ژیانی ئەم کەڵەپیاوەی ئیسلامیش دا، خوا پاداشتی بەرزی بداتەوە تەنیا یەکێك لە هەڵوێستەکانی کە گەورەترین و گرنگترین هەڵوێستی بووە، دەخەینەڕوو کە بریتییە لە:

### (بوێرانەو راشکاوانە دان بەهەڵەی خۆدا هێنان و گەڕانەوە نێو باوەشی هەق)

بەڵێ وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد (أبو الحسن الأشعري) پاش مێردکردنەوەی دایکی بە (أبو علي الجبائي) لەکۆش و باوەشی سەرۆکی (معتزلة)دا گەورە بووەو پێگەیوەو پەروەردە بووە، بۆیە پاش ماوەیەك دەبێتە خەلیفەو جێنشینی (أبو علي الجبائي)و ئاوا(٤٠) ساڵ لەتەمەنی دەگوزەرێنێ! بەڵام سەرەنجام فیطرەت و ویژدانی بێدار دەبێتەوەو عەقڵە گەورەکەی پوچەڵیی‌و گەندەڵیی زۆر لەلایەنەکانی بیرۆکەی (اعتزال)ی بۆ دەردەکەوێ‌و، دوای ئەوەی ماوەی(١٥) رۆژ لەماڵی خۆیدا دەچێتە خەڵوەوەو تێدەفکرێ‌و رادەمێنێ‌و موتالا دەکات و(إستخارة) دەکات، سەرەنجام دەگاتە قەناعەت و دڵنیایی تەواو کە رێبازی راست و دروستی دینداریی‌و مسوڵمانەتی هەر ئەوەیە کە پێشینەی چاك (السلف الصالح)ی لەسەری بوون، ئنجا هەرچەندە ئەوکاتە خاوەنی پلەو پایەیەکی باڵای کۆمەڵایەتی بووە، بەڵام بێدەنگ بوون و مانەوە لە پلەوپایەدا کە لەژێر سایەی قەناعەت هێنان بەبیرۆکەیەکی داهێنراو (فكرة مبتدعة)دا چنگی کەوتوە، بەتاوان دەزانێ‌و شاعیریش گوتەنی:

إِذا كنتَ ذا رأى فكن ذا عزيمةٍ ... فـأن فَسـادَ الـرأي أن تَتَـردَّدا

بۆیه لەئاكام دا (أبو الحسن الأشعري) دەچێتە مزگەوتی گەورەی بەصرا (المسجد الجامع ببصرة)و دەچێتە سەر كورسی‌یەك و بەدەنگی بەرز بانگ دەكات: [هەركەسێك ناسیومی دەمناسیٚو ئەوەی ناشم ناسیٚ ئەوە خۆمی پیٚدەناسێنم: من فلانی كوڕی فلانم، پێشتر دەمگوت: قورئان دروست كراوە(القرآن مخلوق)وە دەمگوت: خوا لە قیامەتیٚ بەچاوان نادیتریٚ، وە دەمگوت: كردەوە خراپەكانم خۆم دروستیان دەكەم..

بەڵام ئەوە ئێستا پەشێمانم و وازدەهێنم و بڕوام وایە كە بەرپەرچی موعتەزیلەكان بدەمەوەو عەیب و هەڵەكانیان بخەمەڕوو! !]

ئنجا لەوە بەدوا (أبو الحسن) دەبێتە گەورەترین و زەبردەست ترین پارێزەر (محامي)ی عەقیدەو ڕێبازی ئەهلی سوننەت و بەرپەرچ دەرەوەی بیرۆكە داهێنراوەكان، وە كتێبی (الإبانة عن أصول الدِّيانة) دەنووسیٚ، كە عەقیدەو (أهل السنة والجماعة)ی تێدا دەخاتەڕوو، وەسەرەتاكەی ئاوا دەست پیٚدەكات:

(وقولُنا الذي نقولُ به وديانَتُنا الذي نَدْينُ بها، التَمسُّك بكتابِ رَبنا عزَّوجلَّ وبسنة نَبينا عليه السلام، ومارُوي عن الصَحابةَ والتابعين وأئمة الحديث، ونحن بذلك مُعتصِمون وبماكان يقول به أبو عبدالله أحمد بن حنبل نضّرَالله وجه ورفع درجَتَهُ وأجْزَلَ مَثوبَتَهُ قائلون، ولما خالَفَ قولَهُ مُخالِفون..)

بەڵیٚ ئەمەیە (أبو الحسن الاشعری)و ئەمەشە ڕێبازەكەی لەبواری عەقیدەدا كە پابەندیی‌یە بەعەقیدەی ئیسلامیی نێو قورئان و سوننەت، كە هاوەڵان و شوێنكەوتووانیان و پێشینەی چاكمان لەسەری بوون!

بەڵام بەداخەوە لەم ڕۆژگارەدا دوو جۆرە كەس زۆر بەهەڵە لەو كەلەپیاوە حاڵی بوون:

أ- جاریٚ زۆر لەگەنج و خوێندەوارەكان ڕیچكەی (أشاعِرة)و ڕێبازی (أشعري)یان لیٚ تێكەڵ بوون و هەر بەیەك شتیان تیٚدەگەن! وە سەرەنجام هەموو ئەو بیرۆكە داهێنراوانەی كە دواتر ئەشعەریی‌یەكان (أشاعِرة) هێناویاننە نێو عەقیدەی ئیسلامیی‌یەوە بۆ وێنە: كورت هەڵهێنانی سیفەتەكانی خوا لە (٧) سیفەت داو بەناوی

(تأويل) كردنـەوەو لابـردن (نفـي)ی زۆربـەی سیفەتەکانی خـوا، یـان خـاڵی کردنـەوەیان لەچەمك و واتای راستەقینەیان و...هتد.

ب- وە زۆر لـەزاناو پێشـەوایەکان کـە بەحیسـاب خۆیـان بەشـوێن کـەوتووی (أبـو الحسن الاشعري) دەزانـن لـەبواری عەقیدەداو گـەلێك جـار نازنـاوی (أشـعري) لـەخۆیان دەنێن!! هەرچەندە ئەگەر دروست بێ ئینسان لـەڕووی فیقهی‌یـەوە نازنـاوی مـەزەبێکی تایبـەتی لـەخۆی بنـێ، لـەڕووی عەقیدەیی‌یـەوە دروسـت نیـە، چـونکە مـەزەبی فیقهـی (المذهب الفقهي) بۆچوون و تێگەیشتنی ئینسانە لەبارەی هەندێك بابەت و مەسەلەوە کـە زیاتر لەبۆچـوون و رایـەك هەڵـدەگرن، بـەڵام عەقیـدە لەلایـەن خـواو پێغەمبەرەکەیـەوەو لەقورئان و سوننەت دا خراوەتـەڕوو و نوختـەی تێدا خراوەتـە سـەرپیت! کـەوابێ نـابێ لەعەقیدەدا وەك (فقه) مەزەب و بۆچوونی جۆراوجۆرو جیاجیا هەبن، بـەناوی (أشـعري)و (ماتريدي)و (معتزلي)و (سَلَفي)و (خَلَفي)و (صوفي) چونکە ئیمان و عەقیدە بناغەی دینـەو گۆڕانی بەسەردا نایەت و یەکێکەو دووان و چەندان نیە!!

بەڵێ عەقیدە لـە ئیسـلام دا تـەنیا یەکێکـەو ئـەویش عەقیـدەی ئیسـلامیی (العقيـدة الإسلامية)و عەقیدەی قورئان و سوننەتەو هیچی‌دیکە.[1]

بێمەوە سەر ئەسڵی مەبەسـت: زۆر لـەو زانـاو پێشـەوایانە کـە پێیـان وایـە لـەبواری عەقیدەدا پەیڕەویی لە (أبو الحسن الأشعري) دەکەن، دەبینی لـەزۆر بابـەت و مەسـەلەی گـەورەو بنچـینەیی‌دا لەسـەر راوبۆچـوونی وی نـین و گـوێ لەمسـتی قسـەو راوبۆچـوونە داهێنراوەکانی زانا دوواییەکان (العلماء المتأخرون)ی قوتابخانـەی ئەشـعەریین و[2] فریـان بەسەر (أبو الحسن الأشعري)یەوە نیە، بێجگە لە نازناوێکی رووت! ئنجا رەنگـە ئەمـەش هۆکارێکی سەرەکیی بێـت بۆ بەهەڵەداچوونی گـەلێك لەگـەنج و خوێنـدەوارەکان و پێیـان

---

١- وەك لە بەرگی یەکەمی کتێبی: ( ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر رۆشنایی قورئـان و سـوننەت دا) باسـم کـردوەو لــە ســەرجەم شــەش بەرگــەکانی ئــەو کتێبــەدا بــەتێرو تەســەلیی ئیمــان و عەقیــدەی ئیســلامیی‌مان خستۆتەڕوو.

٢- دیارە ئەو کتێب و بەرهەمانەی (ابو الحسن الاشعري)یش کەبـەر لەدۆزینـەوەی هـەق و گەڕانـەوەی بۆ سـەر رێبـازی راسـتی پێشـینەی چـاك داینـاون، هـەمان حوکمیـان هەیـەو رەنگـە بەهەڵەداچـوونی هەنـدێك لەشـوێن کەوتووەکانیشی لە سۆنگەی دەرك نەکردنی ئەو ڕاستی‌یەوە بووبێ.

وایە هەرچی ئەو مامۆستاو پێشەوایانە لە کتێبەکانی وەك: (شرح العقائد)و (تهذیب الکلام)و (شرح المواقف)دا دەیخوێننەوەو دەیخەنە روو، ئەوە هەمووی راوبۆچوونی (أبو الحسن الأشعري)یە!!، کەلەپاش (أبو الحسن) گەلێك لەبیروبۆچوونەکانی (معتزلة)و (مُرْجِئة)و (فلاسِفَة) دزەیان کردۆتە نێو دڵ و مێشکیانەوەو دووبارە گێڕۆدەی بیرۆکە داهێنراوەکان (الأفکار البدعیة) بوونەتەوە!!

## لەکۆتایی ئەم باسەش دا دەڵێم:

با هەرکەسێك رێزو خۆشەویستی ئەو کەڵەزاناو موحامیەی عەقیدەی ئەهلی سوننەتی لەدڵ دایە، وەك ئەو:

أ– بوێرو بەجورئەت و بێت و هەر شتێکی بۆ ساغ بووەوە کە هەڵەیە بە ئاشکراو بێ منجەمنج رایبگەیەنێ، ئەگەر وەك ئەو دەنگیش زۆر هەڵنەیەنێ بەدەنگی نزم!

ب– بێجگە لەراستە شەقامی قورئان و سوننەت و پێشینەی چاك هیچ رێیەکی دیکە بەرێگا نەزانێ، لەهەموو بوارەکانی عەقیدەو عیبادەت و حوکم و سیاسەت و ....هتددا.[١]







١- بۆ نوسینی ئەم کورتە باسە دەربارەی (أبو الحسن الاشعری) سوودم لە (رجال الفکر والدعوة...) ج١ص١٤١تا١٥١ وەرگرتوە.

## ١٢- ئیمام غەززالیی (رحمة الله تعالى عليه):

(محمد بن محمد بن أحمد الطوسي: أبو حامد الغزالي) لە (طابران) لەناوچەی (طوس) کە ئێستا پارێزگای (مَشْهد)ی پێدەڵێن و لەسەرووی رۆژهەڵاتی ئێرانە. لەساڵی (٤٥٠)ی کۆچی لەدایك بووە، بابی پیاوێکی صالح و هەژار بووەو تەنیا بەکاسبی خۆی ژیاندوە کە ئیشەکەشی رستنی خوری (غَزْلُ الصُّوف) بوو، وە لەساڵی (٥٠٥) کۆچی دوایی کردوەو هەر لە (طابران) نێژراوە.

جا بەڕاستی خوێنەرە بەڕێزەکان! نازانم لەهەڵوێستە پرشنگدارەکانی ئیمام غەززالیی کە بە (حجة الاسلام) ناسراوە، کامیان تۆمار بکەم و کامیشیان واز لێبهێنم؟!

أ- ئایا هەڵوێستی پیرۆزی بەدوای دڵنیایی (یقین)دا گەڕانی بنووسم، کە وەك بەسەرهاتێکی یەکجار بەتام و چێژ لە: (المُنْقِذُ من الضَّلال)ەکەیدا گێڕاویەتەوە؟!

ب- یان هەڵوێستی ئەو بێداریی‌و هۆشیارییەیە مەعنەوییەیەی کە ناچاری کردوە واز لەبەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەی (النظامیة) بهێنێ‌و دەست بەرداری دەرس گوتنەوە بە(٣٠٠) قوتابی بێت و[1] خواردن و خەوی لێحەرام کردوەو ڕاپێچی گەڕان و سووڕانی دەشت و ساراو شارو وڵاتانی کردوە؟!

ج- یان هەڵوێستی یەکجار بوێرانەی بەرپەرچ دانەوەی سەرجەم بیرۆکە داهێنراوەکان و بیروبۆچوونە پووچەکان، هەر لە(متکلمین)[2] و (متصوفین)[3] ەوە بگرە، هەتا (الباطنیة)[4] و (الفلاسفة)[5]!! بەتایبەت (فلاسفة)کە ئەو کاتە بازاڕ بازاڕی (فەلسەفەی یۆنانی)بوو و کاڵایەکی هێندە بە ڕەواج و ڕمێن بوو، لەبەر وی کەم کەس بەلای قورئان و سوننەت دا دەچوو؟!!

---

١- بڕوانە: (النقذ من الضلال) ص٨٥.

٢- لەو بارەوە دوو کتێبی هەن: (الجام العوام عن علم الكلام) وە: (فيصل التفرقة بين الاسلام والزندقة).

٣- هەرچەندە غەززالیی لە (المنقذ من الضلال)ەکەیدا (تصوف)ی بەچارەسەر داناوە، بەڵام ڕەخنەو تێبینی زۆریشی لەسەر ئەهلی تەصەووف هەیە.

٤- چەند کتێبی لەو بارەوە هەن: (المستظهري) وە (قاصم الباطنية).

٥- کتێبی (تهافت الفلاسفة)ەکەی پشتی فەلسەفەی یۆنانی شکاند.

د- یان هەڵوێستی دلێرانەو جوامێرانەو مشوور خۆرانەی لەبەرانبەر سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگاداو دەست خستنە سەر برینەکانیان و دیاریکردنی چارەسەرودەرمانی هەتووان و سارێژکردنی زامەکانیشیان، هەر لەپادشاو کاربەدەستانەوە بگرە، هەتا گەداو هەژارو نەداری هیچ بەدەست؟!.[1]

بەڵام نەء لەخستنەڕووی ئەو هەڵوێستانە هەموویان دەگەڕێم و پێکەوە دەچینە خزمەتی کتێبی ناوداری: (إِحياءُ علوم الدين)ەکەی چەند دێڕێکی لێ بەنموونە دێنینەوە کە هەڵوێستی جوامێرانەی غەززالی‌یان تێدا دەدرەوشێتەوە، لەبەرانبەر مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ و مەترسی‌داردا کە بریتیە لە:

**(هامووشۆو تێکەڵیی زانایان لەگەڵ حوکمڕان و کاربەدەستانداو وەرگرتنی خەڵات و مووچەو دیاری‌یەکانیان).**

ئیمام غەززالیی لەو بارەوە گوتوویەتی:

[بێگومان ستەمکارەکان لەچاخی یەکەم دا- لە سۆنگەی نیزیکی ڕۆژگاری ئەوان لەسەردەمی خەلیفە راشیدەکانەوە- هەمیشە هەستیان بەزوڵم و خراپەی خۆیان دەکرد، وە تامەزرۆی راکێشانی هاوەڵان و شوێن کەوتووان (الصحابة والتابيع) بوون، وە هەمیشە خواخوایان بوو کە دیاریی‌و خەڵاتەکانیانیان لێ قبووڵ بکەن، وە بەبێ داواکردن و زەبوون کردن ئەو دیاریی‌یانەیان بۆیان دەنارد، بگرە منەتیشیان هەڵدەگرت و خۆشحاڵیش دەبوون کەلێیان وەربگیرێن!

ئنجا ئەوانیش وەریان دەگرتن و دابەشیان دەکردن، وەبەهیچ شێوەیەك لەمەبەستە ناشەرعیی‌یەکانیان دا فەرمانبەریی دەستەڵاتدارەکانیان نەدەکردو نەدەچوونە بەرو مەجلیسیان و کۆڕەکانیان و قەڵەباڵغ نەدەکردو، حەزیان بەمانەوەیان نەدەکرد، بگرە دووعایان لێدەکردن و زمانیان لێ دەکوتان، وە هەڵەو ناشەرعیی‌یەکانیانیان بۆ راست دەکردنەوە، بۆیە مەترسی ئەوە لە ئارادا نەبوو کە بەئەندازەی ئەوە کە زانایان لە دنیای

---

[1] - نامیلکەیەکی بەناوی: (الكشف والتبيين عن غرور خلق الله أجمعين) هەیەو، لەگەڵێك شوێنی (إحياء)ەکەیشی‌دا ئەو باسانەی هێناوەتەپێش.

ژێر دەستی ستەمکارەکان کەڵکیان وەردەگرت، ئەوانیش لەدینی وان بەهرەو پشك وەربگرن، بۆیە وەرگرتنی ئەوان ئاسایی بوو.

بەڵام ئێستا ئەوە بێگومان کاربەدەستان دڵیان لەبەر هیچ بەخششێك نابێتەوە مەگەر بۆ کەسانێك کەبەهیوای بەکارهێنانیان و دەوری خۆی پێقەڵەبالغ کردنیان و پشت پێبەستنیان بۆ بەجێهێنانی مەبەستە- ناشەرعییەکانیان[1]- بن، وە خۆیانیان پێجوان و پیاوچاك بکەن، بەهۆی ئامادەبوونیان لەکۆڕو مەجلیسەکانیان دا، وە بۆ ئەوەی داوایان لێبکەن کەبەردەوام بن، لەسەر بۆ پاڕانەوەیان و مەدح و پێهەڵگوتنیان و تەزکیەکردنیان لە هەردووك حاڵەتی رووبەڕوو و پاش ملەدا، بۆیە ئەگەر بێت و بابای وەرگر(آخِذ):

١- خۆی بە پاڕانەوەو داواکردن زەبوون[2] نەکات!

٢- وە بۆ خزمەت کردن هەمیشە هاموشۆ نەکات!

٣- وە بۆ پاڕانەوەو پێهەڵگوتن خۆی زەلیل نەکات!

٤- وە بەهاوکاریی کردنی لەکاتی داواکردنیدا بۆ جێبەجێکردنی مەبەستەکانی خۆی سووك نەکات!

٥- بە ئاپۆراییو قەڵەباڵغی زۆرکردنی کۆڕو مەجلیسی خۆی شەرمەزار نەکات!

٦- وە بەهۆی پێشاندانی خۆشەویستیو دۆستایەتیو پشتگرتنی لەبەرانبەر دوژمنانیدا خۆی بێبایەخ نەکات!

٧- وە بۆ پۆشینی ستەم و کردەوە خراپ و ناقۆڵاییەکانی خۆی عەیبدار نەکات!

- بەڵێ ئەگەر ئەو ئامانجانەی بابای دەستەڵاتداری ستەمکار هەموویان جێبەجێنەکات- ئەوە ئەگەر لەو پایەدا وەك (شافعي)یش بێت (رەحمەتی خوای لێبێ) یەك درەمیشی ناداتێ! کەوابێ لەم رۆژگارەدا ئەوەی کە بەحەڵاڵیش بزانرێ دروست نیە

---

١- ئەو وشەیە خۆم زیادم کرد چونکە مەبەستی نووسەریش هەر ئەوەیە.

٢- رستەی (أن يذل نفسه) بەسەر هەر حەوت برگەکان دا دێتەوەو من هەرجارەی بە وشەو تەعبیرێکی هاو واتا یان نیزیك هێناومە.

لێیان وەربگیرێ، چونکە سەردەکێشێ بۆ ئەو شتانە، چ جای ئەوە کەبزانرێ حەرامە یان گومانی لێبکرێ!

جا هەرکەسێك بێباکانە ماڵ و سامانیان لێوەربگرێو خۆی پێبشوبهێتە هاوەڵان و شوێن کەوتووان! ئەوە بێگومان ئاسنگەرو فریشتەی وەك یەك تەماشاکردوون و پێکەوەی قیاس کردوون!![1] ]

دەك هەزار رەحمەتت لێبێ ئیمام غەززالیو گۆڕت پڕ نوور بێت، بەڕاستی بەڕاستی حوکمڕانە ستەمکارو تەماعکارو لاسارەکانت چاك ناسیون و ئامۆژگاری باشی زاناو پێشەوایانیشت کردوە، ئەگەر بیانەوێ ڕێزو حورمەتی خۆیان رابگرن و کەسایەتیو سومعەی خۆیان بپارێزن.





     





١- بڕوانە: (احیاء علوم الدین) ج٢ص١٢٢،١٢٣.

## ١٣- شێخ عەبدولقادری گەیلانی (رحمة الله علیه):

(عبـدالقادر الجیلانـي) لەساڵی (٤٧٠)ی کۆچی لـە (گـیلان) لـەدایك بـووەو لەساڵی (٤٨٨)دا چۆتە بەغـداد کـە تـەمـەنی (١٨) سـاڵ بـووەو زۆر بەجیـددیی‌و تامەزرۆییـەوە سەرگەرمی خوێندن بووە، پاش تەواوکردنی خوێندن و وەرگرتنی (إجازة)ش سـەرگەرمی دەرس گوتنەوەو بانگەوازو پەروەردەو تەزکیەی خەڵك بووە، هەتا لەساڵی (٥٦١)داو هەر لەبەغداد کۆچی دوایی کردوە.

جا ئێمە خوا یاربێ هـەوڵ دەدەیـن لـە(١٠) خـاڵی کـورت و گوشـراودا ژمارەیـەك لـە هەڵوێستە گەورەو گرنگەکانی (شێخ عبدالقادر) لێرەدا تۆمار بکەین:

### یەك: زانیاریی شێخ عبدالقادر:[1]

عەبدولقادری گەیلانی بەر لەوەی شێخ و ئوستادی پەروەردەو تەزکیەی قوتابییـان و موریدان بێ، زاناو مامۆستایەکی زەبر دەست و شارەزا بووە، چونکە:

جارێ لەسەرەتاوە زانستە شەرعییە باوەکانی رۆژگاری خۆی هـەموو خوێنـدەوەو چاك تێیان دا کارامەو سەر راست بووەو هەرکام لە: (أبـي الوفـاء ابـن عقیـل و محمـد بـن الحسـن البـاقلاني وأبـو زکریـا التبریـزي) مامۆسـتای بـوون، وەلـەڕووی پـەروەردەو تەزکیەشەوە سەرەتا لەلای: (أبی الخیر حماد بن مسلم الدباس)و پاشان لەلای: (القاضـي أبـي سـعید المخرمـي) سـەرگەرمی (السَّیر والسُّـلوك) بـووەو لـەلای دووەمیشـیان مۆڵـەت (إِجازة)ی پەروەردەکردنی قوتابیی‌و موریدانی وەرگرتوە.

پاشان بۆتە زانایەك کە توانیویەتی لە(١٣) زانست دا قسـە بکـات، وە لەهـەرکام لـە (تفسـیرو حـدیث و فقـه وأصـول ونحـو) دەرسـی دەگوتنـەوەو، لەهـەردووك مـەزەبی (شافعي)و (أحمد)دا فەتوای دەدا، وە لەدوای نیوەڕۆیان بەهەموو جـۆرە خوێندنـەوەکان (القرءات) قورئانی دەخوێندو دەگوتەوە.

بەڵێ ئەمە زانیاریی‌و شارەزایی مامۆستا عەبدولقادری گەیلانی بووەو، با هـیچ کـەس بەهۆی کۆلکە شێخێکی ناحـاڵی ئـەم رۆژگـارەوە ئـەو مامۆسـتاو پێشـەوا پایـە بـەرزەی

---

١- بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لە: (رجال الفکر والدعوة) ج١ص٢٣٩تا٢٦٥، وەرگرتوە.

لەبەرچاو نەكەوێو پێی وانەبێ ئەویش وەك ئەمان بووە! نەخێر بەڵكو هەر خوایان یەكەو تەنیا لە نازناوی (شێخ)یش دا یەك دەگرنەوە، مەگەر بەدەگمەن!

## دوو: خوو و ڕەوشتی:

عبدولقادر نموونەی ڕەوشت و خووی بەرزو شیرین بووەو، لەگەڵ منداڵی گچكەو كەنیزەك دا رادەوەستاو، لەگەڵ هەژارو نەداران دا دادەنیشت و جل و بەرگیانی دەدۆزی! بەڵام بەهیچ جۆرێك هاموشۆی حوكمڕان و كاربەدەستەكانی نەدەكرد قەتیش لەبەر ئەوان و خەڵكی پارەدار هەڵنەدەستا، یەكجار خۆبەكەمگر(متواضع)و سەخیو بەخشندەو سنگ فراوان و نەفس بەرزو دڵنەرم و خاوەن گفت و بەڵێن بووەو، هەمیشە رووگەش و قسەو گفت شیرین و سەرگەرمی بیركردنەوەو زۆر خوا لەیادو بیربووە.

وە زۆر خۆپارێز بووە لەقسەو رەفتاری بێجێو زۆر هۆگری هەق و راستی بووەو لەسەرخۆی تووڕە نەبووە، بەڵام لەسەر شكێنرانی سنوورەكانی شەرع یەكجار بەسام و هەیبەتەوە تووڕەو قەڵس بووە.

وە زۆر حەزی بەوەكردوە كە خواردن بدات بەهەژارو نەداران و دەستبار بۆ خەڵكی ئاتاج و لێقەوماوو داماو بگرێ.

## سێ: پێداگیریكردنی لەسەر پابەندیی بەشەرعەوەو لانەدان لەسونەت:

زۆر جاران خەڵكی ناحاڵی بەناوی طەریقەت و تەصەووفەوە ویستوویانە لە شەریعەت دوور بكەونەوە، بەبیانووی ئەوە كە (طريقة) بەدیلی (شريعة)ە!![1]

جا لەسەدەی پێنجەمی كۆچیدا ئەو بانگەشەیە بازاڕی گەرم بوو بوو! بۆیە شێخ عبدولقادر یەكێك لەو خاڵانەی كە بەردەوام داكۆكی لەسەر دەكرد ئەوەبوو كە شەریعەت

---

١- لەكتێبی: (ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون)دا- چاپی سێیەم- كەتایبەتە بە توێژینەوەی باس و بابەتەكانی تەزكیەو تەصەووفەوە ئەو بیرۆكە پووچە جوان پووچەڵ كراوەتەوە، وێرای گەلێك بۆچوونی دیكەی هەڵەو پەڵە.

و پێوەپابەند بوونی هەموو شتێکەو هیچ شتێك بەدیلی نیەو، لەو بارەوە گەلێك قسەی بەهێزو پێزی لێوە نەقلّ کراون، بۆ وێنە:

أ- (إتَّبعوا ولاتَبْتَدعوا وأطيعوا ولاتُخالِفوا)[1] واتە: شوێن بکەون و شت دامەهێنن، وە فەرمانبەریی بکەن و سەرپێچی مەکەن.

ب- (كلُّ حقيقةٍ لاتَشْهَدُ لَها الشريعة فهي زَنْدقةٌ، طِرْ الى الحق عزَّ وجلَّ بجَناحَيْ الكتابِ والسُّنة، أُدْخُلْ عليه وَيدُكَ في يَدِ الرسولِ ﷺ....)[2]

واتە: هەر حەقیقەتێك شەریعەت شایەدیی بۆ نەدات، ئەوە زەندەقە (بێدینی)یە، بەرەو خوای زالّ و پایەبەرز بەدوو شابالّی قورئان و سوننەت بفڕە، بچۆ لای خواو بادەستت لەنێو دەستی پێغەمبەرﷺ دا بێت.

## چوار: جەخت کردنی لەسەر خوا بەیەکگرتن (التوحید):

لەو بارەشەوە کە بێگومان کاکڵەو رووح و جەوهەری مسوڵمانەتیو دینداریییە، هەڵوێستێکی یەکجار روون و بێچەندو چوونی هەیەو کەم کەسم دیوە لەزاناو پێشەوایانی ئیسلام هێندەی پێشەوا عەبدولقادر (رەحمەتی خوای لێبێ) داکۆکیی لەسەر مەسەلەی خوا بەیەککرتن کردبێ، بۆ وێنە گوتوویەتی:

(بەندە کە خوای بەرزو بێهاوتای ناسی خەڵکی لەدڵ دا نامێنێ، وە وەك چۆن گەڵای وشك لەدرەخت دەکەوێتە خوارێ، ئاوا لەدەوری دەپرژێن و بڵاودەبن..)[3]

هەروەها گوتوویەتی: (تۆ پشتت بەخۆت بەستوە، وە بەخەڵك، وە بەزێڕو زیوەکەت، وە بەکڕین و فرۆشتنەکەت وە بە حوکمڕانی وڵاتەکەت! هەرچی پشتی پێبەبەستی ئەوە پەرستراوتە، وە هەر کەسێك لێی بترسیو ئومێدت پێی هەبێ، ئەوە پەرستراوتە، وە هەرکەسێك پێت وابوو زیان و قازانجی بەدەستە بێئەوەی ببینی کە خوا ئەو شتەی لەسەر دەست جێبەجێدەکات، ئەوە پەرستراوتە).[4]

---

١- بڕوانە: (الطبقات الكبرى) للشعراني ص١٢٩.

٢- بڕوانە: (الفتح الرباني) المجلس الرابع والاربعون.

٣- سەرچاوە پێشوو، المجلس السادس والخمسون.

٤- هەمان سەرچاوە، المجلس العشرون.

## پێنج: پەرۆش و دڵسووتانی بۆ ئیسلام:

کەم کەس هێندەی ئەو مامۆستاو شێخە بەڕێزە (قُدِّسَ سِرُّهُ) هێندە بەکوڵ و بەدڵ بۆ ئیسلامەتی گریاوە بەپەرۆش بووە! سەرنجی ئەم چەند قسەیەی بدەن بزانن بۆن کڕووزو بۆن سۆی هەناوی لەتاو ئیسلام هەڵقرچاوو برژاوی عەبدولقادر یان لێنایەت!

(دينُ محمدٍ ﷺ تَتواقَعُ حِيطانُهُ ويَتَناثرُ أساسُهُ، هَلُمُّوا ياأهْلَ الأرضِ نُشَيِّدُ ما انهدَمَ ونقيمُ ماوقَعَ، هذا شيءُ مايُتَّمّ، ياشَمسُ ويا قَمَرُ ويا نَهارُ تعالَوا)[1]

واتە: ئایینی موحەممەد ﷺ دیوارەکانی دەڕمێن و بناغەکەی بڵاودەبێ، ئەی خەڵکی سەرزەوی ڕاکەن بائەوەی ڕووخاوە چاکی بکەینەوەو ئەوەی کەوتووە ڕاستی بکەینەوە ئەمە کارێکە بە ئێمە تەواو نابێ، ئەی خۆر، ئەی مانگ و ئەی ڕۆژگار وەرن وەرن!

هەروەها گوتوویەتی: (ياقوم! الإسلام يبكي ويستَغيْثُ، يَدهُ في رَأسِه مِنْ هؤلاءِ الفُجّار، مِنْ هؤلاءِ الفُسّاق، مِنْ هؤلاءِ أهلِ البدعِ والضَّلالِ، مِنَ الظلمة، مِنَ اللاّبسين ثيابَ الزُّورِ، مِنَ المدَّعين مالَيْس فيهم..)[2]

واتە: ئەی گەل! ئیسلام دەگریەت و هاوار دەکات دەستی بەسەری گرتووە لە چنگ ئەو تاوانبارانە، ئەو لاڕێیانە، ئەو خاوەن بیدعەت و گومڕاییانە، لەچنگ زۆرداران، لەچنگ ئەوانەی کە بەرگی ساختەیان پۆشیوە ئەوانەی کەلافی شتێك لێدەدەن کەلێی بێبەشن.

## شەش: بەزەیی هاتنەوەی بەخەڵکیدا:

عەبدولقادری گەیلانی بەرانبەر بەخەڵکی بەگشتیو بەرانبەر بەگوناهباران و لاڕێبووان بەتایبەت، یەکجار بەڕەحم و سۆزو پەرۆش بووە، باگوێی لێبگرین داخۆ چۆن چۆنی سۆزو پەرۆشی خۆی دەردەبڕێ: گوتوویەتی: (يا خَلْقَ الله إني أطْلُبُ صَلاحكم ومنفعتكم بالجملة. أتَمنى غَلْقَ أبوابِ النار وَعَدْمَها بالكلية، وألاّ يَدْخُلَها أحدٌ مِنْ خلقِ الله عزَّ وجلَّ، وإنَّما تمنَّيْتُ هذه الأُمَنيةَ لاطِّلاعي على رحمة الله عز وجَلَّ وشفَقَتِهِ على خَلْقِهِ..)[3]

---

١- هەمان سەرچاوە، ص٦٤٨،٦٤٩.

٢- هەمان سەرچاوە، ص٦٦١.

٣- هەمان سەرچاوە، التاسع والاربعون.

واتە: ئەی خەڵکی خوا من چاکبوون و بەرژەوەندیی تێکڕاتانم مەبەستە، خۆزگەم ئەوەیە کە دەرگاکانی ئاگری دۆزەخ دابخرێن و یەکجاریی نەمێنێ، وە هیچ کەس لەدروست کراوانی خوای نەچێتە نێو، بۆیەش ئەم خۆزگەیەم خواست چونکە دەزا بەزەیی خوای زاڵ و پایەبەرزو پەرۆش بۆ بەندەکانی چۆنە!

هەروەها دەربارەی بەزەییو سۆزو پەرۆشی زاناو پێشەوا رەسەنەکان بەرانبەر بەخەڵکی بەگشتیو گوناحباران بەتایبەت، گوتوویەتی:

(...كيف لايَرحمونَ العُصاة وهم مَوْضعُ الرَّحْمةِ، مقامُ التوبة والإعتذار، العارِفُ خُلُقُهُ من أخلاقِ الحق عز وجلَّ، فهو يجتَهِدُ في تَخليص العاصي مِنْ الشيطان والنفْسِ والهوى، اذا رأى أحدكُمْ ولَدَهُ أسيراً في يد الكافِر ألَيْس يَجْتَهِدُ في تَخْلِيصِهِ؟! فهكذا العارِفُ الخَلْقُ جميعهم عنده كالأولاد)[١].

واتە: جا بۆچی دەبێ- زانا ڕەببانیەکان- بەزەییان بەگوناحباران دا نەیەتەوە، لە حاڵێك دا کە ئەوان جێگەی بەزەیی پێداهاتنەوەن و لەپایە (مقام)ی پەشیمان بوونەوەو داوای لێبووردن کردن دان؟! خواناس ئاکارەکانی لەسیفەتەکانی خوای باڵادەست و بەرزەوەن، هەمیشە سەرگەرمی قوتارکردنی گوناحبارە لەچنگی شەیطان و نەفس و هەوا، ئایا کاتێك یەکێکتان منداڵەکەی بەدیلی لەدەستی کافردا ببینێ هەوڵ نادات قوتاری بکات؟! دەجا ئوستادی خواناسیش ئامادەیەو هەموو خەڵکی پێ وەك جگەرگۆشەکانی خۆی وایە.

## حەوت: ڕەخنەگرتنی لە حوکمڕان و کاربەدەستان و ڕاست کردنەوەی هەڵەکانیان:

عەبدولقادری گەیلانی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) تەنیا ئامۆژگاری خەڵکی عەوام و سادەی نەدەکردو مەیدانی ئەمرو نەهیو حوکم و سیاسەت بۆ کاربەدەست و حوکمڕانەکان چۆڵ بکات!

١- هەمان سەرچاوە، المجلس الثالث والخمسون.

بــەڵكو زۆر بەتونــدییش لەگــەڵ هەڵــەو پەڵــەو ســتەم و ناشــەرعییەکانی دەستەڵاتدارەکانیش دا رووبەڕوو دەبووەوەو رووردەربایسی لەگەڵ کەس نەدەکردو قسەی لەهیچ کەس نەدەخواردەوە (ابن کثیر) لەو بارەوە گوتوویەتی:[1]

(کان یأمرُ بالمعروف وینْهی عن المنکر للخلفاءِ والوزراءِ والسَّلاطین والقُضاةِ والخاصَّة والعامَّةِ، یَصْدَعُهُمْ بذلك علی رؤس الأشهاد علی رؤس المنابِرِ وفي المحافِلِ ویُنْکِرُ علی مَنْ یَولِّي الظلَمة، ولاتأخُذَهُ في الله لَوْمةَ لائمٍ).

واتە: لەبەرانبــەر خەلیفــەکان و وەزیرەکــان و ســوڵتانەکان و قازییــەکان و خــەڵکی تایبەتیو گشتی دا فەرمانی بەچاکەو ڕێگریـی لـە خراپـە دەکرد، وە بەئاشـکراو لەسـەر مینبــەرەکان و لــەنێو کــۆڕو مەجلیســەکان دا بەڕاشــکاویی هــەقی دەگــوت و بەگوێیــدا دەدان، وە رەخنــەی لــەو کەســە دەگــرت کــە بابــای ســتەمکار دەکاتــە کاربەدەســت، وە لەپێناوی خوادا لەلۆمەو سەرکۆنەی هەموو کەس بێباك بوو.

خاوەنی کتێبی: (قلائِدُ الجواهِرِ)یش لەوبارەوە ئەم ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە:[2]

کاتێك (المقتفي لأمرِ اللهِ)ی (أمیر المؤمنین) ئەمری دەرکرد بۆ (یَحْیی بـن سـعید بـن یَحْیی بن المظفر) کە بە (ابن المزاحم) ناسرابوو، کە ببێتە بەرپرسی (مظالم)، عەبـدولقادر لەســەر مینبــەر روو بــە (المتقــي لامــرالله) گــوتی: ســتەمکارترین ســتەمکارت بەســەر مسوڵمانانەوە کردۆتە کاربەدەست، سبەینێ وەڵامـت لـەلای پـەروەردگاری جیهانـەکان و بەزەییترینی خاوەن بەزەییان چییە؟! ئیدی"خەلیفە" لەرزیو گریاو قاضی ناوبراوی دەست بەجێ لادا.

## هەشــت: رەخنــەگرتنی لــەزانا خراپــەکان و وابەســتەو دابەســتەکانی کۆشك:

هــەروەها عەبـدولقادر بەرانبــەر بــەو زانــاو شــارەزایانەی کــە بـوو بوونــە هــاودەم و هاوڕازی حوکمڕان و کاربەدەستەکان و، ملی شەرعیان بـۆلای ئارەزووەکانیـان و حـوکم و

---

١- بڕوانە: (رجال الفکر والدعوة) ج١ص٢٦١،٢٦٢،کە لە (البدایة والنهایة) وەریگرتوە.

٢- بڕوانە: (قلائد الجواهر) ص٨.

بڕیاره هەڵەو ناڵەبارەکانیان بادەداو، دینی خۆیانیان بەدونیا دەدا زۆر بەتوندیی ڕووبەڕوو بۆتەوەو قسەی زبری پێگوتوون، بۆ وێنە: لەکۆڕی ژمارە (٥١)دا کە یەکێك بووه لە کۆڕو مەجلیسە زۆرەکانی شێخ عەبدولقادر کە بۆ خەڵکی بەغدادی گرتوە گوتوویەتی:[1]

(أيْنَ أنْتُمْ وهُمْ؟! ياخَونةً في العِلْمِ والعمل! يا أعْداءَ الله ورسوله! يا قاطعي عباد الله عزَّ وجلَّ! أنتم في ظُلْمٍ ظاهرٍ، ونِفاقٍ ظاهرٍ، هذا النفاقُ الى متى؟! يا عُلماءُ يازُهّادُ! كمْ تُنافقون الملوك والسَّلاطين، حتى تأخُذوا منهم حُطامَ الدنيا وشهواتها ولَذاتها، أنتم وأكثر الملوك في هذا الزَّمَنِ ظَلَمَةٌ وَخَوَنَةٌ في مالِ الله عزَّ وجلَّ في عبادهِ. أللهم أكْسِرْ شوكة المنافقين وآخْذُلْهُمْ أو تُبْ عليهم، وأقْمعِ الظلمة وطَهر الأرضَ منهم، أو أصْلِحهُمْ، آمين)

واتە: ئێوە لەکوێو ئەوان (مەبەستی زانایانی ڕەسەنە) لەکوێ؟! ئەی خائینانی بواری زانست و کردەوە! ئەی دوژمنانی خواو پێغەمبەرەکەی! ئەی ڕێگرانی بەندەکانی خوای زاڵ و بەرز! ئێوە لە ستەمێکی ئاشکراو نیفاقێکی بێپەردەدان، ئەو دەغەڵییە هەتا کەنگێ؟ ئەی زانایان ئەی زاهیدان! هەتا کەی نیفاق لەگەڵ پادشاو دەستەڵاتداران دا دەکەن، بۆ ئەوەی بەرماوی دونیاو ئارەزوو و خۆشییەکانی یان لێوەربگرن! ئێوەو زۆربەی حوکمڕانانی ئەم ڕۆژگارە زۆردارو خائینن لەماڵی خوای بەرزو مەزن داو سەبارەت بە بەندەکانی! ئەی خوایە یان شان و شەوکەتی مونافیقەکان بشکێنەو زەبوونیان بکە، یان یارمەتییان بدە تۆبە بکەن، وەیان زۆرداران بفەوتێنەو زەوییان لێپاك بکەوە، یان چاکیان بکە، ئامین.

## نۆ: پەروەردەو تەزکیەکردن و بەڵێن و پەیمان لێوەرگرتنی شاگردو موریدان:

ئەگەر عەقڵ و هۆش و وەسیلەو ئامرازی کەشف و ناسین و زانینی شتانە، دڵ و دەروونیش هۆکارو چەقی وەرگرتن و وەرنەگرتن و خۆشویستن و بوغزاندن و جووڵاندن و بەگەڕخستنی ئینسانە! بۆیە هەردەم ئوستادو ڕابەرو ڕێنیشاندەرە ڕەسەنەکان، وێڕای

---

١- بڕوانە: (الفتح والفيض الرحماني)، المجلس الواحد والخمسون.

(عەقڵ) سەروکاریان لەگەڵ (دڵ)یش دا هەر هەبووە! چونکە زانیویانە کە ئینسان تووڕەکەو هەمبانەیەك نیە پڕی بکەی لەزانیاریو شارەزاییو وازی لێبهێنی!

جا عەبدولقادری گەیلانیش وەك باقی مامۆستاو پێشەوا ڕەسەنە پێشووەکانی وەك: (الحسن البصري و جعفر الصادق و معروف الكرخي و جنيد البغدادي و فضيل بن عياض و أبو حامد الغزالي) وێڕای تێگەیاندن، مشووری پێگەیاندنیشی لەشاگردو موریدەکانی دەخواردو هەردووك پرۆسە (عملية)ی فێرکردن و پەروەردەکردن (التعليم والتربية) کەبە هەردووکیان (تزكية) پێك دێنن، پێکەوە ئەنجام دەدان.

ئنجا بەهۆی بەڵێن و پەیمان (بيعة) لێوەرگرتن و پاشان چاودێریی کردنیشەوە توندتوندو لەدڵ و دەروونەوە، قوتابیو پەیڕەوەکانی خۆی بەخۆیەوە گرێو شەتەك دەدا، بۆ ئەوەی بەهیچ جۆرێك مەودای ترازان و دوورکەوتنەوەیان نەدات و لەگەڵ خۆیدا بەرەو خوای پەروەردگارو بەخشش و ڕەزامەندییەکەی بیانبات!

دیارە لەم هەڵوێست و ڕەفتارە پێغەمبەرانەیەی عەبدولقادرو هاو وێنەکانیدا چاکترین و دەرس و پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەو زاناو شارەزایانە هەیە، کەپێیان وایە دەگونجێ ئینسان تەنیا بەزانیاریو شارەزایی ڕووت و قووت چاك بکرێو پەروەردە بکرێ!!

چونکە بێگومان تەنیا لەڕێی عەقڵ و هۆشەوە خەڵك دواندن، عادەتی فەیلەسووفان و زاناو بێڕووحەکانە، نەك هی پێغەمبەران و میراتگرە ڕەسەنەکانیان!

## دە: بانگەوازکردنی شێخ عەبدولقادر بۆ ئیسلام و، خەڵك لەسەر دەست گەڕانەوەی بۆلای خوا:

شتێکی دیارو سەلمێنراوە کە شێخ عەبدولقادری گەیلانی خاوەن کەڕامەتگەلێکی ئاشکرا بووەو، ئەمە ڕاستیەیەکە تێکڕای مێژووزانان لەسەری یەکدەنگ بوون، بۆ وێنە: (الشيخ موفق الدين) خاوەنی کتێبی (المُغني) لە فیقهی مەزەبی ئیمام ئەحمەد ئاوا گوتوویەتی:

(لَمْ أسْمَعْ عن أحدٍ يُحْكى عَنْهُ مِنَ الكرامات أكثر مما يُحكى عن الشيخ عبدالقادر) هەروەها (الشيخ عزالدين بن عبدالسلام) لەوبارەوە گوتوویەتی:[1] (إنه لَمْ تَتوافر كراماتُ أحدٍ من المشائخ الا الشيخ عبدالقادر فأن كراماتِه نُقلَتْ بالتواتُر) هەروەها ( شيخ الإسلام ابن تيمية)ش هەمان قسەی کردوە.[2]

بەڵام گومانی تێدا نیە کە گەورەترین کەرامەتی عەبدولقادری گەیلانی (رەحمەتی خوای لێبێ) بریتی بووە لە زیندووکردنەوەو بووژاندنەوەی دڵە بێئاگاو مردووەکان و ڕۆشن کردنەوەیان و ئاوەدان کردنەوەیان بەڕووناکی عیبادەت و تەقواو ئیمان!

جا باگوێ لەخۆی بگرین تاکو ئەزموونی خۆیو بەرهەم و ئەنجامی ئەزموونی کاری بانگەوازی لێببیستین:[3]

(كان يَجْلِسُ عندي رجلان وثلاثةٌ يَسْمَعون كلامي ثم تَسامَعَ بي النّاسُ وازدَحَم عليَّ الخَلْقُ... وكان الناسُ يجيئون في اللَّيلِ على الشمْعِ والمشاعلِ يأخذون لهم مَواضعَ ثم ضاق على الناس الموضعُ فَحُمِلَ الكرسيُّ الى خارج البَلَدِ...وكان يَجيئون على الخيل والبِغالِ والحمير والجِمال.. وكان يحضر المَجْلِسَ نحوُ منْ سَبْعين ألفاً).

واتە: لەسەرەتاوە دووسێ پیاو لەلام دادەنیشتن و گوێیان لە قسەم دەگرت، پاشان خەڵکی گوێبیست بوون و قەڵەباڵغیان لەسەر کردم..وە خەڵکی بەشەوێ لەبەر ڕۆشنایی مۆم و پڵێتانەوە دەهاتن بۆ جێگاگرتن، دوایی جێگاکە لەخەڵکی وەتەنگ هات، بۆیە کورسیەکەمیان بردە دەرەوەی شار... وە خەڵکی بەسواری ئەسپ و ئێسترو گوێدرێژو حوشتران دەهاتن...وە دەوری(٧٠٠٠٠) کەس ئامادەی ئەو کۆڕو کۆبوونەوانە دەبوون.

هەروەها هەر لەوبارەوە گوتوویەتی:[4]

(أتَمنَّى أنْ أكون في الصَّحاري والبراري كما كنتُ في الأول، لا أرى الخَلْقَ ولا يرَوْنَني، ولكن أراد الله عزَّوجلَّ مِنِّي مَنْفَعةَ الخَلْقِ، فأنه قَدْ أسْلَمَ على يَدَيَّ أكثر من خَمْسةِ ألاف من

---

١- بڕوانە: (ذيل طبقات الحنابلة) لاب رجب.

٢- بڕوانە: (جلاء العينين) للالوسی.

٣- بڕوانە: (قلائد الجوهر) ص١٥،١٦.

٤- بڕوانە: (قلائد الجواهر) ص٢٢.

اليهود والنَّصارى، وتابَ على يَدَيَّ من العيّارين والمسالحة أكثر مِنْ مائةِ ألف وهذا خَيْرٌ كثيرٌ)

واته: بەئاواتەوەم كە وەك يەكەم جارم لە بيابان و چۆڵەوانىيەكان بم، نە خەڵك ببينم و نەبمبينن، بەڵام خواى زاڵ و پايەبەرز ويستى وابووە كە سوودم پىٚ بەخەڵك بگەيەنىٚ، هەتا ئێستا زياتر لە(٥٠٠٠) كەس لەجوو و ديانەكان لەسەر دەستم مسوڵمان بوون، وە زياتر لە(١٠٠٠٠٠)كەس لەخەڵكى دزو چەكدارى رێگر لەسەر دەستم تۆبەيان كردووە، ئەمەش خێرو قازانجێكى زۆرە.[1]

بەڵام با هەموو لايەك بزانن كە ئەو كەسانەى لەسەر دەستى شێخ عەبدولقادر مسوڵمان بوون، يان دەستيان لەگوناح و خراپەكارى هەڵگرتووەو گەڕاونەوە لاى خوا، وەك ئەو صۆفىو دێوانەو دەروێشانەى ئەم رۆژگارە نەبوون، كە مەگەر چۆن دەنا لەشێخەكانيانەوە، لەجياتى خوا بەيەكگرتن (توحيد)، هاوبەش پەرستيى (شرك)و، لەباتى مل كەچيى بۆ شەرع، بيدعەتچێتيى (إبتداع)و، لەجىٚى لەقورئان و سوننەت شارەزابوون، مێشكى خۆ پڕ لەحيكايەتى پڕوپووچ و ئەفسانەكردن و...هتد وەربگرن! چونكە پێشەوايەكى وەك عەبدولقادر بێگومان شاگردو موريدەكانيشى لەقەدەر خۆى بوون و كەم و زۆر لەخۆى چوون، وەك چۆن صۆفىو موريدو دێوانەو دەروێشەكانى ئەم رۆژگارەو هەر رۆژگارێكى ديكەش هەر لەقەدەر شێخ و ئوستادەكانى خۆيان دەبن و لەوان دەچن و، پێشينانيش جوانيان گوتوە: (گۆزە چى تێدابىٚ هەر ئەوەى لىٚ دەڕژىٚ)وە زانيويانە دەڵێن چى! كە گوتوويانە:

(گەورە دەڵێن لەبنە بانان، گچكەش دەڵێن لەسەربانان!)



---

١- بۆ نووسينى ئەو چەند خاڵە دەربارەى ژيانى شێخ عبدالقادرى گەيلانى سوودم لە (رجال الفكر والدعوة ج١ص٢٣٩تا٢٦٥)، وەرگرتوە.

## ١٤- ئیمام نـەوەوی (رحمة الله تعالى عليه):

(أبو زكريا يحيى بن شرف بن مِرا بن حسن بن حسين بن محمد بـن جمعـة بـن حـزام النووي) لەمانگی موحـەڕەمی سـاڵی(٦٣١) لـە گونـدی (نَـوى)ی سـەر بـە(جولان)ی سـەر بە(دیمشق) لەدایك بووەو لە ڕەجەبی ساڵی (٦٧٦) هەر لـە (نـوى) كۆچـی دوایـی كـردوە لەتەمەنی(٤٥)ساڵیدا.

شایانی باسیشە كە ئیمام نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) یەكێكە لەزاناو پێشـەوا ناوازەو ناودارو هەڵكەوتووەكانی ئیسلام، كـە(حـدیث)و (فقـه)ی پێكـەوە كۆكردوونـەوەو وێڕای دونیا بەكـەمگرتن (زهـد)و عیبـادەت و پارێزكـاری (تقـوى)ی زۆری، یـەكجار بـوێرو هەقبێژو نەترسیش بووەو، ئـەركی فـەرمان بەچـاكەو ڕێگریـی لەخراپـە (الأمـر بـالمعروف والنهي عن المنكر) لەگەڵ هەموو كەس دا بەگشتیو لەگـەڵ حـوكمڕان و كاربەدەسـتان دا بەتایبەت، زۆر باش ئەنجام داوە.[1]

وە (محي الدين النووي) (خوا لێی ڕازی بێ) كەڕاماتی زۆری لێگێڕراوەتەوەو بێـژن و ماڵیشـیی هەڵبـژاردوەو یەكێكـە لـەزانا ڕەبـەن (أعزب)ەكـان، كـە ڕەنگـە لەبـەر زێـدە سەرگەرمی بەزانستەوە بەپەسەندی نەزانیبێو نەیپەرژابێتە سەر ژن هێنان.

جـا بێگومـان ئیمـام نـەوەوی زۆر هەڵـدەگرێ لەسـەری بنووسـرێو هەڵوێسـتی جوامێرانەی پرشنگداری وای زۆرن كـە بـۆی تۆمـار بكـرێن، بـەڵام ئێمـە لێـرەدا تـەنیا بـە یەكێكیان وازدێنین كە بریتیە لە:

**(بـەرگریكردن لـە میللـەت و خـەڵكی هـەژارو نـەدارو بەرەنگاربوونـەوەی حوكمڕانە ستەمكارەكان)** جا ئێستا بـا گـوێ لـە(عـلاء الـدين ابـن العطـار) بگـرین كـە قوتابییەكی زۆر نیزیك و دانسقەی ئیمام نەوەوییـەو، كتێبێكـی سـەربەخۆی دەربـارەی ژیانی ئەو كەڵە زاناو پێشەوایە نووسیوە، بەناوونیشانی: (تحفة الطالبين في ترجمـة الامـام مُحي الـدين)، (ابـن العطـار) دەربـارەی ئـەو لایەنـەی ژیـانی ئیمـام نـەوەویو هەڵوێسـتی جوامێرانەی لەسەركردنەوەی میللەتی نەدار، گوتوویەتی:

---

١- بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) (المقدمة) ص١/٥٢،٥.

(وكان مُواجِها لِلمُلوكِ والجبابرة بالانكار ولاتأخُذُهُ في الله لَوْمة لائمٍ، وكان اذا عَجَز عن المواجهةِ كتب الرسائلَ وتوصَّل الى إبْلاغها، فَمِمّا كَتَبَهُ وأرسَلَني في السَّعي فيه وهو يتضَّمنُ العَدْلَ في الرعيَّة وإزالة المَكوسِ عَنْهُمْ، وكتب معه فى ذلك..شيخ الحنابلة، وشيخ المالكية، والشيخ أبوبكر محمد بن أحمد الشريشى المالكي، والشيخ ابراهيم المعروف بابن الأرضي، والشيخ محمد خطيب دمشق وابن خطيبها، وجماعة آخرون...)

واته: وه- نەوەوی- لەسەر شتی ناشەرعیی بەرەنگاری پادشاو ملهورەكان دەبووەوەو لەپێناوی خوادا لەسەر كۆنەی لۆمەكاران بێباك بوو، وە ئەگەر بۆی نەلوابایە رووبەڕوو بێتەوە، نامەی بۆ دەنووسین و لەڕێگەی یەكێكەوە دەیگەیاندن، جا یەكێك لەو نامانە كە نووسیەو منی نارد بۆ گەیاندنی كە داكۆكییكردن لەسەر دادگەریی رەچاوكردن لەڕەعیەت داو، لابردنی باج و گومرگی گرتبووە نێوخۆی، وە ژمارەیەك لەزانایان لەگەڵیان ئیمزا كرد، وەك: موفتی حەنبەلییەكان و موفتی مالیكییەكان و (شێخ أبوبكر محمد بن أحمد الشريشى) مالیكیو شێخ(ابراهيم) ناسراو بە(ابن الأرضي)و، شێخ(محمد) خەطیبی دیمەشق و كوڕی خەطیبی دیمەشق وەكۆمەڵێكی دیكەش..

پاشان (ابن العطار) دەقی نامەكەی (نَوَوي) هێناوە كە نێوەڕۆكەكەی ئەوەیە كە خەڵكی شام لەم ساڵ دا لەبەر كەم بارانییو بێبەروبوومییو...هتد هەژارو تەنگدەستن و پێویستیشە كە حوكمڕانان بەزەییيان بەڕەعیەت و میللەت دا بێت و لەكاتی لێقەومان دا دەستباریان بۆ بگرن، نەك هێندەی دیكە سەغڵەتیان بكەن و باج و پیتاكیان لێوەربگرن! لە كۆتایی نامەكەیشیدا گوتوویەتی: (والجماعة الكاتبون منتظِرون ثمرة هذا مِمّا إذا فَعَلْتمُوهُ وَجَدْتموهُ عند الله): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴾[1].

واتە: وە ئەو كۆمەڵە زانایەی كە ئەم نامەیەیان نووسیوە چاوەڕێی بەرهەمی ئەم داوایەی ئێمە دەكەن، كە ئەگەر ئەنجامی بدەن لەلای خوا پاداشتی دەبیننەوە: (بێگومان خوا لەگەڵ ئەوانەیە كە پارێزكاریی دەكەن وە ئەوانەی كە چاكەكارن).

---

١- النحل: ١٢٨

جا دیارە کە نامەکە ئاڕاستەی (السلطان الظاهر الترکي) کەبە (الظاهر بیبریس) ناسراوە، کراوە، کەلەڕێی: (الأمیر بدر الدین بیلبك الخزندار)ەوە پێی بگات، بەلام بەداخەوە کاتێك نامەی نەوەوی‌و برا زانایەکانی بەناو براو دەگات، وەلامێکی توندو کرچ و کاڵ و پڕ هەڕەشەو گوڕەشەیان لەوەلام دا بۆ دەنێرێ!!

بەلام ئایا ئیمام نەوەوی ئازاو جوامێرو ئیمان قەوی‌و تەنیا سەر بۆ خوا نەوی، پاشەکشە دەکات و خۆی کش و مات دەکات و، بەهەڕەشەو چاو بزکردنەوەیەکی کاك (ظاهر) دەست بەپاڕانەوەو لالانەوەو پاساو هێنانەوەو خۆپەڕاندنەوە دەکات؟!

نەخێر نەخێر، تەماشا بکەن چۆن بێئەوەی وەك پێشەوایەکی دامەزراو و نەلەخشاو نەهەڵبچوی‌و نەخۆی شلوێ بکات، زۆر بەئارامیی‌و ویقار ئەمما پیاوانەو مەحکەم، وەلامی سوڵتان ظاهیر دەداتەوەو بەرپەرچی تەواوی قسەو قاڵەکانی دەداتەوە، جا لەبەرئەوەی نامەکە درێژە من برگە (فقرة) گرنگەکانی بەزنجیرە دەنووسم و بەکوردی وەریان دەگێڕم:

١- لە برگەی یەکەمی نامەکەی‌دا بەسەر سوڕمانەوە ئاماژە بە وەلامی ڕەخنەگرانەو توورەو تۆسن و هەڕەشە ئامێزی دەکات!

٢- پاشان بۆی روون دەکاتەوە کە سوڵتان بەهەڵەو پێچەوانەی شەرعەوە باسی جەنگ و جیهادی کردوەو رای گەیاندوە کە بێدەنگ بوونیش لەبەرانبەری شتی هەڵەو ناڕاست دا بۆ زانایان حەرامەو هەق ڕوونکردنەوەش فەرزە!!

٣- ئنجا هەڵەکەی (ظاهیر) روون دەکاتەوە کە بریتیە لەوەی وای زانیوە نەوەوی‌و زانایەکانی شام دەڵێن (جیهاد) تەنیا لەسەر سەربازان (الأجناد) پێویستە!! بۆیە نەوەوی بۆی روون دەکاتەوە کە ئەوان دەعوای وایان نەکردوە، بەلام چونکە جیهاد لەئەسڵ دا فەرزی کیفایەیە، هەرکاتێك دەستەلاتداری مسوڵمانان سوپایەکی تایبەتی راگرت و مووچە (معاش)ی لە (بیت المال) بۆ بڕینەوە- وەك واقیع وایە-، ئەوە باقی خەڵك و میللەت سەرگەرمی کاروبارو بەڕێوەبردنی ولات دەبن، وەك کشتوکاڵ و پیشەسازیی‌و چالاکی‌و کارەکانی دیکە، دیارە لە حاڵێکی وادا جیهادکردنی سوپای ئیسلام لەبەرانبەر ژیان و گوزەران دابین کردنیانە.

٤- پاشان دێته سەر ئەسڵی مەبەست (بيت القصيد)و دەڵێ: جا مادام سەربازەكانی جیهاد ژیان و گوزەرانیان لە خەزێنەی دەوڵەت دابین دەكرێ، ئەوە تێكڕای زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕێك كەوتوون كە هەتا(بيت المال) شتێكی تێدا بێ، لەماڵی نەغدینە (نقد)و كەل و پەل و زەویو شتی فرۆشتن، ئەوە دروست نیە هیچ شتێك لە خەڵك و رەعیەت وەربگیرێ.

٥- دوایی ڕوونی دەكاتەوە كە ئێستا (واتە لەڕۆژگاری نەوەویدا) (بيت المال) ئاوەدانەو پڕە، خوا زیادی بكات، مادام وابێ دروست نیە بەناوی جەنگ و جیهادەوە لەژێر هیچ ناوونیشانێك دا پارە لە خەڵكی بستێنرێ.

٦- ئنجا ڕاستییەكی یەكجار گرنگ رادەگەیەنێ ئەویش ئەوەیە، كە دەبێ بۆ سەركەوتن لە جیهادو هەر كاروبارێكی دیكەش دا، بەهۆی پەنا بردنە بەر خواو شوێن پێهەلگرتنی پێغەمبەرﷺ پابەندیی بەیاساكانی شەرعەوە زەمینەسازی بكرێ!

٧- پاشان لە بڕگەیەكی دیكەی نامەكەیدا جەخت لەسەر ئەوە دەكات كە هەرچی بۆی نووسیوە، لەڕووی دڵسۆزیو پەرۆشییەوە بووە بۆ سوڵتان و بۆ رەعیەتیش.

٨- ئنجا رەخنەیەكی بەجێ لەرەخنەو گلەییەكی سوڵتان ظاهیر دەگرێ كە بۆچی ئیمام نەوەویو زانایەكانی دی كاتی خۆی گلەییو سەركۆنەی دەستەڵاتدارە كافرەكانیان نەكردوەو دەڵێ: چۆن پادشاو سوڵتانەكانی ئیسلام لەگەڵ طاغووتەكانی كوفر قیاس دەكرێن و چۆن چۆنی ئامۆژگاری ئەو طاغووتانەمان كردبایە كە بڕوایان بەئاینەكەمان نیە ؟!

٩- پاشان لە وەڵامی ئەوەدا كە سوڵتان هەڕەشەی لەمیللەتی شام كردوە سزایان بدات و تۆڵەیان لێبستێنێتەوە، دەڵێ: جا ئەو خەڵكە بێدەستەڵاتە چ خەتاو سووچێكیان هەیە كە لەسەر ئەو نامەیەی ئێمە سزا بدرێن، كە هیچ ئاگایان لەنووسینی نەبووەو ئەگەر ئاگاشیان لێی ببووایە هیچی وای تێدا نیە شایستەی گلەیی بن!

١٠- وەلە كۆتاییدا گوتوویەتی: (وأما أنا في نفسي فلا يَضُرُّني التَّهديدُ وأكْبَرُ منهُ ولايَمْنَعُني ذلك منْ نصيحةِ السُّلطانِ فإني أعتقدُ أنَّ هذا واجبٌ عليَّ وعلى غيري، وما تَرتَّبَ على الواجِب فهو خَيرٌ وزيادةٌ عندالله تعالى: ﴿يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ

ٱلْأَخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴾[١]، ﴿ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾[٢]. واته: بەلام من بۆ خۆم ئەوە نەهەرەشەو نە لەهەرەشەش گەورەتر زیانم لیّنادات و ڕێم لیّناگریّ کە دڵسۆزی سوڵتان بم و ئامۆژگاری بکەم، چونکە من ئەوە بەفەرز دەزانم لەسەر خۆم و غەیری خۆیشم، دیارە هەرشتێکیش بەهۆی فەرزێکەوە بێتە دی، ئەوە هەر خێرو بەرەکەتە لەلای خوای بەرز: (بێگومان ئەم ژیانە دونیایی‌یە رابواردنێکی کەمەو دوارۆژ مەنزڵگای تێدا سەقامگیر بوونە)، (وە کاری خۆم بەخوا دەسپێرم، بێگومان خوا بینەری بەندەکانیەتی)[٣].

**بەلێ خوێنەرە خۆشەویستەکان!** ئەمەیە ئیمام نەوەوی‌و ئەمە بوو یەکێك لەهەڵوێستە پڕشنگدارو ڕەفتارە جوامێرەکانی! خوایە لە ئیمام نەوەوی خۆش بەو پلەو پایەی بەرزو بەرزتر بکەوەو، هیدایەتی ئێمەش بدە کە شوێن پێی ئەو پاڵەوان و کەڵە پیاوانەی ئیسلام هەڵبگرین و پەندو دەرس لەژیان و هەڵوێستە بەرزەکانیان وەربگرین.





١- غافر: ٣٩

٢- غافر: ٤٤

٣- بڕوانە: (مقدمة صحيح مسلم بشرح النووي) ص٧١الى٧٥.

## ١٥- ئەلعیز کوڕی عەبدولسسەلام (رحمة الله تعالى عليه):

(العِزُّ بن عبدالسَّلام)ناسراو بە (سلطان العلماء)وە فرۆشیاری پادشایان (بائِعُ الملوك)!! ساڵی (٥٧٧)ك، لە (دمشق) لەدایك بووەو لەساڵی (٦٦٠) لە (قاهرة)ی میسر کۆچی دوایی کردوەو سوڵتان (الظاهر ركن الدين بيبرس) لەناشتنیدا بەشداربووەو لەدامێن چیای (المقطم) نێژراوە.

ئەم دوو هەڵوێستە ناوازەو سەرسوڕهێنەرەش لەنێو هەڵوێستە پڕ سەروەرییەو جوامێرییەکانی ئەم کەڵە زاناو پێشەوایەی ئیسلام دا، هەڵدەبژێرین:

**یەك:** کاتێك کە(الملك اسماعيل) کوڕی (الملك عادل) لەدژی (نجم الدين)ی برای حوکمڕانی میصر، یارمەتی لە خاچپەرستەکان وەردەگرت و لەبەرانبەردا بەپێی ڕیوایەتی (السبکي) (صیدا)ی پێدان، وە لەڕیوایەتی (المقريزی)دا قەلای (الصفد)و شوێنی دیکەش، پاشان ڕێی بەخاچپەرستەکان (الصليبيون)دا کە بۆ کڕینی چەك و کەل و پەلی جەنگ بێنە نێو شاری دیمەشقەوە، سوڵتانی زانایان (العز بن عبدالسلام) بەرەنگاری ئەو خیانەتە بووەوەو فەتوایدا کە چەك فرۆشتن بە نەصرانیەکان حەرامە، پاشان چووە سە مینبەری مزگەوتی (الأُموي) کە خەطیبی ڕەسمیی بوو و فەتوا ناودارەکەی خۆی کە: (حەرامە چەك بە نەصرانیەکان بفرۆشرێ) لەسەر مینبەر ڕاگەیاند، وە دووعای بۆ (ملك إسماعيل) نەکرد، – کە ئەمە بەیعەت لێ دارنین دەگەیەنێ–، وە دەستی کرد بەم دووعایەو خەڵکیش بەدەنگی بەرز(آمين) یان دەگوت: (أللَّهمَّ أبْرِمْ لِهذه الأمةِ إبْرامَ رُشْدٍ تُعَزُّ فيه أولياؤك وتُذَلُّ فيه أعداؤك ويُعمل فيه بِطاعتك، ويُنْهى فيه عن مَعْصيَتك) واتە: خوایە بڕیارێکی سەر ڕاستانە بۆ ئەم ئوممەتە بێنەدیو هەل ومەرجێکی بۆ بڕەخسێنە کە دۆستانتی تێدا سەربەرزو دوژمنانتی تێدا سەرشۆڕبن، وە فەرمانبەریی تۆی تێدا بکرێو سەرپێچیی تۆی تێدا لابرێ!

دیارە (ملك اسماعیل) لەوکاتەدا لەدەرەوەی دیمەشق بوو و کە هەواڵەکەی بیست ئەمری کرد بەلادان (عَزْل)ی (ابن عبدالسلام) هەم لەخەطیبی مزگەوتی ئومەوییەو هەم لەسەرجەم ئەرکەکانی دیکەشی، وە ئەمریشی کردبوو بەگرتنی ئەویش و(الشیخ ابن

الحاجب المالكي)ی هاوەڵێشی، چونکە ئەویش لەگەڵیدا هاو هەڵوێست بووە! بەڵام دوای گەڕانەوەی بۆ دیمەشق بەریدان و(ابن عبدالسَّلام)ی لەماڵی خۆیدا دەست بەسەر کرد.

(القَرافي) کە قوتابی (العز عبد السلام)ە، دەگێڕێتەوە کە هەندێك لە کاربەدەستانی دەوڵەت چەند جارێك هەوڵیان دا کە(ابن عبد السلام) لەگەڵ (ملك اسماعیل) دا ئاشت بکەنەوەو تەکلیفیان لێ کرد کە بچێتە لای (ملك) بەڵام ئەو ڕازی نەبوو و گوتی: (قَرأت العِلمِ لأكون سَفيراً بين الله وبَيْنَ خَلْقِهِ، وأتَـردَّدُ إلى أبْواب هـؤُلاء؟!) واتە: بۆیە زانیارییم فێربووم کە ببمە نوێنەری نێوان خواو بەندەکانی‌و، ئێستاش بچمە بەردەرگای ئەوانە؟!!

هەروەها جارێکیان هەندێك لەنیزیکەکانی (اسماعیل) پێیان گوت: کە ئەگەر بێت و عوزری بۆ بهێنیەوەو دەستی ماچ بکەی دەگەڕێیەوە سەر پلەوپایەو حاڵەتی پێشووت!! بەڵام (العز)ی خاوەن عیززەت گوتی: (واللهِ ماأرْضاهُ أنْ يُقبِّل يَدَيَّ فَضْلاً عَنْ أنْ أُقبِّل يَدَهُ! يا قومِ أنتم في وادٍ وأنا في وادٍ، الحمدالله الذي عافاني مِما ابتَلاكُمْ بِهِ) واتە: بەخوا ڕازی نابم کە دەستیشم ماچ بکات، چ جای دەستی ماچ بکەم! گەلۆ! ئێوە لە دۆڵێك دان و من لەدۆڵێکی دیکەدام! ستایش بۆ خوایەك کەلەوەی ئێوەی پێوە گرفتار بوون، سەلامەتی کردووم.

پاشان جەنگ لەنێوان هەردووك برا (اسماعیل)و (نجم الدین)دا ڕوویداو (نجم الدین) بەسەر (اسماعیل)و هاوپەیمانە خاچ پەرستەکانیدا سەرکەوت و، (العز بن عبدالسلام)یش کەلە چادرێکی نیزیك چادری (اسماعیل)دا حەپس کرابوو، قوتاری بوو! بەڵام ڕازی نەبوو لەشام بمێنێتەوەو چوو بۆ میصر.

**دوو:** هەڵوێستی دووەمی (العِزْ بن عبدالسلام) کە هەردووك شۆرەتی بەرزی: (سلطان العلماء)و (بائع السلاطین)ی بەبەلاش وەرنەگرتوون، بەم جۆرەیە: (السُّبْكي) گوتوویەتی: شێخ لەلای ئیسپات نەبوو بوو کە کاربەدەستە تورکەکانی دەوڵەت ئازاد (حُرّ)ن، بۆیە پێی وابوو بە حوکمی کۆیلە (رقيق)بوونیان بەموڵکی خەزێنەی دەوڵەت (بيت المال)ی مسوڵمانان دادەنرێن! جا شێخ (العِزْ بن عبدالسلام)، ئەو فەتوایەی داو ئاگاداریشی کردنەوە کە ئەگەر بێت و هەرکام لەو ئەمیرو کاربەدەستانە، سوڵتان

بەپارەی خۆی نەیان کڕیو ئازادیان نەکات[1]، ئەوە هەر بەکۆیلە دادەنرێن و سەرجەم ئەو هەڵس و کەوتانەی کە بۆ دروست بوون (جواز)یان پەکیان لەسەر ئازادیی (الحرية) کەوتوە، وەك: هێنانی ئافرەتانی ئازاد (نكاح الحرائر)و کڕین و فرۆشتن و بازرگانیو پێسپێرانی کاروباری جەنگییو ئیدارییو...هتد، لەڕووی شەرعییو دادوەریی(قضائي)یەوە بە نادروست (غير جائز)دادەنرێن!

جا بەحوکمی ئەوە کە لەوکاتەدا (عزالدين بن عبدالعزيز بن عبدالسلام) پلەوپایەی (قاضي القضاة)ی میصری هەبوو، سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگا بەبڕیارو فەتوایەکانییەوە پابەند بوون، بۆیە لەسۆنگەی ئەو فەتواو بڕیارەوە کێشەوگرفتی گەورەی جۆراوجۆر لەنێو خەڵك و جەماوەرو دام ودەزگاکانی دەوڵەت دا دروست بوون و میصر بەجارێك هەژا!!

چونکە ژنان دەستیان کرد بەچۆڵ کردنی ماڵ و بەجێهێشتنی مێردەکانیان و، بازرگانەکان کڕین و فرۆشتن و مامەڵەکانیان لەگەڵ کۆیلەکان (ممالك)دا راگرت و، بگرە کار گەیشتە ئەوە کەمنداڵ و پاڵ لەکۆڵان و بازاڕەکان دا بەهەڵڵا هەڵڵا بکەونە شوێن ئەو کاربەدەستە خۆبەزلگرو بەزەبرو زۆرو ملهوڕانەی کە بەفەتواو بڕیارێکی بوێرانەی جەنابی (قاضي القضاة) لە لووتکەی دەستەڵات و لوتبەرزییەوە هاتوونەتە نزمایی کۆیلایەتی و خاوەنی خۆنەبوون!!

دیارە دەست و پێوەندو کاسەلێسەکانی کۆشکی سوڵتان و وابەستەو دابەستە نزم و پەستەکانی کێچیان کەوتە کەوڵ و کەوتنە جم وجۆڵ و دەستیان کرد بەهاندانی سوڵتان و ترس و وەبەرنانیو پێیان گوت: (إعْزِلهُ عن الخِطابةِ وإلاّ شنَّعَ عَليك على المِنْبَرِ كما فَعَل في دمشق) لەوتاربێژیی لای بدە، ئەگەرنا لەسەر مینبەر دەتشکێنێ وەك لەدیمەشق کردی.

---

[1] - چونکە کاتی خۆی سوڵتانەکان بەمنداڵیو بەگەنجییو ئەوانەیان بەپارەی (بيت المال) کڕیوەو پاشان فێری سوارچاکییو کاری سیاسیو ئیدارییان کردوون و، دوایی بێ ئەوەی ئازاد بکرێن، کردوویانن بەکاربەدەست و مشوورخۆری وڵات و کارە ئیدارییو جەنگییەکانیان پێسپاردوون! جا لەبەر ئەوەی (کۆیلە) حوکمی بەسەر (ئازاد)دا ناڕوات، لەڕووی شەرعییەوە پێویست بووە ئازاد بکرێن.

جا لەسەرەتاوە سولتان وەفدێکی ناردە لای ئەو کەڵە زانایەو لەوبارەوە دواندی کە لەو بڕیارو قسەیەی پاشگەزبێتەوە، بەڵام بێسوود بوو، پاشان سولتان (نائب السَّلْطنة)ی ناردەلاو بەنەرمیی دواندی، بەڵام دیسان کەڵکی نەبوو! ئەوجار (نائب السَّلْطنة)کە خۆیشی هەر لە(مماليك) بوو، زۆر قەڵس بوو و خۆیو کۆمەڵێکی زۆر لەدارو دەستەکەی سوار دەبن و بەرەو ماڵی شێخ دەچن و لەبەر خۆیەوە دەڵێ: چۆن ئەو کابرایە دەتوانێ ئاوا سووکایەتییمان پێبکات و وەك کەل وپەل بمانفرۆشێو بمانخاتە مەزادەوە، لەحاڵێك دا کە ئێمە پادشاو حوکمڕانین؟! بەخوا دەبێ بەم شمشێرەم لێی بدەم!

بەڵێ (نائب السَّلْطنة) بە شمشێرێکی رووتی لەکالان دەرکێشراوەوە دەچێتە ماڵی شێخ (العِزّ بن عبدالسلام)و بەتووڕەیی لەدەرگا دەدات! منداڵێکی شێخ دەچێتە دەرێو دەرگا دەکاتەوەو، کە ئەو حاڵە دەبینێ دەگەڕێتەوە لای بابیو چی دیوە بۆی دەگێڕێتەوە، ئەویش هیچ خۆی سەغڵەت ناکات و ئەمیەتی پێناکات و دەڵێ:

(يا ولدي! أبوك أقلُّ مِنْ أَنْ يُقْتَلَ في سبيل الله) ئەی رۆڵەم! بابت لەوە کەمترە کە شایستەی ئەوەبێ لەرێی خوادا بکوژرێ!

پاشان دەچێتە دەرێو (نائب السَّلْطنة) هەر کەشێخ دەبینێ دەلەرزێو دەگری و شیرەکەیشی لەدەست بەردەبێتەوەو داوا لەشێخ دەکات کە دووعای خێری بۆ بکات!

پاشان ئەم وتووێژەیان لەنێوان دا بوو:

– نائب السَّلْطنة: گەورەم دەتەوێ چی بکەی؟!

+ الشيخ عزالدين: دەتانخەمە مەزادەوەو دەتانفرۆشم!

– نائب السَّلْطنة: جا نرخەکەمان لەچیدا خەرج دەکەی؟!

+ الشيخ عزالدين: لە بەرژەوەندیی مسوڵمانان دا.

– نائب السَّلْطنة: کێ ئەو پارەیە وەردەگرێ؟!

+ الشيخ عزالدين: خۆم وەری دەگرم!

کاتێك (نائب السلطنة) گەڕایەوە کۆشکی سولتان، کە سولتان لەوێ بوو و ئەمیرەکانیشی بەدەورەوە بوون و، رووداوو قسەکانی بۆ گێڕانەوە، زیاتر ڕقیان هەڵساو

سوڵتان بڕیاریدا کەخۆی لەگەڵ ئەو فەتواو بڕیارەدا بەرەنگاربێتەوە! وە بەرگریی لە کاربەدەستەکانی خۆی بکات.

سوڵتان رای سپاردە لای شێخ و ئاگاداریشی کردەوە کەڕازی نیە بەفرۆشتن و خستنە مەزادەوەی کاربەدەستەکان، بگرە ڕایشی سپاردەلا کەپێی بڵێن: سوڵتان ئەمیری مسوڵمانانەو جێبەجێکردنی فەرمانی فەرزەو لەسەرووی ئەو دەزگا قەزاییەشەوە کە شێخ سەرۆکیەتی!

دیارە شێخ لەسەر هەڵوێست و بڕیاری خۆی مکوڕ بوو وە رەخنەشی لە سوڵتان گرت کە بۆچی دەست وەردەداتە کاروباری قەزا(قضاء)وە، وە دووپاتی کردەوە کە هەر سوورە لەسەر ئەوە کەبە شێوەیەکی شەرعیی ئەو ئەمیرو کاربەدەستانە ئازاد بکرێن، ئەگەرنا ئەو هەڵس وکەوت و ڕەفتارانەیان کەلەسەر ئازادیی (حرية) راوەستاو (مُتَوَقّف)ن، دروست نین!

دیارە سوڵتانیش گوێی بۆ قسەو بڕیاری (عزالدين) نەگرت! بۆیە دەستی لەکاری (قضاء)و وتاربێژیی‌و پێش نوێژیی مزگەوتی (عمرو بن العاص) کێشایەوەو، بڕیاری بەجێهێشتنی میصریداو کەل وپەلەکەی لەکەرێك بارکردو لەگەڵ ماڵ و خێزانی بەرەو دەرەوەی میصر کەوتەڕێ!

بەڵام خەڵکی میصر لەهەر جادەو کۆڵانێکەوە دەڕۆیشت بە وردو درشت و ژن و پیاوو بازرگان و خاوەن پیشەو کاسب کارو...هتدەوە دەکەوتنە دووی‌و لەگەڵی دەڕۆیشتن، هەتا چەند (میل)ێك بەپێیان لە (قاهرة)وە دوورکەوتن و، ڕێوبان لەگریان و هاواری خەڵکی دەنگی دەدایەوەو دیمەنێك لەڕۆژی حەشری گەورەی دێنایە پێش چاوی خەڵك!

کاتێك سوڵتان ئەو حاڵەتەی بینی‌و یەکێك لە نیزیکەکانیشی بەگوێیدا چپاند: (تَدارَكْ مُلْكَكَ وإلاّ ذَهَبَ بِذَهابِ الشَّيخِ) فریای موڵکەکەت بکەوە، ئەگەرنا بەڕۆیشتنی شێخ لەدەستت دەچێ‌و دەڕوات!

ئیدی دەست بەجێ سوڵتان بەسواری ئەسپێك خۆی دەگەیەنێتە شێخ (العِزْ)و لەئەسپەکەی دێتە خوارێ‌و پێی دەڵێ: ئەی شێخ بۆ کوێ؟!

شێخ دەڵێ: (ألم تكنْ أرضُ الله واسعةً فتهاجروا فيها؟! ففيم المُقامُ بِأرْضِكَ وقد اسْتَضْعَفْتَ فيها القضاءَ بشريعة الله واعتديْتَ على القضاءِ؟!)

واتە: ئایا زەوی خوا فراوان نەبوو کە کۆچی تێدا بکەن؟ بۆچی لەخاکی تۆدا بمێنمەوە کە حوکم کردنت بەشەریعەتی خوا تێدا بێهێزکردووەو دەست درێژییت کردۆتە سەر قەزا(قضاء)؟!

سوڵتانیش دەڵێ: نەخێر نابێ بەجێمان بهێڵی، چیشت پێچاکە ئەوە بکە!

ئیدی سوڵتان ئەسپێك دەداتە خزمەت سوڵتانی زانایان (سلطان العلماء)و بەعیززەت و شەوکەت و هەیبەتی زیاترەوە دەگەڕێتەوە بۆ قاهیرە.

ئنجا لەرۆژێکی مەزنی مێژووییدا سوڵتان بەفەرمانی (قاضي القضاة) تێکڕای ئەمیرو کاربەدەستەکانی خڕ دەکاتەوەو (ابن عبدالسلام)یش لە مەزادێکی ئاشکرادا یەك یەك دەیانخاتە مەزادەوەو نرخی گرانیشیان لەسەر دادەنێ، بەشێوەیەك کە بێجگە لە سوڵتان هیچ کەس بۆی ناکڕێن، بۆیە سوڵتان لەماڵی تایبەتی خۆی نرخەکەیان دەدات و دەیان کڕێتەوەو ئازادیان دەکات و سوڵتانی زانایانی ئەمیرفرۆش (بائع الامراء)یش پارەکەیان وەردەگرێ‌و لەبەرژەوەندیییەکان و کاروباری مسوڵمانان و خزمەتی ئەهلی عیلم و بڵاوکردنەوەی زانستە شەرعیییەکان دا خەرجی دەکات![1]

پاشانیش فەتواو بڕیار دەردەکات کە ئەمیرو کاربەدەستە فرۆشراوو ئازاد کراوەکان لەمەودوا (عقود)ەکانیان شەرعیی‌و دروستن و، ئەو کێشەو گرفتە خێزانیی‌و ئابووریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و سیاسیییانەی کە بۆیان دروست بوو بوون، سەرجەم چارەسەر دەبن!

دیارە شێخ (عزالدین)یش بەم هەڵوێستە ناوازەو بوێرانەیەی هێندە دیکە لەدڵی خەڵکیدا ڕێزو حورمەت و خۆشەویستی پەیدا دەکات و، دەبێتە جێی متمانەو باوەڕیان و پەناو پشتیوانیان و، تەنانەت لەڕۆژانی جومعەدا پاش وتارو نوێژ هێندە بۆی تامەزرۆو عەوداڵ دەبن، لێی ناگەڕێن بڕوات هەتا بانگ و نوێژی عەصر.

---

١- بۆ نووسینی ئەو دوو هەڵوێستەی (العز بن عبدالسلام) کەلە زۆر سەرچاوان دا هاتوون، پشتم بە: (العز بن عبدالسلام: سلطان العلماء)ی عبدالمنعم الهاشمي، وە (سير الأعلام النبلاء)ی الذهبي، ج١٧ ص٣٠تا٣٢، وە (العلماء وأمانة الكلمة)ی محمد سرور بن نايف زين العابدين، بەستوە.

دەیاخوا شێخ عیـززەدین هـەزاران رەحمـەت لـە خـۆت و بابـت و دایکـت، وە هـەزار رەحمەتیش لەقوتابیەیە دڵسۆزەکانت و خەڵك و جەماوەرە مسوڵمانە پشتیوانەکەشت کـە ئاوا خزمەتیان کردوویەو پشتیان گرتووی!

خواش بەکەرەمی خۆی زاناو پێشـەوایانی ئیسـلامیی ئـەم رۆژگـارەش وا لێبکـات و هێنـدەیان هیممـەت بـەرز بکـات، کـە ئەگـەر لەسـەر هـەق ئـاواش بـەرۆك و یەخـەی دەسـتەڵاتدارانیش نـەگرن، بـەڵای کەمـەوە هێنـدەش نـەفس نـزم نـەبن کـە خۆیانیـان و ئایینەکەیانیان پێبفرۆشن!





## ١٦- شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمییەی حەڕرانی (رحمة الله تعالی علیه):

(تقي الدين: أحمد بن عبدالحليم بن عبدالسلام بن تيمية الحراني) لەساڵی (٦٦١)ك لە حەڕران (حران)[١] لەدایك بووەو لەساڵی (٧٢٨) لە سجنی قەڵا (سجن القلعة) لەشاری (دمشق) کۆچی دوایی کردوەو یەکێکە لەزاناو پێشەوا هەرە بەرزو بەرجەستەکانی ئیسلام، کە زانست و حیکمەت و عیبادەت و سیاسەت و پارێزکارییو فیداکارییو فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپەو فێرکردن و پەروەردەکردنی لەخۆیدا کۆکردوونەوەو، لەژیانیشیدا ماڵی پێکەوە نەناوەو ژنی نەهێناوەو کەم لە زانایانیش هێندەی وی جوامێرو بوێرو هەقبێژو پشوو درێژو خاوەنی زانیارییو شارەزایی هەمەلایەنەو هەمە جۆری قووڵ و فراوان بوون[٢]، خوا بەچاکترین شێوە پاداشتی بداتەوە، بەڵام بێگومان نە ئەم و نەهیچ زانایەکی دیکەش پارێزراو (معصوم) نەبوون و نین.

جا لەڕاستیدا خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان! ئینسان لە ئاست ژیانی کەڵە زانایەکی وەك (تقي الدين: ابن تيمية)دا کەسەر لەبەری تەمەنی پڕبووە لە هەڵوێستی جوامێرانەی درەوشاوە، سەراسیمە دەبێ کەچی تێدا هەڵبژێرێو چی واز لێبهێنێ!

بابایەك کە بەدڵ و بەزمان و بەقەڵەم و بەدەست و بەچەك، سەرگەرمی بەرگرییکردن لە ئیسلام و مسوڵمانان بووە، لە هەموو بوارو مەیدانەکانی:

١- فێرکردن.

٢- دەرس گوتنەوە.

٣- تەزکیە کردن.

٤- وتاردان و کتێب دانان.

٥- فەتوادان.

٦- وتووێژو شەڕە قسە لەگەڵ نەیاران.

---

١- حەڕران ناوچەیەکە لە کوردستانی سوریای ئێستاو زۆر لە مێژوونووسانیش (ابن تيمية) بە کورد دادەنێن.

٢- بڕوانە: (سير الأعلام النبلاء)ی الذهبي، ج١٧ ص٥٠٣،٥٠٤، کە پوختەیەکی جوانی لە ژیان و خەسڵەتەکان و کەسایەتی ناوازەی (ابن تيمية) باس کردوە، کە هاوچەرخ (معاصر)یشی بووە.

٧- پووچاندنەوەو بەرپەرچ دانەوەی کوفری کافران و ئەفسانەو بیدعەتی لادەران.

٨- فەرمان بەچاکەکردن و ریێ لەخراپەگرتن.

٩- جەنگ و جیهاکردن.

١٠-ئامۆژگاریی‌و سەرکۆنەکردنی دەستەڵاتدارانی لاڕێو ستەمکار.

وە ئامادە نەبووە تۆسقاڵێك لەو هەڵوێست و بیروڕایانەی خۆی پاشەکشە بکات کە پاش لێکۆڵینەوەی قوولّ و فراوان پێیان گەیشتوەو قەناعەتی پێیان هێناوە، وە زۆر مەردانەش باجی ئەو بوێریی‌و ئازایەتیی‌و ئازادیی‌یەی خۆی داوەو، سەرەڕای ئەوەی کە لەگەڵ سەرجەم پێڕو کۆمەڵە سەرگەردان و لاڕێ بووەکانی ڕۆژگاری خۆی تێك گیراوە، هەر لەتەتەرو مەغۆل و نەصرانیی دورزیی‌و عەلەوییی‌یەکانەوە بگرە، هەتا (رافضة)و بەناو صۆفیی‌و مەزهەبیی‌یە کەللە وشك و عەقلّ دۆگمایەکان و عەوام و ڕەشۆکیی‌یە بێئاگایەکان و، بەرواڵەت زاناو پێشەوا وابەستەو دابەستەکان و، کاربەدەست و حوکمڕانە ستەمکارو بەدڕەفتارەکان، بەڵێ سەرەڕای ئەوە، چەند جارێکیش ناچار بووە کۆچ و کۆچبار بکات و بەملاو لادا بڕوات و، تەنانەت بەوەندەش لێی نەگەڕاون و چەند جارێکیش بەناهەق سجن کراوەو بەساڵ و زیاتریش ماوەتەوەو دەرس گوتنەوەو نووسین و فەتوادانیشی لێ قەدەغە کراوەو، سەرەنجامیش هەر لەحەپسخانەدا سەری ناوەتەوەو کۆچی دوایی کردوە!!

ئایا بابایەکی وا چۆن چۆنی دەگونجێ لەچەند لاپەڕەیەك داو لەچەند خاڵێك دا هەڵوێستە پڕ سەروەریی‌و جوامێریی‌یەکانی تۆمار بکرێن؟!

بۆ خوا صوڵحاوێك و لەپێناوی خوادا ژیاوێك، هێندە لەخوا نیزیك بێو بەجۆرێك دنیای لەلا گچکە بووبێتەوەو دواڕۆژی هەڵبژاردبێ، کە هەموو ئەو شتانەی خەڵکیان پێ‌دەترسێنری‌و لەلایەن طاغووت و ستەمکارە ملهوڕەکانەوە هەڕەشەیان پێ‌دەکرێ کە (کوشتن و گرتن و دەرکردن)ن، نەك هەر لەلای بووبنە شتێکی ئاسایی‌و هاکەزایی، بگرە بووبنە سێ ئاواتی شیرین و سێ خەلات و دیاری سەنگین و بڵێ:

(ماذا يَفْعَلُ أعْدائي بي! إنَّ قَتْلي شهادة وسجني خَلْوةٌ ونَفْيي سياحةٌ) واتە: ناحەزەکانم چیم لێدەکەن!!

بێگومان کوژرانم شەهیدییەو حەپس کرانم خەڵوەو ئیعتیکافەو دوورخرانەوەشم سیاحەت و گەڕانە!

بەڵام بەهەرحاڵ بەپێی یاسای: (لەهەر باغە گوڵێك و لەهەر دەستکە گوڵێك چڵێك) لەچەند خاڵێکی کورت و گوشراودا چەند هەڵوێستێکی درەوشاوەی ئەو کەڵە پیاوەش تۆمار بکەین:

## یەك: چاك لێتێگەیشتن و لێکۆڵینەوەی قووڵ و هەمەلایەنە لەبارەی قورئان و سوننەتەوە:

بەڵێ ئەمە گرنگترین خەسڵەت و تایبەتمەندیی (ابن تیمیة)یە، کە بۆ وەڵامی هەر پرسیارێکی شەرعیی، روون بوونەوەی هەر مەبەستێکی ئیسلامیی، بەبێ ئەملاولاکردن، یەکسەر رووی کردۆتە وەحی خواو، پەنای بردۆتە بەر کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ: ﴿ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾[1].

ئاخر هەرکەسێك تەواو دڵنیاو مسۆگەر بوو کە ئامانج و مەبەستەکەی لەفڵانە جێیە چنگ دەکەوێ، بێگومان هەموو هەوڵ و تەقەللای خۆی تێدا دەدات، هەتا بە ئامانج دەگات، (ابن تیمیة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (جاری وا هەیە بۆ تێگەیشتن لە ئایەتێکی قورئان سەرنجی(١٠٠) تەفسیرم داوەو دوایێش لەخوا پاڕاموەوە کەلەوبارەوە زانیاری دیکەم پێببەخشێ!)[2]

دیارە قووڵ و فراوان و هەمەلایەنەیی لە قورئان و سوننەت حاڵی بوونی (شێخ الإسلام)یش لەسەرجەم کتێب و بەرهەمەکانیدا، وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە.

## دوو: بوێریی‌و جورئەت لەگوتنی هەق و بەرپەرچدانەوەی ناهەقدا:

ئەمیش وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، هەڵوێست و خەسڵەتێکی دیکەی پرشنگداری (ابن تیمیة)یە (رەحمەتی خوای لێبێ)و لەهەق خستنەڕوو و ناهەق

---

١- النور: ٥٤

٢- بڕوانە: (رجال الفكر والدعوة) ج٢ (شيخ الاسلام ابن تيمية).

پووچاندنەوەیدا هێندەی پووشکەیەك خاتری کەسی نەگرتوەو بەسەر هەڵەی هیچ کەس دا بازی نەداوەو، لەبەرانبەر خراپەو ناشەرعی هیچ کەس دا پادشا بووبێ یان گەدا، چاوی لە قووچ نەناوە! هەرکام لە کتێبەکانی: (الجواب الصحیح لمن بدل دین المسیح)کە تێیدا بەرپەرچی نەصرانیەکانی داوەتەوەو (درء التعارض بین العقل والنقل)کە (١٠) بەرگی قەبەیەو (الرد علی المنطقیین) کە بەرگێکی گەورەیە کەتێیان دا بەرپەرچی (فلاسفة)و (متکلمین) دەداتەوەو (منهاج السنة النبویة) کە چەند بەرگێکەو تێیدا موناقەشەیەکی وردو قووڵ و سەرکەوتووانەی بیرۆکە چەوت و هەڵەکانی (شیعە)و (رافضة)و (معتزلة)کان دەکات و پەردەیان لەسەر لادەدات، وە دووبەرگی گەورەی (مجموع الفتاوی)یەکەی بەناوونیشانی: (التصوف)و (السلوك) کە تێیاندا پشتگیریی لەتەصەووفی شەرعیی‌و ڕەسەن دەکات و هێرشێکی مەردانەش دەکاتە سەر لاف لێدەرەکانی تەصەووف (أدعیاء التصوف)و پاك و پیسی ئەو مەسەلەیە لەیەك هەڵداوێری‌و جیایان دەکاتەوە، بەتایبەت بیرۆکەی یەکتایی‌بوون (فکرة وحدة الوجود) کە کەسانی وەك (ابن عربی‌و ابن سبعین و ابن الفارض و التلمساني) باسیان کردوەو بەسەختی پشتگیرییان کردوە، بەتایبەت (فصوص الحکم)و (الفتوحات المکیة)دا زۆر بێ‌پەردەو ڕاشکاوانە ئەو مەسەلەیەی خستۆتەڕوو، وە (ابن تیمیة) بەبێ سڵەمینەوە لەنازناوی زل، زۆر چاك ئەو مەسەلەیەی پووچاندۆتەوەو دەریشی خستوە کە بیرۆکەی گۆڕین زەندەقەو بێ‌بڕوایی(إلحاد)ێکی رووتەو هیچ جۆر پینەو پاساوێکیش هەڵناگرێ.

بەڵێ ئەو کتێب و بەرهەمانەی کەناومان هێنان، کە هاو وێنەی دیکەشیان هەن، چاکترین بەڵگەی هەقبێژیی‌و جورئەت و ئازایەتی ئەو کەڵە پێشەوایەن.

## سێ: رووحانیەت و لایەنی مەعنەویی بەهێز زیکرو فیکری بەپێز:

(ابن تیمیة) وەك هەر زاناو پێشەوایەکی هەڵکەوتووی ئیسلام، بابایەکی یەکجار خواپەرست و پارێزکارو هەمیشە سەرگەرمی فیکرو دەم بەزیکر بووەو لایەنی ڕووحیی‌و تەزکیەی یەکجار بەهێز بووەو، قوتابیەکانی بەتایبەت (ابن قیم الجوزیة) لەوبارەوە شتی زۆری لێوە باس کردوە، بۆ وێنە گێڕاویەتەوە کە (شیخ الإسلام) پاش نوێژی بەیانیان لەشوێنی خۆی هەڵنەدەستاو دەمایەوەو سەرگەرمی زیکرو فیکرو پاڕانەوەو

رازو نیازی گەرم و بەکوڵ دەبوو، هەتا دەبووە چێشتەنگاو، وە دەیگوت: ئەگەر بێت ئەمە واز لێبهێنم هێزو وزەم نامێنێو هەرەس دێنم![1]

هەروەها (ابن تیمیة) خۆی گوتوویەتی: گەلێك جاران ئەگەر مەسەلەیەكی شەرعییم بۆ حەل نەكرابایەو لێم عاسێ بووبایە، دەچوومە مزگەوتە لاچەپ و چۆڵەكان و بەكوڵ لەخوا دەپاڕامەوەو دەمگوت: (یا مُعَلِّم ابراهیم علِّمني) ئەی فێركەری ئیبراهیم فێرم بكە، هەتا خوا دڵی رۆشن دەكردمەوەو مەسەلەكەم بۆ حەل دەبوو![2]

## چوار: فەرمان بەچاكە كردن و رێ لەخراپە گرتن:

وەك پێشتر ئاماژەمان پێكرد ژیانی (ابن تیمیة) هەمووی پڕ بووە لە ئەنجام دانی ئەركی گەورەو گرنگی: (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)، بەلام تەنیا نموونەیەك لەو بارەوە دێنینەوە:

(قازان) كە لەنەوەكانی (جەنگیزخان)ی مەغۆلی‌یەو حوكمڕانی مەغۆلەكان بووە، مسوڵمان بووەو ناوی لەخۆی ناوە (محمود)وە خەڵكێكی زۆری لە تەتاری‌یەكان لەگەڵ مسوڵمان بووەو لەنێو سوپایەكەیدا ئامۆژگاری‌كەران (وعاظ) هەبوون و بە حیسابی خۆی بۆیە لەگەڵ حوكمڕانەكانی (شام و میصر) جەنگاوە، چونكە لەئیسلام و حوكمی شەریعەت لایان داوە!

بەهەرحاڵ رۆژێكیان وەفدێكی گەورەی زانایان بەنوێنەری خەڵكی شام دەچن بۆلای (محمود)و جا باگوێ لە (الشیخ ابن أبی أبرك البالِسي) كە ئەندامێكی وەفدەكە بووە بگرین داخۆ چۆن چۆنی باسی دیدارو گفت و گۆی نێوان (أحمد)ی ئیسلام و (قازان) تەتاری دەكات:

دەڵێ: (شیخ الإِسلام) بەتەرجومانەكەی گوت: بە (قازان) بڵێ: تۆ پێت وایە مسوڵمانیو بانگ بێژو قاضیو ئیمام و شێخ تان لەگەڵن! كەچی شەڕمان لەگەڵ دەكەیو وڵاتمان داگیر دەكەی، لەبەرچی؟! خۆ لەگەڵ ئەوەش دا كەبابت و (هۆلاكۆ)ی باپیرت

---

[1] - بڕوانە: (رجال الفكر والدعوة) ج٢ (الشیخ الاسلام ابن تیمیة).

[2] - بڕوانە: (رجال الفكر والدعوة) ج٢ (الشیخ الاسلام ابن تیمیة).

کافربوون، وڵاتی ئیسلام (مەبەستی شام و میسرە)ی داگیر نەکرد، بەڵکو پەیمانی لەگەڵ میللەتی ئێمە هەبوو، کەچی تۆ پەیمان داو شکاندت و قسەت کردو نەتبردە سەر!

بالیسی دەڵێ:

پاشان خواردنیان هێنایە پێشمان و هەموویان خواردیان جگە لە (ابن تیمیە)، پێی گوترا: ناخۆی؟! گوتی: جا چۆن لە خواردنی ئێوە بخۆم، کە هەمووی مەڕی خەڵکە رفاندووتانەو بەدارو چیلکەیەکیش کوڵاندووتانە کەهی خەڵك بووەو بڕیوتانە؟!

دەڵێ پاشان (قازان) داوای لێکرد دووعای بۆ بکات، ئەویش دووعای کردو گوتی: (اللّٰهُمَّ إِنْ كانَ عَبدُك هذا محمودٌ إنَّما يقاتلُ لتكون كلمتُك هي العُليا وليكون الدين كلُّه لله فانْصُرهُ وأيِّدْهُ وملِّكْهُ البِلادَ والعِبادَ، وإنْ كان إنَّما قامَ رياءً وسُمْعةً وطلباً للدنيا ولتكون كلمته هي العُليا ولِيُذِلَّ الإسلام وأهْلَهُ فأَخُذْ لهُ وزَلْزِلْهُ وَدَمِّرْهُ واقطَعْ دابِرَهُ) واتە: ئەی خوایە ئەگەر ئەم بەندەیەت (مەحموود) تەنیا بۆ ئەوە دەجەنگێ کەناوی تۆ بەرز بێت و گەردن کەچیی بەس بۆ تۆ بێ، ئەوە سەری بخەو پشتی بگرەو زاڵی بکە بەسەر وڵات و خەڵکیدا، بەڵام ئەگەر بەس بۆ ئەوە هاتوە کە ریایی‌و خۆنواندن بکات و دنیا وەدەست بخات و ناوی خۆی بەرز بکاتەوەو ئیسلام و شوێن کەوتووانی زەلیل بکات، ئەوە بیشکێنەو رای تەکێنەو بیڕووخێنەو دوایی بێنە!

(بالسي) دەڵێ: (قازان)یش دەستی بەرزکردبوونەوەو هەر (آمین)ی بۆ دووعایەکانی دەکرد! ئێمەش بەرگ و پۆشاکی خۆمانمان خڕ دەکردەوە لەترسی ئەوە کە ئەگەر فەرمانی کرد بەکوشتنی نەبادا جلەکانمان بەخوێن بن!

جا کاتێك لای (قازان) هەڵساین و رۆیشتین، (قاضي القضاة نجم الدين بن صصري)و ئەوانی دیکەش پێیان گوت: نیزیك بوو سەری خۆت و ئێمەش بەفەتارەت بدەی، بەخوا لێرە بەولاوە هاوەڵایەتیت ناکەین! دەڵێ:

جا ئێمە کۆمەڵێك رۆیشتین و ئەویش لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوەڵەکانی مایەوە، جاکاتێك کاربەدەست و ئەمیرە نیزیکەکانی (قازان) ناویان بیستبوو، هاتبوون بۆلای‌و داوای دووعایان لێکردبوو، وەلەکاتی گەڕانەوەشی بۆ دیمەشق دەوری(٣٠٠) سواری

لەگەڵ بوو، وە من خۆم لەگەڵی بووم، بەڵام ئەوانەی دیکە کە نەویّران لەگەڵی بێنەوە کۆمەڵێکی تەتاریی چووبوونە سەر ڕێگایان و هەموویانیان ڕووت کردبوو![1]

## پێنج: بەشداریی‌کردن لە جەنگ و جیهاددا:

هەڵوێستێکی دیکەی درەوشاوەی (ابن تیمیة) بەشداریی‌کردنی کردەیی‌یەتی لەجەنگ و جیهاددا هەم لەدژی تەتەریی‌یەکان و هەم نەصرانی‌یەکان و هەم (نصیریة)و (رافضة)و (اسماعیلیة)کانیش!

بۆ وێنە: (محمد بن عبدالهادي) کە یەکێکە لە قوتابی‌یەکانی (شیخ الاسلام) ئەم دیمەنەمان لەجەنگی: (شقحب) کەلەنێوان تەتاریی‌یەکان و خەڵکی شام دا رووی‌داوە، بۆ باس دەکات: (( وە (شیخ)(خوا لێی رازی بێ) و برایەکەی‌و هاوەڵەکانی ئەو جەنگاوەرانەی لەگەڵیان بوون لەشوێنەکانی خۆیان بەئاشکراو بەئامرازەکانی جەنگەوە مابوونەوە، هەر سەرگەرمی ئامۆژگاری‌کردنی خەڵکی بوو کە خۆڕاگرو نەلەخشاو بن و، بەڵێنی سەرکەوتن و موژدەی غەنیمەت گرتنی پێ‌دەدان، وە موژدەی یەکێك لەو دوو شتە هەرەچاکەکان (احدی الحسنیین)ی پێ‌دەدان، هەتا خوا گفتی خۆی هێنایەدی‌و سەربازەکانی خۆی سەرخست و، هەر خۆی تەتاریی‌یەکانی تێك شکاندو بڕوادارانی سەرخست)).

هەروەها (شیخ الاسلام) لەشەڕو کوشتارو تەمبی‌کردنی ئەو پێڕو کۆمەڵانەی دیکەش دا کە ئاماژەم پێ‌کردن هەم بەهاندان و خەڵك و کاربەدەستان هەڵنان و هەم بەدەستی خۆی‌و رادانە مەیدانیش بەشداری کردوە.[2]

## شەش: رەوشتی بەرزو جوان و لێبوردن و دلگەورەیی‌و سینە سافیی:

(ابن تیمیة) چەندە لەسەر خواو ئایینی خوا توندو تووڕەو دڵگەرم بووە، لەسەر خۆی‌و ستەم لێ‌کرانی‌و ماف پێ‌شێل کرانی، بەپێچەوانەوە یەکجار رەوشت جوان و میهرەبان و لێبوردەو دڵنەرم بووە.

---

١- ئەم بەسەرهاتە لە (البداية والنهاية)ی ابن کثیردا هاتوە، ج١٤ص٨٩.

٢- بڕوانە: (الكواكب الدرية) ص١٨٢، وة :(العلماء وأمانة الكلمة) ص٣٧تا٤٢.

**بۆ وێنە:** كاتێك لە میصر بەهۆی قسەهێنان و بردن و زمان لێكوتانی چەند كەسێكی حەسوودو ناحەزەوە گیرۆدەی حەپس دەبێت و ماوەیەك دەگیرێ‌و پاشان كە كاربەدەستان بۆیان روون دەبێتەوە كە بەزوڵم و هەڵە گیراوە بەری دەدەن و داوای لێبووردنی لێدەكەن و ئامادەیی خۆشیان نیشان دەدەن كە هەموو ئەو كەسانەی دەستیان لە بەگرت دانیدا هەبووە بیانگرن! (ابن تیمیة) دەڵێ: نەخێر قبووڵ ناكەم هیچ كامیان بگیرێن، چونكە ئێمەی زانایان هەر برای یەكین! بگرە كاتێك كەیەكێك لەو زانایانە تووشی گرفتارییەك دەبێ (ابن تیمیة) دەچێتە لای ماڵ و خێزانەكەی‌و پێیان دەڵێ: هەر كارو پێویستی‌یەكتان هەیە من لەجیاتی فلانە كەس ئامادەم جێبەجێی بكەم! هەر بۆیەش ئەو زانایانە دانیان بەفەزڵ و چاكەو پیاوەتی ئەو كەڵە پیاوەدا هێناوەو گوتوویانە: ئێمە دەستمان رۆیی خراپەمان لەگەڵ كرد، كەچی ئەو لەبەرانبەردا چاكەو پیاوەتیی‌و جوامێریی لەگەڵ كردین!![1]

## حەوت: ئەدەب و رێزو قەدر زانینی (ابن تیمیة) بۆ زاناو پێشەوایانی ئیسلام:

هەڵوێستێكی دیكەی زۆر درەوشاوەی (ابن تیمیة) ئەوەیە كە ئەدەب و رێزو حورمەتێكی زۆری بەرانبەر بەسەرجەم زاناو پێشەوا رەسەنەكانی ئیسلام هەیەو چاك قەدریانی زانیوە، بەپێچەوانەی تێگەیشتنی گەلێك كەسی نائاشنا بەو پیاوە بەرێزە، كە گومانیان وایە رێزو حورمەتی زانایان ناگرێ!!

جا من تەنیا یەك بەڵگە بەنموونە دێنمەوە لەوبارەوە:

(ابن تیمیة) نامیلكەیەكی هەیە بەناوی: (رفع الملام عن الأئمة الأعلام) كە تایبەتە بە روونكردنەوەو سەلماندنی ئەو راستی‌یەوە كە هیچ كام لەزاناو پێشەوا بەرێزەكانی ئیسلام هەروا لەخۆوەو بەبێ پاساو(مبرر)و بەڵگەی ناچاركەر لەگەڵ یەكتردا تێك گیران و مشتومرو راجیایی (اختلاف)یان نەبووە، وە هیچ كامێكیشیان بەهیچ شێوەیەك نەیویستوە سەرپێچی لەفەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بكات، بەڵكو هەموویان بەهەموو

---

١- بڕوانە: (رجال الفكر والدعوة) ج٢، (حیاة شیخ الاسلام ابن تیمیة).

توانایان كۆشش و تەقەللایان ئەوە بووە كە رەزامەندیی خـواو پێغەمبەرەكـەیﷺ لەچـی دایەو وابكەن و وابلێن.

ئنجا (ابن تيمية) ئەو نامیلكەیەی خۆی ئاوا دەست پێدەكات:[1]

(وبعد، فيجب على المسلمين بعد موالاة الله ورسوله موالاة المؤمنين كما نطق بـه القرآن، خصوصا العلماء الذين هم ورثه الانبياء، الذين جعلهم الله بمنزلة النجوم يهتدى بهـم فى ظلمات البر والبحر، وقد أجمع المسلمون على هدايتهم ودرايتهم، وليعلم أنـه لـيس أحـد من الائمة المقبولين عند الامة قبولاً عاما يتعمد مخالفة رسول الله في شيء من سنته، دقيـق وجليل، فأنهم متفقون اتفاقا يقينيا على وجوب اتباع الرسول، وعلى أن كل أحد من الناس يؤخذ من قوله ويترك الارسول اللهﷺ، ولكن اذا وجد لواحد منهم قول قد جاء حديث صحيح بخلافه، فلابد له من عذر فى تركه..)

واتـە: دوای ئـەوە، لەسـەر مسـوڵمانان پێویسـتە پـاش دۆسـتایەتی خـواو پێغەمبەرەكەی دۆستایەتی بڕواداران بكەن، وەك قورئان فەرموویەتی، بەتایبەت زانایانێك كـەمیراتگری پێغەمبـەرانن، ئەوانـەی كـە خـوا وەك ئـەو ئەستێرانەی لێكـردوون كـە لەتاریكیـیـەكانی وشـكانیی‌و دەریـادا رێیـان پـێ دەزانـرێ، وە مسـوڵمانانیش لەسـەر شارەزایی‌و زانایی‌یان یەكدەنگن...وە پێویستە بزانرێ كە هیچ كام لەو پێشـەوایانەی كـە بەگشتی لەلایەن ئوممەتەوە پەسەند كراون، بەئەنقەست سەرپێچی لەفەرمانی پێغەمبەرو هیچ شتێكی رێبازەكەی ناكەن، چ ورد بێ چ درشت، چونكە هـەموویان بەدڵنیایی‌یـەوە لەسەر ئەوە كۆك و رێكن كە پێویستە شوێن پێی پێغەمبەر هەڵبگیرێ، وەكە هەركەسێك لەخەڵكی قسەشی لێوەردەگیرێ‌و بەسەریشیدا دەدرێتەوە، جگە لەپێغەمبەری خـواﷺ، بـەڵام: هـەركات بینـرا یـەكێكیان قسـەیەكی هەیـە پێچـەوانەی فەرموودەیـەكی راست(صحيح)، ئەوە حەتمەن عوزرێكی هەیە كە كاری بەو فەرموودەیە نەكردوە.

**بەڵێ: خوێنەری سەنگین و شیرین!** ئەمەیە ئەدەب و رێزو قەدرگرتنی (شيخ الاسلام ابن تيمية) بۆ زاناو پێشەوایانی ئیسلام، دەجا خوایە تۆش رێزو حورمەتی بۆ زیادبكـەی‌و پلەو پایەی بەرزتر بكەیەوە.

---

١- بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج٢٠ص١٢٩ال١٢٩الی١٦٠.

لــــەكۆتايى ئــــەم خاڵــــەش دا بەپەســــەندى دەزانم لــــەبارەى (ابــــن تيميــــة)وە ئامۆژگارىيــەكى گــەنج و رۆشــنبيرەكانمان بكــەم و، ئاگادارييــەكيش ئاراســتەى زانــاو مامۆستا بەڕێزەكان بكەم:

١- گەنجە خۆشەويستەكان! بێگومان وەك لەم چەند برگەيەدا خستمانەڕوو (شيخ الإسلام) زانايەكى بەرجەستەو ناوازە بووە، بەڵام وريابن:-

أ- وێڕاى زانستى ئەو پياوە، ئــەدەب و رێزو رەوشتى بــەرزىو دادگــەريىو ســينگ فراوانيشى لێوە فێربن.

ب- بە لەهەڵە پارێزراو (المعصوم من الخطأ)ى مەزانن، چونكە بێجگە لەپێغەمبەران (سەلامى خوايان لىٚبىٚ) هيچ كەس لەهەڵە پارێزراو نيە، بۆ وێنــە: پــێم وايــە (ابــن تيميــة) لەبارەى (الصفات الخبرية)وە لەسۆنگەى كاردانەوە (رد فعل)ى بۆ ئەوانــەى كــە بەگشــتى صــيفەتەكانى خوايــان (تأويــل) دەكــردو بەتايبــەت (الصــفات الخبريــة) تووشــى جۆرێــك لــەزيادەڕۆيىو تێپەڕانــدن (المبالغــة والافــراط) بــووەو لــە كتێبەكانىــدا ئــەو باســەى زۆر خســتۆتەڕوو و زەقــى كردۆتــەوە، وەك لــە زنجــيرە دەرســەكانى: (ئيمــان و عەقيــدەى ئيسلامىى)[١]دا باسم كردوە، وە هەربۆيــەش هــەموو ئــەو كەســانەى زۆر لــەژێر كــارتێكردن (تأثير)ى (ابن تيمية)دان لەكۆن و هاوچەرخ، زياد لەپێويست سەرگەرمى بــاس و خواســى صيفەتە خەبەرييەكانن و كارێك دەكەن كە ئەو باسە قەبارەو پانتاييەكــەى زۆر زيــاتر لەوەى كە لەقورئان و سوننەت دا بۆى ديارى كراوە بۆى تەرخان بكرىٚ، لەسەر حيســابى باس و بابەتى دى!![٢]

وە حەزدەكەم كە ئێوەى خۆشەويست ئاگادار بكەم لەوە كە (ابن تيميــة) وەك هــەر زانــاو پێشــەوايەكى ديكــەى پارێزكــارو دووربــين (محتــاط)، جــارى وا هــەبووە پرســيارى

---

١- ئەو زنجيرە دەرسە(٥٠) دەرسەو بەتۆماركراوى هەن و ئێستاش ئامادەى چاپ دەكرێن. سوپاس بۆ خوا ئێستا لە شەش بەرگ دا چاپ كراون.

٢ - ديارە هەرچۆن بىٚ رەفتارەكەى (ابن تيمية) (خوا لێى خۆش بىٚ) وێچووتر بووە لــەهى ئەوانــەى خۆيــان بەپەيڕەوانى وى دەزانن، چونكە كارەكەى ئەو ئەگەر جۆرێك زيادەڕۆيشــى تێدا بووە، بــەڵام زيـاتر كاردانــەوە بووە، ئەوە لە لايەكەوەو لە لايەكى ديكەشەوە (ابن تيمية) وەك ئەو جۆرە كەسانە هەموو عەقيدەو ئيسلامەتى لەو لايەنەدا كورت هەڵنەهێناو بوو، وەك لەهەڵوێستەكانىدا خستمانەڕوو.

ئاراسته كراوەو گوتوويەتی نازانم و تێیدا وەستاوە، وەك (ابن كثير) لە (الحافظ أبو عبدالله الذهبی)یەوە دەگێڕێتەوە لە تەفسیری رستەی: ﴿ ....وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ.... ﴾[1]،

هەروەها جاری واش بووە كە شتێكی نووسیوەو پاشان بۆی دەركەوتووە كە هەڵەیەو رایگەیاندوە كەبەهەڵەدا چووە![2]

٢- مامۆستا بەڕێزەكان! وەك گوتراوە: (لِكل جَوادٍ كَبْوَةٌ ولِكل حُسامٍ نَبْوَةٌ) جا بێگومان زانای ناودار (أحمد بن حجر الهيتمي) خاوەنی (تحفة المحتاج) كە بەتايبەت لە كوردستانی خۆمان دا زۆر ناودارە، زاناو پێشەوایەكی گەورە بووە، بەڵام بەتەئكيد لەگەڵ (ابن تيمية)دا ناچێتە تەرازووەوەو، منیش تكايەكی دڵسۆزانەتان لێدەكەم كە ئێوەی بەڕێز چی دی بەهۆی قسەو فەتوایەكی (ابن حجر) كە لەكتێبی: (الفتاوى الحديثية)[3]دا هاتوەو دەربارەی (ابن تيمية) گوتوويەتیو بێگومان قسەيەكی هەڵەو ناواقعیيانەشە! بەڵێ چی دی بەهۆی قسەو فەتوای بەڕێز (ابن حجر)ەوە خۆتان لە (ابن تيمية)و كتێب و بەرهەمە نايابەكانی دوور مەگرن، چونكە لە دەريايەكی پڕ گەوهەرو مرواريی بێبەش دەبن.

---

١ -النساء: ٢٣. بڕوانە: (تفسير القرآن العظيم) ج١ص٤٩٨، هەروەها بڕوانە: (معالم في طريق طلب العلم)ص٢٧٥،٢٧٦، عبدالعزيز بن محمد بن عبدالله السرحان.

٢- بڕوانە: (اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم) ج٢ص٨١١، كە گوتوويەتی : (...وكنت قد كتبتها فی منسك كتبته قبل أن أحج...ثم تبين لنا أن هذا كله من البدع المحدثه التي لاأصل لها في الشريعة..)

٣- بڕوانە: (الفتاوى الحديثية) ص٨٢تا٨٥، كە گەلێك وەسفی نالايقی بۆ بەكارهێناون وەك: (خَذَلَهُ الله وأضله وأعماه وأصمه وأذله...الخ) بەڵام جێی سەرنج ئەوەيە كە (ابن حجر) خۆی كتێبەكانی (ابن تيمية)ی نەخوێندۆتەوەو بەس پشتی بە قسەو نووسينەكانی (السبكي)و (التاج)ی كوڕی بەستوە! ئنجا پاش ئەو هەموو قسە ساردو سووكانەش لەكۆتاييدا گوتوويەتی: (فأن صح مكفر أو مبدع يعامله الله بعدله والا يغفر لنا له)!! ئاخر تۆ كە دڵنيانی ئەو شتانەی گوتوون يا نا، چۆن دەبێ ئەو حوكمە قورس و قسە سووكانەی پێبڵێی!

خۆتـان راسـتەوخۆ كتێـب و بەرهـەم و فەتوايـەكانی (شـيخ الإِسـلام) بخوێننـەوەو بەچاوی خۆتان تەماشای ئەو پياوە بكەن، دڵنيام ئەوانـەتان كـە كـەيفتان پێـی نايـەت، پاش ناسينی هەڵوێستتان بەتەواويی لەبارەيەوە دەگۆڕێ!





## ١٧- مامۆستا مەلا سەعیدی نۆڕسیی (رحمة الله تعالی علیه):

(سەعیدی کوڕی میرزا) ناسراو بە (بدیع الزمان) وە (سەعیدی مەشهوور)، لە ساڵی (١٢٩٤)ی کۆچی بەرانبەر بە (١٨٧٦) زانینی لەدێی (نۆرس)ی سەر بەناحیەی (ئیسپارتە)ی سەر بەقەزای (خیزان)ی عایدی ویلایەتی (بەتلیس)ی کوردستانی سەر بەتورکیا، چاوی بە دنیا هەڵهێناوەو، یەکێکە لەزاناو پێشەوا هەڵکەوتووەکانی ئیسلام لەسەدەی چواردەیەمی کۆچیو بیستەمی زایینیدا، لەساڵی (١٩٦٠)ی زایینیدا لەشاری (ئۆرفە)ی سەر بە(دیاربەکر) کۆچی دوایی کردوە.

جا ئێمە بۆ چاکتر ناسینی (مامۆستا نۆڕسیی) لەسێ خاڵان دا باسی:

أ- کورتەیەك لەبەسەرهاتی ژیانی پڕ ماجەڕایی.

ب- خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی.

ج- هەڵوێستەکانی.

دەکەین و پاشان چەند تێبینیو سەرنجێکی خۆشمان لەبارەی مامۆتا مەلا سەعیدی نۆڕسییو نامەکانی (نوور)و دیاردەو تەوژمی نۆڕسییایەتی (النورسّية) دەخەینەڕوو:

### یەکەم: کورتەیەك لە بەسەرهاتی ژیانی پڕ ماجەڕای مامۆستاو مەلا سەعیدی نۆرسیی:

هەڵبەتە ئێمە ناتوانین ژیانێکی(٨٥-٨٦) ساڵەی پڕ رووداوو کارەساتی (نۆرسیی) لەم نووسراوەدا بنووسین و کەبەرگێکی سەربەخۆی (کلیات رسائل النور) بۆ تەرخان کراوە لە (٥٤٤) لاپەڕەی ورددا! بۆیە ناچارین لەچەند بڕگەیەکی زنجیرەیی (مُتَسَلْسِلْ)داو بە کورتی، گرنگترین ڕووداوەکانی ژیانی بنووسین، تاکو بەگشتی ماجەڕای ژیانیمان لەبەرچاو رۆشن بێو بۆ درێژەش خوێنەران حەواڵەی ئەو کتێب و سەرچاوانە بکەین کە لەوبارەوە هەن، بەتایبەت بەرگی (٩)ی (کلیات رسائل النور) بەناوونیشانی: (سیرة ذاتیة).

* لەساڵی (١٢٩٤)ی كۆچی بەرانبەر بە (١٨٧٦)ی زاینی لەدایك بووە– وەك پێشتر باسمان كرد.

* وە لەساڵی (١٣٠٣)ك، (١٨٨٥)ز هەنگاوەكانی یەكەمی خۆی بەرەو زانست ناوەو لە گوندی (تاغ) دەستی بە خوێندن كردوە.

* لەساڵی (١٣٠٨)ك، (١٨٩١)ز لەلای شێخ (جەلالیی) لە (بایەزید) دەستی بە خوێندنی راستەقینە كردوە.

* لەساڵی (١٣٠٩)ك، (١٨٩٢)ز، نازناوی (بدیع الزمان)ی دراوەتێو لەلایەن زاناو مەلایەكانی كوردستانەوە، بەتایبەت پاش وتووێژی لەگەڵ زانایان لە (سوعرود).

* وە لەساڵی (١٣١١)ك، (١٨٩٤) ماوەیەك لە (تیللو) گۆشەگیر بووە، وە موناقەشەیەكی گرنگی لەگەڵ زانایەكانی شاری (جەزیرە) كردوەو، هەر لەم ساڵەش دا چووە بۆ شاری (ماردین)و دەستی كردوە بەگرنگیو بایەخ دان بەسیاسەت.

* وە لەساڵی (١٣١٢)ك، (١٨٩٥)ز لەماردینەوە بۆ (بەتلیس) دوورخراوەتەوە.

*وە لەساڵی (١٣١٤)ك، (١٨٩٧)ز، بەدەعوەتی والی چووە بۆ شاری (وان)و لەوێ لەلای خانە خوێیەكەی –كە والی بووە– سەرەڕای لەبەركردن (حفظ)ی (متن)ی(٩٠) كتێب هەر بەموتاڵاو خوێندنەوەی خۆی شارەزایيو بەرچاو ڕوونییەكی باشی لەزانستە نوێیەكان (العلوم الحدیثة)دا پەیدا كردوە.

* وە لەساڵی (١٣٢٥)ك، (١٩٠٧)ز بەمەبەستی دامەزراندنی قوتابخانەی (الزهراء) دەچێتە ئەستەمبوڵ (استانبول)و، داواكارییەك دەداتە سوڵتان (عبدالحمید) سەبارەت بەئاوەدانیيو چاكسازیيكردن لەناوچەی كوردستان داو، پاشان بەتۆمەتی تێكچوون دەبرێتە خەستەخانەی شێتان (مُسْتشفی المجاذیب)و دوای گفتوگۆیەكی قووڵ لەگەڵ پزیشك دا ئەویش دەخاتە ژێر كاریگەریی خۆیەوەو بەردەدرێ.

* وە لەساڵی (١٣٢٦)ك، (١٩٠٨)ز لە (٢٣)ی تەموز، سوڵتان (عبدالحمید) بۆ جاری دووەم (مَشْروطیة) –پێكهێنانی پەرلەمان، (مجلس الحل والعَقْد)– رادەگەیەنێو، (نۆرسیی) خۆشحاڵیی خۆی رادەگەیەنێو وتارێك دەدات بۆ ڕوونكردنەوەی چەمك و واتای راست و دروستی ئازادییو (مشروطیة).

وه لەهەمان ساڵ دا هەم (الشيخ بخيت) شێخی ئەزهەرو هەم نوێنەری جوولەکە (عمانوئيل قرصو) دەبينێ.

* وه لەساڵی (١٣٢٧)ك، (١٩٠٩)ز، رۆڵی سەرەکی دەبێ لەدامەزراندنی (جمعية الإتحاد المحمدي)دا کە زياتر لەدژو کاردانەوەی (جمعية الإتحاد والترقي) پێکهاتوه.

هەروەها لەهەمان ساڵ دا بەهۆی ڕووداوی (٣١) مارتەوە، کە بەشێکی زۆری سوپا ياخی دەبێ، دەبرێتە دادگای سەربازی عورفی (المحكمة العسكرية العرفية)و پاشان تەبريە دەبێ.

* وه لەساڵی (١٣٢٨)ك، (١٩١٠)ز ئەستەمبووڵ بەجێ دەهێڵێو بەرەو (وان) دەچێ، وه گەشتێك بەنێو عەشیرەتەکان (عشائر)ی کوردستان دا دەکات و ناميلکەی (المناظرات) دەنووسێ.

* وه لەساڵی (١٣٢٩)ك، (١٩١١)ز لەوەرزی زستاندا دەچێتە شام و لەوێ وتارێك لەمزگەوتی ئومەويی (الجامع الأُموي)دا دەدات کە دواتر بەناوونيشانی (الخطبة الشامية) چاپ و بڵاودەبێتەوە، پاشان لەڕێی (بيروت- أزمير)ەوە دەگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ و لە ڕۆژانی (٧-٢٦-٦-١٩١١) لەگەڵ سوڵتان (رشاد)دا گەشتێکی (روم ايلی) دەکات، وه لەهەمان ساڵیش دا بەردی بناغە (الحجر الأساس) قوتابخانەی (الزهراء)ی لەشاری (وان) ڕۆنا. □

* وه لەساڵی (١٣٣١)ك، (١٩١٤)ز دا هێرشی چەتە ئەرمەنييەکان بەرپەرچ دەداتەوە، وه وێڕای بەردەوام بوون لەسەر دەرس گوتنەوەی بەقوتابيەکانی لەگوندی (خوڕ خوڕ) سەرگەرمی مەشق (تدريب) پێکردنيشيان دەبێ.□

* وه لەساڵی (١٣٣٣)ك، (١٩١٥)ز دا لەشکر (فرْقة)ێکی هێزی بەرگريی میللی پێك دێنێ، لەگەرمەی جەنگ لەگەڵ رووسەکاندا.□

وه لەساڵی (١٣٣٤)ك، (١٩١٦)ز دا لەسەنگەری شەڕدا کتێبی (إشارات الإعجاز في مَظانِّ الإيجاز) بەسەر فەقێو قوتابيەکانی‌دا دەخوێنێتەوە، وه لەهەمان ساڵ دا بەبرينداريی ديل دەکرێو دەکەوێتە دەست رووسەکان لە(٢-٣-١٩١٦)دا، پاشان بەرەو

(قوصتورما) دەبرێو لەوێش لەسەر دەرسەکانی ئیمان بەردەوام دەبێ، وە لەوێ لەمزگەوتێکی تەتارییەکان دا، یەکەمین حاڵەتی بێداریی رووحیی بۆ پەیدا دەبێ.

* وە لەڕۆژی (١٧-٦-١٩١٨)دا پاش راکردنی لەحەپسخانەی رووسەکان، دەگاتەوە ئەستەمبووڵ، وە لەهەمان ساڵ دا لەڕۆژی (١٣-٨) بەئەندام لە (دار الحكمة الإسلامية) دادەمەزرێ.

* وە لەساڵی (١٣٣٨)ك، (١٩٢٠)ز دا کاتێك ئینگلیزەکان ئەستەمبووڵ دەگرن لە (١٦)ی مارت، (نۆرسیی) نامیلکەی (الخطوات الست) بەتورکیو عەرەبی بڵاودەکاتەوە دژی پیلان و سیاسەتی ئینگلیزەکان، وە لەهەمان ساڵ دا واز لەدەوامی (دار الحکمە) دێنێ.

* وە لەساڵی (١٣٣٩)ك، (١٩٢١)ز دا وەڵامی پرسیارەکانی (الكنيسة الإنكلينيكية) دەداتەوە، وە لە (تل يوشع) گۆشەگیر دەبێت و کودەتا (إنقلاب)یەکی مەعنەویی بەسەردا دێو لەقۆناغی سەعیدی کۆنەوە دەگۆڕێ بۆ سەعیدی تازە (السعيد الجديد).

* وە لەساڵی (١٣٤٠)ك، (١٩٢٢)ز دا بەدەعوەتی (كمال أتاتورك) دەچێتە (أنقرة)و لەلایەن کۆڕی شورا (مجلس البرلمان)ەوە کە (المبعوثان)ی پێگوتراوە، لە (١٢-١١) پێشوازیی کراوەو پاشان لە (١٩-١-١٩٢٣)ز دا (بیان)ێکی بۆ پەرلەمان خوێندۆتەوەو لەگەڵ (أتاتورك) تێك گیراوە.

* وەسەرەنجام پاش ئەوەی لە (٢٥)ی شوباتی (١٩٢٥)ز لە (وان) دووردەخرێتەوە بۆ (بوردور)، هەر لەوکاتەوە هەتا کاتی کۆچی دوایی لەشەوی (١٩٦٠/٣/٢٣)ز، بەرانبەر بە (١٣٧٩)ك، نۆرسیی (رەحمەتی خوای لێبێ) هەر سەرگەرمی دانان (تألیف)ی نامەکانی رووناکی (رسائل النور) دەبێ کە بەکۆن و تازەوە سەرجەم (١٣٠) نامیلکەن، وە رژێمی عەلمانییو رەگەزپەرستی تورکیاش هەر سەرگەرمی گرتن (سجن)و دوورخستنەوە (نفي)ی خۆیو دادگاییکردن (محاكمة)ی خۆیو قوتابییەکانی دەبێو، هەموو ئەم شوێنانە بەگرتن و دوورخستنەوەو دادگاییکردن دەبینێ: (بوردور، بارلا، أسپارطة، أسكي شهر، قسطموني، أنقرة، دينزلي، أميرداغ، أفيون، أستانبول).

* وەك گوتمان لەشەوی (١٩٦٠/٣/٢٣) سەعات (٣) كۆچی دوایی كردوە لە (ئورفە)و (٢٤-٣) هەر لەویَ نێژراوە، بەلاَم رژێم لەسەرەتای مانگی تەمووزی هەمان سالّ دا، جەنازەكەی دەرهێناوەتەوەو بەفڕۆكەیەك براوە بۆ شاری (أسپارطة) كە مامۆستا مەلا (عبدالمجید)ی برایشی تێیدا بووەو باگوێی لێبگرین خۆی بۆمان بگێڕێتەوە:[١]

(پاش تێپەڕبوونی (٥) مانگ بەسەر كۆچی دوایی كاكم دا بانگ كرامە دیوانی والی (قۆنیا)و سێ جەنەڕاڵی لەگەلّ بوون، یەكیان پێی گوتم: لاتان شێرراوە نیە كە ئێمە لەهەل و مەرجێكی دژواردایین، سەردان كەرانی گۆڕی كاكیشت رۆژ بۆ رۆژێ زیاد دەكەن، جائێمە دەمانەوێ بەهاوكاری بەرێزت ئێسقانەكانی بگوازینەوە بۆ نێوەڕاستی (أناضول)، جا بێزەحمەت ئەم داواكارییە ئیمزا بكە!)

وە قاقەزێكیان هێنایە پێشیَ كەبەناوی منەوە داواكاریی (طَلَبْ) كرابوو! منیش پاش خوێندنەوەی گوتم: جا خۆ من داوای وام نەكردوە... تكاتان لێدەكەم لێی بگەڕێن بالانی كەم لەگۆڕەكەیدا ئاسوودەبێ!

بەلاَم ئەوان لەسەر هەلّوێستەكەیان مكووڕبوون و گوتیان: هیچ مۆلّەتی تێدا نیە: ئنجا پاش ئیمزاكردنی داواكارییەكە چووینە فڕۆكەخانەو فڕۆكەیەكی عەسكەریی بەرەو (ئورفە) هەلّی گرتین و سەعات (٣)ی شەو چووینە گۆڕستان... ئیدی گۆڕەكەیان رووخاندو تابووتەكەیان دەرهێنا، جا كاتێك تابووتەكەیان كردەوە لەدلّی خۆم دا گوتم: حەتمەن ئێسقانەكانی كاكی خۆشەویستم بوونەتە خۆلّەمێش، بەلاَم كە دەستم لەكفنەكەدا وام دەزانی دوێنێ مردوە! كفنەكەش هەر ساغ بوو تەنیا لەلای سەریەوە تۆزێك زەرد بووبوو، پەلّەیەكی وەك دلّۆپە ئاوێك هەبوو، كاتێكیش پزیشك دەم وچاوی دەرخست، تەماشام كرد وەك زەردەخەنەی هاتبێ وابوو، سەرەنجام بەدلّی پڕغەم و پەژارەوە بەچاوی پڕ لەفرمێسكەوە لەفڕۆكەكەدا لەتەنیشت تابووتەكەوە دانیشتم، فڕۆكە رووی كردە شاری (أفیون)و لەوێش بەسەیارەیەكی (إسْعاف) جەنازەكە برایە (أسپارطة)و لەشوێنێك كە هەتا ئێستاش نەزانراو (مجهول)ە، بەخاك سپێرا).

---

١- بڕوانە: (كلیات رسائل النور) بەرگی (٩) (سیرة ذاتیة) ص٤٨٦،٤٨٧.

## دووەم: خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی مامۆستا سەعیدی نۆرسیی:

بێگومان مامۆستا مەلا سەعیدیش وەك هەر زاناو پێشەوایەکی هەڵکەوتووی ئیسلام، خەسڵەت و ئاکاری پەسەندی زۆر بوون، بەڵام ئێمە دەمانەوێ زیاتر ئاماژە بەو خەسڵەت و ئاکارانەی بکەین کەنیشانەو درووشم و تایبەتمەندیی کەسایەتی ناوازەی ئەم کەڵەپیاوە بۆ خوا ژیاوەن:

- زانست:

ئاشکرایە کە زانیار (عالِمْ) بوون مەرج و سیفەتی سەرەکی هەر پێشەوایەکی ئیسلامە، بەڵام زانیاری قووڵ و هەمەلایەنەی (نۆرسیی) شتێکی سەرسوڕهێنەرە، هەربۆیەش زانا هاوچەرخەکانی هەر زوو نازناوی (بدیع الزمان)یان پێداوە، وە هەر لەسەرەتای تەمەنیشیەوە (سەعید) لەخەون دا بەخزمەت پێغەمبەری خواﷺ گەیشتوەو موژدەی ئەوەی داوەتێ کە لەبارەی قورئانەوە زانیارییەکی وای دەدرێتێ پێویستی بەپرسیار لێکردنی هیچ کەس نەکات.[1]

لایەنێکی دیکەی گرنگی زانستی (نۆرسی) ئەوەیە کە وێڕای زانستە ئامرازییەکان (العلوم الآلية)و زانستە شەرعییەکان، شارەزاییەکی قووڵ و وردیشی لەزانستە نوێیەکان (العلوم الحديثة)دا هەبووە، وەك: گەردووناسیو فیزیاو کیمیاو زیندەوەرزانیو جوگرافیاو زەوی ناسیو کۆمەڵناسیو دەروونزانیو... هتد، وەك لە (رسائل النور)دا وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە.

- بۆ خوا یەکلابوونەوە (التجرُد):

بێگومان ئینسان بەئەندازەی خواناسی (مَعْرِفَةِ الله)و ئیمانی بەخوا، بۆی ساغ و یەکلا دەبێتەوە لەبەندایەتی بۆ کردن و پەرستنیدا، جا مامۆستا مەلا سەعید وەك لەسەرجەم ژیان و گوزەران و هەڵس وکەوت و هەڵوێستەکانیدا دێتە بەرچاو، پیاوێکی یەکجار خواناس و ئیماندار بووە، بۆیەش ئەو ئیخلاص و ساغ بوونەوەیەی لەمامۆستا

---

[1] -بڕوانە: (سيرة ذاتية)ص٤٥، كليات رسائل النور (٩).

مەلا سەعیددا دێتە بەرچاو لەکەم کەس دا دێتەدیەو، عەرەبیش گوتوویانە: (وكلُّ إِناءٍ بالّذي فيه يَنْضَحُ).

پێشم وایە ئەو هەموو خۆ بەکەم زانین (تواضع)ەی مامۆستا مەلا سەعیدیش کەڕەنگە هەندێك جاران جۆرێك لەزیادەڕۆیی (مبالغة)یشی تێدا ببینریّ، زیاتر هەر زادەو بەرهەمی ئەو بۆ خوا ساغ بوونەوەیەی بووە! سەرنج بدەن چەند جوانی فەرمووە: (... حاصلُ الكلامِ إنَّ حقيقة الإخلاصِ تمنَعُني عَنْ كل مايمكِنْ أنْ يكون وَسِيْلَةً إلى كسْبِ شُهْرةٍ لبلوغِ مراتِبَ مادّية أو معنوية...)[1]

- **فیداکاریی (التضحية):**

ئەمیش یەکیّ دیکەیە لەخەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی ئەو پیاوە بەرزو بەڕێزەی ئیسلام، چونکە بەتەئکید بەبیّ فیداکارییو لەخۆبوردن و قوربانیدان و چاوپۆشی لەزۆر شت کردن، ئینسان کاری گەورەی بۆ ئەنجام نادریّ.

ئنجا ژیان و بەسەرهاتی ئەو پێشەوا رەندەش کە بەزۆری بەگیراوییو دوورخراوەییو دەست بەسەرییو ئاوارەیی بردوویەتە سەرو تەنانەت نەیپەرژاوەتە سەر ژن هێنان و ماڵ و حاڵ پێکەوەنانیش! هەمووی هەر فیداکارییو لەخۆبووردوویی بووە، سەرنج بدەنە ئەم قسە بەهێزو پێزەشی کە لەبەردەم دادگای (آفیون)دا کردوونی تاکو رادەی قوربانیدان و جوامێرییو بوێریی (نۆرسیی) بزانن:

(ئاگاداربن و زۆرباش بزانن کە ئەگەر بەژمارەی مووەکانی سەرم، سەرم هەبن! وە هەر رۆژە یەکێکیان لەجەستەم جیابکرێتەوە، ئەم سەرەم کە بۆ روون کردنەوەی راستییەکانی قورئان لەخۆمم گرتوە- نەزرم کردوە- بەهیچ شێوەیەك لەبەردەم زەندەقەو کوفردا دایناەوێنم و بەهیچ رەنگێك دەست بەرداری ئەم خزمەتە ئیمانییە نوورانییە نابم..)[2]

---

١ - سەرچاوەی پێشوو ص٣٧٢.

٢- هەمان سەرچاوە ص٣٩٤.

- **پەرۆش و سۆزو بەزەیی (الشَّفقة):**

ئەمیش خەسڵەت و تایبەتمەندییەکی دیکەی ئەو پیاوە بۆ خوا صولّحاوە بووەو نەك هەر بەرانبەر بەدۆست و نیزەکانی، بگرە دەرهەق بەدوژمن و ناحەزانیشی یەکجار دڵنەرم و میهرەبان و بەپەرۆش بووەو، تەنانەت لەحاڵێك دا کە ئازاریشیان داوە دووعای هیدایەتی بۆ کردوون! بێگومان دڵ و ئەخلاقی وا گەورەش تەنیا بەرهەمی ئیمان و خواناسی مەزنە!

- **شت لەخەڵك وەرنەگرتن و دەست پێوەگرتن (الإستعناء والإقتصاد):**

تایبەتمەندییەکی دیکەی مامۆستا مەلا سەعید ئەوە بووە کەهیچ جۆرە یارمەتیو دیارییو خەڵاتێکی لەهیچ کەس وەرنەگرتوەو لەوبارەشەوە گەلێك هۆکارو حیکمەتی باس کردوون، بۆ وێنە گوتوویەتی:[1]

أ- لەبەرئەوەی گومڕایەکان زانایانی ئیسلام بەوە تۆمەتبار دەکەن کە زانستیان کردۆتە هۆکاری خۆ پێژیاندن بۆیە پێویستە بەکردەوە وەدرۆ بخرێنەوە.

ب- چونکە ئێمە شوێن پێهەڵگرتنی پێغەمبەرانمان (سەلامی خوایان لێبێ) لەسەر فەرز کراوەو ئەوانیش وەك قورئان باسی کردوە، هەمیشە بێنیازیی (إسْتِغْناء) خۆیانیان بەرانبەر بەخەڵکی دەربڕیوە: ﴿ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾[2] ، ﴿ قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ ﴾[3].

ج- لەبەرئەوەی لەمەزهەبی شافیعیدا وەك (ابن حجر) هێناویەتی: حەرامە کە دیارییو هاوکارییەك کە بەو ناوەوە پێت دەبەخشرێ کە ئینسانی چاك (صالح)ی قبووڵی بکەی، مادام چاك (صالح) نەبی.[4]

---

١ – برگەی(أ،ب) لە (المکتوبات)- المکتوب الثانی- دا هاتوون، کە بەرگی (٢)ی (کلیات رسائل النور)ە.

٢- الشعراء: ١٠٩

٣- ص: ٨٦

٤- بڕوانە: (تحفة المحتاج لشرح المنهاج) ج٧ص١٧٨، لابن حجر الهیتمي الشافعي، کە نووسیویەتی: (ومن أعطی لوصف یظن به کفقر أو صلاح أو نسب.. وهو باطنا بخلافه، حرم علیه الأخذ مطلقاً...)

جا ماموستا مەلا سەعید گوتوویەتی: من ئەگەر خۆم بەصالح بزانم ئەوە لەخۆبایی بوون (غرور)ەو، ئەگەر خۆیشم بەچاك نەزانم حەلالْ نیەو پێم ناشیێ![1]

د- هۆكارو پەرچ (مانع)ێكی دیكەش ئەوەیە كە ئەو دەرسە گەورەو گرنگ و مەعنەوییانە لەگەلْ ئەو دیاریی‌و بەخششانە نەخرێنە تەرازوویەكەوە، ئایا حەیف نیە گەوهەرو ئەلْماس بەلەتكە شووشەی بێبایەخ بگۆڕرێنەوە؟!![2]

ئنجا دیارە ئەو بێنیازیی‌و شت وەرنەگرتنەكەشی بەهۆی ئەو هەموو سادە ژیان و دونیا بەكەمگرتنەوە بۆ مەیسەر بووە، كە ژمارەی پێوانەیی (الرقم القياسي) تێدا شكاندوە!

## سێیەم: هەندێك لەهەلْوێستەكانی ماموستا سەعیدی نۆرسیی:

### • صولْح و پێكهاتنەوە كردن لەنێوان عەشایەری كورددا:

یەكەمین هەلْوێست و چالاكی گرنگی سەعیدی نۆرسیی پاش نیشتەجێبوونی لەشاری (وان) كە بەدەعوەتی (حەسەن پاشا) والی، ئەوێ چوو بوو، بریتی بووە لەپێكەوە ئاشت كردنەوەی عەشیرەت و تیرە ناكۆكەكانی كوردستان، كە جاری وا بووە لەسەر شتی گچكەو كەم بایەخ شەڕو هەرای گەورەیان بەرپاكردوە! بۆ وێنە: صولْحی لەنێوان (شوكر ئاغا)و (موستەفا پاشا)ی سەرۆك عەشیرەتی (میران)دا كردوە كە ئیدارەی دەولەتی عوسمانیی لەچارەسەركردنی كێشەكەیان دا دەستەوستان بووە![3]

### • هێرش كردنە سەر ستەم و خۆسەپاندن (الظلم والإستبداد)ی رۆژگاری سولْتان (عبدالحميد):

سەعیدی نۆرسیی لەبارەی پێناسەی (إِسْتِبداد)ەوە لەكتێبی (صَيْقَلُ الأسلام)دا گوتوویەتی[4]: ئیستیبداد بریتیە لەخۆسەپاندن و رەفتاری گۆترەكاریی، واتە تۆبزیی‌كردن

---

١- بڕوانە: (كليات رسائل النور) ج٩ (سيرة ذاتية) ص٤٩٢.

٢- هەمان سەرچاوە ص٤٩٣.

٣- بڕوانە (سيرة ذاتية) ص٦٢.

٤- سەرچاوە پێشوو ص٧٥.

بەهۆی هێزو دەستەڵاتەوە، واتە تاك ڕەویی.. ئنجا هەر ئەویشە کە ئینسانی ڕێز لێگیراوی خلۆر کردۆتەوە بۆ پلەی هەرە خوارەوەی نزمیی‌و ریسوایی.. وە بەهۆی ئەوەوە جیهانی ئیسلام گیرۆدەی زەبوونیی بووە، وە لەسۆنگەی وی‌یەوە ناکۆکی‌و دووبەرەکی‌یەکان سەریان هەڵداوە، وە هەر ئەوە کە ئۆممەتی ئیسلامی ژاراویی کردوەو ژارەکەی بەهەموو رەگ و دەمارەکانی‌دا بڵاوبۆتەوە.

پاشان گوتوویەتی: وە بێگومان خۆسەپاندنی ستەمکارانە هیچ پەیوەندی‌یەکی بە شەریعەتی بێهەڵەو پەڵەوە نیە، چونکە شەریعەت بۆ ڕێنمایی تێکڕای مرۆڤایەتی هاتوەو بۆ لابردنی هەر جۆرە ستەم و خۆسەپاندنێك هاتوە.

## • دوو داواکاریی لەسوڵتان (عبدالحمید):[1]

مامۆستا نۆرسیی دوو داواکاریی گرنگی ئاڕاستەی سوڵتان عەبدولحمید کردوون:

١- چاککردنی کاروبارو گوزەرانی کوردستان و بەرەو پێش بردنی‌و بوژاندنەوەی بەهۆی بنیات نانی قوتابخانەی زەهرا (مدرسة الزهراء)ەوە، کە پێشنیاری کردبوو وێڕای زانستە شەرعیی‌یەکان زانستە دونیایی‌یە نوێیەکانیش بخوێندرێن.

٢- چاککردنی کۆشك (إصلاح القصر) کە مەڵبەندو چەقی خیلافەت و کۆکردنەوەی مسوڵمانانە، لەو بارەوە روو بەسوڵتان گوتوویەتی: ((کۆشکی (یەڵدز) کە بۆتە ئەستێرەیەکی بێشۆق بەهۆی گۆڕینی بۆ مەڵبەندی زانستەکانەوە، وەك ئەستێرەی (کۆ- ثریا) بەرەو ئاسمان بەرزی بکەوە !

وە لەجیاتی قەمچی بەدەست و دۆزەخەوانەکان! ئەهلی حەقیقەت و فریشتەکانی رەحمەتی تێدا نیشتەجێبکە، بۆ ئەوەی وەك بەهەشت گەش و جوان بێ)).

## • پشتگیریی پێکهێنانی کۆڕی شورا (المَشْروطية):[2]

هەڵوێستێکی دیکەی (نۆرسی) (رەحمەتی خوای لێبێ)، ئەوەیە کە کاتێك سوڵتان (عبدالحمید) بۆ جاری دووەم لەساڵی (١٩٠٨)ز دا (مَشْروطية)[1]ی راگەیاند، زۆر

---

١- هەمان سەرچاوە ص٧٩.

٢- هەمان سەرچاوە ص٨١،٨٢.

بەڕاشـــكاوییو جیددییانـــە پشـــتگیریی‌كردو گـوتی[2]: (مشْـــروطية) درەوشـــێنەرەوەو تەفســیری هــەردووك ئایــەتی: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾[3] ، و(﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾[4])ەو بریتیە لە راوێژی شەرعیی (المشورة الشـرعية) ....(مَشْـروطية) بریتیـە لـە حوكمڕانیێتیـو سەروەرییو ئۆممەت و حكوومەت دەبێ خزمەتكار بێ.

پاشان گوتوویەتی: (..واتـە مـن بـە (مشـروطية) رازی بـووم لەسـەر بنـەمای بەلگـە شـــەرعییەكان نـــەك وەك بانگەشـــەكەرانی شارســـتانیێتی رۆژئـــاوا كەلـــەڕووی لاسایكردنەوەوەو بەپێچەوانەی شەریعەتی لێحـاڵیبوون، بـەلام مـن لەشـەریعەت نایەمـە خوارێو دەست بەرداری نابم و شەریعەت لەبەرتیلی هیچ شتێك دا نادەم! ![5]

بەكورتی: مامۆستا سەعیدی نۆرسیی بە دامەزراندنی كۆڕی راوێژ (مجلس الشـوری) كە ئەوكاتە پەرلەمان یان (مشروطية)ی پێ‌گوتراوە، رازی بووە بـۆ رزگـاربوون لـەحوكمی تاكە كەسیو خۆسەپاندن (إسْتِبدادْ)، بـەلام بەمـەرجێك لەسـەر بناغـەی شـەریعەت و بـۆ جێبەجێ‌كردنی یاساكانی بێت، نەك بكرێتە جێدار (بديل)ی شـەرعی خـوا، كـە بێگومـان ئەوكاتــە خــەڵك و میللــەت (لــەكۆلك دەســڵەمنەوەو بەســەر بــەرازدا دەكــەون) چــونكە لەدیكتاتۆریەتی تاكە كەسەوە دەگوازنەوە بۆ حوكمێكی نەفامیو طاغووتییانە!

هەڵبەتە شـەریعەتی خـوای كاربـەجێ و یاسـا دادگەرەكانیشـی، بـەبێ ڕاوێـژكردن و گێڕانەوەی دەستەلات بۆ خەڵك و كۆمەلگا هـیچ كـات جێبـەجێ نـاكرێن، وەك لـە زنجـیرە وتــاری: (ئیســلام و دەوڵەتــداریی و حــوكمڕانیی) دا خســتوومانەتە ڕوو كــە لــە كــەناڵی ئاسمانیی (پەیام)و بەرنامەی (سەرنج)دا پێشكەشیان دەكەین.

---

١- مەبەست لە (مشروطية) راگەیاندنی سیستەمی پەرلەمانییە لەدەوڵەتی عوسمانیدا كەبەو پێیە حوكمەت و وەزارەتـەكان لەبـەردەم پەرلـەمان دا بەرپرسـیار دەبـن، نـەك لەبەرانبـەر سـوڵتان دا، هـەروەها یاسـادانان (تشريع)یش دەبێتە ماف و ئەركی پەرلەمان.

٢- بڕوانە: (سيرة ذاتية) ص٨١، كە بەرگی (٩)ی (كليات رسائل النور)ە.

٣- آل عمران: ١٥٩

٤- الشوری: ٣٨

٥- هەمان سەرچاوە، ص٨٢.

- **داواكاریيه‌كانی له‌كۆمه‌ڵه‌ی (الإتحاد والترقي):**[1]

مامۆستا نۆرسیی پاش جڵه‌وی حوكمڕانیی به‌ده‌سته‌وه گرتنی كۆمه‌ڵه‌ی (یه‌كیه‌تیی‌و به‌ره‌و پێش چوون) ئه‌م سێ داواكاریيه‌ی ئاڕاسته‌كردن:

أ- بنیاتنانی قوتابخانه‌ی زه‌هرا- وه‌ك پێشتریش داوای كردبوو-.

ب- راستگۆیی‌و ئه‌مانه‌ت و دابین كردنی پێداویستیيه‌كانی زانایانی ئیسلام.

ج- پێكهێنانی كۆڕێكی راوێژ بۆ ئیجتیهاد (إجتهـاد)، چونكه تاكه كه‌سێك بـه‌ناوی (شیخ الأسلام)ه‌وه به‌ته‌نیا به‌هه‌موو لێكۆڵینه‌وه‌و بڕیارو فه‌توایه‌ك راناگات![2]

- **پێكهێنـانی سـوپای گـه‌لیی بـه‌رگریی‌و چـوونه سـه‌نگه‌ری جیهـاده‌وه له‌دژی رووسه‌كان:**

هه‌ڵوێستێكی دیكه‌ی مه‌ردانه‌ی مامۆستا مـه‌لا سـه‌عیدی نۆرسـیی ئه‌وه‌یـه كـه دوای ئه‌وه‌ی له‌ساڵی (١٩١٤)ز دا به‌سیفه‌تی ئامۆژگار (واعـظ) ده‌چێته نێـو ریزه‌كـانی سـوپای عوسمانیيـه‌وه، له‌سـاڵی (١٩١٥)ز دا سـوپای پشـتیوانان (الأنصـار) لـه‌كورده مسـوڵمانه فیداییيه‌كان پێك ده‌هێنێ‌و له‌جه‌بهه‌ی (قه‌فقاز)دا به‌سه‌رپه‌رشتی خۆی ده‌چنه مه‌یدانی جه‌نگ و جیهاده‌وه!

شایانی باسیشه كه له‌گه‌رمه‌ی شـه‌ڕو كوشـتارو تۆپبـارانی رووسـه‌كان دا تـه‌فسـیری (إشارات الإعجاز فی مظانّ الإیجـاز) ده‌نووسـێ‌و به‌سـه‌ر قوتابيیـه‌كانی، به‌تایبـه‌ت (مـه‌لا حه‌بیب)دا، ده‌یخوێنێته‌وه‌و ئه‌وانیش تۆماری ده‌كه‌ن.

وه له‌و جه‌نگه‌دا نیزیكه‌ی (٢٠) له قوتابیيه نه‌جیبه‌كانی شه‌هید ده‌بن كه یه‌كێكیان (مه‌لا حه‌بیب)بووه، خۆیشی بریندار ده‌بێ‌و لاقی ده‌شكێ‌و (٣٤) سـه‌عات لـه‌نێو قوڕێـدا ده‌مێنێتـه‌وه‌و چـاوه‌ڕێی مـردن ده‌بـێ! پاشـان له‌گـه‌ڵ كۆمـه‌ڵێك له‌قوتابیيه‌كانیـدا ده‌گیرێ‌و به‌دیلیی ده‌كه‌وێته ده‌ست رووسه‌كان.

---

١- كۆمه‌ڵه‌یه‌كی نهێنـی (جمعیـة سـریة) بوون له‌سـاڵی (١٨٨٩) پێك هـات به‌مه‌به‌سـتی له‌سـه‌ر حـوكم لادانی سوڵتـان (عبدالحمید)و كۆمه‌ڵه ماسۆنیيه‌كان هاوكارییان كردن و به‌زۆری له‌ریزه‌كانی سوپادا هه‌بوون.

٢- هه‌مان سه‌رچاوه، ص ٩٠.

وە ماوەی نیزیکەی دوو ساڵ و نیو بەدیلیی دەمێنێتەوە، پاشان رادەکات و بەفەلاکەت دەگەڕێتەوە بۆ ئەستەمبووڵ.

## • نۆرسیی بەدیلییش هەر جوامێرو مەرد بووە:[1]

یەکێك لەوانەی کە لەجەنگی جیهانی یەکەم و لەجەبهەی قەفقازدا بەدیل گیراوەو لەگەڵ مامۆستا سەعیددا رەوانەی (سیبریا) کراوەو لەدوورگەی (نانکون)ی سەر بە (باکۆ)دا حەپس کراوە ئەم هەڵوێستەی نۆرسی دەگێڕێتەوە:

– رۆژێکیان کە (نیقولا نیقولافیج) سەردانی سەربازگە (معسکر)ی ناوبراو دەکات بۆ پشکنین، سەرجەم دیلەکان لەبەری هەڵدەستن بۆ رێزلێنان، جگە لە (بدیع الزمان) کە هەرچەندە سێ جاران بەبەردەمیدا رادەبورێ گوێی ناداتێو لەبەری هەڵناستێ، جا جاری سێیەم لەبەردەمی دەوەستێو بەهۆی تەرجومانەوە ئەم وتووێژیان لەنێوان دا دەبێ:

– نیقولا: ئەوە من ناناسیێ؟!

+ سەعید: بەڵێ دەیناسم، ئەوە (نیقولا نیقولافیج)ە خالّی (قَیصر)و فەرماندەی گشتی جەبهەی قەفقازە.

– نیقولا: کەواتە لەبەرچی ویستی رێزم لێنەگرێ؟!

+ سەعید: نەخێر ببوورە، من بەسووك سەیرم نەکردوە، بەڵام فەرمانی عەقیدەکەمم جێبەجێکردوە.

– نیقولا: جا عەقیدەکەی فەرمان بەچی دەکات؟!

+ سەعید: من زانایەکی مسوڵمانم و هەڵگری ئیمانم و کەسێکیش لەدڵ و دەروونیدا ئیمان هەڵبگرێ لەوە چاکترە کەئیمانی نیە، جا ئەگەر لەبەری هەڵساباما و رێزم لێنابایە، بۆ عەقیدەکەم کەم رێزیی دەبوو بۆیە لەبەری هەڵنەستام!



١- هەمان سەرچاوە، ص١٣٠، ١٣١.

– نيقولا: دەجا مادام بەبێ ئيمانم ناوبەرێ ئەوە هەم من و هەم سوپای گەلەكـەم و هەم قەيسەريشی بێڕێز سەير كردوە ! بۆيە دەست بەجێ دادگايـەكی سـەربازی (محكمـة عسكرية) پێك بێنن و بزانن وەڵامی چیيە ؟ !

پاشـــان دادگـــای ســـەربازيیەكە پێـــك دێـــت و ئەفســـەرە تـــورك و ئـــەڵمانیو نەمسـاوييەكان دێنـە لای سـەعيد نۆرسـیو تـەكليفی لێدەكـەن كـە داوای لێبـوردن لـە فەرماندە رووسەكە بكات، بەڵام ئەو پێيان دەڵێ: من ئارەزووی سەفەری دوارۆژ دەكەم و دەمەوێ بچمە خزمـەت پێغەمبـەری بـەڕێزﷺ بۆيـە پێويسـتيم بـە پاسـپۆرتێك هەيـە بـۆ دوارۆژو ناتوانم شتێك بكەم پێچەوانەی ئيمانەكەم بێت !

ئيدی بەناچاريی لەبەرانبەر ئەم قسەيەدا هەموويان بێدەنگ دەبن داخۆ ئەنجام چی دەبێ !

سەرەنجام دادگاش بڕياری خۆی دەدات كە حوكمی لەسێدارەدانە بـەپێی مـاددەی (إهانة)كردنی قەيسەرو سوپای رووسـی، وە مەفرەزەيـەك دێن و دەيبـەن بـۆ گۆڕەپـانی مەرگ، (بـديع الزمـان)يش هەڵدەسـتێو بەدڵخۆشـييەوە بـە ئەفسـەرە رووسـەكە دەڵـێ: (١٥)دەقيقە مۆڵەتم بدەن تاكو ئەركی سەرشانم ئەنجام بدەم!

ئيدی هەڵدەستێو دەستنوێژ دەگرێو لەكاتی نوێژكردنيدا (نيقولا نيقولافيج) پێی دەڵێ:

بم بەخشە، من وام زانـی بـەو رەفتـارەت ويسـتووتە (إهانـة)م بكـەی، بۆيـە بـەپێی قـانوون رەفتـارم لەگـەڵ كـردی ! بـەڵام ئێسـتا زانـيم كـە ئـەو هەڵوێسـت لـەئيمان و عەقيدەتەوە هەڵقوڵيوە، بۆيـە بڕيـاری دادگـام هەڵوەشـاندەوەو بێگومـان تـۆ شايسـتەی هەموو رێزێكی بەهۆی چاكیو پارێزكارييتەوە، بمبوورە ناڕەحەتم كردن، دووبـارە داوای لێبـوردنم هەيـە. دەك هـەزار رەحمـەت لـەخۆت و بابـەو دايكـت مامۆسـتا مـەلا سـەعيدی نۆرسيی ! بەڕاستی زاناو پێشەوای ئيسلام دەبێ وەك تۆ جوامێرو بوێرو مەردو دلێر بێ.

• دانـــان و بلاوكردنـــەوەی ناميلكـــەی (شـــەش هـــەنگاوەكان) بـــۆ بەرهەڵستيی‌كردنی ئينگليزەكان:[1]

هەڵوێستێكی ديكەی شێرانەی سەعيدی نۆرسيی ئەوە بووە كە لەساڵی (١٩٢٠)ز دا دوای ئەوەی ئينگليزەكان شاری ئەستەمبووڵيان داگيركردوەو دەستيان كردوە بە پيلان گێڕان و نەخشەدانان، مامۆستا مەلا سەعيد ناميلكەی (الخطوات السّت)ی نوسيوەو بلاوكردۆتەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەو پوچەڵ كردنەوەی نەخشەو پيلانەكانيان و، دوايی فەرماندەی ئينگليزەكان كە ناميلكەكەی بەدەست گەيشتوە، بڕياری لەسێدارەدانی سەعيد نۆرسيی داوە! بەڵام كەپێيان راگەياندوە هەنگاوێكی وا دەبێتە مايەی توڕەيی‌و بێزاريی سەرجەم خەڵك و جەماوەرو كاردانەوەی تونديان، لەو بڕيارەی پاشگەزبۆتەوە.

ئنجا كاتێكيش كە سەركردەكانی جووڵانەوەی رزگاريخوازی كە لە (أناضول) بوون هەواڵی ئەو هەڵوێست و بەرەنگاريی‌يەی نۆرسيی دەبيستن، دووجار دەعوەتی دەكەن كە بچێتە لايان بۆ (أنقرة)، بەڵام ئەو ناچێ‌و بۆيان دەنوسێ: [كە من دەمەوێ كوێ زياتر مەترسی‌دارە لەوێ بمێنمەوەو خەبات بكەم، نەك لەپشت سەنگەرەوە، وەپێم وايە ئێرە لە(أناضول) مەترسی‌دارترە].

• يەكخستنی رووگە (توحيد القِبْلَة)و گۆڕانی سەعيدی كۆن بۆ هی نوێ:

مامۆستا مەلا سەعيدی نۆرسيی لەساڵانی (١٩٢١،١٩٢٢)ز دا حاڵەتێكی بێداريی‌و هۆشياريی رووحی گەورەی بەسەردا دێت و پاشان ئەو حاڵەتە هۆشياريی‌و بێداريی‌يە سەردەكێشێ بۆ هاتنەدی كودەتاو گۆڕانكاريی‌يەكی ريشەيی گەورە كە لەئاكامی‌دا

---

١ –بڕوانە: (سيرة ذاتية) ص١٤٤.

نۆرسی لەو ناميلكەيەی‌دا پيلان و نەخشەكانی ئينگليزو هاوپەيمانەكانی ناوناوە هەنگاوەكانی شەيتان (خطوات الشيطان)و بەناوی شەش جۆر وەسوەسەوە خستوونيەڕوو، وە بۆ هە وەسوەسەو هەنگاوێكيش وەڵام و بەرپەرچێكی خستۆتەڕوو كە هەڵی بوەشێنێتەوە. بڕوانە: (كليات رسائل النور) بەرگی (٨) (صيقل الإسلام/ الخطوات الست ص٥٤٣ تاكو ص٥٥٦، الطبعة الاولی ١٤١٦، ١٩٩٥، نشر: دار سوزلر– استانبول.

قۆنـاغی سـەعیدی کـۆن دەپێچـرێتەوەو قۆنـاغی سـەعیدی نـوێ (السـعید الجدیـد) دێتەکایەوە.

سەرەتای گۆڕانکاریی‌و بێداریی‌یەکەش پاش خوێندنەوەی کتێبی: (فُتـوحُ الغَیْـب)ی (عبدالقادر الگیلانـی) دەبـێ (رەحمـەتی خـوای لێبـێ)، هـەروەها خوێندنـەوەی کتێبـی (المکتوبات)ی (سید أحمد السَّرهندي) کە بە (الأمام الرّباني) ناسراوە!

شایانی باسیشـە کـە (نۆرسـی) ماوەیـەك لـەنێوان ئـەو دوو کتێبـەدا لـەدوو دڵیی‌دا دەبێ، کە ئایا کامیان بگریی‌و خاوەنەکەی بکاتە رابەر (مُرْشِدْ)ی خۆی؟!

هەتا سەرەنجام رستەیەکی (مَکتوبات)ی دەکەوێتە بەرچاو کە دەڵێ: (وَحّدِ القِبلَـةَ)، وە خورپەیەکی خوایی (خاطِرِ رَحْماني) بەدڵ دا دێت و پێی دەڵێ:

(إنَّ بدایة هذه الطرقِ جمیعها... ومَنْبَعِ هـذه الجداول کلّهـا.. وشَـمْسَ هـذهِ الكواكب السّیارة...إنما هو القرآن الکریم، فتوحید القبلة الحقیقی إذن لایکونُ إلا في القـرآن الکریم، فالقرآنُ هو أسْمی مُرْشِدٍ..وأقدَسُ أُستاذٍ علی الاطلاقِ..)[1]

واتـە: بێگومـان سـەرەتای تێکـڕای ئـەم ڕێبازانـە..وە سەرچـاوەی سـەرجەم ئـەو جۆگایانە.. وە خۆری هەموو ئەو خڕۆکانە بەس قورئانی بەڕێزە، جا کەواتە: یەکخسـتنی رووگە، بەڕاستی تـەنیا بـەهۆی قورئـانی بەخشـندەوە دەبـێ، چـونکە قورئـان بـەرزترین رابەرو پاکترین و چاکترین مامۆستایە بەبێ هەڵاواردن.

شایانی باسیشە جیاوازیی جەوهەریی‌و بنەڕەتیی نێوان سـەعیدی کـۆن و سـەعیدی تازە، بریتیە لە خۆدزینەوەی سەعیدی تازە لەمەیدانی سیاسەت و چالاکی‌یە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتیی‌و فەرهەنگی‌یەکان و یەکلابوونەوە بۆ لایەنی مەعنـەویی (ئیمـان و عیبـادەت، تەقوا، تەزکیە، ئەخلاق، ئاداب).



١ –بڕوانە: (سیرة ذاتیة) ص١٥٨تا١٦٢.

- **تێك گیران لەگەڵ (مصطفى كمال أتا تورك)دا:**[1]

لەساڵی (١٩٢٢)ز، (١٣٣٨)ك دا (مصطفى كمال أتا تورك) دوو بروسكەی دەعوەت بۆ مامۆستا مەلا سەعید دەنێرێ لەڕێی (تحسين بگ)ی هاوەڵیەوەو سەرەنجام دەچێ، بەڵام كەدەچێتە ئەنقەرەو لەلایەن بەرپرسانەوە لە وەزیران و ئەندامانی پەرلەمانەوە، هەروەها لەلایەن خەڵكیەوە پێشوازییەكی گەرم دەكرێ، هەست دەكات كە ئەندامانی پەرلەمان گرنگیو بایەخ بەدرووشمەكانی ئایین نادەن بەتایبەت نوێژ، بۆیە بەیاننامەیەك لەوبارەوە لە (١٠)خاڵ دا بڵاودەكاتەوە بەسەر ئەندامانی مەجلیس دا، وە بۆ خۆی بەسەر (مصطفى كمال)و جەنەراڵ (كاظم قرەبكر)دا دەیخوێنێتەوە، وە لەئەنجام دا (٦٠) كەس لەئەندام (نائب)ەكان دەست بەنوێژ دەكەنەوە!

سەرەتای بەیاننامەكەش ئاوا دەست پێدەكات: (يا أُيها المبعوثون! إِنَّكُمْ لمبعوثون ليوم عظيم! أيها المجاهدون! ويا أَهْلَ الحل والعَقْدِ!)

ئەتا توركیش لەبەردەم ئەندامانی پەرلەمان دا پێی دەڵێ:

بێگومان ئێمە زۆر ئاتاجی زانایەكی بەتوانای وەك تۆین و بۆیە دەعوەتمان كردووی كە سوود لەبیروڕا راستەكانت وەربگرین، تۆش بەدەنگمانەوە هاتی، كەچی یەكەمین كارت ئەوەبوو كەباسی نوێژت نووسیوەو جیاوازییت خستۆتە نێوانمانەوە!

ئەویش پاش وەڵام دانەوەی تێرو تەسەلی قسەكانی بەتوڕەییەوە پەنجەی بۆ رادەكێشێو دەڵێ: (پاشا- پاشا..إِنَّ أعظم حقيقة في الإسلامِ- بَعْد الايمان- هي الصلاة، والذي لايُصلي خائِنٌ، وحكمُ خائِنِ مَردودٌ) واتە: پاشا- پاشا بێگومان گەورەترین راستیی لەئیسلام دا- پاش ئیمان- نوێژە، وە كەسێك نوێژێ نەكات خائینەو خائینیش حوكمی نارەوایە.

دیارە كەمال ئەتا تورك زۆر قەڵس دەبێ، بەڵام رقی خۆی قوت دەداتەوەو سەربارەش بۆی پێشنیار دەكات كە ببێتە ئەندامی پەرلەمان و ئامۆژگاری گشتی (الواعظ العام)یش لە ویلایەتەكانی رۆژهەڵات (كوردستان)دا، وە لەسەرۆكایەتی كاروباری ئایینی (رئاسة الشؤن الدينية)و لە (دار الحكمة)ش دا ئەندام بێت، وە مانگی (٣٠٠) لیرەی

---

١- هەمان سەرچاوە، ص١٨١تا١٨٧.

هەبیّ! ! بەلاّم مامۆستا مەلا سەعید هەموو ئەو پلەوپایانە رەد دەكاتەوەو قبوولّیان ناكات، چونكە دەزانیّ لەسەر حیسابی ئایین و عەقیدەكەی دەبیّت و دەبیّتە بورغیّكی باش لەئامیّریّكی خراپ دا!

## چوارەم: چەند سەرنج و تێبینییەك دەربارەی نۆرسیی‌و شوێن كەوتووەكانی:

بێگومان هەڵسەنگاندنی كەسایەتی بەڕێز مامۆستا نۆرسیی‌و كۆمەڵ و تەوژمی نورییەكان كات و دەرفەتێكی تەرخانی دەوێ‌و ئێمە لێرەدا تەنیا مەبەستمان ئەوەیە كە چەند سەرنج و تێبینییەكی كورت و خێرا بخەینەڕوو، نەك لێكۆڵینەوەی تێرو تەسەل بكەین:

١- بەبێ رەچاوكردنی قۆناغ و بارودۆخ و هەل و مەرجی تایبەتی هەركەس و كۆمەڵێك لەكاتی هەڵسەنگاندن و لەمەحەك دانیدا دووچاری حوكمی هەڵەو ستەمكارانە دەبین.

بۆ وێنە: بۆ ئەوەی بزانین بۆچی (إمامْ غزالـي) وازی لەبەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەی (نظامية) هێناوەو رووی كردۆتە شام و فەلەسطین و سەرگەرمی دانانی كتێبی (احياء علوم الدين) بووە، نەك كارێكی دیكە بكات و كتێبێكی دیكە دابنیّ! پێویستە بزانین داخۆ ئەوساكە (أبو حامد الغزالي) لە چ حاڵەت و قەیران (أزمة)ێكی دەروونییدا ژیاوە، كە ئاوا هەڵی پێچاوەو تاوی داوە! ئەگەرنا رەنگە گومانی خراپی پێببەین و هەڵوێست و رەفتارەكەی بە جۆرێكی دیكە سەیربكەین.

دەجا مامۆستا سەعید نۆرسیی و هەر زاناو پێشەوایەكی دیكەش، بەهەمان شێوەو بۆ هەڵسەنگاندنی كارو چالاكییەكانیان پێویستە سەرەتا ژینگە (بيئة)و هەل و مەرج و بارودۆخی ئەوسای كوردستان و توركیاو جیهانی ئیسلامیش، چاك چاك بتوێژینەوەو بزانین چۆن بووەو چی تێدا بووە، ئەوجار لەحیكمەت و هاندەری هەڵوێست و رەفتارو هەنگاوەكانی نۆرسیی حاڵی دەبین كەبۆچی وای كردوەو، وەك فڵانە زاناو پێشەوای دیكەی نەكردوە؟!

٢- نۆرسی کە هەر سەرگەرمی باس و خواسی (ئیمان) بووە پاساو (مُبرر) ماقووڵی خۆی پێبووە، بەڵام مەرج نیە پەیڕەوان (أتْباعْ)ی وابن!

بەڵێ کە دەبینین مامۆستا مەلا سەعیدی نۆرسیی سەرجەم نامەکانی رووناکی (رسائل النور)ی کە لەقۆناغی سەعیدی نوێ (مرحلة السعيد الجديد)دا نووسیونی، بۆ روونکردنەوەی راستییەکانی ئیمان و عەقیدەی تەرخان کردوون، ئەوە بێگومان عوزرو پاساوی خۆی پێبووە، کە بریتی بووە لەوەی ئەو لەگەڵ تەوژم و لێشاوی بێڕەزای کوفرو زەندەقەی ئەتا تورکییدا بەرەنگار بۆتەوەو، هەر هێندەی لەدەست هاتوە، کە ئەگەر ناتوانێ بەرگریی (دفاع) لە تێکڕای ئیسلامەتی بکات، با لانی کەم بەرگری لە ئەسڵ و بناغەکەی بکات، کە ئیمان و عەقیدەیەو ئەمیش لەهەموو لایەنەکانی ئیسلامەتی زیاتر کەوتۆتە بەر پەلامارو هێرش، وێڕای ئەوەی کە ئەسڵ و بناغەی ئیسلامەتیشە!

ئنجا بێگومان لەو هەلومەرجەی ئەوسای تورکیادا کەبەپێی نەخشەو پیلانی داڕێژراوی کوفری جیهانیو خۆماڵی ویستراوە درەختی ئیسلام لەڕیشەوە بنبڕبکرێ، بەپێی دەستوورو قانوونی ئەوسای وڵات! نۆرسی بەسەد حاڵ توانیویەتی کە بەرگری لەئیمانیش بکات و لەسەر ئەوەندەش- کە بێگومان کەم نەبووە- چەندان جار گیراوەو دادگاییکراوەو چەندان ساڵ دوورخراوەتەوەو دەست بەسەر کراوەو چەند کەڕەت هەوڵی کوژران و لەسێدارەدانی دراوەو، زیاتر (١٠)جار دەرمان داو و ژار خواردوو کراوە!![1]

کەواتە: بەتەئکید ئەگەر هاتباو پێی لەبەرەی ئیمان و عەقیدەو عیبادەت و ئەخلاق زیاتر راکێشابایە، پڕۆژەکەی لێتێك دەدراو نیوەچڵ دەکراو، دیارە ئەویش تەواوکردن و

---

١- ئەو دە کەڕەت ژەهرخواردوو کردنانەش ئەمانەن:

١- لە (أنقرة) لە پەرلەمان دا بەدەرزی، ساڵی ١٩٢٢،١٩٢٣زدا.

٢- لە (سجن)ی (أسكي شهر)، ساڵی ١٩٣٥دا.

٣و٤و٥- لە(قسطموني) لەساڵی ١٩٣٦،١٩٤٣دا.

٦و٧و٨- لە (سجن)ی (دينزلي) لەساڵی ١٩٤٣،١٩٤٤دا، کە لەهی سێیەم (حافظ علي) کۆچی دوایی کردووە.

٩و١٠و١١- لە (أمير داغ) لەساڵی ١٩٤٥،١٩٤٦دا، کە لەهی جاری سێیەم دا(حسن فيضي) مردووە، خوا لێیان خۆش بێت.

بڕوانە: (كليات رسائل النور) بەرگی (٩) (سيرة ذاتية) ص٣٦٠.

بەئەنجام گەیاندنی پرۆژەی قوتارکردنی ئیمان (مشروع إنقاذ الإيمان)ی بەلاوە گرنگترو پێویست تر بووە، لە کردنی چەند قسەیەك و نووسینی چەند شتێك کە بکرێنە بیانوو بۆ تێکدان و وەستاندنی پرۆژەکەی، وە ئەنجام و بەرهەمێکی ئەوتۆشیان نەبێ.

بەلاّم بێگومان شوێن کەوتووانی مامۆستا نۆرسیی‌و قوتابیی‌انی قوتابخانە ئیمانی‌یەکەی ئەو عوزرو پاساوەی مامۆستاو ڕابەرەکەیانیان نیە، چونکە:

أ- ئەو هەر ئەوەندە فریاکەوتووەو هەر هێندەی بۆ لواوە، کە نەهێڵێ لافاوی کوفری ئەتا تورکیی، بناغە (أساس)ی ئیسلامەتیی ڕامالّێ‌و برووخێنێ، جا کە ئێستا ستایش بۆ خوا بناغەکە پارێزراوە، پێویستە پەیڕەوەکانی مشووری لایەنەکانی دیکەی ئیسلامەتیش بخۆن!

ب- بێگومان قوتابی دەبێ تەواوکەرو درێژە پێدەری کارو کاروان و پرۆژەی مامۆستایەکەی بێت! دەجا پێویستە ئەو بناغەیەی کە مامۆستا مەلا سەعید بەرگریی لێکردوەو پاراستوویەتی، قوتابی‌یەکانیشی دیوار (جدار)ی لەسەر هەڵچنن و بنیات بنێن، چونکە نەئیسلام بەس ئیمان و عەقیدەیەو، نە بناغەی بێ دیواریش بەتەنیا نواو جێگای حەوانەوەی لێدروست دەبێ!

ج- نۆرسیی لەسیاسەتی کوفری پڕ فڕوفێڵ بێزارو دوورە پەرێز بووەو پەنای لێ بەخوا گرتوە، نەك بڕوای بەحوکم و سیاسەتی شەرعیی نەبووبێ!

زۆر کەس کە ئەو قسەی مامۆستا نۆرسی کەوتۆتە بەرگوێ: (أعوذُ باللهِ من الشَّيطانِ والسياسةِ) پێی وایە ئەو زاناو پێشەوایە هەر یەکجاریی‌و بەگشتی وازی لەهەر جۆرە سیاسەتێك هێناوەو بڕوای بەئەسڵی سیاسەت و کارو چالاکی سیاسی نەماوە!!

بەلاّم باگوێ لەخودی مامۆستا نۆرسیی بگرین داخۆ لەوبارەوە چی دەڵێ:[1]

(ڕۆژێکیان پیاوێکم بینی کە سیماو نیشانەی زانستی هەبوو عەیب و ڕەخنەی غەرەزاویی‌یانەی ئاشکرای لە زانایەکی گەورەو چاك دەگرت، بەڕادەیەك کە گەیاندیە سنووری بەکافردانان (تکفیر)ی! ئەویش لە سۆنگەی ڕاجیایی‌یان لەسەر هەندێك مەسەلەی سیاسی!! منیش لەئاکامی ئەو ڕووداوەدا مچوڕکێکی توندم پێدا هات وەپەنام

---

١- بڕوانە: (سيرة ذاتية) ص٢٠٢،٢٠٣.

بەخوا گرت لەو ئەنجامەی کەسیاسەت پێی گەیشتوە، وە گوتم: پەنا بەخوا دەگرم لەشەیطان و لەسیاسەت (أعوذ بالله من الشيطان والسياسة)، وە لەو ڕۆژەوە لە مەیدانی سیاسەت کشامەوە).

هەروەها لەشوێنێکی دیکەداو لەوەلامی پرسیاری:[1]

- بۆچی مەیدانی سیاسەتت بەجێهێشتوەو هەرگیز لێی نیزیك ناکەویەوە؟!

گوتوویەتی: سەعیدی کۆن دەوری (١٠) ساڵ خۆی خستە نێو گێژی سیاسەتەوە بەشکم لەو ڕێیەوە خزمەتێك بەئایین و زانست بکات، بەڵام هەموو ڕەنج و کۆششەکانی بەدەم (با)وە چوون، بۆیە بۆی دەرکەوت کە ئەو ڕێیە خاوەن کێشەو گرفتی زۆرەو گومان لێکراوە، بۆیەو لەو سۆنگەیەوە سەعیدی کۆن سیاسەت و کۆڕو مەجلیسە دونیاییەکانیو ڕۆژنامە خوێندنەوەی لەگەڵ جگەرەکێشان، پێکەوە واز لێهێنان!

کەواتە: مامۆستا مەلا سەعید نۆرسیی:

أ- دوای ئەوەی سیاسەت گۆڕراوە بۆ میکیاڤیلییەت و هەلپەرستییو بێویژدانییو لەبەهابەرزەکان (القيم العليا)و ڕەوشتە پەسەندەکان دابڕاوە.

ب- وە دوای ئەوەی ڕێگای خزمەتکردنی لەو ڕووەوە لێبەستراوەو ناچاری وازلێهێنان و دوورە پەرێزی کراوە.

ج- وە دوای ئەوەی هەتا شیری بڕی کردوە ڕەنجی داوەو لەو مەیدانەدا ئەسپی خۆی لینگ داوەو تاو داوەو، ئەزموون و شارەزایی چاکی تێدا وەدەست هێناوە:

ئەوجا دەست بەرداری کاروچالاکی سیاسی بووەو وازی لێهێناوە! کەواتە: ڕاست نیە کە مامۆستا سەعیدی نۆرسیی بڕوای بەسیاسەت و کاری سیاسی نەبووەو هیچ ئەهمیەت و بایەخی پێنەداوە! بەڵکو دیارە بارودۆخ و هەل ومەرج، هەر ئەوەندەی ڕێداوەو بەناچاری ملی ئەسپی خۆی لەو مەیدانە وەرسوڕاندوەو باداوە!

٣- بەڵام بەندە لەئەنجامی خوێندنەوەو موتاڵای تێکڕای بەرهەمەکانی مامۆستا نۆرسییو سەرنج دان و تێوەڕامانی وردی ژیان و گوزەرانیدا، ئەم سێ تێبینییەم بۆ

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ص٢٠٦.

دروست بوون كه لهگهڵ حورمهت و ڕێزی زۆرم بۆ مامۆستا نۆرسیی، ناتوانم لێیان بێدهنگ بم:

**یهكهم:** مامۆستا نۆرسیی لهباسی خوا بهیهككرتن (توحید)دا بهزۆری جهخت لهسهر بهدیهێنهرایهتیو پهروهردگارێتی (خالقیة وربوبیة)ی خوای پهروهردگارو بێوێنه دهكات و كهمتر باسی پهرستراوێتی (ألوهیة)ی خوا دهكات، كه بێگومان پهرستراوێتی خوا، ئهسڵ و بهشی ههره گهورهو گرنگی ئیمان و خوا بهیهككرتنهو پێغهمبهرانیش (سهلامی خوایان لهسهر بێ)و شوێن كهوتووانیشیان ههر لهسهر ئهو لهگهڵ طاغووت و فیرعهون و نهمروودو ئهبوو جههلهكان دا تێك گیراون!! ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ﴾[1]، واته: وه لهپێش تۆدا هیچ پێغهمبهرێكمان نهناردوه كه پێمان ڕانهگهیاندبێ (بهگهلهكهی بڵێ) كه جگه لهمن هیچ پهرستراوێكی دی نیه، دهجا بم پهرستن.

**دووهم:** ههرچهنده مامۆستا مهلا سهعید ههمیشه داكۆكی لهسهر ئهوه كردوه كه قوتابیيهكانی بهخۆیهوه پهیوهست نهبن و تهنیا لهسوڕگهی نامهكانی ڕووناكی (رسائل النور) بخوێننهوه، بهڵام دهبووایه دوو ڕاستی دیكهی گهورهو گرنگیشی به قوتابیو پهیڕهوانی بڵێ:-

أ- نامهكانی ڕووناكی (رسائل النور) ههرچییهك بن و ههرچۆنێكی بن، ههر تهفسیرو لێكدانهوهی مامۆستا نۆرسیین بۆ قورئان و نابێ لهوه بێئاگابین كه قهرهبووكهرهوه (مُعَوِّض)و جێگرهوهی قورئان و سوننهت نین و، پێویسته وێڕای سوودو كهڵك لێوهرگرتنی نامهكانی ڕووناكی مامۆستا نۆرسیی، كهچهند دڵۆپهیهكن لهدهریای قورئان و سوننهت، لهو دهریاو سهرچاوهیهش كه نامهكانی ڕووناكی لێوه هاتوون بێبهش نهبین! چونكه بێگومان قورئان و سوننهت كهلێن پڕكهرهوهی ههموو كتێب و بهرههمێكی زاناو پێشهوایانن، بهڵام بهرههم و كهلهپووری زاناو پێشهوایان، بههیچ جۆرێك جێگرهوهو كهلێن پڕكهرهوهی وان نین.

---

١- الأنبیاء: ٢٥

ب- نامەکانی ڕووناکی تایبەتن بەبابەت و مەسەلەکانی ئیمان و عەقیدەو لایەنی مەعنەوییەوە، بەڵام بێگومان ئیسلام تەنیا لەو لایەنانەدا کورت هەڵنەهاتوە، بۆیە دەبووایە مامۆستا مەلا سەعید زۆر بەڕاشکاویی‌و جەخت کردنەوە بەقوتابی‌و پەیڕەوانی بڵێ: (نامەکانی ڕووناکی) بەس (کافي) نین بۆ مسوڵمانەتی‌و دینداریی کردنێکی تێرو تەواو، چونکە لایەنەکانی دیکەی ئیسلام، وەك:

- حوکم و سیاسەت و بنیاتنانی دەوڵەت.
- فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە.
- جێبەجێکردنی حوکم و سزاو سنوورە شەرعییەکان.
- جەنگ و جیهادو بەرەنگاربوونەوەی ئەهلی کوفرو نیفاق و یاخیبووان. مەگەر چۆن دەنا هیچ باس و خواستێکیان لە (نامەکانی ڕووناکیی)دا نیە. ئاشکراشە کە ئیسلامەتیی بەبێ ئەم لایەنانەش جێبەجێ ناکرێ!

**سێیەم:** پێم وایە مامۆستا مەلا سەعید وەك پێویست خەم و مشووری لەمیللەتی مسوڵمانانی کورد نەخواردوە، کە ئەوکاتە زۆر ستەمدیدەو لێقەوماوو چەوساوە بووە، دیارە پشتگیریی نەکردنیشی[1] لە ڕاپەڕینەکەی (شێخ سەعیدی پیران) هەر بەشێکە لەو کەمتەرخەمیەی (خوا لێی خۆش بێ) وە ئێستاش لەگەڵ بێ قوتابی‌و پەیڕەوانی، سەبارەت بەگەلی کوردو کێشە ڕەوایەکەی هەر کەمتەرخەمن.[2]

هەرچەندە لەگەلێك بواری دیکەدا کارو خزمەتی باشیان هەیە، چ لەنێو تورکیاو چ لە دەرەوەی تورکیاشدا و هەڵبەتە ئەوانیش ئێستا دابەشبوونە بۆچەند ڕەوت و گرووپێك.






---

١- بڕوانە: (كليات رسائل النور)، (٩) (سيرة ذاتية) ص٢٠٦تا٢٠٩.

٢- ناشڵێم مامۆستا مەلا سەعید هیچ عوزرو پاساوێکی لەوبارەوە نیە، بەڵام پێم وایە دەبوو بابایەکی وەك ئەو زاناو پێشەوا بەرزە لەئاست ڕووداوێکی واو ڕووداوێکی وادا، بێدەنگ نەبووایەو هەڵوێستێکی هەر نواندبایە، واتە: ئەگەر قەناعەتی بەجووڵانەوەکەی شێخ سەعیدی پیرانیش نەبوو خۆی هەولێکی دیکەی دابایە.

## ١٨- شێخ ئەمجەدی زەهاویی (رحمة الله تعالى عليه):[١]

ناوی زنجیرەی باب و باپیرانی (شێخ ئەمجەد) بەم شێوەیەیە:

(شێخ ئەمجەد کوڕی شێخ موحەممەد (فَیْضي)، کوڕی شێخ موحەممەد سەعید، کوڕی مەلا ئەحمەد، کوڕی حەسەن بەگ، کوڕی ڕۆستەم بەگ، کوڕی کەیخوسرەو بەگ، کوڕی ئەمیر بابا سولەیمان، کوڕی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەیی پشدەریی)یە.[٢]

شێخ ئەمجەد لەساڵی (١٣٠٠)ك، (١٨٨٣)ز لەشاری بەغداد لەدایك بووە، لەخێزانێکی بەڕێزو ناوداری ئەهلی زانست، چونکە هەرکام لەبابی (شێخ محمد سعید)و باپیری (شێخ محمد فيضي) هەتا کۆچی دواییان کردوە (مُفتي)بەغداد بوون.

وە لەڕۆژی (١٤)ی شەعبانی (١٣٨٧)ك بەرانبەر (١٩٦٨)ز دا هەر لەبەغداد کۆچی دوایی کردوە.

شایانی باسیشە کە دیار نیە کەی بنەماڵەی شێخ ئەمجەد لەگوندی (دارە شمانە)[٣]ی پشدەرەوە کەنشینگەی (فەقێ ئەحمەد)[٤] بووە، بەرەو سلێمانی هاتوون، بەڵام هۆکاری پەیدابوونی شۆرەتی (زەهاویی) بۆ ئەو بنەماڵەیە لەحاڵێك دا کە لەئەسڵ دا دارەشمانەییو پشدەریو پاشان سلێمانەیی بوون، ئەوە بووە کە (حەسەن بەگ)ی باپیری (موحەممەد فیضي) لەئەنجامی کێشەیەك دا کە لەگەڵ حاکمی بابانیەکان کەوتۆتە نێوانیانەوە، بەشێوەیەکی کاتی (مؤقت) کۆچی کردوە بۆ (زەهاو)و ماوەیەك تێیدا ماوەتەوە.[٥]

---

١- بۆ هەرچی لێرەدا نووسیومە لەبارەی شێخ ئەمجەدەوە پشتم بەکتێبی (الإمام أمجد بن محمد سعيد الزهاوي: فقيه العراقين والعالم الإسلامي) بەستوە، کە نووسراوی: (كاظم أحمد ناصر المشايخي)یە.

٢- مامۆستا مەلا عومەر دیبەگەیی ئەم زانیارییەی لەخودی شێخ ئەمجەدەوە گێڕاوەتەوە.

٣- دێیەکە لەپشتی قەڵادزەوەو لەخوار گوندی (هەڵشۆ)وەو لەرۆژئاوای (هێرۆ)وە.

٤- هەرکام لە بابانییەکانی سلێمانیو میراودەلییەکانی پشدەر خۆیان بەنەوەی (فەقێ ئەحمەد) دەزانن و رەچەڵەکی خۆیان دەبەنەوە سەر وی، بەم پێیەش بێ بەندەو مامۆستا شێخ ئەمجەدیش پشتێکین! ڕەچەڵەکی بەندەش ئاوایە: عەلی کوڕی باپیر کوڕی ماماغا کوڕی وەتمان کوڕی ئەحمەد کوڕی حەمەداغا کوڕی میراودەل ... کوڕی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەیی.

٥- هۆی کۆچکردنیان بۆ زەهاو – کە شارە دێیەکە عایدی کرماشانە- و هەڵبژاردنی، ئەوە بووە کە دایکی (محمد فيضى)– واتە هاوسەری میر أحمد یان مەلا أحمد- خەڵکی زەهاو بووە.

جا ئێمە خوا یاربێ لە دوو خاڵی سەرەکیدا باسی هەڵوێست و رەفتارە جوامێرانەو پرشنگدارەکانی شێخ ئەمجەد دەکەین، لە یەکەمیان دا خەسڵەتە بەرزو پەسەندەکانی دەخەینە روو کە (تقوی و زهد ورع و تواضع و حیاء و سماحة)ی ئەو پیاوە بەرزەیان تێدا دەردەکەوێ، چەند وردە بەسەرهاتێکی لێ دەگێڕینەوە، وە لەدووەمیان دا چەند هەڵوێستێکی سەربەرزانەی تۆمار دەکەین:

## یەکەم: رەوشت و خەسڵەتە بەرزو پەسەندەکانی شێخ ئەمجەدی زەهاویی:

### ١- خواردن و خۆراکی:

شێخ ئەمجەد (رەحمەتی خوای لێبێ) لە مەسەلەی خواردن و خواردنەوەدا هەم زۆر سادەخۆرو بەقەناعەت بوو، وە هەم زۆر وردبین بوو و بەجیددی لەحەڵاڵ و حەرام دەخەفتا، بۆ وێنە:

أ- (نهال)ی کچی دەگێڕێتەوە کە لەهەر زەویو زارێك دا شەریکی ببوایە لەبەرهەم و بەروبوومەکەی نەدەخوارد، نە وەك هەقی شەریکەکەی بکەوێتە لا.[١]

ب- شێخ (علي طنطاوي)یش کە رەفیقی سەفەری بووە بۆ هیندستان و لەبەر کێشەی (فلسطین) چووبوون، دەڵێ: دوو مانگمان پێچوو تەنیا نان و چایی دەخوارد هەتا نەخۆش کەوت.[٢]

ج- هەروەها (نهال) خانی کچی گێڕاویەتەوە کە کاتێك عەشایەر دەعوەتیان دەکرد زۆر نارەحەت دەبوو کە ئەزیەتیان دەکێشاو خواردنیان بۆ ساز دەکردو پێی دەگوتن: ئێمە پێویستیمان بەو خواردنە نیە، بەڵکو تەنیا ئەوەمان لێتان دەوێ کە گوێمان لێبگرن و ئەوەی بۆتان باس دەکەین لێمان وەربگرن و جێبەجێی بکەن.[٣]

---

١- بروانە: (الأمام أمجد بن محمد سعيد الزهاوي..)ص١١٩.

٢- هەمان سەرچاوە، ص ١٢٠.

٣ -هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

## ٢- وەرع و خۆپاراستنی لەحەرام:[١]

أ- لەکاتێك دا شێخ ئەمجەد خانووەکەی لە (أعظمیة) دروست دەکات گوێی لەیەکێك لەکرێکارەکان دەبێ وشەیەکی کوفر (کفر)ی بەزاردا دێ، ئەویش بانگی دەکات و کرێیەکەی بەتەواوی دەداتێو ئیزنی دەدات، پاشان فەرمان دەکات کە هەرچی ئەو کرێکارە دروستی کردوە بروخێنرێو کرێکارێکی دیکە دێنێ!

ب- شێخ ئەمجەد خانوویەك بەکرێ دەگرێو تێیدا نیشتەجێ دەبێ، خانووەکە درەختێکی خورمای تێدا دەبێ، جا کاتێك وەختی چنینی دێ بۆی دەچنێو بۆی دەخاتە گونیانەوەو بەحەمباڵێك دا بۆی دەبات و، پێی دەڵێ: کاکە گیان ئەم خورمایەم لە درەختی خورمای نێو خانووەکەت چنیوە، جا لەبەر ئەوەی لە عەقد(عَقْد)ی بەکرێگرتنەکەدا دار خورمایەکە باس نەکراوە، ئەوە موڵکی تۆیە!

ج-ساڵێکیان شێخ ئەمجەدو (أستاذ محمد محمود صواف) دەنێررێنە هەولێر بۆ بەسەرەوە گەڕان و پشکنینی مزگەوتەکانیو، پاش جێبەجێکردنی کارەکەیان شەوێك لەهاوینە هەواری (صلاح الدین) دەمێننەوە، جا کاتێك دەگەڕێنەوە هەولێر شێخ ئەمجەد لەبەرپرسی ئەوقافی هەولێر دەپرسێ: کەئایا کرێی سەیارە لە هەولێرەوە بۆ ئەوێ چەندە؟! تاکو خۆی بیدات، چونکە چوون بۆ هاوینە هەواری (صلاح الدین) ناکەوێتە جوغزی ئەرکەکەیانەوە! سەرەنجام لەسەر ئەوە مشت ومڕیان دەبێو، بەوە کۆتایی دێ کە (محمد صادق المختار) کە یەکێك بووە لەقوتابیەکانی شێخ کرێیەکە دەدات!

د- جارێکیان پیاوێك دەچێتە لای شێخ لەفەرمانگەکەی خۆیو داوای لێدەکات کەنامەیەکی بۆ کەسێك بۆ بنووسێ تاکو کارەکەی ئاسان بێت! شێخیش قاقەزی لەلا نابێ، بۆیە فلسێکی دەداتێو دەڵێ: بچۆ پەڕە قاقەزێك بکڕە، کابراش دەڵێ: ئەی شێخ ئەوە قاقەزی سپیە لەبەردەمت! ئەویش دەڵێ: ڕۆڵە گیان ئەمە ماڵی دەوڵەتەو هی من نیە! بۆیە کابرا دەچێ قاقەزێك دەکڕێو بۆی دەهێنێو ئنجا نامەکەی بۆ دەنووسێو دەڕوات.[٢]

---

١- هەمان سەرچاوە، ص١٢٢، وە١٢٣، وە ١٢٥.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ص١٢٥،١٢٦.

٣- پابەندیی بەشەرع و سوننەتەوەو گوێ نەدان بەڕەخنەو گلەیی ئەم و ئەو:

أ- كاتێك شاعیری ناسراو (جميل صدقي الزهاوي) كە مامی بوو مرد، مەلیك داوای لێكرد كە نوێژی لەسەر بكات، بەڵام شێخ ئەمجەد چونكە گومانی هەبوو لەئیمانی مامیدا، رازی نەبوو نوێژی لەسەر بكات، جا كاتێك پاش بەڕێكردنی تەرمەكەی گەڕایەوە ماڵ و ئامۆژنی بەگلەیییەوە پێی گوت: بۆچی نوێژت لەسەر نەكرد! خۆ لەچەند مانگی دوا دوای تەمەنیدا داوای لێبوردن (إستغفار) پاڕانەوەو نوێژ هەبوو؟! پێی گوت: ئەگەر پێشتر ئەمەم زانیبایە نوێژم لەسەری دەكرد.[1]

ب- كاتێك (شيخ إبراهيم الأيوبي) بەنوێنەری كۆمەڵەی (الشبّان المسلمين) دەچێتە لای شێخ ئەمجەدو ئەویش سەرگەرمی دەرس گوتنەوەی شەرع (فقه) دەبێ لەقوتابخانەی (السليمانية)داو عادەتی شێخیش وابووە بۆ هیچ كەس دەرسی نەبڕیوە، جا دیارە (الشيخ الأيوبي)یش بەپەلە بووە، بۆیە پاش مۆڵەت وەرگرتن دەڵێ: كوڕەكە چاوەڕێی تۆن و زانایان و وەزیرەكانیش هاتوون و بەدوای جەنابت دا ناردوویانم كە وتەیەكیان بۆ بفەرمووی! بەڵام شێخ ئەمجەد هەر بەردەوام دەبێ لەسەر دەرسەكەی بۆیە (الأيوبي)یش بەجەخت كردنەوە قسەكەی دووپات دەكاتەوە، شێخ ئەمجەدیش تێیەوە دەخوڕێ‌و دەڵێ: (أتريدني أنْ أتْركَ فَرْضاً وأحْضُر بِدْعةً؟!!) دەتەوێ فەرزێك واز لێبهێنم و ئامادەی بیدعەتێك بم؟!!

دیارە ئاهەنگەكەش بەبۆنەی چل ڕۆژ تێپەڕین بەسەر كۆچی دوایی (محمد اقبال)ی شاعیری ناودار دا بووە.[2]



١- هەمان سەرچاوە، ص١١٦.

٢- هەمان سەرچاوە، ص ١٢٦،١٢٧.

٤- لەبەر رۆچوون لەبیرکردنەوەو زیکردا ئافرەتانی رووتی نەدیتوون و قسەی جنێوو ناشیرینی نەبیستوون، یان خوا نەیهێشتوە ببینێو بیبیستێ؟![1]

أ- (الشيخ فوأد الألوسي) (خوا لێی خۆش بێ) گێڕاویەتەوە کە جارێکیان بۆ کارێکی ئیسلامیی لەگەڵ شێخ ئەمجەد زەهاویدا دەچنە میصرو سەردانی شاری (الأسكندرية)ش دەکەن، جا لەکاتی تێپەڕین بەو شەقامەدا کە لەئاقار دەریا(کورنیش)یە، کە بەدرێژایی کەنارەکانی شوێنی مەلەوانی (مسبح)تێدا سازکراوە، ئافرەتانی بێشەرم بەپۆشاکی مەلەکردنەوە دەبینن و، شێخ فوئاد زوو زوو (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)و (لاحول ولاقوة إلا بالله العلي العظيم) دەڵێ! جا دوای گەیشتنیان بەمەبەست و پشوودان، شێخ فوئاد بەشێخ ئەمجەد دەڵێ: ئەو دیمەنە پرش شەرمەزارییانەت بینی لەوڵاتێکی مسوڵمان دا؟!

شێخ ئەمجەدیش دەڵێ: ئەفەندی مەبەستت چیە؟!

شێخ فوئادیش دەڵێ: ئەو ژنە نیمچە رووتانەی کە لەشەقامەکەدا بەلایان دا تێپەڕین!

شێخ ئەمجەدیش دەڵێ: ئەفەندی بەخوا هیچم نەبینی!

ئنجا بێگومان ئەو نەدیتنەی شێخ ئەمجەد چ لەبەر زیکرو فیکرو رۆچوون و رامان بووبێو، چ لەبەر نەهێشتنی خوای بەخشندە بووبێ، وەك کەرامەت، هەر چۆن بێ بەرزیو گەورەیی ئیمان و مسوڵمانەتی ئەو کەڵە زانایە دەگەیەنێ.

ب- جارێکیان شێخ ئەمجەد لەکاتێك دا کە دەرس بە (الشيخ عبدالقادر الخطيب)و (الشيخ الآلوسي) دەڵێ لە قوتابخانەی (السليمانية)ی بەغداددا، کت وپڕ پیاوێك دێتە ژوورێو بەدەنگی بەرزو قسەی ناجۆرو ناشیرین شێخ ئەمجەد دەدوێنێو تۆمەتباری دەکات بەچەند شتێك، بەڵام شێخ ئەمجەد چ بەسەرخۆی ناهێنێو شلوێ نابێ، (شیخ فوئاد)و (شیخ ئالوسی)یش دەیانەوێ بۆی هەڵسن و سزای بدەن، بەڵام لەشەرم و رێزو سامی شێخ ئەمجەد هیچ ناڵێن و هیچ ناکەن! ئیدی کابراش پاش تەواوکردنی جنێوو قسە سووکەکانی دەڕوات و شێخ ئەمجەدیش بەوشەیەکیش وەڵامی ناداتەوە.

---

١- هەمان سەرچاوە، ص ١٢٠تا١٢٢.

دوای چەند ڕۆژێك دیسان كابرا پەیدا دەبێتەوەو (فوآد)و (آلوسي) پەنا بەخوا دەگرن نەبادا دەست پێبكاتەوە. بەڵام هەرهێندە دەزانن كابرا دەست دەكات بەداوای لێبوردن كردن و چاوپۆشیكردن! شێخیش پێی دەڵێ: ئەوە چییە بۆچی داوای لێبوردن دەكەی؟!

ئەویش دەڵێ: چەند ڕۆژێك لەمەوبەر بێئەدەبییم بەرانبەرت كردو ئێستاش بۆم دەركەوتوە كەهەڵەم و زوڵمم لێكردووی!

شێخیش دەڵێ: بەخوا كوڕم ئەوەی باسی دەكەی نایەتە یادم، خوا بتبەخشێ! دیارە (فوآد)و (آلوسي) لەقسەی شێخ سەرسام دەبن، كەئایا كاتی خۆی چاوپۆشییو هێمنیی (حلم)نواندوەو ئێستا لەبیری چۆتەوە! یان هەر خوا گوێی لەبیستنی قسە ناجۆرەكان پاراستوە وەك چۆن لەئەسكەندەرییە چاوی لەدیتن پاراست؟!

## ٥- شەرم و شكۆو ئەدەب و ڕێزی:[١]

أ- (نهال) خانی كچی دەگێڕێتەوە كە شێخ ئەمجەدی بابی یەكجار بەشەرم و شكۆ بووەو، جارێكیان پیاوێك ئازار لەئەژنۆیدا دەبێو كەئەژنۆی هەڵدەكات و دەردەكەوێ شێخ لەشەرمان ڕووی وەردەسوڕێنێ بۆ ئەوەی نەیبینێ!

ب- جارێكیان شێخ ئەمجەد دوو پیاو دەبینێ دەمەقاڵێیانەو یەكێكیان جنێو بەوی دیكەیان دەدات، شێخیش لێیان دەچێتە پێش و پێیان دەڵێ: جنێو بەیەكتر مەڵێن چونكە دادگا (محكمة)یەك هەیە! ئیدی كە دوو پیاوەكە قسەكەی شێخ دەبیستن تەریق دەبنەوەو دەڕۆن!



١- سەرچاوەی پێشوو، ص١٢٩.

٦- **شێخ ئەمجەد ناوی خەڵکی لەبیرچۆتەوە، بۆ ئەوەی تووشی غەیبەت نەبێ:**[١]

یەکێکی دیکە لەخەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی شێخ ئەمجەد کەپێم وایە تایبەتە بەخۆیەوە، ئەوەیە کە لەگەڵ هێزی زۆرو سەرسوڕهێنەری (حافظة و ذاکرة)ی ناوی خەڵکی زوو لەبیرچۆتەوەو تەنانەت هی ئەوانەش کە زۆر لێیەوە نیزیك بوون و لەوبارەوە شتی سەیر سەیری لێدەگێڕنەوە.

ڕۆژێکیان لەوبارەوە پرسیاری لێدەکرێ کەبۆچی وایە ؟!

ئەویش دەڵێ: لەسەرەتای تەمەنمەوە ئەو ئایەت و فەرموودانەم خوێندنەوە کەدەربارەی غەیبەت هاتوون، جامنیش بۆ ئەوەی نەتوانم غەیبەتی کەس بکەم، لەخوا پاڕامەوە کە ناوی کەسان (أشخاص)م لەبیر بەرێتەوە!

وە شێخ ئەمجەد ڕێی بەهیچ کەس نەدەدا کە لەکۆڕو مەجلیسی ویدا باس و غەیبەتی یەکێکی دیکە بکات و یەکسەر قسەکەی پێدەگۆڕی.

٧- **هاوکاریکردنی خەڵك و تکا بۆ کردنیان و ئیش و کار بۆ ڕاپەڕاندنیان:**[٢]

شێخ ئەمجەد بۆ دەستبار بۆ گرتنی خەڵك و هاوکاریکردنیان لەکاروباری شەرعییو ڕەوادا بەهیچ جۆرێك دریغی نەدەکرد، بۆیە گەلێك کەس پەنای بۆ دەهێنا کەلەلای بەرپرسانی حکومەت تکا (شفاعة)یان بۆ بکات، بەتایبەت زۆر بەدەم زانایانی کورد (علماء الکرد)ەوە دەچوو کە لەئەوقاف و شوێنەکانی دیکە کاروباریان بۆ ڕاپەڕێنێ.

أ- مامۆستا مەلا عومەری دیبەگەیی کە دۆستێکی نیزیکی شێخ بووە گێڕاویەتەوە دەڵێ: لەبیرمە جارێکیان شێخ ئەمجەد لەگەڵ کۆمەڵێك زانای کورددا چوو بۆ لای بەڕێوەبەری ئەوقاف (أحمد زکي المدرس)و ئەویش داواکارییەکەی جێبەجێکرد، ئنجا پاش سێ ڕۆژی دیکە دەستەیەکی دیکەی زانایان هاتن و داوایان کرد واسطەیان بێت، منیش نارەحەت بووم و بەشێخ ئەمجەدم گوت: ئەی شێخ دەتوانی قاقەزێکیان بۆ بنووسیو خۆت نەچی، چونکە سێ ڕۆژ لەمەوبەر چوویە لای! ئەویش بێدەنگ بوو،

---

١- هەمان سەرچاوە، ص ١٢٩، ١٣٠.

٢- هەمان سەرچاوە، ص ١٣٠.

دوایی وتی: ئەوان پێیان وایە ئەگەر لەگەڵیان نەچم گرفتەکەیان حەل نابێ‌و، وەپێیان وایە پشتیوانی‌یان ناکەم، بۆیە رازی بوون و نەبوونی بەڕێوەبەر (مُدیر)م بەلاوە گرنگ نیەو دەبێ هەر بچم و دڵیان خۆش بکەم!

ب- جارێکیان یەکێك لە برایەکانی شێخ ئەمجەد تەکلیفی لێ‌دەکات کە لەگەڵی بچێ بۆ لای بەرپرسی فەرمانگەیەك کە لەوێ بەکارمەند (موظف) دابمەزرێ، شێخیش لەگەڵی دەچێ‌و کە دەچنە لای سەرۆکی فەرمانگە (رئیس الدائرة)ەکە بەچاکترین شێوازو پێشوازیی لێ‌دەکات و بەخێری دەهێنێ‌و دەڵێ: فەرموو مامۆستای بەڕێزمان فەرمان بکە! ئەویش پێی دەڵێ کە هاوکاری برایەکەی بکات بۆ دامەزران و لەو فەرمانگەیەداو، کابراش دەڵێ لەخزمەتین و خوایاربێ جێبەجێ دەبێ، ئنجا شێخ سوپاسی دەکات و لەکاتی چوونە دەرەوەدا پێی دەڵێ: هیوادارم هاوکاری‌و یارمەتی‌یەکەت لەچوارچێوەی هەق دابێ‌و، ئەگەر یەکێکی دیکەی لەو شایستەترو چاکتر هەبوو برایەکەمی پێش مەخە!

## دووەم: هەڵوێستە پرشنگدارەکانی شێخ ئەمجەد زەهاوی:

### ١- یەکێك لەهەڵوێستە بوێرەکانی شێخ ئەمجەد لەسەردەمی پارێزەر(محامی)ایەتی‌دا:[١]

لەساڵی (١٩٢٤)ز دا خوشك و برایەك بەناوی (بی‌بی و جواد کاب)بۆ وەرگرتنەوەی ئەو خانووەیان کەکۆمەڵی بەهائی‌یەکان (الطائفة البهائیة) لێیانیان زەوت کردبوون و کردبوویان بەڕووگەی خۆیان، بەبیانووی‌ئەوەی کەکاتی خۆی (بهاء الله) کە بەپێغەمبەری خۆیانی دەزانن تێیدا نیشتەجێ بووە. سکاڵانامە (عریضة)یەك دەدەنە دادگای (بِداءة)ی بەغدادو بەڵگەنامەکانی خۆیانیش دەدەنە دەست (قاضي)و ئەویش کەدڵنیا دەبێ مولکی جەوادو خوشکەکەیەتی (١١/٢٣) بەقازانجی ئەوان حوکم دەردەکات.

ئیدی بەهائی‌یەکان کێچیان دەکەوێتە کەوڵ و لێشاوێکی برووسکەی ناڕەزایی دەربڕین لەسەرتاسەری ئەوروپاو ئەمریکاوە بۆ(المندوب السامي البریطاني) رەوانە دەکەن، کە (السیر بیرسی کوکس) بووە لەبەغدادو داوا دەکەن کە حکومەتی بەریتانیا

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ص١٥١،١٥٢.

بەقازانجی بەهائیەکان دەخالەت بکات و ئەویش قسە لەگەڵ مەلیك دا دەکات و مەلیکیش بەڵێنی پێدەدات و، بۆ ڕۆژی دوایی فەرمان دەکات کە خانووەکە چۆڵ بکرێو کلیلەکانی تەسلیمی حکوومەت بکرێن.

دیارە خوشك و برایە کە شیعە دەبن، بۆیە زانایانی شیعە دەست دەکەن بەناڕەزایی دەربڕین و(الحاجّ محمد جعفر التمَّن) بەنوێنەرایەتی خۆیان دەنێرنە لای مەلیك فەیسەڵی یەکەم کە لەوبارەوە بیدوێنێو داوای لێبکات خانووەکە بگێڕێنەوە بۆ خاوەنەکانی! دیارە مەلیك دەکەوێتە نێوان دوو بەرداشەوە، لەلایەك فشاری بەریطانیاو بەهائیەکان و، لەلایەکی دیکەشەوە گوشاری خەڵك و میللەت و لەپێشیانەوەش زانایانی ئیسلام.

وە سەرەنجام کێشەکە دەبێتە کێشەیەکی ئایینی سیاسی ئاڵۆز، جا کاتێك شێخ ئەمجەد- کە ئەوسا پارێزەر (مُحامي)بووە- دەبینێ هیچ کام لەپارێزەرەکان ناوێرن بەرگری لەخاوەن خانووەکە بکەن، لەترسی بەریطانیاو بەهائیەکان و (الملك فیصل الاول)، غیرەتی ئیماندارانەی دەجۆشێو بەرگریی لێکردنی خاوەن خانووەکان- جەوادو خوشکەکەی- وە ئەستۆ دەگرێو سەرەنجام لە(١٩٢٤/٦/٨)ز دا، شێخ ئەمجەد بوێرانە بەرگریی (دفاع)یەکی وردو بەڵگەدارو ڕاشکاو لە خاوەنداریێتی (مالکیة) جەوادو خوشکەکەی بۆ خانووی گۆڕین دەکات و، دەعوایەکە دەباتەوەو خانووەکە بۆ خاوەنە شەرعییەکانی دەگێڕێتەوە.

### ٢- شێخ ئەمجەد ئامادە نابێ ببێتە موفتی عێراق:[1]

پاش کۆچی دوایی موفتی عێراق (الشیخ قاسم القیسي)خەڵکی هەموو چاو دەبڕنە شێخ ئەمجەد کە ئەرکی فەتوادان (مَنْصِبِ الإفتاء) بەئەستۆوە بگرێ، بۆیە هەرکام لە (عبدالرحمن خضر و محمد محمود صواف و شفیق العاني) دەچنە لایو تەکلیفی لێدەکەن کە ئەوکارە بەئەستۆوە بگرێ، بەڵام پێیان دەڵێ:



١- سەرچاوەی پێشوو، ص١٤٦.

(ما قيمةُ هذا المَنْصِبِ والدولةُ عَلْمانية؟! إذا قَبِلْتُ هذا المَنْصِبَ وَجَبَ عَلَيَّ أَنْ أُفْتي بِكُفرِ هذه الحكومةِ). واته: له حالێك دا كه دهوڵهت عهلمانىيه ئهو پلهوپايهيه چ نرخێكى ههيه؟! ئهگهر ئهو ئهركه بهئهستۆوه بگرم پێويسته فهتوا بدهم بهكوفرى ئهم رژێمه!

**٣- شێخ ئهمجهد لهسهر زانايانى بوێرو خهباتگێر، وه دهنگ دێ:**

أ- بۆ وێنه: لهكاتێك دا كهلهسهردهمى حوكمى (عبدالكريم قاسم)دا ههردووك زاناى پايه بهرز (الشيخ عبدالعزيز البدري) و (الشيخ محمد مهدي الخالصي) دهگيرێن، شێخ ئهمجهد ديدارێك لهگهڵ (عبدالكريم)دا دهكات و دهورى سێ سهعات و شتێك قسهى لهگهڵ دهكات و ههردووك زاناى تێكۆشهر دهست بهجێ بهردهدات.[1]

ب- ههروهها لهكاتيك دا - لهساڵى (١٩٥٣)ز دا، كه رژێمى عهلمانى پاكستان حوكمى لهسێدارهدانى زاناى گهوره (أبو الاعلى المودودي)ئهميرى كۆمهڵيى ئيسلاميى پاكستان (الجماعة الإسلامية فى الپاكستان) دهردهكات، شێخ ئهمجهد كه ئهوكاته سهرۆكى كۆمهڵهى برايهتى ئيسلاميى (جمعية الأخوة الإسلامية) بووه، دهستبهجێ بروسكه دهكات بۆ ههركام له دادوهرى گشتى (الحاكم العام)و سهرۆك وهزيران (رئيس الوزراء)و بهتهلهفۆنيش (الأستاذ محمد محمود صواف) بانگ دهكات- كهلهشام بووه-، بۆ عێراق تاكو لهوبارهوه تهگبيرێك بكهن.

**٤- شێخ ئهمجهد فهتوايهكى گرنگ و سهير لهبارهى كاروبانگهوازى ئيسلامىيهوه دهدات:**

لهوبارهوه گوتويهتى:[2] (لَوْ أن كُنْتُ قاضياً، وأتاني شاهدٌ، وعَلِمتُ أنه يقْطَعُ الليلَ والنهَّار بالعبادةِ ولا يَعْمَلُ للإسْلامِ أعدُّهُ فاسِقاً وأرُدُّ شهادَتَهُ)، واته: ئهگهر بێت و من قاضى بم و شايهدێك بێته لام و بشزانم كه شهوو رۆژ بهخواپهرستى دهباته سهرێ، بهڵام كار بۆ ئيسلام ناكات! ئهوه بهفاسقى دادهنێم و شايهدىيهكهى رهد دهكهمهوه!

---

١ -ههمان سهرچاوه، ص٢١٠، ٢١١.

٢- ههمان سهرچاوه، ص٢١٩.

**٥- شێخ ئەمجەدو تەقەللاكانی بۆ بەربەست كردنی بەرەو عەلمانیەت بردنی فێركردن:**[١]

هەر لەوكاتەوە كە مەلیك فەیصەڵی یەكەم بەپێی نەخشەیەكی بۆ داڕێژراو (ساطِعُ الحُصَري) كردە بەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی زانستیەكان (المدير العام لوزارة المعارف)، شێخ ئەمجەد دەستی كرد بەهەوڵ و تەقەللا بۆ لادانیو دوورخستنەوەی، چونكە دەیزانی چ توخمێكی پیسەو چۆن كاتی خۆی خەڵكی دیمەشق خۆپێشاندانیان لەدژی كردوەو هاواریان كردوە: (لا إله إلا الله، ساطِعٌ عَدوُّ الله)!

جا شێخ ئەمجەدو زانایانی دیكەی ئیسلام كە زانیویانە ئەو كابرایە بەنەخشەو پیلانی ئینگلیز دەیەوێ خوێندن و پەروەردەو فێركردن بەرەو سیكۆلاریزم و بێدینی بەرێ، چەند هەوڵێكیان دا بۆ لادان و نەهێشتنی لەسەر ئەو كارەو، هەم شێخ ئەمجەد خۆی دوو جاران مەلیكی بینیوەو داوای لێكردوەو ئەویش بەڵێن و گفتی پێداوە كە لای بدات، وەهەم زانایانیش بەكۆمەڵ دوو جاران مەلیكیان بینیوەو، جاری یەكەم گفتی پێداون، بەڵام جاری دووەم بەڕاشكاویی پێی گوتوون كە: (إنَّ الانكليز مُصِرُّونَ على بَقاءِ ساطعٍ في مَنْصِبهِ في الوزارة) واتە: ئینگلیز سوورن لەسەر مانەوەی (ساطع) لەپلەوپایەی خۆیدا لەوەزارەت!

دیسان جارێكی دیكەش لە رۆژگاری (نوری سعید)دا شێخ ئەمجەد هەندێك لە زانایان كۆدەكاتەوە كە تەگبیرێكی ئەو وەزارەتە بكەن و، سەرەتا دەچنە لای وەزیری مەعاریف (خليل كنَّة)و شێخ بەڕاشكاویی قسەی لەگەڵ دەكات و ئەویش هەر بەڕاشكاویی وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: (نحنُ دَوْلَةٌ عَلمانية، فإذا أَردْتَ إِجْراءَ تَغْييرٍ عليكم بالسُلطاتِ العُليا)، شێخیش دەڵێ: جا ئەو دەستەڵاتە كێیە؟ دەڵێ: سەرۆك وەزیران (نوری پاشا)، ئینجا دەچنە لای ئەویش و دەیدوێنن و ئەویش حەواڵەی (الوصي على العرش: عبد الاله)یان دەكات و شێخ ئەویش دەدوێنێ، (وصي)یش لە وەڵام دا دەڵێ:

---

١- هەمان سەرچاوە، ص١٧٩تا١٨١.

(إن التعليم في بلادِنا هو بموجَب خِطَّةٍ مَدْروسةٍ) واتە: فێرکردن لەوڵاتانی ئێمەدا بەگوێرەی نەخشەیەکی داڕێژراوە، شێخیش دەڵێ: ئاخر کێ ئەو نەخشەیەی داناوە تاکو رووبەڕووی ببینەوەو گفتوگۆی لەگەڵ بکەین؟!!

### ٦- شێخ ئەمجەدو کێشەی فەلەسطین:[١]

مامۆستا مەلا ئەمجەدی زەهاویی ئەهمیەت و بایەخێکی تایبەتی بەکێشەی فەلەسطین (القضية الفلسطينية)داوەو لە هەموو ئەو کۆنگرە (مُؤْتَمَر)انەدا کە بۆ ئەو مەبەستە بەستراون، بەشداربووەو چی لەدەست هاتبێ ئەنجامی داوە، کە دەتوانین لەنێو هەوڵ و هەنگاوەکانیدا ئەمانە بەنموونە بهێنینەوە:

أ- لەساڵی (١٩٤٨)ز دا بۆ یەکەمین جار سەفەری میصری کرد بۆئەوەی ناوی (الجامعة العربية) بگۆڕێ بۆ (الجامعة الإسلامية)، تاکو کێشەی فەلەسطین گشتگیرترو هەمەلایەنەتر بێت و بەرگرییکردن لە گەل و خاکی فەلەسطین لەدڵ و دەروونەوە هەڵبقوڵێو هاندەرو پاڵنەرێکی عەقیدەیی هەبێو سەرجەم مسوڵمانان تێیدا بەشداربن، نەك لەجوغزی نەتەوەی عەرەب دا کورت هەڵبێو تەنیا هاندەرێکی عاطیفی هەبێ! بەلام بێگومان هەوڵ و تەقەللای شێخ ئەمجەد بێ سوودو ئاکام بوو و عەرەبەکان لێیان نەبیست، بەبیانووی ئەوەی کە لەچەند شوێنێکی وەك (لبنان)و (جزائر) خەڵکی نەصرانی هەن!

جا هەرچەندە شێخ ئەمجەد لەکاتی گفتوگۆی لەگەڵ (عبدالرحمن عزام) سەرۆکی ئەوسای (الجامعة العربية)دا ئەو بیانووەی بڕین بە بەڵگەی ئەوە کە (یهود و نصاری) لەنیوەدورگەی عەرەبیو شوێنی دیکەش دا هەبوون و لەگەڵ کیان و قەوارەی ئیسلامییش دا هیچ گرفت و کێشەیەکیان نەبووەو بەختەوەرانە لەژێر سایەی حوکمی ئیسلامییدا ژیاون! بەلام کاك (عبدالرحمن عزام)! نەیبیست و هەموو بەڵگەکەشی ئەوەبوو کە: (إنَّنا مُقَيَّدون بنظام الجامعة العربية ولايمكن الخروج عليه) ئێمە پابەندین بەپرۆگرامی (الجامعة العربية)وەو ناکرێ لێی دەربچین!

---

١ –سەرچاوەی پێشوو، ص ٢١٧تا ٢٢٠.

دیاره هەر بۆیەش ئێستاشی لەگەڵ بێ (عەرەبەکان)وەك (عارەبانە) هەر بەدوای جولەکەوەن و ئاسنی سارد دەکوتن و ئاوێ لەئاشێ دەکەن!

ب- سەفەری دووەمیشی لەوپێناوەدا بۆ (دمشق)و (قاهرە)و (قدس) بوو لەو کۆنگرە ئیسلامیی (المؤتمر الاسلامي)یەدا کە لەقودس داو لەپێناو کێشەی فەلەسطین دا بەسترا ئامادەبوو، وە بەسەرۆکی کۆنگرەکەش هەڵبژێررا.

ت- وە مامۆستا ئەمجەد زەهاوی لەگەڵ یەکەمین پۆلە موجاهیدی عێراق دا چۆتە فەلەسطین و سەردانی هێڵەکانی پێشەوەی جەنگی کردوە، لەساڵی (١٩٤٨)دا.

ث- سێیەمین سەفەریشی دوای ئەوەبوو کە کۆنگرەی ئیسلامیی کە لەقودس بەسترا بڕیاریدا ببێتە سەرۆکی کۆنگرەی ئیسلامیی و، بەسەرۆکایەتی وەفدێك سەردانی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئاسیا (بلاد شرق آسیا)ی کرد، بەمەبەستی هاندانی خەڵکی مسوڵمان بۆ هاوکاریو پشتگیریی خەڵکی مسوڵمانی فەلەسطین، وە لەو سەفەرەیدا هەرکام لە: (الأستاذ محمد محمود الصواف و د.أمین المصري و الشیخ الورتلاني و الشیخ محمد بشیر الإبراهیمي و الشیخ علي طنطاوي) لەگەڵ بوون، بەڵام دوایی بەس (شیخ علی طنطاوي) لەگەڵ بەردەوام بوو و سەردانی (پاکستان)و (هند)و (أندونیسیا)و (مالیزیا)یان کردو سەفەرەکەیان دەوری (٧)مانگ درێژەی کێشا.

### ٧- شێخ ئەمجەدو پێکهێنانی کۆمەڵەو دەزگا ئیسلامییەکان:[١]

شێخ ئەمجەد دوای ئەوەی لەساڵی (١٩٤٦)ز دا لەخزمەتی بواری دادوەریی (المجال القضائي) خانەنشین (متقاعد) کرا، دەستی کرد بەدروست کردن و پێکهێنانی کۆمەڵ و دەزگا ئیسلامییەکان، وە لەنێوان ساڵانی (١٩٤٦-١٩٥٨)، ئەم کۆمەڵە (جمعیە) ئیسلامییانەی بەهاوکاری زانایانی دیکەو قوتابییەکانی پێك هێنا:

١- جمعیة الآداب الإسلامیة ١٩٤٦-١٩٤٨.

٢- جمعیة إنقاذ فلسطین ١٩٤٨.

٣- جمعیة التربیة الإسلامیة ١٩٤٩.

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ص١٨٨تا٢٠٥.

٤- جمعية الإخوة الإسلامية ١٩٥١.

٥- جمعية رابطة العلماء ١٩٥٣.

٦- اللجنة العليا لنصرة الجزائر ١٩٥٢.

وە بۆ خۆی سەرۆك و مشوورگێڕی سەرجەم ئەم كۆمەڵ و ڕێكخراوانە بوو.

ئاشكراشە كەهەركام لەو كۆمەڵ و دەزگایانە چەندان جۆرە كارو چالاكییان هەبووە، لەسەرجەم بوارو لایەنەكانی: زانستییە شەرعییەكان و فیكرو فەرهەنگ و بانگەوازو پەروەردەو ڕەوشت و كۆمەڵایەتیو جیهادییو سیاسیداو كاریگەرییەكی گەورەو گرنگیان لەسەر كۆمەڵگای عێراقیو دەرەوەی عێراقیش هەبووە، بۆ بێداریيو هۆشیاریی مسوڵمانان و بەرەو ئیسلام گێڕانەوەیان و بەرپەرچ دانەوەی بیرۆكەو ڕێچكە ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاواییەكان.[1]

هەزاران ڕەحمەتی خوای بەخشندەو بەخشەر برژێتە سەر گیانی جوامێرانەی مامۆستا مەلا ئەمجەدی زەهاوییو پلەوپایەی بەرزو بەرزتر بكاتەوە.





١- پێم وایە مامۆستا مەلا ئەمجەدی زەهاوی بەئەسڵ پشدەرییو دارەشمانەییش، بەرانبەر بەكێشەی ڕەوای كوردو چەوسێنرانەوەی و ماف پێشێل كرانیو خاك داگیركرانیو...هتد، كەمتەرخەم بووەو پێم سەیرە كە شتێكی ئەوتۆی لەوبارەوە لێنەگێڕاوەتەوە، لەحاڵێك دا كەزۆر بەكێشەی فەلەسطینەوە ماندوو بووەو كێشەی كوردیش لە كێشەی فەلەسطین كەمتر نیەو گەلی كوردیش ئەگەر لەگەلی فەلەسطین مسوڵمانتر نەبێ كەمتر نیە !!

## ١٩- پێشەوای شەهید حەسەنولبەننا (رحمة الله تعالى عليه):

(حسن بن أحمد بن عبدالرحمن البنا) لەساڵی(١٩٠٦)ی زایینیو لەگوندی (المحمودية)ی سەر بە (مديرية البحيرة)ی نیزیك لەشاری (الاسكندرية) لە (مصر) هاتۆتە دونیاوە، گەلێك لەزاناو لێکۆڵەرەوە هاوچەرخەکان بەیەکێك لەزاناو پێشەوا بلیمەت و هەڵکەوتووەکان و نوێکەرەوەیەکی ئایین (مجدد الدين)ی دادەنێن.

دامەزرێنەری (کۆمەڵی برایانی مسوڵمان) (جماعة الاخوان المسلمين)ە، کەکاریگەرییەکی گەورەی لەسەر خەملاندن و گەشەپێدانی هۆشیارییو هەستانەوەی ئیسلامیی هەبووە لەسەدەی چواردەیەمی کۆچیو بیستەمی زایینیدا.

وە لەساڵی (١٩٤٩)ز لە (شەوی ١٢/١٣ی شباط)، بەرانبەر بە (١٤)ی ربيع الثاني (١٣٦٨)ك دا، رژێمی ئەوسای میصر بەپادشایەتی (الملك فاروق)و بەدەست لەپشت دانی زلهێزەکانی وەك ئینگلیزو ئەمریکا، لەتەمەنی (٤٣) ساڵیداو لەنێوەڕاستی شاری (القاهرة)ی پایتەختی میصردا کوشتی، خوا بەشەهیدی وەرگرتبێ.[١]

شیاوی باسیشە کە (حَسَنُ البَنَّا) هەرچەندە تەمەنێکی کەمی بەسەر بردوە، بەڵام چەندان هەڵوێستی مەردانەو جوامێرانەی تۆمارکردوە، کە ئێمە ناتوانین لەم چەند لاپەڕەیەدا سەرژمێریان بکەین و وەك هی زاناو پێشەوایانی دی ناچارین گوڵبژێریکیان بکەین.

ئاشکرایە کە وەك چەندان جاری دیکەش گوتوومانە: هیچ کام لەزاناو پێشەوایان فریشتەی بێهەڵەو بەفری بێپەڵە نەبوون و نین و (حَسَنُ البَنَّا)ش کە لەچاو تەمەنی کەمیو ئاڵۆزو بڵۆزیی بارودۆخی سیاسی ئەوساکە، رەنگە زیاتر لەخەڵکی دی جووڵابێت، عەجایب و سەیر نیە کەپشکیشی لەهەڵەو کەم وکوڕییدا زیاتر بووبێو گوتراویشە: (مِنْ فَضائل الرجال أَنْ تُعَدَّ معايِبُهُمْ).

١ –بڕوانە: (من قتل حسن البنا؟!) محسن محمد، ص٥٤٤، وە بڕوانە: (لماذا أغتيل الإمام الشهيد: حسن البنا؟!) عبدالمتعال الجبري، ص٧تا١٦٩، وە بڕوانە: (مجموعة رسائل الإمام الشهيد: حسن البنا) ج١ ص٧تا١٥.

**یەك: بنیاتنانی كۆمەڵی برایانی مسوڵمان:**

بێگومـان یەكـەمین و گـرنگترین هەڵوێسـتی پرشـنگدارو جوامێرانـەی (حَسَـنُ البَنَّا)(رەحمەتی خوای لێبێ) ئەوەبوو كە لەساڵی (١٩٢٨)ز و لەتەمەنی (٢٢) ساڵیدا!! كۆمەڵی برایـانی مسـوڵمان (الأخـوان المسـلمین)ی دامەزرانـد، لـەمانگی ئـازاردا، بەرانبـەر مانگی (ذو القعدة)ی ساڵی (١٣٤٧)ك.

دیارە ئەو كارو هەڵوێستەی پێشەوای شەهید كارێكی گەورەو هەڵوێستێكی یـەكجار جوامێرانەو بوێرانەو پڕ بەپێستی كات و ڕۆژگار بوو، چونكە چوار ساڵ بوو كە (كمال أتـا تـورك) بەدەسیسـەو دەسـت لەپشـت دانـی زلهێزەكـان و جولەكـە زایۆنی‌یـەكان (الیهـود الصـهاینة) لەسـاڵی (١٩٢٤)ز دا، جـاڕی هەڵوەشـاندنەوەی خیلافـەتی ئیسـلامیی‌و دامەزراندنی كۆماری توركیای عەلمانی دابوو!

وە لەو سەرو حەدەدا مسوڵمانان بەگشتی هەستیان بەبێ سەرو سێبەریی‌و بێ‌پەناو پشتیوانیی دەكردو، لەبۆشایی‌یەكی گـەورەو سـامناكیی بێ‌كیـان و قەوارەیی‌دا قـەتیس مابوون و دەستیان لەهەموو پچكان بڕابوون!

بۆیـە دامەزرانـدن و پێكهێنـانی كۆمـەڵ و بزوتنەوەیـەكی ئیسـلامیی كەهێنانـەوەو گێڕانـەوەی حـوكم و كیـان و قـەوارەی ئیسـلامیی ئامـانجی سـەرەكی‌و كۆتـایی بـوو،... ئاسۆیەكی روون و هەنگاوێكی ئومێد بەخش بوو بۆ مسوڵمانان.

هەربۆیەش كۆمەڵی ناوبراو زۆر زوو گەشەی كردو لـەماوەی كـەمتر لـە (١٠) سـاڵ دا بوو بەپارسەنگێكی قورسی تا تـەرازووی موعادەلـە سیاسـی‌یەكان و، پـاش (٢٠) سـاڵیش بــەجۆرێك تــرس و بیمــی خســتە دڵــی دوژمــن و ناحــەزە خۆماڵی‌یــەكان و زلهێــزە جیهانی‌یەكان، كە هـەموویان لـەدژی بوەسـتن و بـۆ لـەنێوبردن و خەفـەكردنی دەسـتبار بۆیەكتر بگرن و بكەونە پیلان گێڕان و نەخشەدانان!

ئنجا بەپێویستی دەزانم تیشكێك بخەینە سـەر بەرنامـە (مـنهج)ی (حَسَـنُ البَنَّـا) كـە كردوویەتی بەبناغەی كارو چالاكی كۆمەڵ و بزوتنەوە ئیسلامیی‌یەكەی.

جا بێگومان ئەم بابەتە هەویرێكی ئاوخوازەو زۆری بەبەرەوەیە، بەڵام ئێمە لەچـەند بڕگەیەكی گوشراودا دەیخەینەڕوو:

### ١- گشتگیریی (الشمولیة) لە تێگەیشتنی ئیسلام و کار بۆکردنیدا:

(حَسَنُ البَنَّا) لەوبارەوە گوتوویەتی:[١]

ئەی براکەم گوێ بگرە! بانگەوازی ئێمە ئەگەر بەفراوانترین پێناسەی وەسفی بکەین ئەوەیە کە(ئیسلامییە)، جا دیارە ئەم وشەیەش مانایەکی فراوانتر لەو چەمکە تەسکەی هەیە کەخەڵکی تێی دەگەن، چونکە ئێمە پێمان وایە کە ئیسلام گشتگیر (شامل)ەو تێکڕای کاروبارەکانی ژیان و گوزەران دەگرێتە خۆیو، لە هەموو مەسەلەیەکیدا فەتواو بڕیاری وردی خۆی هەیەو، لەبەردەم کێشەو گرفتە واقیعییەکانی خەڵکیداو ئەو سیستەم و ڕێسایانەدا کە چاککردنی کاروباری خەڵکی پەکی لەسەریان کەوتوە، دەستەو ئەژنۆ دانانیشێ، بەڵێ پەیامی ئێمە (ئیسلامیی)یە بەهەموو ماناو چەمکەکانی وشەی ناوبراو، هەر ماناو مەبەستێك حەز دەکەی لێی بفامەوە، بەمەرجێك لەو تێگەیشتنەت دا پابەندبی بەکتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەیوﷺ ڕێبازی پێشینە چاکەکانی مسوڵمانان.

جا هەرچی کتێبی خوا (کِتاب الله)یە ئەوە بناغەو ریشەی ئیسلامەو، هەرچی سوننەتی پێغەمبەرەکەیشییەتی ئەوە شەرح و تەفسیری کتێبی خوایەو، هەرچی ڕێو شوێنی پێشینەی چاکیشە (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەوە پیادەکەرو جێبەجێکەری ئەو بەرنامەو ڕێبازەو سەرمەشق و بەرجەستەکەری کردەیی ڕاستەقینەیانن.

وەهەر لەوبارەوە گوتوویەتی:[٢]

(الاسلام نظام شامل يتناولُ مظاهر الحياةِ جميعا، فهو:

دولة وطنٌ أو حكومة وأمة

وهو: خُلُق وقوة أو رحمة وعدالة

وهو: ثقافة و قانونٌ أو علم وقضاءٌ

وهو: مادة وثروة أو كسبٌ وغنيٌ

وهو: جهادٌ و دعوة أو جيش و فِكرة

---

١- بڕوانە: (مجموعة رسائل الامام الشهيد) ج١ص٣٢، (دعوتنا).

٢- بڕوانە: (مجموعة رسائل الإمام الشهيد) ج١ص٢٥٤، (رسالة التعاليم).

كما هو: عقيدة صادقة وعبادة صحيحة سواءً بسواءٍ)

٢- قۆناغەكانی كارو خەبات:

(حَسَنُ البَنَّا) قۆناغەكانی كارو خەباتی كۆمەڵەكەی خۆی بۆ سێ قۆناغ دابەش كردوە:[١]

أ- **التعريف:** ناساندن، كەمەبەستی پێی بانگەوازكردنی خەڵكە بۆ ئیسلام و فێركردن و پەروەردەكردنیانە بەڕەچاوكردنی هەر شێوازێكی شەرعیی.

ب- **التكوين:** پێكهێنان، كە مەبەستی پێی پەروەردەكردن و بارهێنان و راهێنانی ئەندام و كادیرە لێهاتووەكانەو ئامادە كردنیانە بۆ جیهادو بەرەنگاریی.

ج- **التنفيذ:** جێبەجێكردن، كە مەبەست پێی رووبەڕوو بوونەوەو جەنگ و جیهادو سەرەنجام سەركەوتن و پێكهێنانی كیان و قەوارەی شەرعیی‌یە بۆ ئیسلام و مسوڵمانان.

هەروەها (حَسَنُ البَنَّا) رای وابووە كە كۆمەڵ و كۆمەڵگای ئیسلامیی بەوجۆرە پێك دێ كە لەسەرەتاوە تاكی مسوڵمان (الفردُ المسلم)و پاشان خێزانی مسوڵمان (الأسرة المسلمة)و دواتریش كۆمەڵگای مسوڵمان (الأمة المسلمة، المجتمع المسلم) بهێنرێتە دی‌و پێبگەیەنرێ.[٢]

٣- **بەكارهێنانی هێزو بەرەنگاربوونەوەی چەكداریی لەكات و قۆناغی خۆیدا:**

ئەمیش هەرچەندە لەبڕگەی پێشودا ئاماژەمان پێكرد، بەڵام بەپێویستم زانی كەلەم بڕگە سەربەخۆیەش دا تیشكی بخەمە سەر، چونكە ئەم مەسەلەی بەرەنگاربوونەوەی چەكدارانە (المواجهة المسلحة) لەكات و قۆناغی خۆیدا، وێڕای ئەوەی كە لەشەریعەتی ئیسلامیی‌و سیرەو ئەزموونی پێشینەی چاكمان دا شتێكی روون و بێ چەندوچوونە، پێشەوای شەهید (حَسَنُ البَنَّا)ش لەڕۆژگاری خۆیدا بەخاڵێكی گەورەو

---

١- بڕانە: سەرچاوەی پێشوو، ص٢٦٥،٢٦٦، وە بڕوانە: (منهج التغييرعند الشهيدين: حسن البنا و سيد قطب) د. محمد عبدالقادر أبو فارس، ص٣٦،٣٧.

٢- بڕوانە: (مجموعه رسائل الامام الشهيد) ج١ص١٩٠تا١٩٣ (دعوتنا في طور جديد).

گرنگی بەرنامەی کارو خەباتی کۆمەڵی برایانی مسوڵمان (الأخوان المسلمین)ی داناوە، بەڵام بەداخەوە ئێستا نەك هەر کاڵ بۆتەوە بگرە هەر لەبەرنامەی کاری ئەو کۆمەڵە ئیسلامیی‌یەدا نەماوەو سەرو سۆراغی نیە !

جا بزانین داخۆ (حسن البنا) لەوبارەوە رای چی بووە ؟![1]

(إنَّ الإخوان المسلمين سَيَسْتَخْدمونَ القوةَ العَملية حَيْثُ لايُجْدي غيرُها، وَحيثُ يَثِقُونَ أَنَّهُمْ قَدْ آستكْمَلُوا عُدَّةَ الإيمانِ والوحدة، وهم حين يَسْتَخْدِمون هذه القوة سيكونون شُرفاءَ صُرَحاءَ وسَيُنْذِرونَ أولاً، وينتظرونَ بَعْدَ ذلك، ويُقْدِمون في كرامةٍ وعِزةٍ)

واتە: مسۆگەر بن کە (برایانی مسوڵمان) هێزی کردەیی (مەبەستی چەکە) بەکاردێنن لەحاڵێك دا کە جگە لەوە شتێکی دیکە کەڵکی نابێ، وە لەکاتێك دا کەمتمانەیان دەبێ کە لەرووی ئیمان و یەکڕیزیی‌یەوە ئامادەن، وەکاتێکیش ئەو هێزە بەکاردێنن شەریفانەو راشکاوانە دەیکەن و سەرەتا بەرانبەریان ئاگاداردەکەنەوەو پاشان چاوەڕوانیی دەکەن[2]، وە دوایی بەکەرامەت و عیززەتەوە دەست بەکاردەبن.

## دوو: بەناشەرعیی لەقەڵەمدانی رژێم و حکوومەتەکانی سەردەم و هەوڵدان بۆ هێنانە کایەی حوکم و سیستەمێکی ئیسلامیی:

بەڵێ ئەمیش هەڵوێستێکی دیکەی یەکجار بوێرانەو جوامێرانەی (حسن البنا) بووە (خوا لێی خۆش بێ) کە لەچەندان بۆنە (مُناسبة)دا بەڕاشکاویی رای‌گەیاندوەو ئەوەندەی لەبڕستیشی‌دا بووە کاری بۆ کردوە، جا باسەرنجی چەند قسەیەکی بدەین لەوبارەوە، جارێ لەبارەی ناشەرعیی بوونی رژێم و حوکمە نائیسلامیی‌یەکانەوە گوتوویەتی:[3]

* (...ونحن لهذا لانَعْتَرفُ بأيِّ نِظامٍ حكومي، ولابهذه الأشكالِ التقليدية التي أرْغَمَنَا أهلُ الكُفْرِ وأعْداءُ الإسلامِ على الحَكْمِ بها والعَمَلِ عَلَيها).

---

١- بڕوانە: (المؤتمر الخامس) لە (منهج التغييرعند الشهيدين..)دا، ص ٣٠.

٢- مەبەستی ئەوەیە کەپاش (إنذار)چاوەڕێ دەکەن داخۆ داوایەکەیان وەردەگیرێ، یان رەد دەکرێتەوە! کەبێگومان بەرپەرچ درانەوەی ئەو جۆر داواکاریی‌یانە بەڵگەنەویستە.

٣- بڕوانە: (رسالة الى الشباب) کە لە (منهج التغييرعند الشهيدين..) ص١٦، وەرگیراوە.

وەك دەبینین زۆر بەڕوونیی‌و راشكاویی رژێم و سیستەمە نائیسلامیی‌یە خوازراوە داسەپێنراوەكان بەناشەرعیی لەقەڵەم دەدات!

* وە لەبارەی حوكمڕان و دەستەڵاتدارە وابەستەكانەوە گوتوویەتی:[1]

(وأنَّى لِحُكامِنا هذا، وهم جميعاً قد تَرَبَّوا في أَحْضانِ الأجانِبِ ودانُوا بفكرتِهِمْ، على آثارِهِمْ يُهرَعون وفي مَرضاتِهِمْ يتنافَسون، ولعَلَّنا لانكونُ مُبالَغِين إذا قُلْنا: إن الفكرة الإستقلالية في تصريف الشؤون والأعمالِ لَمْ تخطُرْ ببالِهِمْ فَضْلاً عَنْ أنْ تكون منهاج عَمَلِهِمْ، إنَّ قوْماً فَقَدوا الإسْلامَ في أنفسهم وفي بيوتِهِمْ وشؤونهم الخاصة والعامة لأعْجَزُ أن يُفيضوهُ على غيرِهِمْ...)

وەك دەبینین (حسن البنا) زۆر بەڕوونیی رایدەگەیەنێ كە حكومڕانانێكی لەباوەشی بێگانەدا پەروەردەبوو و بەشیری گوانی ئەهلی كوفر گۆشكراو، بەهیچ جۆرێك لێیان چاوەڕوان ناكرێ كەلەسەر بناغەی عەقیدەو ئایینەكەی خۆیان كیان و قەوارەیەكی سەربەخۆ (مستقل) بنیات بنێن..

* وە لەوبارەوە كە پێویستە حوكم و شەریعەتی خوا، لەهەموو بوارو لایەنەكانی ژیان و گوزەرانی كۆمەڵگاو دەوڵەتدا پیادە بكرێ، گوتوویەتی:[2]

(إنَّ مُهِمَّتَنا في بَعْضِ تفاصيلها أن يكون في مصر أولاً بِحُكم أنَّها في المقدمةِ، ثمَّ في غيرها كذلك):

– نظام داخلي للحكم، يتحقَّقُ به قولُ الله تبارك وتعالى: ﴿ وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ ﴾[3].

– ونظام للعلاقات الدولية يتحقَّقُ به قول القرآن الكريم: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗا ... ﴾[4].

---

١- بڕوانە: (الاخوان المسلمون تحت راية القرآن) كە لە (منهج التغير...) ص١٦،١٧وەرگیراوە.

٢- سەرچاوەی پێشوو: ص٢٤، ٢٥، ٢٦.

٣- المائدة: ٤٩

٤- البقرة: ١٤٣

- ونظام عملي للقضاء يُستَمَدُّ من الآية: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴾[1].

- ونظام للدفاع والجندية، يُحقّقُ مرمى النّفير العام: ﴿ ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ... ﴾[2].

- ونظامٌ اقتصادي استقلالي، للثروة والمال والدولة والأفراد، أساسُهُ قوله تعالى: ﴿ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا ﴾[3].

- ونظام للفرد في سلوكه الخاص، يُحققُ الفلاح المقصود، بقوله تعالى: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴾[4].

- وروحٌ عام يُهيْمنُ على كل فَرْدٍ مِنْ أفرادِ الأُمَّة مِنْ حاكمٍ ومحكومٍ، قِوامُهُ قول الله تعالى: ﴿ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ... ﴾[5].

(...نحن نريدُ الفَرْدُ المُسْلِمَ والبَيْتَ المُسلِمَ والشَّعْبَ المُسلِمَ والحكومة المُسْلِمةِ والدولة التى تقود الدول الإسلامية، وتضُمُّ شتاتَ المسلمين وتَسْتَعيْدُ مَجْدَهُمْ، وتَرِدُّ عليهم أرْضَهُمُ المَفقودة وأوطانَهُمُ المسْلوبة وبلادهم المغصوبة، ثم تحملُ عَلَم الجِهادِ ولِواءَ الدعوة إلى الله حتى تسْعَدَ العالمُ بتعاليم الإسْلامِ).



١- النساء: ٦٥
٢- التوبة: ٤١
٣- النساء: ٥
٤- الشمس: ٩
٥- القصص: ٧٧

وەك دەبینین (حسن البنا) ئامانجی خۆیو حیزبەكەی لەوەدا دەدرەوشێنێتەوە كە سەرەتا لەمیصرو پاشان وڵاتە ئیسلامییەكانی دیكەش كیان و دەوڵەتێكی ئیسلامیی وا پەیدا دەبێت، كە:

أ– پەیڕەوو پڕۆگرامی نێوخۆی (النظام الداخلي).

ب– پەیوەندی نێو دەوڵەتانی(العلاقات الدولیة)

ج– سیستەمی دادوەریی (نظام القضائي)

د– سیستەمی بەرگرییو سەربازیی (نظام الدفاع الجندیة)

هـ– سیستەمی ئابووری (نظام الاقتصادي)

و– سیستەمی رەوشتی (نظام السلوكي)

ز– گیانی گشتیی حوكمڕان بەسەر تاك و كۆمەڵەوە (الروح العام المهیمن علی الفرد والجماعة).

بەڵێ كیان و دەوڵەتێك كە هەموو ئەم لایەن و دام و دەزگاو سیستەمانەی بەپێی قورئان و سوننەت بن و لەبەر ڕۆشنایی شەرع دا بەڕێوە بچن.

پاشان تەنها بەوەندەش وازناهێنێو دەڵێ:

ئێمە تاكی مسوڵمان و ماڵی مسوڵمان و گەلی مسوڵمان و حكومەتی مسوڵمان و دەوڵەتێكی مسوڵمانی وامان دەوێ, كە دەوڵەتە ئیسلامییەكان ئیدارە بكات و, مسوڵمانانی پرژو بڵاو خڕ بكاتەوەو پاشان شكۆی جارانیان بۆ بگێڕێتەوەو, سەرزەمینی لەدەست چوویان و خاكی داگیركراویان و نیشتمانە زەوت كراوەكانیان بۆ بستێنێتەوە, دوایش ئاڵای جیهاد هەڵبگرێو بەیداغی بانگەواز بۆ لای خوا بەرز بكاتەوە, هەتا سەرجەم جیهان لەسێبەری یاساو ڕێساكانی ئیسلام دا بەختەوەر دەبێت!

## سێ: هەڵوێستی لەبارەی كێشەی فەلەسطینەوە:

پێشەوا (حەسەنی بەننا) خوا لێی خۆش بێ هەڵوێستیكی زۆر مەردانەو بوێرانەی لەمەڕ كێشەی فەلەسطین نواندو, هەر ئەو هەڵوێست نواندنەیشی بوو كە وەرچەرخانێكی بنەڕەتی لەسیاسەت و هەڵوێستی ڕژێمی میصرییو زلهێزەكانیش دا دروست كرد،

لەبەرانبەر کۆمەڵی برایانی مسوڵمان (الإخوان المسلمین) بەگشتیو ڕابەرەکەیدا بەتایبەت.

سەفارەتی ئینگلیز لەوبارەوە گوتوویەتی:[1]

(برایان) لەمیانەی ئەو ئاڵۆزییو پەشێوییەدا کە لەساڵانی (١٩٣٦)و(١٩٣٩)دا لەفەلەسطین ڕوویدا, هاتنە مەیدانی سیاسەتەوە, چونکە ڕۆڵی سەرەکییان گێڕا لە ورووژاندنی بارودۆخ و کاروچالاکی دژ بە بەریتانیا).

جا ئێستە باچەند هەڵوێستێکی حەسەنی ڕابەرو کۆمەڵە ئیسلامییەکەی لەبارەی کێشەی فەلەسطین و لەسەرکردنەوەی فەلەسطینییە ستەمدیدەکان و پشتگیریکردنیان, بەخێرایی بخەینەڕوو:

١- لەساڵی (١٩٣٦)دا شۆڕشی گەورەی عارەبان دژی جوولەکە لەفەلەسطین بەرپابوو, وە وەك سەفارەتی ئینگلیز گوتوویەتی:[2] کۆمەڵی برایانی مسوڵمان لەوکاتەدا ماڵ و سامان و چەك و چۆڵیان بۆ شۆڕشە فەلەسطینییەکان دەناردو قومبەلەی دەستییان بۆ دروست دەکردن و بانگەشەیان بۆ شۆڕشەکە دەکرد, وە ئاشکرا بوو کە زۆربەی بڵاوکراوەکان کە لەبازاڕەکان دا دەردەکەوتن بۆ پشتگیریی کێشەی فەلەسطین هی (برایان) بوون.

٢- لە (٨ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٥)دا (حسن البنا) بۆ(الجامعة العربیة)ی پێشنیار کرد کە ئامادەیە (١٠٠٠٠) گەنجی فیدایی بخاتە ژێر دەستی بۆ بەشداریکردنی لەرزگارکردنی فەلەسطین دا![3]

٣- (إحسان عبدالقدوس) کە باپیەکی نەصرانیی بووە، لەژمارە (١٢٢٤)ی گۆڤاری (روز الیوسف)دا لە (٢٧ی نوڤمبر ١٩٥١)دا دەرچووە، لەبارەی قارەمانێتی فیداییەکانی (برایانی مسوڵمان)دا نووسیویەتی:[4]



١- بڕوانە: (من قتل حسن البنا؟!) ص٢٦٨.

٢- بڕوانە: (من قتل حسن البنا؟!) ص٢٦٩.

٣- بڕوانە کتێبی: (من قتل حسن البنا؟!) ص٢٧٢.

٤- بڕوانە کتێبی: (لماذا أغتیل الإمام الشهید حسن البنا؟!)ص١٢٠.

(برایانی مسوڵمان) ئەمڕۆش وەك دوێنێ نوێنەری بانگەوازیی ئایینین و بۆ جەنگ و جیهاد وە لەسایەی بانگەوازی ئەوانەوە مەیدانەکانی فەلەسطین چەندان قارەمانی لێبینین کە وەك پاڵەوانان راوەستان، وە ناوی خوایان بەرزکردەوەو هەر قارەمانێکیان بەدەکەس بوو، وەهیچ ئەفسەرێکی بەشدار لەجەنگی فەلەسطین و هیچ چاودێرێکی ئەو جەنگە ناتوانێ نکوڵیی لەکاری فیدایی‌یەکانی برایانی مسوڵمان و بوێریی‌و قارەمانێتی‌یان بکات.

٤- کچێکی جوولەکەی دەمارگیر بەناوی (روث کاریف) لەساڵی (١٩٤٧) لەڕۆژنامەی (الصنداي میرۆر)دا لەوتارێکی‌دا کە لەسەر بەشداری‌کردنی جەنگاوەرانی برایانی مسوڵمان لەجەنگی فەلەسطین دا نووسیویەتی، گوتوویەتی:[1]

(بێگومان جوولەکە کە داوا لەئەنجوومەنی ئاسایش (مجلس الأمْن) دەکەن کە هێزی نێو دەوڵەتی‌یان بۆ بنێرێ، لەبەر ئەوە نیە کە بەرگری‌یان بۆ لەخۆیان نەکرێ، بەڵکو بۆئەوەیە کەئەو هێزە نێودەوڵەتی‌یەی دەچێتە فەلەسطین لەگەڵ پیاوانی برایانی مسوڵمان دا رووبەڕوو بێتەوە، وە بەوەش مەترسی راستەقینەی ئەو بزووتنەوەیە لەلایەن جیهانەوە دەزانرێ! )

کەواتە: قارەمانێتی موجاهیدە ئیسلامیی‌یەکان بەڕاددەیەك بووە کە جوولەکەکان ناچاربن هانا بەرنەبەر زلهێزەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەیان، ئەو زلهێزانەی کە هەمیشە ئەنجوومەنی ئاسایش و نەتەوە یەکگرتووەکان(الامم المتحدة)یان کردۆتە دێوجامەیەك بۆ فریودانی خەڵکی سادەو سەرکێڵ!

٥- (حسن البنا)بە (النقراشي پاشا)ی گوت:[2] لەکاتێك دا کە بەهودنە (هدنة) قایل بوو لەگەڵ جوولەکە، لەکاتێك دا کە زلهێزەکان گوشاریان خستە سەر میصرو وڵاتە عەرەبی‌یەکانی دیکە بەهۆی تین بۆ هاتن و سەغڵەت بوونی جولەکەوە:

[بۆچی هودنە لەگەڵ جووی فەلەسطین قبوول دەکەی؟! جەنگی فەلەسطین لەنێوان چەند پارتیزانێکی تازە هاتوو بۆ سەرزەمینی فەلەسطین و ئێمەومانانە کەئێمەش

١- سەرچاوەی پێشوو، ص ١٢٠،١٢١.

٢- هەمان سەرچاوە، ص١١٨.

وەك ئەوان كۆمەڵە پارتیزانێكی ئیسلامیین! دە لەجەنگاوەرە پارتیزانەكان بگەڕێ با بەرەنگاری یەكتر بنەوە، جا ئەگەر ئێمە سەركەوتین، ئەوە شكۆمەندیی میصرە، وە ئەگەر كوژراشین ئەوە دەچینە ئەو بەهەشتەوە كەتامەزرۆیی وی هەڵیگرتووین بۆ فەلەسطین.

لێمان گەڕێ با لەفەلەسطین بەگژ جووەكان دا بچین، تۆش وەك سیاسییەك هەقی خۆتە كەلەژێر گوشاری نێودەوڵەتی‌دا هودنە قبوول بكەی، بەڵام هەقت نیە رێگا لەجەنگاوەرە عەرەب یان مسوڵمانەكان بگری كە لەگەڵ زایۆنی‌یەكان دا بەرەنگار بنەوە، چونكە نەجەنگاوەرە زایۆنی‌یەكان خەڵكی فەلەسطینن و نەجەنگاوەرانی ئێمەش فەلەسطینین، دەواز بێنە باهەق خۆی بەباطل دا بدات].

بەڵام بێگومان نەقراشی وابەستەو دابەستەی بەكرێگیراوانی خۆماڵی‌و دوژمنی كافری بێگانە، ئەو ئیرادەو جورئەتەی نەبوو كە بوێرێ ئەوە بكات!

## چوار: هەوڵدانی بۆ سەربەخۆیی میصرو دژایەتی‌كردنی ئینگلیز:

ئەمیش هەڵوێستێكی دیكەی پرشنگداری حەسەنی بەننایە (خوا لێی خۆش بێ)، وەك چۆن بەدرێژایی مێژوو هەر زاناو پێشەوایەكی ڕەسەنی ئیسلامیی مادام گەل و نیشتیمانەكەی دیل و ژێر دەست بووبێ هەروای كردوە.

دیارە حەسەنی بەنناو كۆمەڵەكەیشی مێژوویەكی دوورودرێژو درەوشاوەیان هەیە لەو بواری هەوڵدان بۆ سەربەخۆیی میصرو دەركردنی ئینگلیزو دژایەتی كردنیان لەنیوەی یەكەمی سەدەی بیست دا كە حەوجێ بەبەڵگە هێنانەوە نیە، بەڵام هەر بۆ وێنە دەڵێین:

١- لەرۆژی (١٠ی ئۆكتۆبەری ١٩٤٦)دا (حسن البنا) لەرۆژنامەی (الاخوان المسلین)دا داوای لەگەلی میصر كردوە كە هەموو جۆرە پەیوەندی‌یەكی ئابووری‌و رۆشنبیری‌و كۆمەلایەتی لەگەڵ ئینگلیزدا بپچرن، تاكو ناچاربن میصر بەجێ بهێڵن.[1]

٢- وە لە(٢١ ئۆكتۆبەری) هەمان ساڵ دا (حسن البنا) لەرۆژنامەی ناوبراودا كە ئۆرگانی ڕەسمیی حیزب بووە، هێرشێكی زۆر توندی كردۆتە سەر ئینگلیزو هەڕەشەی

---

١- بڕوانە: (من قتل حسن البنا؟!) ص ١٤٠.

لێکردوون کە ئەگەر لەسەر زەوتکارییو بەدڕەفتاریی خۆیان بەردەوام بن، سەرەتا (٣٠,٠٠٠,٠٠٠)کەسی میصری لێیان پەست و تووڕە دەبێو، پاشان ئەو رق و تووڕەیییە وەك بروسکە (برق) بەدڵ و دەروونی (٧٠,٠٠٠,٠٠٠)کەسی عەرەب و پاشان (٣٠٠,٠٠٠,٠٠٠)کەسی مسوڵمان دا تێپەڕدەکات و سەرجەم جیهانی ئیسلامیان لێدەورووژێ![1]

وە لەڕۆژنامەی ناوبراودا داوای لەو کەسانە کردبوو کە کتێب و گۆڤارو رۆژنامەی بەزمانی ئینگلیزییان لایە، بیدەنە دەست نزیکترین بارەگای کۆمەڵی برایان، تاکو لەمەیدانە گشتییەکانی قاهیرەو شارەکانی دیکەدا بسووتێنرێن.[2]

٣- لەسۆنگەی ئەوەو کە ئینگلیزەکان ستەم و دەستدرێژییان بەتایبەت لەشارەکانی میصردا لەڕادە چوو بووە دەر، بۆ وێنە:[3]

أ- بەسەیارەکانیان پیرو منداڵەکانیان لەشەقامە گشتییەکان دا دەشێلان لەحاڵێك دا کە سەرخۆش بوون، یان هەر بەهەوەنتەو بۆ خۆشی!

ب- وە جاری وابوو کە بابایەکی سەرخۆشیان بەچەکەوە پەلاماری کچێکی دەدا لەماڵی خۆیان دا، یان ڕاوی دەنا هەتا ژوورەوەو ئەگەر بۆی لوابا لەوێدا سواری دەبوو!.

ج- بگرە جاری وابوو کە لەڕێو بان و سەرجادەو شەقامەکان دا بێئابروویییان دەکردو ناموس و کەڕامەتی خەڵکییان دەشکاند!

بەڵێ لە سۆنگەی ئەوەوە خەڵکی بەگشتییو بەتایبەت لەڕیزی پێشەوەیان برایانی مسوڵمان، مەردانەو جوامێرانە لەئینگلیزە ستەمکارو بێناموسەکان ڕاپەڕین و کۆڕو کۆبوونەوەو ڕێپێوان و خۆپیشاندان (المسیرات والمظاهرات)یان پێك هێنا بۆ هاندانی جەماوەرو داواکردنی وەردەنان (إجلاء)ی ئینگلیزەکان, وە برایانی مسوڵمان، پشکی

---

١- هەمان سەرچاوە، ص١٤٨.

٢- بڕوانە: (لماذا أغتيل الإمام الشهيد؟!) ص٨٦.

٣- هەمان سەرچاوە، ص٨٧،٨٨.

شێر (حصة الأسد)یان لەو چالاکیو جم وجۆڵانەدا هەبوو, بەتایبەت لەنێو ڕیزی قوتابییەکانی زانکۆی زانکۆی (الأزهر)و زانکۆکانی دیکەدا.[1]

٤- کاتێ لەنێوان ئەڵمانیاو دەوڵەتە هاوپەیمانەکان (الحلفاء) کە لەدژی یەکتر لەجەنگدا بوون (جەنگی جیهانی دووەم)، ڕێککەوتن نامەیەك مۆرکرا کە کۆتایی بەشەڕ بێت.

أ- (حسن البنا) بەهەلی زانیو هەڵسا داوای وەدەرنان (إجلاء)ی ئینگلیزی کرد بەبێ هیچ مەرج و بەندێك!

ب- وە داوای ئەو قەرزو قۆڵانەی میصری کرد کە لەسەر ئینگلیز هەیبوون و ئەوکاتە (٤٠٠,٠٠٠,٠٠٠) جونەیهی ئیستەرلینی مەزەندە دەکرا!

ج- وە داوای کرد کە داگیرکردنی یاسادانان (الإحتلال التشريعي)یش کۆتایی پێبهێنرێ، بەوە کەشەریعەتی ئیسلامیی جێگای یاسا دەستکردەکان (القوانين الوضعية) بگرێتەوە، ئەو یاسا دەستکردانەی کەپاش داگیرکرانی وڵات لەلایەن ئینگلیزەوە داسەپێنراون!

د- وە داوای کرد کە مزگەوتەکان ڕۆڵی شەرعییانەی ڕاستەقینەیان بۆ بگێڕرێتەوە لە فێرکردن و پەروەردەکردن و خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتیو هۆشیارکردنەوەی سیاسی مسوڵمانان داو، تەنها لەسەر لایەنی ڕووحیی کورت هەڵنەیەت.

هـ- وە داوای کرد کە (الجامعة العربية) گەشەی پێبدرێو وای لێبکرێ کە بڕیارەکان پابەندکەر (مُلْزِمْ)بن و هەروا شتێکی ڕۆتینی نەبن، وە کۆکەرەوە (جامعة)یەکیش بۆ گەلانی مسوڵمان پێك بێت کە گەلانی عەرەبیش کۆبکاتەوەو بەجۆرێك بێت کەنەکەوێتە ژێر فشارو کاریگەریی زلهێزەکان.[2]

هەڵبەتە ئینگلیزەکان ئەم هەڵوێستەی (حسن البنا)و حیزبە ئیسلامییەکەییان بەهەڕەشەو زەنگێکی مەترسیدار دانا، کە پێویستە هەرچی زووتر بەهێز بەرپەرچی بدرێتەوە![3]



١- هەمان سەرچاوە، ص٨٧،٨٨.

٢- بڕوانە: (لماذا أغتيل الإمام الشهيد حسن البنا؟!) ص٨٨.

٣- هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

ئێستاش- پاش خستنەڕووی هەڵوێستە سەرەکیە پرشنگدارەکانی پێشەوا حەسەنی بەننا- کاتی ئەوە هاتوە کە لەخاڵی پێنجەم و کۆتاییدا باسی چۆنیەتی کوژران و کۆتایی هاتنی تەمەنی کورت و بەهێزو پێزی ئەو کەڵەپیاوە بکەین، کە بێگومان کوژران و شەهیدکرانەکەی باجی ئەو هەڵوێستە جوامێرانەو بوێرانانەی بووە.

## پێنج: چۆنیەتیو هۆکاری کوژرانی حەسەنی بەننا:

لەڕاستیدا کوژرانی پێشەوا حەسەنی بەننا (رەحمەتی خوای لێ بێ) زادەو دەرئەنجامێکی سروشتییو چاوەڕوان کراوی هەڵوێستە مەردانەو جوامێرانەکانی بووە، هەر لە بەناشەرعییو ناڕەوا لەقەڵەم دانی حوکم و سیستەمە عەلمانییو نائیسلامییەکانی میصرو دەوڵەتانی دیکەی جیهانی ئیسلامییو داواکردنیو جەخت کردنی لەسەر بەڕێوەبردنی وڵات بەپێی شەریعەتی خواو بنیات نانی کیان و قەوارەیەکی سیاسیدا، کە سەرو سێبەری مسوڵمانان و قەڵغان و پارێزەری سەرو ماڵ و کەرامەت و وڵات و نیشتمانیان بێت، هەتا پشتگیریکردنی لەگەڵ ستەمدیدەی فەلەسطین و جەنگ کردنی مەردانەی فیداییەکانی کۆمەڵەکەی لەدژی جوولەکە داگیرکەرو داپلۆسێنەرەکان و، داکۆکیکردنی لەسەر وەدەرنانی ئینگلیزەکان و ئازادییو سەربەخۆیی میصرو سوودان! خاوەنی کتێبی (لماذا أُغتيل الإمام الشهيد حسن البنا؟!) لەوبارەوە گوتوویەتی:[1]

(هَلْ عَرَفْنا إذاً لماذا أُغتيلَ حسن البنا؟!

قُتِلَ حسن البَنّا من أجْلِ إجهاضِ جمهورية القدس التي كان حاكمها العسكري من الإخوان، ولِضمانِ أَمْنِ الكيان الإسرائيلي.

قُتِلَ حسن البنّا من أجل القانون الإسلامي.

قُتِلَ حسن البنّا من أجل الخلافة الإسلامية، وإقامة الكيان الإسلامي الصحيح للأمة الإسلامية.

قتل حسن البنّا من أجلِ إزالة التَسلُّطِ الذي أجاعَ وأذلّ الشعوب الكادحة في العالم العربي والاسلامي..)

---

١- بڕوانە: (لماذا أغتيل الإمام الشهيد ...؟!) ص١٦٣،١٦٤.

چـۆنیەتی کوشتنەکەیشـی هەرچـەندە وردەکـاریی (تفاصـیل)ی زۆرە، بـەڵام زۆر بەکورتی بەم جۆرە بووە: پاش ئەوەی لەساڵی(١٩٤٨)دا بەفشـارو فـەرمانی هـەرکام لـە زلهێزەکانی ئەمریکاو بەریطانیاو فەڕەنسا[١] (محمود فهمي النقراشي پاشا) سەرۆکی رژێمی میصری ئەوسا، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی (حل)ی کۆمەڵی برایـانی مسـوڵمانی بـەڕەسمی راگەیانـدو، لەشـەوی (٨ی دێسـەمبری ١٩٤٨)دا بڕیارەکـە جێبـەجێکرا[٢]، دەسـت کـرا بەنەخشەو پیلان دانان بۆ کوشتن و تیرۆرکردنی ڕابەرەکەیشی![٣]

جا ئەوە بوو کە پلە پلە وەك چۆلەکە خستیانە قەفـەزەوەو لەسـەرەتاوە سـەرجەم بەرپرس و ئەندامانی کارای کۆمەڵەکەی گیران و، پاشان پاسەوانەکانیشیان گرت و دوایی ترومبێلەکەیشیان زەوت کردو پاشـان دەمانچـە مۆڵـەت پێدراو (مُـرخَّص بـهِ) کەیشـیان لێوەرگرتـەوەو سـەرەنجام تەلەفۆنەکەیشـیان بڕی‌و..لـە ئاکـامیش دا شـەوی(١٣/١٢ی شوباتی ١٩٤٩) سەعات دەوری (٩)ی شەو لەکاتێك کە لەگـەڵ (د. عبـدالکریم منصـور)ی زاوای‌دا سواری تاکسـی‌یەك دەبـوون، لەلایـەن سێکەسـەوە لـەپیاوانی رژێـم کـە سـواری سەیارەیەکی رەشی پۆلیسـی سیاسـی بـوو بـوون، بـەژمارە: (٩٩٧٩)درایـە بـەر رێژنـەی گوللەو دەست رێژیان لێکرا، ئەو سێ کەسەش کە بەوکارە گڵاوە هەڵسان ئەمانە بوون:

١- محمود عبدالحمید، بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی (مدیر الأمن العالم).

٢- محمد سعید، سەرباز، (جندي).

٣- أحمد حسین، سەرباز (جندي).

دیارە پاش تەقەلێکرانیان خۆی‌و زاوایەکەی بریندار دەبن و پاش کەین و بـەینێکی زۆر پزیشکیان دەگاتـە سـەری، بـەڵام لەکۆشـکەوە (القصـر الملکـي) فـەرمان دەردەچـێ کەهیچ پزیشکێك بۆی نیە چارەسەری بکات و ئاوا بەبرینداریی خوێنی لەبەر دەڕوات هەتا تەواو دەبێت! دیارە (ملك فاروق) هەتا ئەو شێرە پیـاوە تـەواو دەبـێ هـەر لەپـەیوەنـدی

---

١- بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، ص١٣٢،١٣٣.

٢- هەمان سەرچاوە، ص ١٣٤تا١٣٧.

٣- بۆ زانینی درێژەی چۆنیەتی ئەو نەخشەو پیلانەی زلهێزان و کافرو دەغەڵە خۆماڵی‌یەکانی میصر سەرنجی: (مَن قَتَلَ حَسَن البنا؟!) ص٤٨٠تا٥٤٤ بەتایبەت (فصل)ەکانی (عصفور في قفص)و (الشهید)و (الجنازة)، بدە.

تەلەفۆنییدا دەبێت و لەگەڵ خەستەخانەداو پەیتا پەیتا دەپرسێ: ئەرێ حەسەنی بەننا نەمردوە؟ (هل مات حسن البنا؟!)[1]

ئنجا لەهەمووی دڵتەزێن تر ئەوەیە کە رژێم نەیهێشت هیچ کەس بەلای جەنازەی ئەو پێشەوا بێنازەدا بچێ، تەنیا بابی جەرگ سووتاوی خۆی شۆردیەو کفنی کردو پاشانیش رژێم نەیهێشت پیاوان جەنازەکەی بەرنە سەر گۆڕستان و، ئەو جەنازە بێنازە بەشانی بابیو سێ ئافرەت چووە سەر گۆڕستان و نێژراو، ئەملاو لای جادەو شەقامەکانیش پڕکرابوون لەسەربازو جەندرمەی چەکدارو ئامادە![2]

بەڵێ جەنازەی پێشەوای شەهید لەسەرشانی پیاوێك (کەبابی بوو)و سێ ئافرەت چووە گۆڕستان، چونکە هاوەڵ و قوتابییەکانی یان گیرابوون یان خۆیان پەنهان کردبوو![3] وە کچێکی پێشەوا حەسەنی بەننا کە لەگەڵ جەنازەکەیدا بوو شێرەژنانە دەیچریکاند[4]:

(قَرَّ عَيْناً ياأَبتاهُ، فَلَنْ نتخلّف عَنْ رِسالتكَ، ولَئِن مَنَعَتِ الحُكومةُ مَنْ يُشَيِّعُ جَنازتَكَ– وأسَفاهُ لِنَذالَةِ الحُكام– فَحَسْبُنا عَزاءً وجزاءً أَنَّ أرواح الشهداءِ تَمْشي مَعَنا، وتُشَيِّعُ من قبل أَهْلِ السَّماء مَنْ عَجَزَ عن تَشييْعِهِ أهلُ الارضِ!!)

واتە: ئەی بابە گیان دڵئارام بە! ئێمە لەپەیامەکەت دواناکەوین، وە ئەگەر رژێم پێشگیریی لەکەسانێك کردوە کە جەنازەکەت بەرنە سەر گۆڕستان– ئای مخابن لەبوودەڵەیی حوکمڕانەکانی میصر– ئەوە ئەوەندەمان بەسە بۆ دڵدانەوەو پاداشت، کە رووحی شەهیدان لەگەڵمان دەڕۆن، وە کەلەلایەن ئەهلی ئاسمانەوە بەڕێ دەکریێ، لەکاتێك دا کە خەڵکی زەمین نەیانتوانی ئەو جەنازەیە بەخاك بسپێرن!!

---

١- بڕوانە: (لماذا أغتيل الامام الشهيد ...؟!) ص١٦٠،١٦١.

٢- بڕوانە: (من قتل حسن البنا؟) ص٥٤٣.

٣- بەڕاستی لەوجۆرە کوژران و بەخاك سپێرانەی پێشەوای شەهیددا عیبرەت و دەرسی زۆر هەن بۆ مشوور خۆرانی کاروچالاکی ئیسلامیی، کە لێرەدا دەرفەتی باسکردنیان نیە، چونکە پێم وایە شێخێکی طەریقەو کوێخا دێیەکیش وا بەسادەییو ئاسانیی ناکوژرێو نانێژرێ!!

٤ – بڕوانە: (من قتل حسن البنا؟!) محسن محمد، ص٥٤٣.

خوا پاداشتی حەسەنی بەننا بداتەوە پلەو پایەی بەرزتر بکاتەوەو لەڕیزی شـەهیدە سەربەرزەکانی ئیسلام دا جێی بـۆ بکاتـەوەو چاکترو زیـاتریش هیدایـەتی پـەیڕەوانیو ئێمەو مانانیش بدات، کە پەیڕەویی لەهەنگاوە راست و ئیجابیـیەکانی بکـەین و لەهەڵـەو کەم و کوڕیی خۆیو کۆمەڵەکەیشی دەرس و پەند وەربگرین.

## ٢٠- پێشەوا ئەبوولئەعلای مەودوودیی (رحمة الله تعالی علیه):[1]

(أبو الأعلى المودودي) کوڕی (السيد أحمد حسن)ەو لەساڵی (١٩٠٣)ی زایینی لەشاری (أورنگ آباد)ی سەر بە (حیدر آباد الدکن) لەدایك بووە.

دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئیسلامیی (الجماعة الاسلامية)ی پاکستانە، کە لەساڵی (١٩٤١)ز داو بەهاوکاریی (٧٥)کەس کە لەسەرجەم ناوچەکانی هیندستان کۆببوونەوە بنیاتی ناو، پاشان دروست بوونی دەوڵەتی پاکستان یەکێك بوو لەبەرهەمەکانی خەبات و تێکۆشانی ئەبوولئەعلاو کۆمەڵە ئیسلامییەکەی لەساڵی (١٩٤٧)ز دا.

وە پێشەوا مەودوودیی (رەحمەتی خوای لێبێ) بەیەکێك لەزاناو سەرکردە بەرجەستەو هەڵکەوتووەکانی مسوڵمانان دادەنرێ و زۆر لەزانایانی هاوچەرخمان بەنوێکەرەوە (مُجدِّد)ێکی ئایینی دادەنێن و خاوەنی تەفسیرێکی قورئان و چەندان کتێب و نامیلکەی بەسوودە، کە زۆربەیان بۆ زمانە زیندووەکانی جیهان وەك عەرەبیو ئینگلیزیو فەڕنسیو فارسی وەرگێڕاون، وە (أبو الأعلى المودودي) لەساڵی (١٩٧٩) لە (٢٢ی سبتمبر)دا، کۆچی دوایی کردوە.

دیارە ئەم پێشەوایەشمان هەڵوێستە مەردانەو جوامێرانەکانی هێندە زۆرن کەناتوانین هەموویان تۆمار بکەین و بەناچاری بەگوڵبژێرێکیان وازدێنین:

### یەك: نووسینی کتێبی: (جیهاد لەئیسلام دا) لەساڵی ١٩٢٨دا:

هەرچەندە (أبو الأعلى المودودي) (خوا لێی خۆش بێ) کە لەخێزانێکی مسوڵمان و لەباوەشی باب و دایکێکی دینداردا پێگەیشتوەو باپیرە گەورەی یەکەمی دامەزرێنەری ڕێبازی چەشتیی (الطريقة الچشتيه)ی صۆفیایەتییە،[2] هەر لەزووەوە سەرگەرمی خوێندن

---

١- بۆ نوسینی ئەم باسە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتوە: (أبو الاعلى المودودي، حياته ودعوته وجهاده)ی خليل أحمد الحامدي، وە (أبو الاعلى المودودي: صفحات من حياته وجهاده)ی أحمد ادريس، وە (المناهج التغييرية الإسلامية خلال القرن العشرين)ی فتحي يكن.

٢- بڕوانە: (أبو الأعلى المودودي: صفحات من حياته وجهاده) ص١٨، ١٩.

خوێندن و شارەزابوونی قورئان و سوننەت بووەو، جارێ سەرەتای لاوێتی بووە کە ڕۆژنامەوان (صُحفي)ێکی زەبر دەست بووە،[1] بەڵام وەك خۆی گێڕاویەتەوە هەڵسانی بەدانان (تألیف)ی کتێبی (جیهاد لەئیسلام دا)دا بەخاڵی سەرەتای وەرچەرخان (نقطة تحول)ی دادەنرێ بۆ چاك تێگەیشتنی ئیسلام و بڕیاردانی کارو خەبات لەپێناودا کردنی.

دیارە دانانی کتێبی ناوبراویش بەسەرهاتێك بۆتە هاندەری، کە بەکورتی ئەوەیە:[2]

لەکۆتایی ساڵی (١٩٢٦)ز دا یەکێك لەمسوڵمانان (سوامی شر هانند) دامەزرێنەری بزووتنەوەی: (تۆبزیی کردن لە مسوڵمانان بۆ کردنیان بەهیندۆسی)، دەکوژێ‌و، لەئەنجام دا هیندۆسی‌یەکان هەراو ئاژاوەیەکی زۆر بەرپا دەکەن و، دەست دەکەن بەهێرشێکی سەخت و خەست بۆ سەر ئیسلام و مسوڵمانان لەهەموو کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، بەتایبەتیش بۆ سەر مەسەلەی (جیهاد)، جا لەو سەروبەندەدا (محمد علي الجوهر) لە مزگەوتی گەورەی (دهلي) وتارێك دەدات و دەڵێ: (بریا یەکێك لە مسوڵمانان کتێبێکی لەبارەی جیهادەوە نووسیبایە کە بەرپەرچی پڕوپاگەندەی هیندۆسەکانی دابایەوە.)

ئیدی (أبو الأعلى) ماوەیەکی چاك سەرگەرمی لێکۆڵینەوەو موتالا دەبێ هەتا سەرەنجام کتێبی ناوبراو دادەنێ.

وە کتێبی ناوبراو کاریگەریی‌یەکی گەورەی دەبێ لەپووچاندنەوەو بەرپەرچدانەوەی قسەو قسەلۆکی ناحەزان دا دژی ئیسلام بەگشتی‌و جیهادو جەنگ بەتایبەت، تەنانەت (محمد إقبال)ی شاعیرو بیریاری گەورەی پاکستانی زۆر پێی سەرسام دەبێ‌و دەڵێ: (چاکترین کتێبە لەبارەی مەسەلەی جیهاد لەئیسلام داو یاساکانی لەبواری جەنگ و ئاشتی‌داو، ئامۆژگاری هەر زانایەك دەکەم کەبیخوێنێتەوە)[3]

وە وەك گوتمان (أبو الأعلى) خۆیشی زۆر لەو کتێبەی خۆی بۆ چاکتر تێگەیشتنی ئیسلام بەهرەمەند بووەو لەوبارەوە گوتوویەتی:[4]

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ص٢٢تا٢٨، وە (أبو الأعلى المودودي صفحات من حياته وجهاده) ص٩،٨.

٢- بڕوانە: (أبو الأعلى المودودي)ی أحمد ادريس، ص٣٦،٣٧.

٣- سەرچاوەی پێشوو، ص٣٦.

٤- بڕوانە: (أبو الأعلى المودودي)ی خليل أحمد الحامدي، ص١٧.

(لەمیانەی لێکۆڵینەوەم دا لەو بابەتەدا بۆم روون بووەوە کە ئیسلام نەهاتوە بۆ دنیا تاکو کوفر بەباڵادەستییو حوکمڕانیی بەسەر بەشەریەتەوە بمێنێتەوەو مسوڵمانانیش بەزەبوونیی لەسایەیدا بژین! بەڵکو خوا ئەم ئایینەی ناردۆتە خوار تاکو باڵادەست بێت و ئەهلی کوفریش لەژێر ڕکێفیدا بن...)

## دوو: دەرکردنی گۆڤاری: (تەرجومانی قورئان) لەساڵی ١٩٣٢دا:

پێشەوا مەردودیی گوتوویەتی[١]: (لەساڵی (١٩٢٩)وە هەتا ساڵی (١٩٣٢) چەندان کتێبخانەو سەرچاوەم لەدڵ و مێشکم دا خاڵیکرد، تاکو بۆ ئەرکی گەورەو گرنگی بانگەواز خۆم سازو تەییار بکەم، لە رۆژگارێك دا کە پڕپڕە لەبیروبۆچوون و تەوژمی جۆراوجۆر).

شایانی باسە کە گۆڤاری (ترجمان القرآن) کاریگەرییەکی یەکجار مەزنی هەبوو لەسەر ئاستی هیندستان و پاکستان و دەرەوەشیان، وە لەساڵەکانی یەکەمیدا پێشەوا مەودودیی بەزۆری خۆی بەتەنها دەینووسیو دەری دەکردو لەساڵی (١٩٣٢)شەوە هەتا ساڵی کۆچکردنی (١٩٧٩) درێژەی هەبوو.[٢]

وە لەکاتێك دا کە پێشەوا مەودودیی دووچاری قەیرانێکی دارایی سەخت هات و نەیدەزانی چۆن گۆڤارەکەی دەربکات، پێی گوترا: کە بەڕێوەبەری کاروباری ئایینی حەز دەکات سەردانی بکەیو داواکارییەکی پێشکەش بکەی تاکو گۆڤارەکەت لێبکڕێ! کەچی مامستا (أبو الأعلى) لەوەڵام دا گوتی:[٣]

(سەختییەکان تەحەموول دەکەم، بەڵام ئابڕووی بانگەواز لەبەر قاپی ئەهلی دونیادا نابەم!) دیارە پێبەپێ گۆڤارەکەش لەسەر نووسین و بڵاوکردنەوەی کتێبانیش هەر بەردەوام بوو، بۆ وێنە:



١- سەرچاوەی پێشوو، ص١٨،١٩.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ص٢٣.

٣- هەمان سەرچاوە، ص٢١.

کتێبی بەقەبارە گچکەو بەنێوەڕۆك گەورەی: (چوار زاراوەکان لەقورئان دا)، وە کتێبی: (شارستانێتی ئیسلامی) وە کتێبی (ئێمەو شارستانێتی رۆژئاوا) وە کتێبی (بنەمایەکانی ئیسلام) کە بۆ زیاتر لە(٣٠) زمان تەرجەمە کراوە![1]

## سێ: دامەزراندنی کۆمەڵی ئیسلامیی:

(أبو الأعلى المودودي) لە یەکێك لەژمارەکانی گۆڤاری (ترجمان القرآن)دا لەمانگی (ئیبریل /١٩٤١)دەرچووە نووسیویەتی:[2]

(هەبوونی کۆمەڵێکی راست لەبانگ کردنی بۆ لای خوادا، پێویستە، کۆمەڵێك کە پەیوەندی لەگەڵ هەموو شتێکدا جگە لەخواو بەرنامەکەی بپچڕێنێ، کۆمەڵێك کە تەحەمولی گیران و ئەشکەنجەو ماڵ و سامان لێزەوت کران و تۆمەت و بوختان بۆ هەڵبەستران بکات و، لە بەرانبەر برسیەتیو تینوێتیو بێبەش بوون و ئاوارەییو بگرە کوشتن و لەسێدارەدانیش دا خۆڕابگرێ، کۆمەڵێك کە گیانیان بەهەرزانیی لەڕێی خوادا ببەخشن و بەدڵ ئاسوودەیی دەست لەهەرچی هەیانە هەڵگرن و هەموو شتێکیان لەڕێی بەرپاکردنی کۆمەڵگای ئیسلامییو سیستەمەکەیدا بەخت بکەن).

پاشان نووسیبووی:

(هەموو ئەوانەی کە ئارەزوومەندی کارێکی وان با لەڕۆژی (٢٥/ ئوغسطس / ١٩٤١)دا لەشاری (لاهوور) کۆببنەوە بۆ لێکۆڵینەوەی بنیاتنانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی بەشێوەیەکی ڕێك و پێك).

وە سەرەنجام لەبەرەبەیانی رۆژی (٢٤ /ئوغسطس /١٩٤١)دا (٧٥)پیاو کۆبوونەوەو کاکڵەو بناغەی کۆمەڵی ئیسلامیی (الجماعة الاسلامية)یان پێك هێنا.

مسوڵمانێکیش بەناوی (سید شودري) زەوییەکی وەقف کراوی خۆی کەپێشتریش لەساڵی (١٩٣٨)دا بەخشی بووی[3] بە(أبو الاعلى)و هەندێك لەهاوەڵەکانیو ناویان لێنابوو (دار الاسلام)، پێی بەخشین و، (أبو الاعلى)و کۆمەڵە ئیسلامییە ساوایەکەی تێیدا

---

[1]– هەمان سەرچاوە، ص٢٣،٢٥.

[2]– بڕوانە: (أبو الأعلى المودودي)ی أحمد إدريس، ص٤٦.

[3]- بڕوانە: (أبو الأعلى المودودي)ی أحمد ادريس، ص٤٠، ٤١، ٤٢، ٤٣.

نیشتەجێ بوون، لەساڵی (١٩٤٢)ەوە هەتا ساڵی (١٩٤٧) کە هیندستان دابەش کراو، پاکستان و بەنگلادیشی لێجیاکرانەوە.[١]

ئێستاش با بۆ زیاتر شارەزاییو بەرچاوڕوونی لەبارەی نەخشەو بەرنامەی کارو خەباتی ئەبوولئەعلاو کۆمەڵە ئیسلامییەکەیەوە لەسێ بڕگان دا سەرنجی هەرکام لە:

ئامانج (الهدف)و، سێ بنەما گرنگەکان (القواعد الثلاثة المهمة)و، پێنج شێوازەکانی بانگەواز (الأساليب الخمسة للدعوة) بدەین:

## ١- ئامانجی کۆمەڵی ئیسلامیی:

کۆمەڵی ئیسلامیی لەپاکستان ئاوا باسی ئامانجی خۆیانیان کردوە:[٢]

(مەبەست و ئامانجی کۆمەڵی ئیسلامیی لووتکەی هیوای سەرجەم خەبات و تەقەللاکانی بریتیە لەبەرپاکردنی ئایینی خوا (إقامة دين الله) یان بەرپاکردنی سیستەمی ئیسلامیی، وە بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خواو گەیشتن بەڕزگاربوون لە دوارۆژدا، وە مەبەست لەبەرپاکردنی ئایین تەنها بەش و لایەنێکی نیە، بەڵکو تێکڕای ئایینی خوایە بەتەواویی، چ پەیوەندی بەتاکەوە هەبێ چ بەژیان و گوزەرانی کۆمەڵگاوە، واتە چ نوێژو ڕۆژوو حەج و زەکات بێ، چ ئابووریو کۆمەڵایەتیو شارستانێتیو سیاسەت، چونکە هیچ بەشێکی ئیسلام هەرچەندە سادەش بێت ناپێویست نیە، بەڵکو ئیسلام هەمووی گرنگ و پێویستە...جا ئەو شتانەی کە تاك (فرد) بەتەنیا دەتوانێ بەڕێوەیان بەرێ باخۆی بەتەنیا لەژیانی تاکیی خۆیدا ئەنجامیان بدات، بەڵام ئەو شتانەی کە بەکۆمەڵ نەبێ ئەنجام نادرێن و پەکیان لەسەر هەوڵ و کارو خەباتی هەرەوەزیی کەوتوە، ئەوە لەسەر بڕواداران پێویستە کە کۆمەڵ و ڕێك و پێکیەك لەنێو خۆیان دا بهێننەدی بۆ ئەنجام دانیان).

## ٢- سێ بنەما گرنگەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی:

مامۆستا مەودوودیی (١٠) مانگ پاش دامەزراندنی کۆمەڵە ئیسلامییەکەی لەشاری (لاهوور)، شاری ناوبراوی بەخۆیو کۆمەڵەکەیەوە بەجێهێشت و لەو زەوییە وەقف

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ص٤٦.

٢ - بڕوانە: (أبو الأعلى المودودي)ی خليل أحمد الحامدي، ص٣٢، ٣٣.

کراوەدا کە پێشتر باسمان کردو پێی دەگوترا: خانووی ئیسلامیی (دار الإسلام) سەقامگیر بوو، مەبەستیشی لەهەڵبژاردنی ئەو شوێنە دوور لەئاوەدانییەو ئارام و هێمنە ئەوەبوو، کە جێگاو ڕێگایەکی دوور دەست و هێمنی دەست بکەوێ بۆ تێدا دارشتنی بنەو بنچینەکانی کۆمەڵەکەیەو، تێدا پەروەردەکردنی ئەندام و کادیرە بناغەییەکانی[1]، جا مامۆستا (أبو الأعلى) لەسەر ئەم سێ بنەماو بنچینە گرنگانە بناغەی کۆمەڵەکەی خۆی دارشت:

### أ- ئیمانی دامەزراوو خووڕەوشتی تەواو:

یەکەمین بنەمای گرنگی کۆمەڵی ئیسلامیی ئەوەبوو کە ئەندامەکانی وێڕای ئیمان و ە یدەیەکی راست و ساغ و نەلەخشاو، خووڕەوشت و ئەدەبێکی بەرزو تەواویشیان هەبێ، مامۆستا مەودوودیی لەوبارەوە گوتوویەتی:[2]

(بە ئەزموونی خۆم بۆم دەرکەوتوە کە ئەو هۆکارەی بۆتە مایەی شکست و فەشەلی بزووتنەوەو بانگەوازەکان ئەوەبووە، کە کەسانێکی پەروەردە نەکراوو رەوشت ناتەواو هەڵکەوتوون و سەرەنجام لەبەرچاوی خەڵکی بێزراون و کەوتوون..)

پاشان گوتوویەتی: (کەواتە: گرنگ ئەوە نیە کەخەڵکی زۆرو زەوەند لەکۆمەڵ و بانگەوازەکەمان خڕبکەینەوە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە کەسانێك کۆبکەینەوە لەپاکییەو چاکییدا نموونەو سەرمەشق بن و هەر سپاردەیەکیان تەسلیم بکەین، دڵنیا بین کە سپاردەکانمان بەکەسانێکی ئەمین سپاردوون!)

### ب- دیسپلین و (ضبط و ربط)ێکی حیزبی پتەو:

ئەمیش دووەمین بنەمای گرنگی کۆمەڵی ئیسلامیی مامۆستا مەودوودیی بوو، کە خۆی لەو بارەوە گوتوویەتی:

(یەکێك لەهۆیەکانی رووخانی بانگەوازو کۆمەڵەکان لاوازیی دیسپلین و ڕێکوپێکییەتی، بۆیە بڕیارمان دا کە زەبت و ڕەبطی کۆمەڵەکەمان زۆر پتەوو مەحکەم بێت و هیچ جۆرە سستیو لاوازییەك قبووڵ نەکەین، وە ئامادەبین کە خۆشەویست

---

١- هەمان سەرچاوە، ص٤٣.

٢- بڕوانە: (أبو الأعلى المودودي)ی خلیل بن أحمد الحامدي، ص٣٧، ٣٨.

ترین کەسمان لێمان جیابێتەوەو شلیی‌و خاویی‌و بێسەرەو بەرەیی لەهیچ کەس قبوول نەکەین، چونکە بێگومان کۆمەڵێکی ژمارەکەمی تۆکمەو پتەوو پێکەوە جۆشدراو، بەسەر ئاپۆڕایی‌یەکی زەبەلاح و بێ نێوەڕۆك دا زاڵ دەبن، بۆیە لەمەرجەکانی ئەندامێتی کۆمەڵەکەمان داماننا کە دەبێ ئەندام پابەند بێت بە فەرزەکان (فرائض)ەوەو دوورە پەرێز بێت لە گوناهە زلەکان (الكبائر)، وە ئەمە لای کەمیی مەرجەکانەو هەرکەسێك ئەمەی لەتوانادا نەبێ، ناتوانێ ئەندامێکی کۆمەڵەکەمان بێت).

### ج- پێکەوە گرێدانی شارەزایی شەرعیی و رۆشنبیریی هاوچەرخ:[1]

ئەمیش مامۆستا مەودوودیی بە سێیەمین بنەمای گرنگی کارو خەباتی کۆمەڵە ئیسلامی‌یەکەی داناوەو مەبەستیشی پێی ئەوەیە کە پێویستە ئەندام و کادیرانی کۆمەڵی ئیسلامیی هەم شارەزای زانیاری‌یە شەرعیی‌یە پێشووەکان (العلوم الشرعية القديمة) بن و، هەم ئاگاداری زانست و رۆشنبیریی هاوچەرخ (المعرفة والثقافة العصرية)یش بن، چونکە کۆمەڵێکی ئیسلامیی کە دەیانەوێ دووانەتی (إزدواجية) نێوان دین و ژین و ئەفسانەی لەیەك پچڕاندنی دین و دەوڵەت و سیاسەت و عیبادەت هەڵبوەشێننەوە، پێویستە هەرکام لەشارەزایی بەئایین (الفقه في الدين)و ئاشنایی بەژین (فقه الحياة) لەخۆیدا کۆبکاتەوە.

ئاشکراشە کە هەرکام لەم سێ بنەمایە بۆ هەر کۆمەڵ و بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی پێویستن.

## ٣- پێنج شێوازەکانی بانگەواز:[2]

مامۆستا مەودوودیی (رەحمەتی خوای لێ بێ) لەبانگەوازکردن (دعوة)یدا ئەم پێنج شێوازەی رەچاوکردوون و ئەندام و کادیرانی حیزبەکەیشی لەسەر پەروەردە کردوون:



١- هەمان سەرچاوە، ص٤٤.

٢- هەمان سەرچاوە، ص٤٦تا٥٣، بەڵام هەندێك لەشێوازەکان، خۆم زیاتر شەرحم کردوون و چەمك و واتایانم روون کردۆتەوە.

### أ- شێوازی جوتیار:

مامۆستا (مَودودي) بابای بانگەواز وەك جوتیار (فلاح)ێك دادەنێ، كە پارچە زەوییەكی تەسلیم دەكرێو ئامادەی دەكات بۆ كشتوكاڵ و سەرەتا دەیكێڵێ، پاشان پاكی دەكاتەوەو هەڵیدەوێژێرێ، ئنجا تۆوی تێدا دەوەشێنێو، پاشان ئاوی دەدات و بژاری دەكات و پەینی پێدەكات و دەرمانی پێدەكات و مشووری دەخوات و پاسەوانی لێدەكات و...هتد هەتا بەروبوومەكەی دێتە بەرهەم.

كەواتە بابای بانگەوازكاریش دەبێ ئاوا بەوردیو هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵ بانگ كراوەكان (مدعويين) خەریك بێت.

### ب- شێوازی پزیشك:

مەبەستی مامۆستا (أبو الأعلى) لەوشێوازە ئەوەیە كە وەك چۆن بابای پزیشك جۆرەها نەخۆشی دێتە بەردەست و هەركامێكیان نەخۆشییەكی تایبەتی هەیەو پێویستی بەچارەسەرێكی تایبەتیش دەكات، بابای بانگەوازكاریش بەهەمان شێوەیەو لەگەڵ هەركەسێك دا بدوێ، پێویستە سەرەتا دەركی نەخۆشییەكەی بكات و چاك چاك لێی وردبێتەوە ئنجا بەپێی دەردو نەخۆشییەكەیو بەگوێرەی سروشت و میزاجی چارەسەری بۆ دیاری بكات.

### ج- شێوازی پۆلێن كردن:

ئەمیش یەكی دیكەیە لەشێوازە سەركەوتووەكانی كاری بانگەوازی قوتابخانەی مامۆستای مەودوودیی، كە مەبەستیش لەپۆلێن كردن (تصنیف) ئەوەیە كە هەركام لە توێژەكانی كۆمەڵگا بەجیاو شێوەیەكی تایبەت و پسپۆڕانە كاری لەسەر بكرێ، ئەمیش لەرێی پێكهێنانی یەكیەتییە پیشەییەكان (الإتحادات المهنية)ەوە وەك، قوتابیو خوێندكاران و پزیشكان و ئەندازیاران و كارمەندان و جوتیاران و كرێكاران و....هتد.

دیارە ئافرەتانیش دەگونجێ بەجیاو، دەشگونجێ هەر لەریزی پیاوان دا كارو چالاكییان بۆ دیاریبكرێو ئاڕاستە بكرێن.

### د- شێوازی لەگرنگترەوە بۆ گرنگ چوون:

ئەم شێوازە زۆر بواران دەگرێتەوە :

- لەڕووی خستنەوە ڕووی ئیسلامەتییەوە، ئیمان و عەقیدە پێش شتەکانی دی دەخرێت.
- لەڕووی تێگەیاندنی خەڵکەوە، بابەت و مەسەلە گەورەو جەوهەرییەکانی دەخرێنە پێش وردە بابەتەکانەوە.
- وە لەڕووی ڕاکێشان و هۆنینەوەی جەماوەرەوە، ئەهلی فیکرو قەڵەم و سیاسەت و کەسانی کاریگەر لەسەر دەوروبەر پێش غەیری خۆیان دەخرێن.

وە لەڕووی ڕیشەکێش کردن و لابردنی ناشەرعیی (منکر)یەکانەوە، ناشەرعیی گەورە (المنكر الأكبر) پێش ئەوانی دی دەخرێت، کە بریتیە لەحوکمڕانییکردن بەغەیری ئەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار (الحكم بغير ماأنزل الله)، چونکە ناشەرعییەکانی دی گشتیان لق و پۆپ و زادەو بەرهەمی ئەو ناشەرعییە زلەن! وە هەروەها..

### هـ - کارتێکردنی خەڵکی، بەکردەوە پێش قسە:

مەبەست لەم جۆرە شێوازەش ئەوەیە کە بابای بانگەوازکار دەبێ بەجۆرێك پەیام و بانگەوازەکەی لەخۆیدا بەرجەستە بکات و بدرەوشێنێتەوە کە بەر لەقسەو وتاری بەکردەوەو ئاکاری، ئیسلام بخاتە بەرچاوی خەڵك و پێشانیان بدات کە خواپەرستیی چییەو پارێزکاریی چۆنەو بەخشندەییو ئازایەتیو جورئەت و دڵسۆزییو چاکەکارییو دەستپاکییو ...هتد چین و چۆنن؟!

## چوار: هەوڵ و تەقەللای بێوچان، بۆ پێکهێنانی کیان و دەوڵەتی ئیسلامیی:

هەڵوێستێکی دیکەی زێدە مەردانەو جوامێرانەی مامۆستای پایەبەرزمان (أبو الأعلى المودودي) (خوالێی خۆش بێ) بریتیە لەهەوڵ و تێکۆشانی بوێرانەی بۆ هێنانەدی ڕێسایەکی ئیسلامیی (دستور إسلامي)و لەسەر بنیات و پێکهێنانی دەوڵەت و قەوارەیەکی ئیسلامیی لەپاکستان.

شایانی باسیشه كه هەوڵ و خەبات و جیهادی مامۆستا مەودوودیی لەو بوارەدا بەگەورەترین كارو چالاكی ئیسلامییانەی دادەنرێ‌و زۆرترین وزەو توانای خۆی‌و زیاترین ساڵەكانی تەمەنی خۆی بۆی تەرخان كردبوو.

جا هەوڵ و تێكۆشانی مامۆستای پایەبەرز لەو بوارەدا لەدوو شێوەی سەرەكی‌دا خۆی دەنوێنێ‌و دوو جۆرە ڕێبازی بۆ گرتوونەبەر:

## یەكەم: ڕێبازی تیۆریی (الطريقة النظرية):

مەبەستیشمان لەم ڕێبازو شێوازەی كارو خەباتی مامۆستا مەودوودیی بۆ هێنانەدی قەوارەو دەوڵەتی ئیسلامیی، ئەوەیە كە چەندان كتێب و نامیلكەی لەوبارەوە نووسین و چەندان كۆڕی بەستن و وتاردان بۆ بەرچاو ڕوونكردنەوەی خەڵكی بۆ وێنە:

- [بنچینەكانی ئابووریی لەنێوان ئیسلام و سیستەمە هاوچەرخەكان دا].
- [چەند بۆچوونێك لەبارەی دین و دەوڵەتەوە]
- [بنچینەكانی ڕێسای ئیسلامیی لە قورئان دا]
- [ڕێكخستنی ڕێسای ئیسلامیی (تدوين الدستور الإسلامي)]
- [خیلافەت و پادشایەتیی(الخلافة والملكية)]

## دووەم: ڕێبازی كردەیی (الطريقة العملية):

مەبەستیش لەو ڕێبازو شێوازە ئەوەیە كە ڕێزدار مەودوودیی بەهۆی گەڕان و گەشت (جولة) كردن بەشارەكانداو سازدانی كۆڕو ڕێپێوان (مسيرة)و خۆپێشاندانی جەماوەریی‌و نامە ناردن و كۆكردنەوەی زانایان و... هتدەوە، كە چەند جارێك سەری‌كێشا بۆ پەلكێش كردنی هەتا قەراغی مەرگ، هەوڵی‌دا كە فشارو گوشار بخاتە سەر حوكمڕان و كاربەدەستەكان بۆ دان هێنان بە دەستوورێكی ئیسلامیی‌دا بۆ دەوڵەتی تازە بنیات نراوی پاكستان، وە لەمانگی مارتی (١٩٤٨)دا لەشاری (كراتشی) كۆمەڵی ئیسلامیی، كۆبوونەوەیەكی گشتی كردو مامۆستای فەرماندە (أمير)یشی بەزۆربەی شارە گەورەكانی

پاكستان دا گەڕاو داواى لەخەڵكى دەكرد كە ئەم چوار داواكارىيەيان لەدەوڵەت هەبێو جەختيان لەسەر بكەن:[1]

١- لە پاكستان دا حوكم تەنها بەدەست خوايەو حكوومەتيش بێجگە لەجێبەجێكەر (مُنَفِّذ) حوكم و بەرنامەى خوا چى دى نيە.

٢- شەريعەتى ئيسلاميى دەستوور (القانون الأساسي)ى پاكستانە.

٣- پێويستە تێكڕاى ئەو ياسايانەى كە ئێستا كاريان پێدەكرێو لەگەڵ شەريعەتى ئيسلام دا دژن، لابـبرێن و لەمەودواش هيچ ياسايەكى لەگەڵ شەريعەت دا نەگونجاو دانەنرێ.

٤- دەبێ حكومەتى پاكستان لەسنوورەكانى شەريعەتى ئيسلام دا دەستەڵاتەكانى سنوردارو مەرجدار بكرێن.

ديارە حكومەتى عەلمانيى (سيكۆلاريست)ى پاكستان بەو هەوڵ و تەقەللايانەى مەودووديىو كۆمەڵەكەى كێچى كەوتە كەوڵ و كەوتە پيلان گێڕان و نەخشەدانان بۆ گرتنىو سەرەنجام لە (٤ى ئۆكتۆبەرى١٩٤٨) راپێچى زيندان كرا، هەرچەندە لەوكاتەدا نەخۆشىو ئازارى گورچيلەى زۆر تينى بۆ هێنابوو، لەحەپسخانەش دا چارەسەركردنيان لێقەدەغەكرد.[2]

پاشان رژێمى لائيكى ئەوساى پاكستان لە (ئۆكتۆبەرى ١٩٤٩)دا بڵاوكراوەيەكى لەسەر مامۆستاو دوو هاوەڵە گيراوەكەى: (ميان طفيل محمد و مولانا أمين أحسن إصلاحي) بڵاوكردەوەو وەك بيانوويەك بۆ درێژكردنەوەى حوكمى گيرانەكەيان، ئەم سێ تۆمەتەى دابووە پاڵيان:[3]

١- هەڕەشەكردن لەسەلامەتىو ئاسايشى پاكستان.

٢- هەوڵدان بۆ لەقكردنى متمانەو وەفاداريى گەل بەرانبەر بەدەوڵەت.

٣- وابەستەو كرێگرتەيى بۆ دەوڵەتێكى بێگانە.

---

١- بڕوانە: (أبو الأعلى المودودي)ى خليل بن أحمد الحامدي، ص٥٥. وە (أبو الأعلى..)ى أحمد إدريس ص٥١.

٢- سەرچاوەى پێشوو، ص٥٦، وە ص٥٥.

٣- بڕوانە: (أبو الأعلى المودودي)ى أحمد إدريس ص٥٦.

جا كاتێك مامۆستا مەودوودیی (بیـان)ی نـاوبراوی خوێنـدەوە نامەیـەكی ئاڕاستـەی حكومەت كرد كەتێیدا گوتبووی:[1]

(...من تەحەددای حكومەتەكەتان دەكەم كە ئەگەر زانیاریی وای لایە كە خـۆم یـان یەكێك لەهەواڵەكانم تاوانێـك لەوانـەی ئـەنجام داوە كـە باسـتان كـردوون، ئەگـەر توانـای ئیسپات كردنی هەیە باپێشانی بدات و بڵاوی بكاتەوەو نەیشارێتەوەو لـەڕێی هۆیـەكانی ڕاگەیاندنیشەوە دەرفەتی وەڵامدانەوەو بەرپەرچ دانەوەم بدەنێ...)

بـەڵام حكوومـەت لەبەرانبـەر ئـەو تەحـەددا كردنـەی مامۆسـتادا پـەنای بـردە بـەر بێدەنگیی‌و لەحەپسخانەش دا بـەبێ پاسـاوو بەڵگـە، مـاوەی (٢٠) مـانگ هێشـتیەوەو، ئەویش لەو ماوەیەدا هەندێك لەبەرهەمەكانی تەواوكردن و نووسینی.

شایانی باسیشە كە (مـودودي) پـاش قوتـار بوونیشـی لەحـەپس لەسـەر داواكـاریی بنـەڕەتیی خـۆی كـە ڕاگەیانـدنی دەسـتوورێكی ئیسـلامیی‌یەو پێكهێنـانی دەوڵـەتێكی ئیسلامیی‌یە، هەر بەردەوام بوو، هـەتا سـەرەنجام لـەڕۆژی (٢٣ی مـارتی ١٩٥٦)دا پـاش ئەوەی كۆمەڵی ئیسلامیی (الجماعة الإسلامية)و (جمعيـة أهـل الحـديث)و (جمعيـة الطلبـة العربيـة)و (٥٠٠) لـەزانایان و شـێخانی طـەریقـەت تێیـدا بەشـداربوون و، تێكـڕا داوای دەسـتوورێكی ئیسـلامیی‌یان كـرد بـۆ وڵات، لەمێـژووی نـاوبراو (٢٣ی مـارتی ١٩٥٦)دا بـەڕەسمیی پەسـەندكرانی دەسـتووری ئیسـلامیی بـۆ وڵات ڕاگەیەنـدراو، مامۆسـتا مەودوودییش لەنامەیەكی‌دا كە ئاڕاستەی گەلی پاكستانی كردبوو، گوتبووی:[2]

(ئـەمڕۆ وەك گـەلێكی ئـازاد ژیانمـان دەسـت پێ‌دەكـەین، گـەلێك كـە لـە دەسـتوورەكەی‌دا دانـی بـەوەدا هێنـاوە كـە حـوكم و یاسـادانان تـەنها هـی خوایـەو، حوكمڕانـان دەسـتەڵاتی حـوكمڕانیی وەك سپاردەیەك لـەخواوە وەردەگـرن و لـەجوغزو سنوورەكانی شەریعەتی خوادا مومارەسەی دەستەڵاتی حوكمڕانیی دەكەن...)

دیارە مامۆستا مەودودیی پـاش هێنانـەدی ئامـانجی یەكـەم (الهدف الأول) خەباتـە سیاسیی‌یەكەی كە دان پێداهێنرانی دەستوورێكی ئیسـلامیی‌یە بۆ پاكسـتان، هـەتا دوا

١- سەرچاوەی پێشوو، ص٥٧،٥٨.

٢- بڕوانە: (أبو الأعلى المودودي)ی خليل بن أحمد الحامدي، ص٦٥. وە (أبو الأعلى..)ی أحمد إدريس ص٦٨.

هەناسەی ژیانی بۆ هێنانەدی ئامانجی دووەمیشی کەپێکهێنانی دەوڵەتێکی ئیسلامیی‌یە هەر لەهەوڵ و تەقللادا بوو و سرەوتنی نەبوو و نەبوو.. !

## پێنج: هەڵوێستی بوێرانەی لەبەرانبەر قادیانی‌یەکان داو حوکم درانی بەسێدارە:

جووڵانەوەی قادیانی‌یەکان (القادیانیة) کە (میرزا غلام أحمد) دامەزرێنەریەتی کۆمەڵێکی لەبازنەی ئیسلام دەرچوون، چونکە پێیان وایە کە (میرزا)یەکەیان وەحی‌و پەیامی خوایی بۆ هاتوەو گەلێك شتی دیکەشیان هەیە.

جا لەساڵی (١٩٥٣)[١]دا، لەهەرێمی پەنجاب (إقلیم البنجاب)مسوڵمانان دەستیان بەنارەزایی دەربرین و خۆپێشاندان کردو، سەرەنجام ئاژاوەو کوشتارێکی زۆریش لەنێوان مسوڵمانان و قادیانی‌یەکان دا ڕوویدا کە کەسانێکیان پلەوپایەو بەرپرسیارێتی گەورە گەورەیان هەبوو لەدەوڵەت دا.

جا وەك گوتراوە: (تیغی رەسەن خۆی لەکالاندا ڕاناگرێ) لەو ئان و ساتە دژوارەدا مامۆستا مەودوودیی وەك شێر لەبێشە هاتەدەرێو نامیلکەیەکی گچکە بەڵام گرنگی لەوبارەوە نووسی بەناوی (ختم نبوت) کە بەعەرەبی بەناوی (المسألة القادیانیة)وە وەرگێڕراوەو، تێیدا زۆر بەڕاشکاویی ڕایگەیاندوە کە پێڕی قادیانی‌یەکان کەمینەیەکی نامسوڵمان (أقلیة غیر مسلمة)ن چونکە بڕوایان بەوە نیە کە بە(محمد) کۆتایی بەپێغەمبەرایەتی هاتوە، وە نامیلکەی ناوبراوی لەماوەی دوو مانگ دا (١٠٠,٠٠٠) نوسخەی لێبڵاوکرایەوە ![٢]

جا لەسۆنگەی ئەوەوە رژێمی عەلمانیی پاکستان لە (٢٨ی مارتی ١٩٥٣)دا بەبیانووی ئاژاوە نانەوە مامۆستا مەودوودیی گرت، وەپاش دادگایی‌کردنێکی ڕواڵەتیی (محاکمة صوریة) حوکمی لەسێدارەدان (الأعدام)ی بەسەردا دا !

---

١- سەرچاوەکانی پێشوو، ص٦٢،٦٣، وە ص٦٣.

٢- بڕوانە: (أبو الأعلى ...)ی أحمد إدریس، ص٦٣، وە سەرەنجام لەساڵی (١٩٧٤) ئەو مەسەلەیە سەری گرت و دەوڵەتی پاکستان بەڕەسمی ئەوەی سەلماند کە قادیانی‌یەکان موسڵمان نین.

جا کاتێك ئەفسەری بەرپرس هات و بڕیاری لەسێدارەدرانی تەسلیمی مامۆستا مەودوودیی کرد، پێشەوا مەودوودیی بەزەردەخەنەوە گوتی: (الحمدللّهِ علی کل حال)، وە کاتێك ئەفسەر (ضابط)ەکە پێی گوت: ئەی شێخ دەتوانی لەماوەی یەك هەفتەدا داوای لێبوردن (إسترحام) بکەی! مامۆستا دەم وچاوی وەك ئاگری سوور گەرم بوو گوتی: (داوای بەزەیی لەهیچ کەس ناکەم چونکە بڕیارەکانی ژیان و مەرگ لەزەمینەوە دەرناچن بەڵکو لەئاسمانەوە دەردەچن، جا ئەگەر لەئاسمانێ بڕیاری مەرگم درابێ، ئەوە هیچ کەس بۆی قوتار ناکرێم، بەڵام ئەگەر لەوێ بۆم بڕیار نەدرابێ هیچ کەس ناتوانێ هێندەی موویەك زیانم پێبگەیەنێ!)[1]

دیارە مسوڵمانان چ لەپاکستان و چ لەدەرەوەی پاکستان زۆر تووڕەو نارەحەت بوون بەبیستنی ئەو هەواڵەو هەبوو بەبیستنی گیانی سپارد، بۆ وێنە: (سید أحمد حکیم) کە یەکێك بوو لەبنیاتنەرانی کۆمەڵی ئیسلامیی[2]، وە لێشاوی نامەو برووسکەی نارەزایی لەسەرجەم کەسایەتییو کۆمەڵ و دام و دەزگا ئیسلامییەکانەوە رژایە سەر حکوومەتی پاکستان، بۆ وێنە:

شێخ ئەمجەد زەهاویی، پێشەوای ئەهلی سوننەت لەعێراق.

شێخ موحەممەدی خالیصی، پێشەواو موجتەهیدی گەورەی شیعەی عێراق.

شێخ ئەمینی حوسەینی، موفتی گەورەی فەلەسطین.

برایانی مسوڵمان (الإخوان المسلمين) لەمیصر.

یسای ئەنصاریی، لەجیاتی حیزبە ئیسلامییەکانی ئەندەنووسیا.

شێخ موحەممەد بەشیری ئیبراهیمی جەزائیریی.

ئەمانەو جگە لە وتاردان و نووسین و خۆپیشاندان و.... هتدی زۆر.[3]

بۆیە سەرەنجام پاش دوو ڕۆژان حوکمی مامۆستا لەسێدارەوە گۆڕا بۆ گیرانی هەمیشەیی (السجن المؤبَّد) کە ماوەکەی لەپاکستان(٢١)ساڵە, پاشان دوای(٢٥)مانگ

---

١ –بڕوانە: (أبو الأعلی المودوودي)ی خليل بن أحمد الحامدي، ص٦٣. وەهی(أحمد إدريس) ص٦٥.

٢– بڕوانە: (أبو الأعلی..)ی أحمد ادريس ص٦٥.

٣– هەمان سەرچاوەی پێشوو.

مانەوە لە حەپسخانە دادگای باڵا (المحلكمة العليا) لەشاری (لاهوور) تانەی لەحوكمی دادگای سەربازیی (المحكمة العسكرية)داو حوكمەكەی هەڵوەشاندنەوە بڕیاری بەردانیدا.

### موژدەیەكی خۆش:

(میان رحیم بخش) گێڕاویەتەوەو گوتوویەتی:[1]

(كاتێك ئەو هەواڵە دڵتەزێنە (حوكم درانی مامۆستا مەودوودیی بەمەرگ)م بیست، خەوتم لەخەونم دا كەسایەتیەكی مەزن و پایەبەرزم بینی هاتە دڵمەوە كە ئەوە پێغەمبەری خوایەو دەستم كرد بەسەرنج دانی، ئەویش رووی بەرەو ئاسمان بەرز كردبووەوە، ئیدی هەر هێندەم زانی رووناكیەك ئاسمانی پڕكردو دەنگێك هات، بانگی كرد: ئەی موحەممەد چیت دەوێ؟! پێغەمبەریش سەجدەی بردو پاشان سەری بەرزكردەوەو فەرمووی: ئەی خوایە بەزەییت! مەودوودیی بەرگریی لە ئایینەكەت دەكات و مسوڵمانانیش پێویستیان پێیەتی، ئیدی هەر هێندەم زانی جم و جوڵێكی گەورەو دەنگێكی شكۆدار شكۆدار هات، دەیفەرموو: ئەی موحەممەد! پاڕانەوەتمان وەرگرت! منیش یەكسەر بێدابوومەوەو بانگی بەیانی گوێی پڕدەكردم و بەگریان و ترسانەوە هەڵسام و ماوەیەكی زۆر كش و مات بووم).

دیارە كاتێكیش مامۆستای موجاهید بەردرا بەرێپێوان و پێشوازییەكی جەماوەریی یەكجار گەورەو قەڵەباڵغەوە، كەتێكڕای چین و توێژەكانی گەلی تێدا بوون بەخێرهاتنەوەی كراو، چەندان كۆڕو كۆبوونەوەو ئاهەنگی خۆشیو شادیی سازكران بەوبۆنەیەوە[2].

### شەش: رێگا نەدان بەدەستكاریكردنی دروشمەكانی ئیسلام:

هەڵوێستێكی دیكەی جوامێرانەی مامۆستا مەودوودیی (خوا لێی خۆش بێ) ئەوەیە كە لەساڵی (١٩٧٥) جەژنی رەمەزان كەوتە جومعەوە، جا (أیوب خان)ی سەرۆكی رژێم قەناعەتی بەو ئەفسانەیە هەبوو كە ئەگەر بێت و وتاری جەژن و وتاری جومعە لەیەك

---

١- هەمان سەرچاوە, ص٦٥،٦٦.

٢- هەمان سەرچاوە، ص٦٦،٦٧.

ڕۆژدا بدرێن، ئەوە شتێکی شوومەو نیشانەی کۆتایی پێهاتنی حوکمڕانیی ئەو شوێنەیە! بۆیە (أیوب) ئەمری دەرکرد کەدەبێ ڕۆژی پێنج شەممە بکرێتە جەژن و دەبێ پێنج شەممە خەڵکی بەڕۆژوو نەبن! بەڵام مەودوودیی شێرەپیاو ئەمجارەش –وەك دەیان جاری دی– ڕاپەڕیو ڕایگەیاند کە جەژن بەگوێرەی دیترانی مانگی نوێ (هلال)یەو مادام مانگی یەك شەوە دیترابێ، هەر بەڕەمەزان دادەنرێ! دیارە ئەییوبی دیکتاتۆر هەر ئەو هەڵوێستە هەق و شەرعییانەیەی مامۆستا مەودوودیی پێهەزم نەکراو گرتی! بەڵام مسوڵمانان تێکڕا ڕۆژی جومعە کردیانە جەژن بۆیە (أیوب خان) دوو مانگ مامۆستای بوێرو هەقبێژی لەحەپسخانەدا هێشتەوە! پاش چەند مانگێکیش حوکمڕانیی ئەیوب کۆتایی پێهات و بۆ خەڵکی بوو بەپەندو عیبرەت![1]

### حەوت: دوو قسەی بوێرانە لە دوو کاتی دژواردا:

کۆتایی هەڵوێستەکانی ئەو کەڵە پێشەوایەش بە دوو قسەی کورت، بەڵام گەورەو گرنگ دێنین، لەدوو کاتی زۆر سەغڵەتییو ناسك دا:

### یەکەم: لەبەردەم ئەییوب خانی دیکتاتۆردا:[2]

لەساڵی (١٩٦٠) پاش ئەوەی (محمد أیوب خان) لەڕێی کودەتایەکی سەربازیی (إنقلاب عسكري)یەوە هاتە سەر حوکم، سەردانی شاری (لاهوور)ی کردو داوای کرد مامۆستا مەودوودیی ببینێ، ئەویش بەو هیوایەی سوودێکی هەبێ سەردانی کرد، جا کەچووە لای ئەییوب، ئەییوب پاش ماوەیەك پێهەڵاگوتنی و ستایش کردنی لەسەر خزمەتگوزارییەکانی پێی گوت:

مامۆستای بەڕێز! من پێشنیارم ئەوەیە کە خۆت بۆ کاری بانگەوازو تێگەیاندنی خەڵکی یەکلایی بکەیتەوەو نەچیتە نێو باتلاغ و قوڕو چڵپاوی سیاسەتەوە، پێم وایە ئەمە بۆ گەل و نیشتمانەکەت سوود بەخش ترە!

مامۆستای داناو بوێریش بەڕێزو نەزاکەتەوە لەوەڵامیدا گوتی:

---

١- بڕوانە: (أبو الأعلى المودودي...)ی خلیل بن أحمد الحامدي، ص٧٠.

٢- هەمان سەرچاوە، ص٥١،٥٢.

(جەنابی سەرۆك وەك فەرمووت: سیاسەتی ئەمڕۆ بۆتە باتلاّغ و قوڕو چلّپاو، جا من بۆیە چوومەتە نێوی تاکو لەچلّك و چەپەر خاوێنی بکەمەوەو، وای لێبکەم هێندە راست و پاك بێت دامێنی کەس پیس نەکات و، مایەی خێرو بەرەکەت بێ بۆ نیشتمان و دانیشتووانی!)

خۆزگە خۆزگە هەموو مامۆستایەك و پێشەوایەکی مسولّمانان هەم دەیزانی‌و هەم دەیتوانی بەوجۆرە وەلاّمی ئەو جۆرە قسانەی حوکمڕان و سیاسەتمەدارەکانی ولاّتەکانیان بدەنەوە!

## دووەم: لەکاتی تەقەلێکران و هەولّی تیرۆرکردندا[1]:

لەسالّی (١٩٦٣)دا پاش ئەوەی ئەییوب خان، دەستوورێکی تازەی دیکتاتۆرانەی بەسەر ولاّتی پاکستان سەپاند، کۆمەلّی ئیسلامیی لەمانگی ئۆکتۆبەردا کۆبوونەوەیەکی گشتی‌یان سازدا، جا هەرچەندە رژێم زۆری پێقەلّس بوو وە گەلێك جۆرە پەرچ و کۆسپی بۆ دروست کردن، وەك: پشتگیریی‌کردن لەبەکارهێنانی بلّیندگۆ (منع استعمال مكبر الصوت)! بەلاّم مامۆستای کۆلّنەدەرو کۆمەلّەکەی هەر سووربوون لەسەر ئەنجام دانی ئەو کۆبوونەوەو ئاهەنگە جەماوەرییەیە! جا ئەوەبوو کە چەند دەقەقەیەك دوای دەست کردنی مامۆستا مەودوودیی بەوتاری دەست پێك (الخطبة الإفتتاحية) درایە بەر دەسترێژی گوللە لەلایەن سیخوڕەکانی رژێمەوەو مامۆستا بەرنەکەوتو یەکێك لەوانەی نیزیکی کوژراو خەلّکەکەش زۆر جەختیان لێکرد کە دابنیشێ‌و چی دی بەپێوە وتار نەدات! بەلاّم بێ‌ئەوەی قسەکانی ببڕێ‌و دابنیشێ گوتی:

(جا ئەگەر من دابنیشم کێ بەپێوە دەمێنێ؟!!)

دەك هەزار رەحمەتت لێبێ مەودوودیی[2]! بەلّێ ئەگەر ڕابەرو سەرکردە دابنیشێ‌و خۆی بشارێتەوە، چۆن خەلّکی لەمەیدان دا دەمێننەوە؟! مەگەر پێشەوا (إمام) بۆ ئەوە نیە پێش بکەوێ‌و لەپێشەوە بێت؟!

---

١- هەمان سەرچاوە، ص٦٨،٦٩.

٢- مامۆستای شەهید (سيد قطب إبراهيم) لەچەند شوێنێکی تەفسیری (في ظلال)دا ناوی (مودودي) هەر بە: (المسلم العظيم) دەهێنێ! قەدری زێڕیش هەر لای زەڕەنگەرە!

## ٢١- مامۆستا سەید قطب (رحمة الله تعالى عليه):[١]

(سيد بن قطب بن إبراهيم) كە وەك خۆی گوتوویەتی باپیرەی شەشەمیان لە هیندستانەوە هاتوە، لە (١٩٠٦/١٠/٩)ی زایینی لەگوندی (موشە)ی سەر بە پارێزگای (أسيوط)ی میصر لەدایك بووەو، پاشان لەقوتابخانە خوێندوویەتی لەساڵی (١٩١٢) چۆتە قوتابخانەی سەرەتایییەوەو قۆناغەکانی خوێندنی بەسەرکەوتوویی بڕیوە، هەتا لەساڵی (١٩٢٩)ز چۆتە کۆلێژی (دار العلوم)و لەساڵی (١٩٣٣)دا بڕوانامەی بەکالۆریۆس لەئاداب (البكالوريوس في الآداب)ی وەرگرتوەو لەساڵی (١٩٣٣) لەڕۆژی (١٢/٢) بە دەرسبێژ (مدرس) لەوەزارەتی مەعریف دامەزراوە.

لەساڵی (١٩٤٥) یەکەمین کتێبی ئیسلامیی خۆی نووسیوە کە کتێبی: (التصوير الفني في القرآن)ە.

وە لەساڵی (١٩٤٨) لە ڕۆژی (١١/٣) لەلایەن وەزارەتی مەعاریفەوە بۆ لێکۆڵینەوەی بەرنامەکانی فێرکردن (مناهج التعليم) بەسواری کەشتی چووەتە ئەمریکاو، پاش کەمتر لەدوو ساڵ بەفڕۆکە لە (١٩٥٠/٨/٢٠) گەڕاوەتەوە میصر.

سەیید قوطب چ پێش شۆڕش (ثورة)و چ دواییش بەشداریی‌و هاوکاریی کردوە: واتە شۆڕشی (١٩٥٢)ز کە لەلایەن سوپاوە بەسەر حوکمی پادشایەتیدا کرا، هەتا ساڵی (١٩٥٣)و دەوری کاریگەریشی هەبوو.

بەڵام لەمانگی شوباتی (١٩٥٣)دا چووە نێو ڕیزی کۆمەڵی برایانی مسوڵمان (جماعة الإخوان المسلمين)ەوە.

لەسەرەتای ساڵی (١٩٥٤)دا وێڕای بەرپرسانی دیکەی برایانی مسوڵمان ڕاپێچی زیندان کراو، (٣)مانگ مایەوەو پاشان بەردرا.

---

١– بۆ نووسینی ئەم کورتە ژیانەی (سيد قطب إبراهيم)و گوڵبژێرێك لەهەڵوێستەکانی، سوودم لەم کتێبانە وەرگرتوە بەتایبەت یەکەمیان: (سيد قطب من الميلاد إلى الإستشهاد) د.صلاح عبدالفتاح الخالدي، (سيد قطب من القرية الى المشنقة) عادل حموده، وە (الفكر الإسلامي المعاصر، دراسات و شخصيات: سيد قطب) تأليف: د.أحمد صلاح الديني الموصللي، وە (لماذا أعدموني؟) کە ناوەڕۆکەکەی هی (سيد قطب)ەو بریتیە لەو دان پێداهێنانەو (إعترافات)ەی کە بەرلەکوژرانی بۆ دادگای نووسیون، بەڵام ناونیشانەکەی دوای خۆی دانراوە.

بۆ جاری دووەمیش پاش رووداوی (المَنْشِيَّة) کە لەڕاستیدا (شانۆگەریی)یەك بوو رژێم سازی کرد بۆ بیانوو پێگرتنی (الأخوان المسلمین)، دووبارە لەڕۆژی (٢٦/١٠/١٩٥٤) گیرا لەگەڵ هەزاران کەس لەبرایانی مسوڵمان، کە بە هەوڵی تیرۆرکردنی (جمال عبدالناصر)، تۆمەتبار کرابوون!

لەساڵی (١٩٥٥)ز دا درایە دادگاو (١٥)ساڵ حوکم درا، بەڵام لەساڵی (١٩٦٤)داو بەتەکلیفی سەرۆك کۆماری عێراق (عبدالسلام عارف)و بەهۆی مۆڵەتی تەندروستیی (عفو صحي)یەوە بەردرا.

لەڕۆژی (٩/٨/١٩٦٥) دووبارە دەستگیر کرایەوە دوای ئەوەی (جمال عبدالناصر) لە شاری (مۆسکۆ)!! رایگەیاند کە پیلانێکی برایانی مسوڵمان (الأخوان المسلمین)ی کەشف کردوە، بەسەرکردایەتی سەیید قطب بۆ تیرۆرکردنی و کودەتا کردن (إنقلاب) بەسەر رژێمەکەیدا.

وە لەساڵی (١٩٦٦) لەڕۆژی (٤/٢١) دا، (سید قطب) دادگایی کراو لەڕۆژی (٢١/٨/١٩٦٦) حوکمی لەسێدارەدرانی بەسەردا دراو، خۆیو دوو هاوەڵەکەی (محمد یوسف هواش و عبدالفتاح إسماعیل) حەفتەیەك پاش دەرچوونی حوکمەکەیان شەوی دوو شەممە (٢٩/٨/١٩٦٦) لەسێدارە دران.

خوا مامۆستای بەڕێزو جوامێرو بوێر (سید قطب)و دوو هاوەڵەکەی بەشەهیدی سەربەرزو پایەبەرز وەرگرێت و بەچاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوە.

شایانی باسیشە کە مامۆستا سەیید قوطبی شەهید (خوا لێی خۆش بێ) پاش (أبو الأعلى المودودي) بەخاوەنی گەورەترین کاریگەریی دادەنرێ لەسەر بێداریيو هۆشیاریی ئیسلامیی سەدەی بیست، بەهۆی هەڵوێستە جوامێرانەو بوێرانەکەیەوەو لەڕێی کتێب و بەرهەمەکانیەوە، بەتایبەت تەفسیری (في ظلال القرآن) و (معالم في الطریق)ەکەیەوە کە ناودارترین و کاریگەرترین کتێبی مامۆستای شەهیدن لەنێو (٢٦) کتێبەکەیدا، کە هەندێکیان بەر لەهیدایەت و گەڕانەوەی بۆ لای خوا نوسیوونی.

ئێستاش بەر لەوەی گوڵبژێرێکی هەڵوێستە مەردانەکانی بکەین، بەپەسەندی دەزانم تیشك بخەینە سەر دوو مەسەلەی گرنگی ژیانی سەیید قوطب، کە بریتین لە:

## أ- قۆنـاغی پـێش هیدایـەت درانـی (حاڵـەتی سەرگەردانیـی سـەیید قوطب):

شـتێکی ئاشـکرایە کـە سـەیید قوطـب ماوەیـەك لـەژیانی بەسـەرگەردانیو ڕێ پـێ نەزانیی ژیاوە، کە بـۆ خـۆی لەچـەند شـوێنێکی (في ظـلال القـرآن)ەکەیـدا ئامـاژەی پـێ دەکات، بۆ وێنە:

لەبـەرگی شەشـەمی و لـە لاپـەڕە (٣٣٥٢، ٣٣٥٣)دا باسـی ئـەو ڕابـردووەی خـۆی دەکات و دەڵێ: بەهۆی خواناسیو ئیمانەوە ئەو حاڵەتە دەروونیەی کـە لـەقۆناغێك لـە قۆناغـەکانی سـەرگەردانی (ضـیاع)و دڵـەڕاوکێ (قلـق)م دا تێیـدا دەژیـام، بـەر لـەوەی لەسێبەری قورئاندا بژیم، پەنهان دەبێ و نامێنێ.. ئەو هەستە کە کاتی خـۆی ئـاوا دەرم بڕیوە[1]:

وقف الكونُ حائراً! أين يَمْضي؟! ولِماذا كيفَ لَوْ شاءَ- يَمْضي؟
عَبَـــثٌ ضـــائِعٌ و جُهـــدٌ غَبـــيْنٌ ومَصَـيرٌ مُقَنَّـعٌ لَـيْسَ يُرْضِـي

بەڵێ سەیید قوطب چەند ساڵێك[2] لەژیانی، بەر لەساڵی (١٩٤٠) لە حاڵەتێکی گومـان و دڵـەڕاوکێو سەرسـامیو حەیرانییـدا ژیـاوە، بـەڵام شـارەزایانی ژیـان و گـوزەرانی و ئاشنایانی لەسەر ئەوە کۆك و یەکدەنگن کە سەیید قوطب لادان و سەرگەردانییو ڕێ پێ نەزانینیەکـەی، تـەنها بیریـی (فکـری) بـووەو ڕەوشـتیی (سـلوکی)نەبووە[3]. هەرچـەندە و سەرگەردانیی سەیید قوطب و هەرکەسێکی دیکـەش هـەر جۆرو شـێوەیەك بێـت مـادام

---

١- دوو دێڕن لە قەصیدەی (یوم خریف) کـە لەسـاڵی (١٩٣٢)دا داینـاوە، بڕوانـە (سـید قطـب مـن المـیلاد..) ص٢٦٣.

٢- بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص٢١٤،٢١٥، دیارە ئەو حاڵەتە سەیید (١٥) ساڵ درێژەی بووە لـە (١٩٢٥) تا (١٩٤٠).

٣ - هەمان سەرچاوە، ص ٢١٨،٢١٩.

هیدایەت و ئیمان و پارێزکاریی بەدوادا بێت، گرنگ نیەو وەك پێغەمبەری خواﷺ بە (عمرو بن العاص)ی فەرموو: (الإسلام يَجُبُّ ما قَبلَهُ)[1].

### ب- هۆکاری ژن نەهێنانی سەیید قوطب:

شتێکی ئاشکرایە کە سەیید قوطب یەکێك بووە لەو زاناو پێشەوا بەرجەستانەی کە لە ژیانیدا ژنی نەهێناوەو خێزانی پێکەوە نەناوە!

جا هۆکاری هاوسەر نەگرتنی سەیید قوطب بەکورتی ئەمە بووە:

سەیید قوطب دوو جاران گیرۆدەی داوی عیشق و خۆشویستنی ئافرەت بووە، یەکەمیان لە سەرەتای لاوێتیداو هەر لەدێیەکەی خۆیان و کتێبی (طفل من القرية)یشی باسی ئەو ئەزموونە خۆشویستنەی دەکات، کە بەهۆی دوورکەوتنەوەی (سید)ەوە بۆ شاری (قاهرة) ئەزموونەکەی بێ ئاکام بووە![2]

جاری دووەمیشیان پاش دەرچوونی لە کۆلێژو لەکۆتایی سییەکان (أواخر الثلاثينيات)دا بووەو، حەزی لە کچێکی قاهیرەیی کردوەو خوازبێنیشی بۆ کراوە، بەلام دوایی کە بۆی دەرکەوتوە کچەکە بەر لەو کەسێکی دیکەی خۆشویستوە، لە مەسەلەکە ساردبۆتەوەو چەند ساڵێك هەروا بەهەڵواسراویی مەسەلەکەیان ماوەتەوەو، هەرکام لە ڕۆمانی (أشواك)و قەصیدەی (الكأس المسمومة)یشی زادەو بەرهەمی ئێش و ژان موعاناتی ئەو ئەزموونە دووەمە ناکامەی عیشق و خۆشەویستینی، کە یەکەمیانی لە ساڵی (١٩٤٧) و دووەمیشیانی لە ساڵی (١٩٤٣)دا بلاوکردوونەوتەوە[3].

دیارە سەرەنجامیش ئەو خوازبێنی (خطبة)یەی هەڵوەشاندۆتەوەو وازی لێهێناوە، بۆ جاری سێیەمیش کە لەئەمریکا گەڕایەوە ویستی ژن بهێنێ، بەلام شۆڕش بەسەرداهات و لەبەر سەرقاڵیی نەپسانەوەو پاشتریش هەموو کات و توانای خۆی بۆ ڕێکخستنەوەی کاروباری برایانی مسوڵمان تەرخان کرد!

---

١- راه البخاري

٢- هەمان سەرچاوە، ص٢٤٧،٢٤٨.

٣- بروانە: (سيد قطب من الميلاد إلى الإستشهاد) بابەتی (المرأة في حياة سيد قطب) ص٢٤٨تا ٢٥١.

وە لەساڵی (١٩٥٤)یش بەر لەگیرانی نیزیك بوو كچێكی صالح و نەجیب بەهاوسەرو بگرێ و چەند هەنگاوێكیشی لەوبارەوە نا، بەڵام گیران و حەپسخانە ئەو هەوڵەیشی بێئاكام كرد!

دوایین هەوڵی ژن هێنانیشی لە ساڵی (١٩٦٤)دا بوو كە بەلێبوردنی تەندروستیی و داواكاریی (عبدالسلام عارف) لەزیندان هاتەدەرو یەكەمین كار كەبیری لێكردەوە هاوسەرگرتن بوو، بەڵام بەر لەداخوازیی كردنی ئەو ئافرەتەی دیاری كردبوو، بۆ كۆتا جار چووەوە زیندانی طاغووتەكان و ئەو ئاواتەیشی لەگەڵ زۆری دی بردە جیهانی بەرزەخ[١] و انشاءالله خوای بەخشندە لەوێو لەدوارۆژیش بە چاكترو پاكتر پاداشتی دەداتەوەو بۆی قەرەبوو دەكاتەوە، بە حۆرییەكانی بەهەشت.

ئێستاش كە هەتا ڕادەیەك تیشكمان خستە سەر ژیان و كەسایەتیی ئەو پیاوە هەڵكەوتووەی ئیسلام، با هەندێك لە هەڵوێستە درەوشاوەكانی گوڵبژێر بكەین:

## یەك: گەڕانەی بۆ ئیسلام كەی و چۆن بووە؟!

پێشتر باسمان كرد كە سەیید قوطب ماوەی (١٥) ساڵێك لە (١٩٢٥)وە تا (١٩٤٠) لەحاڵەتی گومڕایی و سەرگەردانیدا بووە، بەڵام سەرگەردانییەكی فیكریی و دەروونیی و دوور لە لادان (إنحراف)ی ڕەوشتیی، چونكە خێزان و بنەماڵەی سەیید قوطب بنەماڵە (عائلە)یەكی دیندارو رەوشت پاك بوون[٢]، وە سەیید هەر لە سەرەتاوەو بە شلكی پەروەردەیەكی دیندارانە كراوەو لە قۆناغی خوێندنی سەرەتاییدا وێڕای خوێندنی قوتابخانە (مدرسة) لە حوجرە (كُتّاب)ش هەر خوێندوویەتی لەسەر رەغبەت و فەرمانی حاج قوطبی بابی، وە سەیید لە حوجرەدا بەهەشت ساڵیی دەست بە لەبەركردنی (حفظ)ی قورئان دەكات و هەموو ساڵێك (١٠) بەش (جزء)ی لەبەردەكات و بە سێ ساڵان

---

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٢٥٣،٢٥٤، وە بڕوانە: (سيد قطب من القرية الى المشنقة) ص٣٧،٣٨، بڕوانە: (الفكر الإسلامي المعاصر: دراسات وشخصيات: سيد قطب) ص١٦،١٧.

٢- بڕوانە: (سيد قطب من الميلاد إلى الإستشهاد) ص٦٠،٦١.

تەواوی دەكات، واتە لە تەمەنی (١٠) ساڵاندا، كە ئەوكاتە پۆلی چوارەمی سەرەتایی بووە ![1]

جا گەڕانەوەی سەییید قوطب بۆ قورئان و ئیسلام و قوتاربوونی لە گومڕایی، پلە پلە بووەو لەسەرەتاوە بەپاڵنەری لێكۆڵینەوەی ئەدەبیەوە سەرگەرمی توێژینەوەی قورئان بووەو، لە ساڵی (١٩٣٩) لە گۆڤاری (المُقْتَطَفْ)دا گوتارێكی بەناوونیشانی (التصوير الفني في القرآن الكريم) بڵاوكردەوە، كە سەرەنجام لە (١٩٤٥)دا گەشەی كردو بوو بەناوونیشانی یەكەمین كتێب و بەرهەمی ئیسلامییانەی، لە زنجیرەی: (مكتبة القرآن الجديدة).

وە لەساڵی (١٩٤٧)دا دووەمین كتێبی زنجیرەی: (كتێبخانەی نوێی قورئان)ی دەركرد بەناوونیشانی: (مشاهد القيامة في القرآن)[2].

دیارە دەكرێ بڵێین: ئەم گەڕانەوەی سەییید قوطب بۆ ئیسلام لە دەقی ئەدەبییەوە بەهۆی توێژینەوەی قورئانی بەپێزەوە، یەكەمین قۆناغی گەڕانەوەی بووە.

قۆناغی دووەمیشی كە لە ساڵی (١٩٤٧)وە دەست پێدەكات و هەتا ساڵی (١٩٥٣) كە چۆتە نێو ریزی برایانی مسوڵمان (الأخوان المسلمين)ەوە دەخایەنێ[3]، دەتوانین زیاتر بەقۆناغێكی فیكریی (مرحلة فكرية)ی ناوی بنێین، وە لەو قۆناغی دووەمەشدا چەند كتێبێكی بەرهەم هێناون،[4] كە ئەمانەن:

١- (العدالة الإجتماعية في الإسلام) كە یەكەمین بەرهەمی فیكرییەتی و لە ساڵی (١٩٤٧) نووسیویەتی لە (١٩٤٩) چاپ كراوە، كاتێك كە لە ئەمریكا بووە.

٢- (معركة الإسلام و الرأسمالية) كە پاش گەڕانەوەی لە ئەمریكاو لە ساڵی (١٩٥١)دا چاپ كراوە.

٣- (السلام العالمي والإسلام) ئەمیش لە كۆتایی ساڵی (١٩٥١)دا چاپ كراوە.

---

١- هەمان سەرچاوە، ص٥٩، ٦٠، هەروەها بڕوانە: (سيد قطب من القرية إلى المشنقة) ص٣٢تا٣٤.

٢- بڕوانە: (سيد قطب من الميلاد إلى الإستشهاد) ص٢٦٩تا٢٧٣.

٣- سەرچاوەی پێشوو، ص٢٧٣تا ٢٧٩.

٤- وێڕای چەندین گوتار كە بۆ هەندێك لەگۆڤارەكانی دەنووسین، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص٢٧٦تا٢٧٩.

٤-(دراسات إسلامية) كە (٣٠) لە گوتار (مقالة)ەكانی سەييد قوطبی گرتۆتە نێو خۆ، كە لەگۆڤارە جياجياكاندا بڵاوی كردوونەوەو لە ساڵی (١٩٥٣)دا چاپی كردوە.

٥-(في ظلال القرآن) كە لەساڵی (١٩٥٢)وە دەستی بە بڵاوكردنەوەی كردوەو لە ئۆكتۆبەری (١٩٥٢)ەوە تا ينايری (١٩٥٤) شازدە (١٦)بەشی لێ دەركردوە.

قۆناغی سێیەم و كۆتایی گەڕانەوەی سەييد قوطبيش بۆ ئيسلام لە ساڵی (١٩٥٣)وە كە چووەتە نێو ريزی برايانی مسوڵمانەوە دەست پێدەكات و بەشەهيدكرانی لە ساڵی (١٩٦٦)دا كۆتايی پێدێ.[1]

كە دەتوانين ئەو قۆناغی سێیەمی بەرەو خواو ئيسلام گەڕانەوەیەی سەييد قوطب، ناوبنێين: قۆناغی ئيسلامی جووڵاو، (مرحلة الإسلام الحركي).

لەم قۆناغەشدا سەييد قوطب جگە لەپێداچوونەوەو پاڵفتەكردنی تەفسيرەكەی هەتا دەوری نيوەی[2] قورئانی بەڕێز، سەرجەم كتێب و بەرهەمە ئيسلامیيەكانی ديكەيشی نووسين، وەك:

١- (هذا الدين) كە لە زينداندا نووسيويەتیو لە ساڵی (١٩٦٠) چاپ كراوە.

٢- (المستقبل لهذا الدين) ئەميشی هەر دوای هی پێشوو نووسیو بڵاويش كرايەوە.

٣- (خصائص التصور الإسلامي) ئەميش لە ساڵی (١٩٦٢)دا چاپ كراو پێشتر ئامادەی كردبوو.

٤- (الإسلام و مشكلات الحضارة) ئەميش هەر لە ساڵی (١٩٦٢)دا بڵاوكرايەوە.

٥- (مقومات التصور الإسلامي) ئەم كتێبە تەنها بەرهەمێكە كە بيست ساڵ پاش شەهيدكرانی خاوەنەكەی لەساڵی (١٩٨٦)دا چاپ و بڵاوكراوەتەوە.[3]

جا مامۆستا (محمد قطب)ی برای شەهيد لەبارەی ئەم كتێبەوە شتێكی سەرسوڕهێنەری نووسيوەو گوتوويەتی:[4]

١- هەمان سەرچاوە، ص٢٧٩تا ٢٨١.

٢- هەمان سەرچاوە، ص٥٥٠تا ٥٥٩.

٣- هەمان سەرچاوە، ص٥٥٩.

٤- هەمان سەرچاوە، ص ٥٥٩، ٥٦٠.

(ئەم كتێبە كە ئەمڕۆ پێشكەشی دەكەین، وە كە خاوەنەكەی لەڕۆژانی كۆتایی تەمەنی نێو زینداندا تەواوی كردوە بەر لەوەی لەسێدارەدرانی بەسەردا جێبەجێ بكرێ، وە بەشی كۆتایی‌یەكەی لەسەر ئەو قاقەزانە نووسیویە كە دادگا پێی داون بەر لە دادگایی كردنی بۆ ئەوەی دان پێداهێنانەكان (إعترافات) لەسەریان بنووسێ!).

واتە: شەهیدی سەركردەمان سەیید قوطب بەچەند رۆژێك بەر لەكوژران و لە سێدارەدانی ئەو كتێبەی تەواو كردوە، لە حاڵێكدا كە چاوەڕێی مەرگی حەتمی كردوە! هەر بۆیەش وەك (محمد قطب)ی برای گوتوویەتی[1]: لە لووتكەی بەرزیی داڕشتن و دەربڕیندایە.

ئەمانە وەك بەرهەمی فیكریی ئەو قۆناغی سێیەمەی مامۆستای شەهید، وەك پەرێزو بەرهەمی كردەییش، ئەوە دیارە كە وەك گوتمان لە ساڵی (١٩٥٣)وە چۆتە ریزی كۆمەڵی (الأخوان المسلمين)ەوەو یەكسەریش سەرپەرشتی كردنی كارو چالاكی فەرهەنگیو راگەیاندنی پێ سپێرراوەو، هەر لەو سەرو حەدەشدا سەردانی هەركام لە (سورية)و (أردن)و (قدس)ی كردوە، بەكاری حیزبییو بەشداریی چەند كۆنگرەو كۆبوونەوەیەكی گرنگی كردوە بە نوێنەرایەتی برایانی مسوڵمان.[2]

پاشان لەكاتێكدا كە لە زینداندا بووەو بەر لە بەردانی لە ساڵی (١٩٦٤)دا سەرەتا بەشێوەیەكی فیكرییو كەبەریش دراوە بەشێوەی كردەیی، بەرپرسێتی رێكخستنی برایانی مسوڵمان (مسؤلية تنظيم الإخوان المسلمين)ی بە ئەستۆوە گرتوەو سەرەنجامیش باجێكی قورسی ئەو ئەركە گەورەو گرنگ و مەترسیدارەی ئەو قۆناغە دژوارەی داوە، كە بریتی بوو لە كوژران و هەڵواسرانی![3]



١- هەمان سەرچاوە، ص٥٦٢.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ص٢٨١،٢٨٢.

٣- هەمان سەرچاوە، ص٢٨٢،٢٨٣.

دوو: نەفس بەرزیو بێطەماعیی سەیید و رەدکردنەوەی خەڵات و بەخششی گومان لێکراو، لەوپەڕی ئاتاجییدا:

مامۆستا سەیید قوطب ئبراهیم (رەحمەتی خوای لێبێ) وەك هەر زاناو پێشەوایەکی رەسەن یەکجار نەفس بەرزو دنیا بەکەمگر بووەو هیچ حیسابێکی بۆ دونیاو طەماع نەکردوەو ئەم بەسەرهاتەش چاکترین بەڵگەیە:

(د.صلاح عبدالفتاح الخالدي) خاوەنی کتێبی (سید قطب من الميلاد الى الإستشهاد) ئەم رووداوە لە (أستاذ أحمد عبدالعزيز عطار)ەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی[1]:

رۆژێکیان سەیید قوطب تەلەفۆنی بۆ کردم و داوای لێکردم کە بەپەلە بچمەماڵەکەی، وە بە شەرمێکەوە داوای لێکردم کە بەقەرز چەند (جونەیە)ێکی بۆ ببەم، بۆ کڕینی داوو دەرمان چونکە نەخۆشەو پارەی دەرمانیشی لانیە!

منیش بەپەلە چووم و پارەکەشم لەگەڵ خۆم برد..؟

جا کاتێك چوومە ژووری پێشوازییەوە دیمەنێکم بینی، سوێند دەخۆم کە بە بینینی سەرسام بووم!

لە ژوورەکەدا کارمەند(موظف)ێکی دیپلۆماسیی سەفارەتی یەکێك لە دەوڵەتە عارەبییە نەوتدارەکان دانیشتبوو و جانتایەکی پڕ لە پارەی لە بەردەم بوو کە هەزارەها جونەیە (آلاف الجنيهات)دەبوو!

ئیدی کابرا بە جەخت کردنەوەو تکاو رەجای گەرم و گوڕی لە سەیید قوطب دەکرد، کە جانتایەکە هەڵگرێ و هەرچی تێدایە دیارییو خەڵاتی دەوڵەتەکەیەتی بۆی، چونکە دەوڵەتی ناوبراو دەزانێ چ پلەوپایەیەکی هەیەو چ ئەرکێکی لەسەرشانە، بۆیە حەزدەکات بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری ژیانی و بەڕێوەبردنی پڕۆژە ئەدەبیی و فیکرییەکانی بەکاری بهێنێ... منیش سەرنجی سەیید قوطبم دا کە بە نەخۆشی دانیشتبوو و خەمبار بوو.. پاشان بە تووڕەییو هەڵچوونێکەوە دیارییەکەی بەرپەرچدایەوەو پێی گوت:

---

١- هەمان سەرچاوە،ص ٤٩٤،٤٩٥.

به تەئکید من خۆم و بۆچوونەکانم بە ماڵ و سامانی دنیا نافرۆشم، جا پارەکانت بخەوە جانتایەکەت!

پاشان سەیید ئاوڕی لێم دایەوەو گوتی:

ئەوەی لێم داوا کردبووی بۆت هێناوم؟ پێم گوت: بەڵێ، وە ئەندازە پارەکەم دایە دەستیو لەوپەڕی عاجباتییو سەرسامیی دابووم!!

کاتێکیش کابرای دیپلۆمات بەسەرهاتی نەخۆشییەکەی سەییدو ئاتاجیی بۆ پارەی داوو دەرمانی ، زانی، بە سەراسیمەییو سەرسوڕمانەوە چووە دەرێ!

بەڵێ خوێنەرە بەڕێزەکان! پیاوانی ڕەسەنی ئیسلام و پێشەوایانی ڕاست و ساغی موسوڵمانان لە بەرانبەر دنیاو طەماع دا ئاوان و هەموو دنیا وەك پووشکە کایەك تەماشا دەکەن، ئەدی پێغەمبەری خوا کە ئەوان خۆیان بە میراتگرو جێگری دەزانن نەیفەرمووە: (لو كانت الدنيا تعْدِلُ عندالله جَناحَ بَعوضَةٍ ما سَقى مِنْها كافراً شَرْبَةَ ماءٍ)[1]

## سێ: چوونە نێو ڕیزی برایانی موسوڵمانەوە لەکاتی تەنگانەدا:

کەسانێك هەن لە کوێوە (با)ی بێت (شەن)دەکەن و وەك گوڵەبەڕۆژە لەگەڵ دنیاو بەرژەوەندییەکانیان دەسووڕێن، ئەو جۆرە کەسانە هەرچەندە بەڕواڵەت مرۆڤن، بەڵام لە ڕاستیدا من جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ئەوان و ئاژەڵ و ماڵاتدا نابینم، چونکە ماڵات و ئاژەڵیش کوێ لەوەڕی باشی لێ بێ، بێئەوەی داهاتوو و سەرەنجام و حەڵاڵ و حەرام لێك بداتەوە ورگی خۆی تێردەکات، وەك خوای پەنهان بین، فەرموویەتی:

﴿ ...وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴾[2] ، واتە:...وە ئەوانەی کافرن ڕادەبوێرن و دەخۆن، وەك چۆن ئاژەڵ دەخوات، وە ئاگری -دۆزەخ- یش جێگاو ماوایانە.

کەسانێکی دیکەش هەن ڕاست بە پێچەوانەی کۆمەڵی پێشووەوە هەق و ڕاستییو بەرژەوەندیی مسوڵمانان و ڕەزامەندیی خوا تبارك و تعالى لەکوێ بێت و لەچیدا بێت، بێ

---

١- رواه الترمذي عن سهل بن سعد الساعدي وقال : حسنٌ صحيحٌ.

٢- محمد: ١٢

گوێدانە زیان و ئازارو مەترسیو سەرەنجام و بێ سێو دوو کردن و دڵ لەدڵ دان، بەرەو رووی دەچن و لەباوەشی دەگرن.

جا مامۆستای شەهید لەجۆری دووەم بوو و دەیان هەڵوێستیشی ئەو راستییە دەسەلمێنن، بۆ وێنە:

بێگومان سەیید قوطب بەر لەوەی بچێتە نێو ریزی (الأخوان المسلمین)ەوە لە مانگی (مارتی ١٩٥٣)دا لەلای دەستەو دایەرەی سەرکردایەتی شۆڕش (قیادة الثورة) پایەو رێزێکی تایبەتی هەبوو، وە باشیش دەیزانی کە ئەو تاقمە عەسکەرتارە چ بوغزو کینەیەکیان بەرانبەر بەو کۆمەڵە هەیەو، چۆن هەمیشە سەرگەرمی نەخشەدانان و پیلانگێڕانن لە دژیان.[1]

بەڵام سەیید قوطب لەو ئان و ساتەدا کە کۆمەڵی برایان بەرەو بەڵاو گرفتارییو تاقیکردنەوەیەکی سەخت و دژوار دەچوون، چاوپۆشی لەتەماع و بەرژەوەندیی کردو لە ترس و گرفتاری بێباك بوو، چووە نێو ریزی ئەو کۆمەڵە ئیسلامیەیەوە چونکە قەناعەت و بڕوای وابوو کە لەوکاتەدا پاش خوای باڵادەست تاکە هیواو ئومێدی ئیسلام و مسوڵمانانن[2]!.

وە ئەوەش کە بەپلەی یەکەم بوو بە پاڵنەرو هاندەری بۆ چوونە نێو ریزی برایانی مسوڵمانەوە وەك خۆی گوتوویەتی، دوو شت بوون:

أ- کاتێکە کە رابەرو دامەزرێنەری برایانی مسوڵمان (حسن البنا) بە دنەدانی ئیمپریالیزم و بەدەستی رژێم و پادشای میصر لەساڵی (١٩٤٩)دا کوژرا، سەیید قوطب لە ئەمریکا دەبیو سەرسام و سەرنج راکێشراو دەبێ بەو هەموو گرنگیو بایەخ پێدان و شادیی دەربڕینەی ئەمریکاییەکان و لەرۆژنامەکانیاندا هەم ئەمریکاییەکان و هەم ئەوروپاییەکانیش رای دەگەیەنن کە (حسن البنا) مەترسیدارترین پیاوی رۆژهەڵاتەو بە کوژرانی لەلایەن رژێمی وابەستەکانەوە، لەزیان و مەترسیی وی قوتاریان بووە.[3]

---

١- بڕوانە: (سید قطب من المیلاد إلی الأستشهاد) ص٣٣٢،٣٣٣.

٢- بڕوانە: نامیلکەی (لماذا أعدموني؟)ی سید قطب ص١١، وە کتێبی (سید قطب من المیلاد إلی الإستشهاد) ص٣٣٠تا٣٣٢.

٣- بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص٣١٨،٣١٩.

ب- هەوڵ و تەقەللادانی جاسووسی سەر بە (مخابرات) بەریتانی لەگەڵ سەیید قوطب دا (جون هیورث دن) کە بەهیچ جۆرێك توخنی کۆمەڵی (برایانی مسوڵمان) نەکەوێ، وە بابای جاسووس زۆرلەسەر کۆمەڵی ناوبراو قسەی کردو کۆمەڵێك راپۆرتی زۆر وردیی لە بارەیانەوە بۆ خوێندەوە، کە هەر لەڕۆژی دامەزراندنییەوە لەساڵی (١٩٢٨) لە (الإسماعيلية) هەتا هەڵوەشاندنەوەی لەساڵی (١٩٤٨)و پاشان تیرۆرکردنی ڕابەرەکەیان، لەساڵی (١٩٤٩)دا هەرچی جم و جوڵ و چالاکیان بوو تێیاندا تۆمارکرابوو، تەنانەت وتارەکانی (حسن البنا)ی رابەریشیان![1]

وە (جون هیورث دن) بەسەییدی گوت:[2]

ئەگەر بێت و کۆمەڵی ناوبراو لەمیصردا حوکم و دەسەڵات بگرنە دەست، بەڵاو مەترسییەکی گەورە روو لەو وڵاتە دەکات و تاکە هیواو ئومێد هەر رۆشنبیرو لاوانی وەك سەییدن، کە نەهێڵن ئەو بەڵایە بەسەر میصردا بێت!!

دیارە سەییدی جوامێرو دلێرو هۆشیارو بێدار، کاتێك ئەو هەموو کینەو بوغزو غەرەزەو هەست بەمەترسی کردنەی ئەمریکاو ئەوروپا لەبەرانبەر کۆمەڵی: (الأخوان المسلمين)و رابەرە شەهیدەکەی (حسن البنا)دا دەبینێو دەبیستێ، هەر لەوێوەو لەوکاتەوە قەناعەتی بەگەورەییو گرنگیو جەوهەرداریو بزووتنەوەو کۆمەڵیی ناوبراوی لەدڵ دا پەیدا دەبێ، وەك خۆی گوتوویەتی:[3]

(وقد لَفتَ نظري بِشِدّةٍ ما أَبْدَتْهُ الصُّحُفُ الأمريكية وكذلك الإنجليزية التي كانت تصلُ إلى أمريكا من إهتمام بالغ بالإخوان ومِنْ شماتَةٍ و راحة واضِحةٍ في حَلِّ جماعتِهِمْ و ضربها وفي قتل مُرْشدها، ومن حديث عن خطر هذه الجماعة على مصالح الغرب في المنظمة وعلى ثقافة الغرب وحضارته فيها. وصدرت كتبٌ بهذا المعنى سنة (١٩٥٠)، أذكر منها كِتاباً لجيمس هيوارث دن، بعنوان: (التيارات السياسية والدينية في مصر الحديثة) . كل هذا لفَتَ نظري إلى أهمية هذه الجماعة عند الصهيونية والإستعمار الغربي...)

---

١- سەرچاوەی پێشوو، ص٣١٨،٣١٩.

٢- هەمان سەرچاوە، ص٣١٩.

٣- بروانە: (لماذا أعدموني؟) ص١٠.

هـەروەها لـەبارەی سەرسـام (مُعْجَـبْ)بوونی‌یـەوە بـە جیهـادو خـەباتی برایـانی مسوڵمانەوە گوتوویەتی:[1]

(...کاتێك میصر– لێی قەوما– ئـاوڕی دایـەوە بێجگـە لـە (برایـان) کەسـی دیکـەی نەبینی! ئەوان ئامادەی کارو فیداکاریی بوون و مەشقیان بـۆ جـەنگ و جیهـاد کردبـوو و دڵیان لەسەر شەهید بوون گرێ دابوو..) (وە"برایانی مسوڵمان" بزووتنەوەیەکە پێم وایـە هیچ جێدار (بدیل)ێکی نیە کە هاوتـای بێـت بـۆ راوەسـتان لـەڕووی نەخشـەو پیلانـەکانی زایۆنیزم و خاچپەرستە داگیرکەرەکان، کەزۆرم لەبارەیەوە دەزانـی بەتایبـەتی ئەوکاتـەی کە لەئەمریکا مامەوە!)[2]

جـا بەڕاسـتی ئـەم چـوونە ریـزی کۆمـەڵی برایانـەوەی مامۆسـتا سـەیید قـوطـب (رەحمەتی خوای لێبێ) لەو هەل و مەرجەدا کەباسمان کردو بەو هاندەرو پاڵنەرانەوە کە خستماننەڕوو، بەهەڵوێستێکی یەکجار مەردانەو پڕشنگداری دادەنرێ.

## چـوار: بەئەسـتۆوە گرتنـی بەرپرسـێتی رێکخسـتنەوەی برایـانی مسوڵمان لە سامناکترین هەل و مەرجدا:

هەرچەندە سەیید قوطب هەر لەساڵی (١٩٦٢)وە بەپێی ئەو بەرنامە (منهج)یەی کـە لە زینداندا قەناعەتی پێی هاتبوو، پاش شیکردنەوەو وردکردنەوەو رامانی زۆر، بەکردەوە قیادەو سەرپەرشتی ئەو کۆمەڵانەی دەکرد کە لە زینـدان (سـجن)ی (القنـاطیر)دا بـوون[3]، بـەڵام تـەنها لەسـاڵی (١٩٦٤)دا بـەڕەسمیی‌و بەمۆڵـەت پێـدانی رابـەری گشـتی (حسـن الهضیبـي)بەرپرسێتی رێکخستنی برایـانی مسـوڵمان و سەرپەرشـتی کردنـی وەرگـرت[4]. جائەگەر بێت و سەرنجێکی حاڵەتی جەستەیی ئەوسای سەیید قوطـب و، هـەل و مـەرجی سـەختی دژواری برایـانی مسـوڵمان بـدەین، زۆر چـاك دڵنیـا دەبـین کـە ئـەو هەڵوێسـتی بەئەستۆوەگرتنی ئـەرکی سەرپەرشـتی کـردن و قیـادەی رێکخسـتنی برایـانی مسـوڵمان

---

١- بڕوانە: (دراسات إسلامية)ی سيد قطب، ص٢٤٣.

٢- بڕوانە: (لماذا أعدموني؟) ص١١.

٣- بڕوانە: (سيد قطب من الميلاد إلى الإستشهاد) ص٣٨٦،٣٨٧.

٤- هەمان سەرچاوە، ص ٣٩٣،٣٩٤.

(قيادة تنظيم الإخوان المسلمين)ەی مامۆستای شەهيد، چ هەڵوێستێكی جوامێرانەو لە خۆبوردووانەو فيداكارانە بووە!

جارێ حاڵەتی جەستەيیو تەندروستی سەييد قوطب ئەوە لە سۆنگەی ئەوەوە كە هەر لەسەرەتای تەمەنیيەوە جەستەيەكی لاوازو دەرداژۆی هەبووەو گيرۆدەی چەند نەخۆشيیەك بووە[1]، ئينجا سەربارەش لەزيندانەدا لەجياتی چاودێری كردنی بەهۆی نەخۆشيیەكانيیەوە، بەپێچەوانەوە نەخۆشيیەكانيیان بەكاردەهێنان بۆ زياتر ئازارو ئەشكەنجەدانی!

بۆ وێنە: (جابر رزق) لە كتێبی: (مذابح الأخوان المسلمين في سجون ناصر)دا گوتوويەتی:[2]

(سەييد قوطب گەيشتبووە تەمەنی (٦٠) ساڵی...وە گيرۆدەی دڵەكوتە (الذبحة الصدرية) بوو بوو وێڕای نەخۆشی گورچيلەو...نەخۆشيیەكانی گەدە!

بەڵام نە تەمەنیو نە نەخۆشيیەكەی بەتكاكار(شفيع) قبوڵ نەكران، بگرە نەخۆشيیەكانی بەهرەی چاكتر ئەشكەنجەدانيیان لێ وەردەگيرا!

جارێكيان ماوەی چوار ڕۆژان بەكورسيیەكەوە بەستبوويانەوەو خواردن و خواردنەوەيان لێگرتبووەوەو تەنانەت ئاويشيان نەدەدايە..جا لەبەردەمی ئاويان دەڕژاند...ئاشكراشە كە بابای گورچيلە نەخۆش پێويستی بەئاوی زۆر دەكات..وە ئەو جۆرە ئەشكەنجەدانە سەييد قوطبی شەهيدی گەياندە حاڵێك نزيك بوو چاوەكانی لەدەست بدات!)

هەل ومەرجی ئەوسای كۆمەڵەی (برايانی مسوڵمان)يش لەو ئان وساتەدا كە مامۆستای شەهيد ئەركی سەرپەرشتی كردنيان و ڕێكخستنەوەی كاروبارييان و فێركردن و ئاراستەو پەروەردەكردنيان بەئەستۆوە گرت، زۆر سەخت و دژوارو ئاڵۆزو بڵۆزو بە زەحمەت بوو، چونكە لەلايەكەوە زۆربەيان گيرابوون، وە بە ڕەسميی بوون (وجود)ی كۆمەڵەی ناوبراو بەقەدەغە دادەنراو بە هەڵوەشاوە (منحلة) ناودەبرا!

---

١- هەمان سەرچاوە، ص٣٦٢.

٢- بڕوانە: ص١١٤.

ئنجا سەربارەش لەبەر ئازارو ئەشکەنجەی زۆرو جەنگیی دەروونیی (الحرب النفسية) لەگەڵ کردنیان و هەوڵدان بۆ مێشك شۆردنەوە (غسل الدماغ)یان و...هتد، لەنێو خۆیاندا لەرووی فیکرییو بەرنامەیییەوە تارادەیەکی زۆر شپرزەو پرژو بڵاوو بێسەروبەر بوون![1]

بەڵێ بە ئەستۆوەگرتنی ئەرکی قورس و دژواری سەرپەرستی کردنی کۆمەڵی برایانی مسوڵمان لەلایەن سەیید قوطبەوە، بەو حاڵەی کەبوویەتیو لەو هەل ومەرجە سەخت و زەحمەتەدا کە لەئارادا بووە- بەڕای بەندە- لووتکەی هەرە بەرزی هەڵوێست نواندن و خۆبەخت کردن بووەو، پێشم وانیە ئەو جۆرە هەڵوێستانە بەهیچ کەس ئەنجام بدرێن، مەگەر تەواو تەواو بۆ خوا ساغ و یەکلابووبێتەوەو هێندەی نووکی دەرزی بەشی غەیری خوای بەخۆیەوە نەهێشتبێ، کە بەهەموو قەناعەتەوە پێم وایە مامۆستای شەهید یەکێك بووە لەو جۆرە کەسانەو بێگومان بەس خواش بەندەناسەو وەك پێویست پێیان شارەزاو زانایە؟

## پێنج: سەیید قوطب پاش چەندان ساڵ لەزیندان دا مانەوە ئامادە نابێ میصر بەجێبهێڵێو بە دەعوەتی حکوومەتی عێراق کارێکی گرنگ لە وەزارەتی پەروەردەو فێرکردن وەربگرێ:

ئەمیش یەکی دیکەیە لە هەڵوێستە گەورەو درەوشاوەکانی مامۆستا سەیید قوطب![2]

بەڵێ پاش ئەوەی سەرۆکی عێراقی (عبدالسلام عاف) بەتەکلیفی زانایانی عێراق بەتایبەت (شێخ ئەمجەد زەهاویی) داوای لە (جمال عبدالناصر) دیکتاتۆری میصر کرد کە

---

[1] - بۆ ئەوەی بزانی کۆمەڵی (الاخوان المسلمين) لە سەردەمی (جمال عبدالناصر)ی طاغووتدا چییان پێکراوەو چۆن ئازارو ئەشکەنجەدراون، سەرنجی ئەم کتێبانە بدە:

أ- (أيام من حياتي) زينب الغزالي، ب- (البوابة السوداء..) أحمد رائف، ج- (سراديب الشيطان) أحمد رائف، د- (مذابح الاخوان في سجون ناصر) جابر رزق، ه- (مذبحة الاخوان في ليمان طرة) جابر رزق، و- (الموتى يتكلمون) سامي جوهر.

[2] - بڕوانە: (لماذا أعدموني؟) ص٧٢، ٧٣.

(سيد قطب) بەربدات و، لە (ئازاری ١٩٦٤)دا بەردرا، لەکاتی گرێدانی یەکەمین کۆنگرەی لووتکەی عەرەبی (مؤتمر القمة العربـي الأول) لـە (قـاهرة) لەسـاڵی (١٩٦٤)دا (عبدالسـلام عارف) هاتە قاهیرەو بە سەفیری عێراق لە قاهیرەدا دیاریـیەکی بۆ سەیید نـارد، ئـەویش برووسکەیەکی سوپاسگوزاریی بۆ ناردو سەرجەم کتێب و بەرهەمەکانیشـی بەشـێوەیەکی نایاب بۆ بەرگ کردو بۆی نارد.

جا پاش ماوەیەك سەفیری عێراق لە قاهیرە بوو بە وەزیری پەروەردەو فێرکردن لـە عێراق و لەو سەردەمەشدا سەردانی سەیید قوطبی کرد لە قاهیرەو بۆیشی پێشـنیار کـرد کە ئەرك (وظیفة)ێك لە عیراق وەربگرێ، کە بریتیە لە: پسپۆڕی بەرنامـەکانی پـەروەردەو فێرکـردن (خـبیر منـاهج التربیـة والتعلـیم). وە پێشـی گـوت کـە لـەعێراق هـەموو ڕێـزو حورمەتێکی پێویستی لێدەگیرێ!

بەڵام سەیید داوای لێبوردنی کـرد کـە ئـەو کـارەو بەرپرسـیارێتییە وەرنـاگرێو بـە وەزیریشی گوت:[1]

کە شوێنی سروشتیی ئـەو میصـرە، چـونکە لەوێـدا ئـەرکی سەرشـانی جێبـەجێ دەکات!

بەڵێ سەیید قوطب ئەو جـۆرە هەڵوێسـتە فیداکارانـەو جوامێرانـەی هـەبوون[2]، بۆیـە بۆتە ئەو کەڵە مامۆستاو پێشەوایەی کە هەموو مسوڵمانێکی خاوەن غیرەت خۆشی بوێ.

## شەش: چاوپێداگێڕانەوەی بەرنامەی کاری برایانی مسوڵمان:

ئەمیش یەکی دیکەیە لە هەڵوێسـتە درەوشـاوەکانی مامۆسـتای شـەهید، کـە هـەوڵ دەدەین لەم چەند بڕگەیەدا ڕوونی بکەینەوە:

١- پاش ئەوەی (سید) لە زیندانی (لیمان طرة)دا نیشتەجێ بـوو، دەسـتی کـرد بـە شیکردنەوەو تێوەڕامان و هەڵسەنگاندنی ئـەو ڕووداو و کارەسـاتانەی کەبەسـەر کۆمـەڵی

---

١- بڕوانە: (سيد من القرية الى المشنقة) عادل حمودة، ص١٦١.

٢- (عمر التلمساني) سێیەمین ڕابەری گشتی برایانی موسـڵمان گوتوویـەتی: (کاتێـك "سـید قطـب" لـە زینـدان دەرچوو ناردیە لام و پرسی پێکردم- کە ئەوکاتە من گیرابووم- ئایا بچم بۆ عێراق یان نا؟! من رام وابۆ بچێ، بەڵام خۆی وای پێ پەسەند بوو هەر بمێنێتەوە) بڕوانە (ذكريات لا مذكرات)ی عمر التلمساني، ص٢٨٠، ٢٨١.

برایانی مسوڵمان هاتوون، هەر لەکوژرانی پێشەوای شەهید (حسن البنا)وە هەتا ئەوکاتە – ساڵی ١٩٥٤– کە (جمال عبدالناصر) بە سیناریۆیەکی هەڵبەستراو کە رووداوی (المنشية)یە زەمینەی گرتن و زیندانی کردنی هەزارەها ئەندامی ئەو کۆمەڵەی خۆش کرد، پاشان ئەو هەموو رق و کینەو دژایەتی و پیلانانەی زلهێزەکان لە زایۆنیزم و خاچپەرست و کۆمۆنیزم و ئیمپریالیزم، بۆ دژایەتی ئیسلام و مسوڵمانان، هەروەها ئەو بێ بەندوباریی‌و داڕووخانی ئەخلاقی‌یەی کە هاوکات لەگەڵ گرتن و کوشتنی ئیسلامیی‌یەکان دەستی پێکردوەو..هتد.

وە ئەو رامان و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەیەی سەیید قوطب نزیکەی حەوت ساڵی خایاندوە، لە (١٩٥٥)وە تا (١٩٦٢)، وەك خۆی نووسیویەتی.[1]

٢– پاشان سەیید قوطب وەك خۆی گوتوویەتی، پاش ئەوەی دڵنیا دەبێ کە ئەو جۆرە دژایەتی‌و پیلانگێڕانە لەبەرانبەر کۆمەڵی (الأخوان المسلمين)دا کە ئەوکاتە چاکترین نوێنەری پارێزەری ئیسلام بوون، وە ئەو داڕووخانە ئەخلاقی‌و بەهایی‌یەی کە خەڵك و میللەت گیرۆدەی بووە، راستەوخۆ پەیوەستە بە نەخشەو ئامانجەکانی ئیمپریالیزمەوە، گەیشتۆتە ئەو قەناعەتە کە: هەرچەندە رژێمی میسر بەڕەسمیی کۆمەڵی برایانی مسوڵمانی هەڵوەشاندۆتەوەو گرتوونی و دادگایی‌یان دەکات و دەیان کوژێ‌و ...هتد..بەڵام:–

(پێویستە بزووتنەوەی ئیسلامیی هەر بەردەوام بێت و، نەهێشتنی لەم هەل و مەرجەدا شتێکی یەکجار ناقۆڵایەو تاوانێکی زلە، بەڵام پێویستە هەڵەو کەم و کورپییەکان دووربخرێنەوەو پەندو عیبرەت لەو ئەزموونە پێشووە وەربگیرێ)[2]

٣– وە سەرەنجام سەیید قوطب سەبارەت بە چۆنیەتی و شێوازی کارو خەباتی ئیسلامی‌یانە چ لەمیصرو چ لە غەیری میصریشدا، لەو بارودۆخ و هەل و مەرجە جیهانی و



١– بڕوانە: (لماذا أعدموني؟!) ص٢٦، ٢٧.

٢– هەمان سەرچاوە، ص٢٧.

ناوچەیی‌یەی ئەوسادا، دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە لەدان پێداهێنانەکان (إعترافات)ی خۆیدا هاتوە، کە لەنامیلکەی (لماذا أعدموني؟!)دان هەن و پوختەکەی ئەمەیە:[1]

(کۆمەڵی برایانی مسوڵمان کەوتۆتە نێو هەل ومەرجێکەوە وەك ئەوەی کاتی خۆی بزووتنەوەی ئیسلامیی یەکەم بەقیادەی پێغەمبەری خوا تێیدا بووە، لەڕووی بێئاگاییو نەزانینی خەڵکی بەگشتی دەربارەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییو، دووریی لەڕەوشتی ئیسلامیی‌یەوەش، نەك تەنیا دووریی لەسیستەم و حوکمی ئیسلامیی!)

هەروەها لەهەمان کاتیشدا زلهێزەکان و زایۆنیزم و خاچپەرستەکان و ڕژێمە طاغووتی‌یە ناوچەیی‌یەکان، سەرسەختانە سەرگەرمی نەخشەدانان و پیلان گێڕانن! بۆیە لەئاوا حاڵێك دا ماقووڵ نیە کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامی‌یەکان خۆیان بەهەندێك کاروچالاکیی گچکە گچکەوە سەرقاڵ بکەن و، داواکاریی حوکم کردن بەشەریعەت و چەسپاندنی سزاو سنوورە شەرعیی‌یەکان ئاڕاستەی سیستەمە حوکمڕانەکان بکەن! بەڵکو پێویستە لەهەل و مەرجی وادا بزووتنەوەو کۆمەڵە ئیسلامیی‌یەکان وەك پێغەمبەری خوداﷺ و کۆمەڵی ئیسلامیی یەکەم لەبنچینە (قاعدة)وە دەست پێبکەن کە بریتیە لەزیندووکردنەوەی چەمك و واتاو حەقیقەتی ئیمان و عەقیدە لەدڵ و عەقڵی خەڵکیداو، پەروەردەکردن و پێکەیاندنی کۆمەڵێکی هەڵبژاردەیان بە پەروەردەیەکی ئیسلامیی ڕاست و دروست.

وەنابێ بەهیچ جۆرێك هەوڵی بەدەستەوە گرتنی جڵەوی حوکمڕانیی بدەن، لەکاتێك دا کە کۆمەڵگا لەئیسلام ناحاڵی‌یەو جارێ بنچینە (قاعدة)یەکی مسوڵمانی دروست نەبووە، بەڵام پێویستە هاوکات لەگەڵ کارکردن بەپێی ئەو بەرنامە پەروەردەیی (برنامج تربوي)یە هێزێکی پارێزەریش هەبێ کە پشتگیریی بکات لەدەست درێژیی کرانە سەر ئەو کۆمەڵ و بزووتنەوەیە کەنایانەوێ بەزۆرو دەستەڵات بچنە سەرحوکم، تاکو ئەوەی کە لەساڵی (١٩٤٨)و (١٩٥٧) بەسەر (الاخوان المسلمین)و، هەروەها هەر لەو سەروحەدانەش دا بەسەر کۆمەڵی ئیسلامیی لەپاکستان: (الجماعة الاسلامية في پاكستان)دا هات، دووپات نەبێتەوە.

---

١- بڕوانە: ص٢٦ تا٢٩ لەنامیلکەی ناوبراو.

جا دیاره ئەو پارێزگاریی لێکردنەی کۆمەڵی ئیسلامییش بەهۆی چەند دەستەیەکی فیدایی مەشق پێکراو (مجموعات فدائیة مُدَّربة)ەوە، ئەنجام دەدرێ، بەڵام دەبێ بەر لەمەشق و راهێنانی سەربازییو فیدایییانە پەرەردەی ئیسلامیی تەواویان وەرگرتبێ، بە عەقیدەو عیباەت و رەوشتەوە..)[1]

کەواتە: دەتوانین قەناعەت و بۆچوونەکانی سەیید قوطب لەبارەی شێوازو چۆنیەتی کارو خەباتی ئیسلامییەوە لەدوو شت دا کورت بکەینەوە:

**یەکەم:** هەرچەندە بەدەستەوەگرتنی جڵەوی ئامانجی باڵاو کۆتایی کارو خەباتی ئیسلامییە، بەڵام هەڵەیە کە لەسەرێ (قِمَّة)وە هەوڵی دەست لێگیرکردنی بدرێو، پێویستە لەتێگەیاندن و پێگەیاندنی بنچینەوەو لەخوارەوە ڕا کاری بۆ بکرێ.

**دووەم:** نابێ دەرفەت بەدوژمنان بدرێ کە ئەو کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامییە سەرکوت بکەن و لەنێویان بەرن و دەبێ بایی ئەوەی بوون (وجود)ی خۆی بپارێزێ هێزو تواناو درکی هەبێ، ئەگەرنا طاغووت هەرکاتێك ئارەزووی کرد ڕیسی کارو چالاکییەکەیان دەکاتەوە بەخوری!

ئێستاش بۆ ئەوەی بەرنامەو نەخشەی مامۆستای شەهید زیاتر رۆشن بێتەوە، با ئەو شەش قۆناغەی کە خۆی دیاری کردوون و بەخەتی خۆی نووسیونی بیانخەینەڕوو، دیارە بەپوخت و کورت کردنەوەوە:[2]

١- لەسۆنگەی ئەوەوە کە سەرجەم کۆمەڵگایەکن نەك هەر لەڕەوشت و سیستەمی ئیسلامیی بگرە لەتێگەیشتنی ماناو چەمکی خودی ئیسلام و واتای ئیمان و عەقیدەو بەندایەتیکردن بۆ خواش دوورکەوتوونەتەوە، پێویستە لەتێگەیاندن (تفهیم)ەوەی مانای ئیسلام و چەمکی ئیمان و بەندایەتی بۆ خواکردنەوە، دەست بەکاربکرێ نەك لەشتی دیکەوە.

---

١- بڕوانە: (لماذا أعدموني؟!) ص٢٧،٢٨،٢٩، کە من کورت و پوختم کردۆتەوەو چەند وشەو تەعبیرێکی خۆشمم لەگەڵ خستوە بۆ زیاتر رۆشن بوونەوەی مەبەست.

٢- بڕوانە: (لماذا أعدموني؟!) ص٤٢تا٤٥، وە بڕوانە: (سید من المیلاد إلی الإستشهاد) ص٣٩٦،٣٩٧.

٢- ئەوانەی کە ئەو جۆرە تێگەیشتنە راست (فهم صحیح)ە وەردەگرن پێویستە لەهەموو رووەکانی عەقیدەو عیبادەت و رەوشت و فەرهەنگ و هۆشیارییەو- هتدەوە لەسەری پەروەردە بکرێن و لەهەموو رووەیەکەوە بەرچاویان رۆشن بکرێتەوە.

٣- نابێ دەست بەرێکخستن (تنظیم) بکرێو کۆمەڵ بنیات بنرێ، مەگەر پاش دڵنیابوون لە پەروەردەبوونێکی قووڵ و تەواوی تاکەکان (الأفراد) لەرووی ئیمان و عەقیدەو خواپەرستیی و رەوشت و هۆشیارییەوە.

٤- سەرەتای کاری ئیسلامیی بریتی نیە لە داواکاریی (مطالبة) خستنەروو بۆ پیادەکردنی سیستەمیی ئیسلامیی (إقامة النظام الإسلامي)، بەڵکو بریتیە لە گواستنەوەی گەل و میللەت بەحوکمڕان و رەعیەتەوە بۆ تێگەیشتنی راست و دروست لەئیسلام، وە پێکهێنانی بنچینە (قاعدة) یەك کە ئەگەر هەموو توێژەکانی گەلیش نەگرێتەوە، بەلای کەمەوە هەموو ئەو کەسانە بگرێتەوە کە کاریگەرییان هەیە لەئاراستەکردن و جووڵاندنی کۆمەڵگادا بەرەو قەناعەت پێهێنان و کارکردن بۆ بەرپاکردنی سیستەمی ئیسلامیی‌و جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلام.

٥- کەوا بێ ناگونجێ لەرێی کودەتا (إنقلاب)و خۆسەپاندنی بەزۆرو هێزەوە بگەینە حوکمرانێتی ئیسلامیی، بەڵکو لەرێی گۆڕین و راست کردنەوەی بیروڕاو بۆچوونەکانی کۆمەڵگا، یان لانی کەم توێژو کۆمەڵە کاریگەرەکانی کۆمەڵگاوە، بەوەی کە فەرزە ئیسلام لەهەموو بوارو لایەنەکانی ژیان و گوزەرانیان دا فەرمانڕەوا بێت، ئەو ئامانجە مەیسەر دەبێت.

٦- بەڵام لەهەمان کاتیشداو شان بەشانی ئەم کارو کاروان و رەوتە ئیسلامییە پێویستە هێزو قەڵغانێکی پارێزەریش هەبێ کە بەرگریی (دفاع) لەم کاروکاروانە ئیسلامیە بکات لەکاتی رێ لێبەستران (صَدُّ السَّبیل)و دەستدرێژیی کرانە سەرو شەڕو گێچەڵ بۆ نرانەوەدا، چونکە مادام کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامییەکە بەزۆرو هێز خۆی ناسەپێنێ، نابێ رێگایشی لێبگیرێ‌و، لەکاتی رێگا لێگیرانیشیدا هەقی خۆیەتی بەرگریی لەخۆی بکات و بایی رێکردنەوە چەك و هێز بەکاربهێنێ.

منیش دەڵێم:

پێم وایە هەرکەسێك بەوردیی سەرنجی دەقەکانی قورئان و سوننەت و سیرەو ژیانی پێغەمبەری کۆتایی (محمد) ﷺ بدات، دڵنیا دەبێ لەڕاستیی‌و دروستیی ئەم شەش بنچینەو قۆناغە کە مامۆستا سەیید قوطب هێناونی، بۆیە هەڵوێستەکەی خاوەنی کتێبی (سید قطب من المیلاد إلی الاستشهاد)م پێهەڵەیە کەخاڵ و بنچینەی شەشەمی بەرنامە (برنامج)ەکەی سەییدی بەهەڵە داناوەو گوتوویەتی:

(کۆمەڵی ئیسلامیی هەرچی لێبکرێ‌و پێی بکرێ لەلایەن ڕژێمە طاغووتیی‌و درندەو خۆسەپێنەکانەوە، دەبێ هیچ کاردانەوەیەکی نەبێ‌و هەر صەبر بگرێ‌و پشووی درێژ بێت و چاوەڕێ بێت تاخوا دەرووی خێری لێ دەکاتەوە!!)[1]

ئنجا ئەوەش کە بە بەڵگەی ئیسپاتی رایەکەی هێناویەتەوە، هەرچەندە وەك واقیع راستە، بەڵام نابێتە بەڵگەی راستیی رایەکەی، چونکە بەڵێ لەساڵانی (١٩٦٥)و (١٩٦٦)دا ڕژێمی ناصریی‌و، لەکۆتایی حەفتایەکان و سەرەتای هەشتایەکانیش دا ڕژێمی بەعسیی نوصەیریی لەسوریا، زەبری گرچووبڕی لەمسوڵمانانێك دا کە بڕوایان بەبەرەنگاربوونەوە (مواجهة) هەبوو، بەڵام خۆ:

**یەکەم:** سەرنەکەوتنی کارێك و بەئەنجام نەگەیشتنی هەنگاوێك بەتەنها نابێتە بەڵگەی هەڵەیی‌و ناشەرعیی بوونی، وەك چۆن سەرکەوتن و بەئامانج گەیشتنیش بەتەنها، هەمیشە بەڵگەی راست بوون و شەرعیی بوون نیە!

ئایا ناکرێ بڵێین:

هەم کارو نەخشەکەی برایان لەساڵی (١٩٦٥)و (١٩٦٦)داو، هەم هەوڵ و تەقەللایەکەی مسوڵمانانی سوریاش، بەهۆی کەم وکوڕیی‌و ناتەواویی‌و (خَلَلْ)ی چاك ڕەچاوکردنی هۆیەکان (مراعاة الأسباب)دا بووە؟! وەك: پەلەکردن، چاك پەروەردەنەبوونی ئەندامان، لاوازیی لەشارەزایی‌و هۆشیاریی سیاسی، نەبوونی وریایی‌و ئەزموونی تەواو لەڕووی سەربازیی‌و موخابەراتیی‌و...هتد!

---

١- بڕوانە: کتێبی ناوبراو، ص٣٩٦ تا ٤٠٠.

**دووەم:** ئایا ئەو هەموو دەقانەی قورئان و سوننەت کە بەموتڵەقیی هاتوون و باسی فەرزبوونی بەرەنگاربوونەوەو بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیی‌و بەرگریی‌کردن لەچەوساوان و...هتد دەکەن، چییان لێبکەین و، بۆ کەنگێیان هەڵگرین؟! بۆ وێنە:

﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ﴾[1]

﴿... فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ ...﴾[2]

﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ...﴾[3]

**سێیەم:** مسوڵمانان چ بەرگریی‌و دەستەوکەریان کردبێ لەبەرانبەرو ستەم و دەستدرێژیی طاغووتان و، چ نەیانکردبێ، بێمزەرەت و ئاسوودە هەر نەبوون و ناشبن، ئەدی ئەوە نیە خوای زاناو پەنهان و ئاشکرا فەرموویەتی: ﴿...وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْ...﴾[4] ؟! کەواتە: ئەگەر سەلامەت بوون و بێبەلابوون، بەلگەو نیشانەی راستیی‌و تەواویی بەرنامەی کاربێت، مانای وایە هیچ کاتێك مسوڵمانان بەرنامەیەکی راستی کارو خەباتیان نەبووەو نابێ، جگە لەوانەیان کە تەسلیمی حیزب و رژێمە نەفامیی‌و طاغوتیی‌یەکان دەبن و خۆیانیان بەدەستەوە دەدەن!!

**چوارەم:** بەڵام بێگومان من ناڵێم و بەڕاستی نازانم کەبنچینەی ناوبراو، واتە بنچینەی بەهێزو چەك بەرەنگاربوونەوەی ڕژێم و حیزبە گاغووتیی‌یە زۆردارو ڕێگرو دەستدرێژکارەکان،[5] بە موتڵەقیی‌و بەبێ بەندو مەرج (بدون قيد وشرط) وەربگیرێ،

---

١- الحج: ٣٩

٢- البقرة: ١٩٤

٣- البقرة: ١٩٣

٤- البقرة: ٢١٧

٥- لەکتێبی (چەند ڕێروونی‌یەك بۆ ئیسلامی‌یەکانی کوردستان)دا بەشی پێنجەممان بۆ توێژینەوەی ئەم مەسەلەیە تەرخان کردوە، بەناوی: (تاقە داینەمۆی ئیسلام گیانی بەرەنگاربوونەو، تەنها ڕێی حوکمڕانیشی توانایی‌و دەستەڵاتداربوونە)، لاپەڕە ٧٣تا٨٧، چاپی یەکەم.

بەڵکو خستنە قاڵبی جێبەجێکردن (تطبيق)ی ئەم یاساو بنچینەیەش وەك هەر یاساو بنچینەو مەبدەئێکی دیکە، پێویستی بە وردەکاریىو واقیع بینىو شارەزایىو وریایی زۆر دەکات، ئەگەرنا گەلێك یاسای راست و دروست لەسۆنگەی بەهەڵەو ناتەواو جێبەجێکرانەوە، لەجیاتی بەرهەم، ئاکامی زۆر خراپی لێ دەپشکوێتەوە.

ئێستاش کە (٢٧/١٠/٢٠١٠)ز یە، لەوبارەوە بەکورتی دەڵێم: بێگومان ڕێبازو شێوازی ئاسایی و بنەڕەتیی بۆ پاکسازیی و چاکسازیی کۆمەڵگاو پاشان بنیاتنانی دەوڵەت و قەوارەی سیاسی لە ئیسلام دا ، بریتیە لە: بانگەوازو تێگەیاندن و پێگەیاندن و هۆشیارکردنەوەی خەڵك و ئیقناع کردنیان، ئەمە بەرنامە (منهج)و ڕێبازو شێوازی کارکردنی سەرجەم پێغەمبەران بووە لە (نووح)ەوە هەتا (موحەممەد) صەلاوات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، وەك لە زنجیرە وتاری (ئیسلام و دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی)دا بەدرێژیی قسەم لەسەر کردوە، کە لەبەرنامەی (سەرنج)ی (کەناڵی ئاسمانیی پەیام)دا پێشکەش دەکرێن.

بەڵام ئایا لەکاتێك دا کە دوژمن و نەیاران ڕێگا لەکاروچالاکی ئیسلامیی دەگرن و، بگرە شەڕی پێ دەفرۆشن و دەستدرێژیی دەکەنەسەرو گێچەڵی پێدەکەن، ئیسلامییەکان بۆیان هەیە -مادام هیچ ئامرازو شێوازو هۆکارێکی دیکەی بەرگریی لەخۆکردن شك نەبەن -پەنابەرنەبەر هێزو چەك، بۆ بەرپەرچدانەوەی ستەم و دەستدرێژیی دوژمن و ناحەزانیان یان نا؟!

پێم وایە، بەڵێ: بۆیان هەیە، بەڵام بێگومان هەتا بگونجێ خۆڕاگریی (صبر) باشترە، دیارە لەکاتی بیرکردنەوەش لەبەکارهێنانی هێزو بەرەنگاربوونەوەدا، پێویستە زۆر بە وردیی و واقیع بینانەو دووربینانە سەرنج بدرێ، کە ئایا: ئەو بەرژەوەندیی (مصلحة)یانەی کە دێنەدی و ئەو خراپە (مفسدة)انەی کە پەیدادەبن چەندن و چۆنن؟ ئنجا دوای بەراورد (مقارنة) کردنو هەڵسەنگاندن و دڵنیابوون لەوە کە قازانج سەری مایە ناخوات و (مفسدة) بەسەر (مصلحة) دا زاڵ نابێ، ئەوجار بڕیاری بەرەنگاربوونەوەو بەرپەرچدانەوە بدرێ. هەڵبەتە ئەو سەرنجدان و هەڵسەنگاندن و بەراوردکردن و پاشان

بڕیاردانەش، پێویستە لەلایەن سەرکردایەتی و مشوورخۆرو بڕیار بەدەستانەوە بێ، نەك هەرکەس ڕاست بۆوە ئیعلانی جەنگ و جیهاد بکات!

## حەوت: سەیید قوطب لەدان پێداهێنانەکانی نێو زیندانیدا چی بەهەق و راستیی زانیوە، نووسیویەتی، بێگوێدانە ئەو ئاکامەی کە دڵنیا بووە چاوەڕێیەتی:

**بەڵێ خوێنەر بەڕێزەکان!** هەقبێژیی و ڕاست و ڕاشکاوانە دان پێداهێنانی سەیید قوطب – بێ ئەوەی هیچ کەسێك لەهاوەڵانی تووشی زیان و ئازار بکات، یەکی دیکەیە لە هەڵوێستە جوامێرانەو پڕشنگدارەکانی!

مامۆستای شەهید لەکۆتایی دان پێداهێنانەکان (إعترافات)یدا لەژێر ناوونیشانی: (كلمة ختامية)دا نووسیویەتی:[1]

ئەمەی گوتم گرنگترینی جۆرەکانی چالاکییەکانمە لەبزووتنەوەی ئیسلامییدا– کە ئێستا لەیادمە– لەوکاتەوە کە چوومەتە ریزی برایانەوە..

بەڵام قسەیەك ماوە لەکۆتاییدا دەیڵێم، جا چ ئێستاکە وەك خۆی فام بکرێ، چ فام نەکرێ، من ئەرکی خۆمە کەڕای بگەیەنم و لەم چەند خاڵەدا کورتی دەکەمەوە:

١– ئەو توندوتیژییەی کە لەساڵی(١٩٥٤)دا مامەڵەی پێ لەگەڵ (برایان)دا کرا، لەسەر بناغەی ڕووداوێکی بۆ سازکراویان نەك سازکراویان، کە ڕووداوی (المنشيه)یە..ئەو توندوتیژییەی کە ئەشکەنجەدان و کوشتن و دەرکردن و خانوو و ماڵ ڕووخاندنی گرتبوە خۆی..ئەو توندوتیژییە بوو بەمایەی سەرهەڵدانی بیرۆکەی بەهێز بەپەرچدانەوەی دەستدرێژیی، ئەگەر نا ئەگەر زانیبامان کە گرتنەکە تەنها گرتنێکە بەدادگاییکردنێکی دادگەرانە کۆتایی دێ– تەنانەت ئەگەر بەگوێرەی یاسا مرۆڤکردە کارپێکراوەکانی ئێستاش بووایە–، ئەوە هیچ کەس بیری لەبەرپەرچدانەوەی بەهێزو چەك نەدەکردەوە...

---

١- بڕوانە: (لماذا أعدموني؟!) ص٩١تا٩٤، کە بێ گومان من بە کورت کردنەوەوە نووسیومە بەبێ گۆڕینی نێوەڕۆك و دەستکاریی کردنی.

٢- هیچ گومانی تێدا نیە کە لەبەین بردنی بزووتنەوەی برایانی مسوڵمانو بزوتنەوە ئیسلامییە هاووێنەکانی لەناوچەکەدا، ئامانجێکی زایۆنیو خاچپەرستی ئیمپریالیزمە، وە هۆکارێکە بۆ نەهێشتنی عەقیدەو ئەخلاق لەناوچەکەدا، وە بێگومان هەوڵ و تەقەللایەکی زۆریش بۆ ئەو مەبەستە دەدرێ.

وە ئەگەر هاتباو بەشێوازێکی دیکە لەگەڵ بزووتنەوەی برایانی مسوڵمان دا مامەڵە کرابایە جیا لەوەی کە لەساڵی (١٩٥٤)و ئەمجارەش (واتە ١٩٦٥) روویدا، ئەوە لەجیاتی تێکشکاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی دەکرا نەخشەو پیلانەکانی زایۆنیزم و خاچپەرستە ئیمپریالیستەکان هەڵبوەشێنرێنەوەو تێك بشکێنرێن، ئەو بزووتنەوە ئیسلامییەی کە بۆتە کۆسپ و پەرچی بەردەم ئەو تەوژمە بێدینیو ماددییو رەوشت نزمییەی، کەپاش جووڵانەوەی بێدینایەتی کەمال ئەتاتورك لەتورکیا پەرەی ستاندو تەشەنەی کرد.

٣- ئاشکرایە کە دوابەدوای لێدانی (برایان) لەساڵی (١٩٥٤)دا شەپۆلێکی رەوشت نزمییو رێرەوی بێدینی پەیدابوو، وە بێگومان دوابەدوای ئەم لێدرانەشیان شەپۆلێکی توندتر پەیدا دەبێ، کە مەگەر هەر خوابزانێ تا کوێ دەڕوات، جا ئایا ئەو داڕووخانە لە قازانجی کێیە؟! مسۆگەر لەقازانجی ئەم وڵاتەو بگرە رژێمەکەیشی- ئەگەر دووربین بین- نیە! چونکە هەموو سیستەم و قەوارەیەك لەدونیادا بەتایبەت لەسەرەتایەوە، حەوجێی رەوشت و ئاتاجی عەقیدەو ئەو شتانەیە کە دەیپارێزن و خۆییان پێڕادەگرێ، وە بێگومان کۆمەڵگای عەقیدە لەرزۆك و رەوشت دا رووخاو پارووپەکی ئاسان و نێچیرێکی تووك نەرمە بۆ ناحەزانی...

٤- چەند جارێك گوێبیست بووم کە گوتوویانە: ئایا تەنها ئێوە مسوڵمانن؟! ئایا کۆنگرەی ئیسلامیی (المؤتمر الإسلامي)و بەرنامەی (نور علی نور)تان بەس نیە؟ خۆ مزگەوتەکان نوێژیان تێدا بەرپا دەکرێو، خەڵکی حەجێ دەکەن و...هتد.

جا پێویستە کەڕای بگەیەنم: کە ئیسلام شتێکە لەهەموو ئەمانە تەنها گەورەترە، بەرنامەی ژیانێکی تێرو تەواوە، وە ئیسلام تەنها بەوە بەرپا دەبێت کە تاکەکان (أفراد) پەروەردەیەکی ئیسلامییانە بکرێن و پێبگەیەنرێن، پاشان شەریعەتی خوا لەژیانی

خەڵکیدا بەرپاو جێبەجێبکرێ، وە ئیسلام بریتی نیە لەچەند زانیاریی و شارەزاییەك، کە بەبێ جێبەجێکردن و بەرجەستەکردن بڵاوبکرێتەوە، بەڵکو پێویستە سەرەتا وەك پەروەردەو پاشان وەك حوکم و سیستەم بخرێتە قاڵبی کردەوەو بەرجەستە بکرێ...)

پاشان سەیید قوطب (رەحمەتی خوای لێبێ) لەکۆتایی وتەی کۆتایی (كلمة ختامية)یەکەیدا نووسیویەتی: (إنَّ الإسلامَ لايقومُ ولايُوجَدُ في بَلَدٍ لَيْس فيه حَركةُ تَرْبيةٍ ثم قيامُ نظامٍ إسْلاميّ يحكُمُ بشريعةِ الله في النهاية!

وهذه في النهاية كلماتُ رَجُلٍ يَسْتَقْبِلُ وجْهَ الله يُخَلِّصُ بِها ضَمِيرَهُ ويُبَلِّغُ بِها دَعْوَتَهُ إلى آخِرِ لَحْظةٍ. )

**والسَّلام على مَنِ اتَّبَعَ الهُدى..**

**السجْنُ الحَرْبي في ٢٢ أكتوبر سنة ١٩٦٥**

**سيد قطب**

*****

واتە: ئیسلام لەهیچ شوێنێك بەرپا نابێو پەیدانابێ[١]، مەگەر بزووتنەوەیەکی پەروەردەیی تێدا بێ، پاشان لەکۆتاییدا کیان و سیستەمێکی تێدا بەرپابێ، کەحوکم بە شەریعەتی خوا بکات.

ئەمە وشە کۆتاییەکانی پیاوێکن کەبەرەو رووی خوا دەچێو، بەم وشانە ویژدان و دەروونی خۆی ئاسوودە دەکات و، تا دوایین تاوەکانی ژیانی پەیامی خۆی رادەگەیەنێ... وە سەلامیش لەو کەسەبێ کە شوێن رێرووونیی (خوا) دەکەوێ.

**زیندانی (الحَرْبي) لە ٢٢ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٦٥**

**سەیید قطب**



١ – واتە بەو شێوەیەی کە خوای باڵادەست و کاربەجێ فەرمانی پێکردووەو پێغەمبەری خوا ﷺ جێبەجێکردوە، کە لەئایەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ﴾ التوبة: ٣٣، دا دەردەکەوێ.

**ئابەم شێوەیە خوێنەرە بەڕێزەکان!** مامۆستای شەهید کەکاتێك دا لەچاوەڕێی پەتی سێدارەی دەکرد لەگەردنی بەرزی بئالێ، بەڵێ لەو کاتە ناسك و دژوارەدا چی بەهەق و راست و چاکی زانیوە- کە بێگومان هەموو بابایەکی شارەزاو ئاشنا بەقورئان و سوننەتیش بەهەق و ڕاست و ڕەوای دەزانێ- بێباکانەو ڕاشکاوانەو بێ‌قۆرت و پێچ، نووسیویەتی چونکە وەك خۆی گوتوویەتی: بەرەو دیداری خوای پەروەردگار چووەو، دەروون و ویژدانی بەو هەقبێژییەو پەیام و بانگەواز راگەیاندنە بوێرانەو جوامێرانەیە ئاسوودە بووە!

## هەشت: هەڵوێستی جوامێرانەی سەیید قطب لەکاتی لێکۆڵینەوە (تحقیق) و دادگاییدا:

(سید قطب) چ لەکاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵ کران و چ لەکاتی دادگاییکراندا، لەسەر هەڵوێستی بوێرانەو هەقبێژانەی خۆی بەردەوام بووەو هێندەی موویەك نەرم کێشیی (تنازل)ی نەکردوە.

جا بێگومان لێرەدا جێی هەموو ئەو قسە هەق و راست و جوامێرانانەی سەیید نابێتەوە کە لە هەردووك حاڵەتەکەدا کردوونی، بۆیە بەچەند نموونەیەك لەهەر کامێکیان وازدێنین:

### یەکەم: لەکاتی لێکۆڵینەوە (تحقیق) لەگەڵ کرانیدا:[1]

١- پرسیار: هەندێك لەتۆمەتبارکراوان، پێیان وایە کە (حسن الهُضیبي) ئێستاش هەر ڕابەر (مرشد)ە، تۆ ڕات لەوبارەوە چییە؟!

وەڵام: راستییەکەی تێکڕای کۆمەڵی برایانی مسوڵمان ئەو هەستە گشتییەیان هەیە.. وە منیش پێم وایە کە (حسن الهضیبي) هەر لەشوێنی خۆیەتیو ڕابەرە!

٢- پرسیار: ئایا ڕێبازی گەیشتن بەئامانجی کۆتایی چۆنەو پێتان وایە ئەو ئامانجە چییە؟!

---

١- بڕوانە: (الموتی یتکلمون) سامي جوهر، چ١١١تا١٤٦، کە (محضر)ی (تحقیق)ی رۆژانی: یەك شەممە: ١٩٦٥/١٢/١٩ز و، دوو شەممە ١٩٦٥/١٢/٢٠ز و، سێ شەممە: ١٩٦٥/١٢/٢١ز ی هێناوە، وە بڕوانە: (سید قطب من المیلاد إلی الإستشهاد) ص٤٣٠تا ٤٣٩.

وەڵام: ئـەو ئامانجـە کۆتاییـەی کـە لەسـەری پێکهـاتووین ئەوەیـە کـە کیـان و سیسـتـەمێکی ئیسـلامیی بـەرپابێت، کـە بەشـەریعەتی خـوا بەڕێوەبچـێ نـەك بەیاسـا دانراوەکان (القوانین الوضعیة)، ڕێبازیش بریتیە لە پەروەردەیەکی ئیسلامیی درێژخایەنی هەمەلایەنە.

٣- پرسیار: جا ئایا ڕێکخستن (تنظیم)ەکە نهێنی بوو یان ئاشکرا؟!

وەڵام: نهێنی بوو.

٤- پرسیار: جا مەبەست لە نهێنی بوونی چیبوو، مادام ئامـانج پەروەردەیـەکی ئـایینی ڕەوشتیی بێت؟!

وەڵام: لەسـۆنگەی ئـەوەوە کـە قەناعـەتێکمان بـۆ پەیـدا بـووە، کـە لەسـەرجەم ئەزموونـەکانی رابـردوو هــەڵمان هێنجــاوە، وە چــونکە بەنەخشــەو پیلانــەکانی خاچپەرستەکان و زایۆنیـەکان و شیوعیەکان لەناوچەکەدا شـارەزاین، کـە دژایـەتیو پێشـگیریی هـەر پەروەردەیـەکی ئیسـلامیی جـووڵاو دەکـەن، کـە بـەرەو ئـەو ئامانجـە: هێنانەدی کیان و دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەنگاوبنێ.

٥- پرسیار: رات دەربارەی ئەم رژێمەی ئێستا چیە؟!

وەڵام: من بەڕژێمێکی نەفامیی دەزانم.

٦- پرسیار: مانای وایە تۆ پێت وایە پێویستە بگۆڕرێ؟!

وەڵام: بـەڵێ پـێم وایـە دەبـێ بگـۆڕرێ لـەکاتێك دا کـە بنەمایـەکانی کیـان و سیستەمێکی ئیسلامیی دەڕەخسێن.

٧- پرسیار: پێت وایە طاغووت مانای چیە؟!

وەڵام: پێم وایە طاغووت هەر بەرنامەیەکە جگە لەشەریعەتی خوا.

٨- پرسیار: ئایا نازانی کە بەرپاکردنی ڕێکخستنێکی ئەوتۆ پێچەوانەی یاسا (قانون)یەو خۆت و کۆمەڵەکەت دەخاتە بەر چەقۆی یاسا؟!

وەڵام: دەزانم پێچەوانەی یاسایە بەڵام ناچاربووم بۆی، چونکە هەر ئەوە شێوازێکی سەرکەوتووی پەروەردەیەکی ئیسلامییە، هەرچەندە یاساش قەدەغەی بکات!

٩- پرسیار: جا چۆن پێچەوانەی یاسا جوولانەوەو تاوان کردن شێوازی پەروەردەیە؟ ئایا شەریعەتی ئیسلام بەوە رازییە؟ لەحاڵێك دا كە ئایینی رەسمیی دەوڵەت ئیسلامە؟!

وەڵام: مادام یاسا پێشگیریی لە مسوڵمان دەكات كە بەئەركی ئایینی خۆی هەستێ، لەتێگەیاندن و رێپرووونیكردنی خەڵكیدا، ئەوە كەم وكووڕییەكە لەخودی یاساكەدایە كە دژی بنەڕەتێكی ئایینە!

١٠- پرسیار: جا تۆ پێت وایە كە لەیاساكانی ئێستادا شتێك هەیە كەرێ لەمسوڵمان بگرێ بۆ جێبەجێكردنی ئەركە ئایینییەكانیو رێنمایی كردنی خەڵكی؟!

وەڵام: من پێم وایە كە ئەو بڕیارە تایبەتییەی كارو چالاكی ئاشكرای كۆمەڵی برایانی مسوڵمانی قەدەغەكردوە، كە ئەركە ئایینییەكانی ئەنجام ئەدات، ئەوە دژی فەرمانێك لەفەرمانەكانی ئایینە!

**دووەم: لەكاتی دادگاییكرانیدا:**[1]

دیارە (جمال عبدالناصر)ی دیكتاتۆر بۆ دادگاییكردن (محاكمة)ی سەییدو دوو هاوەڵەكەی دادگایەكی سەربازیی (محكمة عسكرية)ی بەسەرۆكایەتی ئەفسەر (ضابط)ێكی بوودەڵەی ترسنۆك و رەوشت نزم و زمان شڕ بەناوی (فؤاد الدجوي) پێك هێنابوو، كە لە (٩/٤/١٩٦٦) دەستی بەدادگاییكردنی سەیید كردوە.[2]

ئینجا شایانی باسیشە كە دادگاییكردنەكان هێندە ستەمكارانەو بێماناو پووچ بوون، تەنانەت بەتەرازوو پێوەری یاسا دەستكردەكانیشی جێی رەخنەو گلەیی زۆر بوون و بێیاساییانە (غير قانونية) دانراون و، رێكخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی (منظمة العفو الدولية)ش كاتی خۆی لە (١٥/٤/١٩٦٦)دا بەیانێكی بۆ رۆژنامەكان و رای گشتیی

---

١- بڕوانە: (الموتى يتكلمون) لە ص١٦٠ تا١٨٢، كە چۆنیەتی دادگاییكردنی سەییدی تێدایە، هەروەها بڕوانە: (سيد قطب من الميلاد إلى الإستشهاد) ص٤٥٠ تا ٤٦٠، كە هەڵبژاردەیەكی لەدادگاییكردنی سەیید قوطب هێناوە.

٢- بڕوانە: (سيد قطب من الميلاد إلى الإستشهاد) ص٤١١.

جیهانه بڵاوکردەوە، کە تێیدا دادگای میصری تاوانبار کردبوو وە (٨) رەخنەی یاسایی لەو جۆرە دادگایی کردنانە گرتبوو.[1]

ئەمەش گوڵچنێکی کورت لەوەڵامە ئازایانەو بوێرانەکانی سەیید لەکاتی دادگاییکرانیدا لەلایەن (دجوي) بوودەڵەو بووکەڵەوە:[2]

پاش وتووێژێك لەنێوان (فؤاد دجوي)و (سيد قطب)دا لەبارەی رێکخستنێکی برایانەوە، وە رونکردنەوەی ئەو راستییە کە لەکاتێکدا سەیید بینیویەتیو زانیویەتی کە بەتەمان تۆڵەی شەهیدەکانی برایان لەساڵی (١٩٤٥)ز دا بستێننەوەو ئەویش بۆی روون کردوونەوە کە ئەوکارە مەترسییەکانی لەسوودەکانی زیاترن و سەرەنجام بەرەو لای بەرنامەیەکی پەروەردەییانە رووی پێ وەرچەرخاندوون، بەڵێ دوای ئەو وتووێژە ئەم گفت وگۆیە روویدا:

+ سەیید: وە من دەستم کرد بەتێگەیاندنیان لەو راستییە کە تۆڵەستاندنەوە ئامانجێکی گچکەیە.

– دەجەویی: ئەدی ئامانجی گەورە چییە؟

+ سەیید: ئامانجی گەورە پێگەیاندنی وەچەیەکی لاوی مسوڵمانی تێگەیشتوو لەئایینەکەیەتی...هۆشیار بەکاروباری کۆمەڵگایەکەی، تاکو ببنە کاکڵەو بناغەی پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی.

– دەجەویی: ئەدی حوکم؟

+ سەیید: حوکم، وەك تێم گەیاندبوون، بەڕاوبۆچوونی من..گۆڕانکاریی لەبنچینەوە دەبێ نەك لە سەرەوە..بنچینەش پێگەیاندنی وەچە (جيل)ە لاوەکانە.

– دەجەویی: بەڕای تۆ لەبنچینەوە دەست پێدەکات تاکو بگاتە کوێ...بگاتە لووتکە یان نیوەی ڕێ؟ تۆ باسی شوێنی هەڵسانت کرد، بەڵام شوێنی گەیشتنت باس نەکرد!

---

١- بڕوانە: (لماذا أعدم سيد قطب وإخوانه؟!) ص٣٥تا٤١، لە (سيد قطب من الميلاد إلى الإستشهاد) ص٤٤٩،٤٤٨.

٢– بووکەڵە، بووکە شووشە.

+ سەیید: بێگومان حوکم و دەستەڵاتی ئیسلامیی لەوان پێك دێ!

– دەجەویی: واتە حوکم و دەستەڵات دەگرنە دەست؟!

+ سەیید: (بەڵێ) من قسەو رایەك دەردەبڕم كە بۆ مێژوو تۆمار دەكرێ!

**بەڵێ خوێنەرە بەڕێزەكان!** ئەمە هەڵوێستی شێرانەو بوێرانەی مامۆستای شەهید بووە، لەكاتی پرسیارو وەڵامی لێكۆڵەرەوان و لەبەردەم دادگادا، كە وەك دەبینین هەمان بیروڕاو بۆچوون كە لەتەفسیری (في ظلال القرآن)و كتێبەكانی دیكەیدا بەتایبەت (معالم في الطريق) نووسیویەتیو خستوویەتەڕوو، هێندەی نووكی دەرزی گۆڕانی بەسەردا نەهاتوە بگرە زیاترو چاكتریش روونی كردۆتەوەو تیشكی خستۆتە سەر!!

## نۆ: هەڵوێستی مەردانەی سەیید قوطب لەماوەی چاوەڕوانی حوكم درانیدا:

سەیید قوطب چوار مانگ زیاتر بەسەر دادگایی‌كردنیدا رابردو هەر چاوەڕوانی ئەوەی دەكرد حوكمی بەمەزەننە زانراوی كە (سێدارە)یە بەسەردا بدرێ، جا لەو ماوەیەدا چەند قسەیەك لەو كەڵەپیاوە بیستراون كە پایەبەرزیی ئەو میراتگرە رەسەنەی پێغەمبەری خواﷺ دەردەخەن:

١– (أحمد رائف) گێڕاویەتەوە[١] كە جارێكیان لەڕێگای مەتبەق (مطبخ) چاوی بە سەیید كەوتوەو پێی گوتوە:

– چاوەڕێی چی دەكەی؟!

ئەویش بەزەردەخەنەیەكی متمانەدارو لەسینەیەكی ئارام و هێمن هەڵقوڵاوەوە گوتوویەتی: (أَنْتَظِرُ الوُفُود على ربِّي)، چاوەڕێی بەخزمەت گەیشتنی پەروەردگارم دەكەم!



١– بڕوانە: (البوابة السوداء) أحمد رائف، ص٢٢٣.

٢- هەروەها لەو سەردەمەدا گوتوویەتی:[١] (إنَّه آنَ أنْ يقدِّمَ إنْسانٌ مُسْلِمٌ رَأْسَهُ ثَمناً لإعْلانِ وجود حركةٍ (إسْلاميةٍ..)، بێگومان کاتی ئەوە هاتوە کە ئینسانێکی مسوڵمان سەری خۆی بکاتە نرخی ڕاگەیاندنی بوونی بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی..

٣- هەروەها لەنامەیەکیدا سەیید قوطب بۆ (أحمد عبدالغفور عطار)ی ناردوەو کاتی خۆی- وێڕای نامەیەکی دیکەی سەیید- دەقی نامەکە بەخەتی سەیید خۆی لەژمارە (٢)ی گۆڤاری (كلمة الحق)دا کە لە (مكة) دەرچووە بڵاوکراوەتەوە[٢]، لەدرێژەی نامەکەیدا نووسیویەتی:

(لَقَدْ وجَدتُ الله كما لَمْ أَجِدْهُ مِنْ قَبْلُ قَطُّ..لَقَدْ عَرَفْتُ مَنْهَجُهُ وطَريقَهُ كما لَمْ أَعْرِفْهُ مِنْ قَبْلُ قَطُّ..ولَقَدْ أَطْمأَنَنْتُ إلى رِعايتهِ وَوَثِقْتُ بِوَعْدِهِ للمؤمنين كما لم أطمئن من قبل قَطُّ..وأنا بعد ذلك - على ماعَهِدْتَني- مَرْفوع الرأس لاأَحْنيْهِ إلا لله، والله يَفْعَلُ ما يشاء..والله غالبٌ على أمرِهِ ولكن أكثر الناس لايَعلَمون..)

واتە: وەك ئەم جارە خوام ناسیوە هەرگیز پێشتر وام نەناسیوە.. بەرنامەکەیو ڕێبازەکەیم بەجۆرێك ناسیوە هەرگیز پێشتر وام نەناسیبوو..

وە بەجۆرێك دڵنیام لەچاودێری کردنی خواو مشوور لێخواردنی، وە بەئەندازەیەك باوەڕ (ثقة)م بە بەڵێنی هەیە بۆ بڕواداران کە هەرگیز لەوەپێش وانەبووم، ئینجا دوای ئەوەش من- وەك ناسیوتم- سەرم بڵندەو بێجگە لەخوا بۆ هیچ کەسی دانانوێنم.. وە خواش چی بوێ دەیکات.. وەخوا بەسەر کاری خۆیدا زاڵ و باڵادەستە، بەڵام زۆربەی خەڵکەی (ئەو ڕاستییە) نازانن..

## دە: هەڵوێستی ئیماندارانەو پێشەوایانەی سەیید پاش دەرچوونی حوکم و بەر لەسێدارەدرانی:

دیارە بەر لە حوکم درانی هەوڵی زۆر لەگەڵ سەیید درا کە نەرمکێشی (تنازل) بکات و حاشا لەکۆمەڵی برایان (ڕێکخستنی تازە) بکات و، داوای لێکرا کە تەنها یەك دێڕ

---

١- بڕوانە: (لماذا أعدموني؟!) ص٧.

٢ -بڕوانە: (كلمة الحق) السنة الأولى: العدد الثاني- مايو: ١٩٦٣\ص٤٠.

(سطر)یان رستە (جملة)یەك بۆ (جمال عبدالناصر) بنووسیێو داوای لێبوردنی لیێبکات، تاکو هەم قوتاری بێت لەزیندان و هەم چ پلەوپایە (منصب)ێکیشی بویێ بیدرێتیێ!

دیارە ئەو هەولێ و تەقەللایانەش هەر بەردەوام بوون هەتا دوا شەوی کە تێیدا لەسێدارەدرا، جا باگویێ لە (حمیدة)ی خوشکی بگرین تاکو ئەو بەسەرهاتەمان بۆ بگێڕێتەوە، (حمیدة) وەك (زینب الغزالي) لێی گێڕاوەتەوە کە گوتوویەتی:[١] (حمزة البسیوني) بەڕێوەبەری حەپسخانە (الحربي) بانگی کردوە بۆ نووسینگەکەی خۆیەو حوکمی لەسێدارەدران (حکم الأعدام)و ئیمزا لەسەر کرانی کاکمی پێشان دام!

پاشان پیێی گوتم:

حکومەت ئامادەیە ئەم حوکمە سووك بکات بەمەرجێ کاکت داواکارییەکەیان جیێبەجیێبکات!

وە پیێی گوتم: کاکت زیانێکی گەورەیە بۆ هەموو میصر نەك تەنها بۆ تۆ، من پێم وانیە پاش چەند ساعاتێکی دیکە ئەو کابرایە لەدەست بدەین، ئێمە دەمانەویێ هەرچۆن و بەهەر شێوازێك بووە لەکوژران قوتاری بکەین!

تەنها چەند وشەیەك بلیێ لەحوکمی سێدارە قوتاری دەکات، جگە لەتۆش هیچ کەس ناتوانیێ کاری تیێبکات..

ئێمە دەمانەویێ بلیێ:

ئەم بزووتنەوەیە سەر بەشوێنێکە! هەر ئەوەندە بلیێ کاری تۆ تەواو دەبیێو، ئەویش بەلێبوردنێکی تەندروستی (عفو صحي)بەردەدریێ!

منیش پێم گوت:

بەلاَم تۆش و (جمال عبدالناصر)یش دەزانیێ کە ئەم بزووتنەوەیە سەر بەهیچ شوێنێك نیە!

(حمزة البسیوني) گوتی: من دەزانم، وە هەمووشمان دەزانین کە ئێوە تەنها لایەنێکن لەمیصر کە لەپێناوی عەقیدەدا کار دەکەن، وە دەزانین کە ئێوە چاکترین خەڵکی ئەم وڵاتەن، بەلاَم بەس دەمانەویێ (سید قطب) لە لەسێدارەدران رزگار بکەین!

---

١- بڕوانە: (أيام من حياتي) س١٨٣، ١٨٤، زينب الغزالي.

پاشان تەماشایەکی (صفوت الحرِبي) کردو گوتی: ئەی صەفوەت ببیە لای کاکی!

منیش چوومە لای کاکم و سەلامم لیّ کردو ئەوەی کەلیّی داوا دەکەن پیّم ڕاگەیاند، ئەویش تەماشایەکی کردم تاکو بزانیّ داخۆ بەدەم و چاومەوە دیارە ئایا من ئەوەی لیّ دەخوازم یان ئەوان؟! هەرچۆن بوو توانیم حالّی بکەم کە ئەوانن.

ئینجا سەرنجی دام و گوتی:

(بەخوا ئەگەر ئەو قسەیە ڕاست بووایە دەمگوت، وەهیچ هێزێك لەسەر ڕووی زەوی نەیدەتوانی کە پێشگیریم لیّبکات لەگوتنی، بەڵام شتی وانەبووەو هەرگیز درۆش ناکەم!)

ئینجا صەفوەت لیّی پرسی: کەواتە ئەمە هەڵوێستتە؟!

(سەیید) گوتی: بەڵیّ.

ئینجا صەفوەت بەجیّی هێشتین و گوتی: هەرچۆن بیّ دەتوانن نەختێك پێکەوە دابنیشن.

ئەوجا منیش بەسەرهاتەکەم لەنووکەوە لەکاکم گەیاندو پێم گوت (حمزة) بانگی کردووم و حوکمی لەسێدارەدرانتی پێشان داوم و، داوای لیّکردووم کە ئەم داواکارییەت لیّبکەم!

ئەویش لیّی پرسیم: جا تۆ بەمە ڕازی دەبی؟

گوتم: نەء

گوتی: (ئەوان زیان و قازانجی خۆیشیانیان بەدەست نیەو تەمەنەکان بەدەست خوان، وە ئەوان حوکمیان بەسەر ژیانی من دا نیەو، ناتوانن تەمەنەکان درێژ یان کورت بکەن، ئەوە هەمووی هەر بەدەست خوایەو خواش لەپشتیانەوە دەورەی داون).

وە لەڕۆژی پێش شەهیدکرانیدا چەند قسەیەکی لیّوە گێڕراونەوە بۆ وێنە:-

١- یەکێك لەبرایەکانی لیّی پرسیوە: بۆچی هێندە بەڕوون و ڕاشکاویی لەو دادگایەدا کە ملی تۆی لەدەست دایە قسەت کرد؟!

ئەویش گوتوویەتی: چونکە قسەی مەیلەو پەنهان (تورية)[1] لە عەقیدەدا دروست نیەو، بابای سەرکردەش نابێ بەمۆڵەتان (رخص) کار بکات، (بەڵکو دەبێ بە (عزائم) کار بکات)[2]

٢- وەکاتێك بیستی حوکمی لەسێدارەدرانیان بەسەردا خوێندەوە، گوتی: (الحَمدلله، لَقَدْ عَمِلْتُ خَمسة عَشَر عاماً لَنيْلِ الشهادَةِ) واتە: ستایش بۆ خوا، بێگومان پازدە ساڵە بۆ بەوەدەست هێنانی پایەی شەهیدیی هەوڵ دەدەم.

٣- وە لەکاتی دیداری لەگەڵ (حميدة)ی خوشکیدا پێی گوت:

(ئەگەر بابە رابەر (حسن الهضيبي)یت دی سەلامی منی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ: کە سەیید ئەوەی کە لەوپەڕی توانای ئینسانداپە تەحەممولی کرد بۆ ئەوەی ئەو (رابەر) هیچ ناڕەحەتیی تووش نەبێ.)

٤- وە کاتێك داوای لێکرا کە لەبەرانبەر بەردرانیدا داوای لێبوردن بکات، گوتی: (لَنْ أعْتَذِرَ عَنْ العمل مَعَ اللهِ) هەرگیز لەبەر کارکردن بۆ خوا داوای لێبوردن ناکەم.

٥- وە کاتێك داوای لێکرا چەند وشەیەك بۆ (جمال عبدالناصر)ی وابەستەو بێجەوهەر بنوسێو داوای بەزەیی نواندنی لێبکات: گوتی:

(إنَّ أُصبُحُ السبابة الذى يَشْهَدُلله بالوَحْدانيةِ في الصلاةِ، لَيرْفُضُ أنْ يكتُبَ حَرفاً يُقِرُّ بهِ حكم طاغيةٍ) واتە: ئەو پەنجەی شایەتمانە کە لەنوێژدا شایەدیی بۆ یەکتایی خوا دەدات، رازی نابێت پیتێك بنووسێ کە دان هێنان بەحوکمی طاغووتێکی تێدا بێ!

٦- وەکاتێ: پێی گوترا: داوای چاوپۆشی لێکران بکات! گوتی:

(لِماذا أسْتَرْحِمُ إنْ سُجِنْتُ بِحَقٍ فأنا أقْبَلُ حُكْمَ الحقَ! وإنْ سُجِنْتُ بباطِلٍ، فأنا أكْبَر مِنْ أنَ أسْتَرحِمَ الباطِلَ)[1].



---

١- (تورية) یان (كناية) یان (تعريض) کە لەکوردیدا (قسەی بەئاماژە) یان (لەبەر راهاوتین) یان (قسەی مەیلەو پەنهان)ی پێدەگوترێ، ئەوەیە کە قسەیەك بکەی مانایەك زیاتر هەڵبگرێ تۆش مەبەستت پێی مانا پەنهان و وردەکەی بێت، نەك رواڵەتیو ئاشکراپەکەی.

٢- ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە خۆم زیادم کردوە چونکە (لازم)ی قسەکەیەتی.

واتە: بۆچی داوای مەرحەمەت بکەم، ئەگەر بەهەق گیرابم، ئەوە حوکمی هەقم قبووڵەو، ئەگەر بەناهەقیش گیرابم، ئەوە من لەوە گەورەترم کە داوای بەزەیی پێداهاتنەوەی باطیل بکەم!

٧- هەروەها دەگێڕنەوە کە بەر لە پەت خستنەگەردنی مەلایەکی سەر بەحکومەت پێی گوتوە: شایەتمان بهێنە! ئەویش بەزەردەخەنەوە پێی گوتوە: (لەسەر شایەتمان لەسێدارەم دەدەن!!)[٢]

## لەکۆتایی‌دا:

لە کۆتایی گوڵبژێری هەڵوێستە پرشنگدارەکانی سەیید قوطب دا (رەحمەتی خوای لێبێ) بە پێویستم زانی ئەم چەند روونکردنەوەیە بنووسم:

١- بێگومان سەیید قوطب هەر یەکێکە لەزاناو پێشەوایانی ئیسلام و وەك ئەوان هەرچەند زاناو لێهاتوو بەڕێزە، بەڵام لە هەڵەو کەم و کوڕییش پارێزراو نەبووە، بەتایبەتیش کە کەمتر دەرفەتی بووە لێکۆڵینەوە لەسەرچاوەکانی کەلەپووری ئیسلامیی‌دا بکات، لەبەر چەند هۆکارێك کە شاراوە نین.

٢- بەڵام هیچ کەسێکی خاوەن ویژدانیش ناتوانێ نکووڵیی لە چاك و راست و قووڵ تێگەیشتنی (سید قطب) بکات لەبارەی عەقیدەو شەریعەت و گەلێك باس و بابەتی گرنگی سیاسەتی شەرعیی‌یەوەو من پێم لەوبارەوە (مجتهد)ێکی گەورە بووە.

٣- ئەوەش کە ئەو پێشەوا بەڕێزەی پێ تۆمەتبار دەکرێ کە گوایە مسوڵمانانی بەکافر داناون و (تکفیر)ی کردوون، فڕی بەسەر هەق و راستی‌یەوە نیە، چونکە خۆی لەوبارەوە



١- ئەو شەش قسەو هەڵوێستەی کە لەم شەش برگەیەدا هاتوون، لەکتێبی (لماذا أعدم سيد قطب وإخوانه؟!) ص٢، وەرگیراون، هەروەها (سيد قطب من الميلاد إلى الإستشهاد)یش لێی خواستوونەوە، بڕوانە: ص٤٧٣،٤٧٤.

٢- ئێستا نازانم لە چ سەرچاوەیەك دا ئەو قسەیەم بینیوە!

قسەی روون و راشکاوو بێپێچ وپەنای هەیەو لە نامیلکەی (لِماذا أعدموني؟!)دا هاتوە کە گوتوویەتی:[1]

(وقَدْ قُلْتُ لَهُ: إننا لَمْ نُكَفِّر الناسَ، وهذا نَقْلٌ مُشَوَّهٌ، إنَّما نحن نَقُولُ: إنَّهم صاروا مِنْ ناحيةِ الجهلِ بحقيقةِ العقيدة وعدمِ تصور مَدْلُولِها الصحيح والبُعْدِ عن الحياةِ الإسلامية إلى حالٍ تُشْبِهُ حال المجتمعاتِ الجاهلية، وأنه من أجْلِ هذا، لاتكون نُقْطَةُ البَدْءِ في الحركةِ الإسلامية هي قضية إقامَةِ النظام الإسلامي، ولكن تكون إعادة زرع العقيدة والتربية الأخلاقية الإسلامية، فَالمَسْألة تَتَعَلَّقُ بِمَنْهَجِ الحركة أكثر مما تتعلقُ بالحكم على الناس).

واتە: وە پێم گوت: ئێمە خەڵکی کافر ناکەین.. ئەمە قسە گواستنەوەیەکی شێوێنراوە، بەڵکو ئێمە تەنها دەڵێین، کە خەڵك لەڕووی تێگەیشتنی حەقیقەتی عەقیدەو چاك وەرنەگرتنی واتای راست و دروستیەو، دووریی لەژیانی ئیسلامیەوە، چوونەتە حاڵێکەوە کە وەك حاڵی کۆمەڵگا نەفامییەکان دەچێ، جا هەر بۆیەش نابێ خاڵی دەستپێکردنی خەباتی بزووتنەوەی ئیسلامیی، مەسەلەی بەرپاکردنی حوکم و سیستەمی ئیسلامیی بێت، بەڵکو دەبێ دووبارە چاندنەوەو چەسپاندنەوەی عەقیدەو پەروەردەی رەوشتی ئیسلامیی‌یانە بێت، کەواتە مەسەلەکە زیاتر پەیوەندیی بە بەرنامەی کاری بزووتنەوەوە هەیە، نەك حوکم بەسەر خەڵکیدا دان.

٤- کەسانێکیش کە لەڕووی بوغزو غەرەزەوە لەبارەی ئەو پێشەوا بەرێزەوە دەدوێن و وەك مێشەرەشە هەر بەدوای هەڵەو کەم وکوڕییەکانیدا دەگەڕێن، کە بێگومان هیچ ئینسانێك لە هەڵەو کەم وکوڕیی خاڵی نابێت! وە ئەو هەموو هەڵوێستە جوامێرانەو مەردانەی سەیید قوطب نادیدە دەگرن و، ئەو هەموو زانیاریی‌یە بەسوودو راستیە بەرزو مەزنانەی کە سەیید لە تەفسیرەکەیداو لەکتێبەکانی دیکەیدا خستوونیەڕوو بەکەم دەگرن، یان تەنانەت هەیانە کەخۆی بەمەلاو زانا دەزانێ کەچی لەئاست ئەو پیاوە

١- بڕوانە: لاپەرە ٣٦، ٣٧ هەروەها بڕوانە: (شبهات حول الفكر الإسلامي المعاصر) للمستشار: سالم البهنساوي، ص٣١١ تا٣٢٤، وە بڕوانە: (ذكريات لامذكرات) ص٢٨١، ٢٨٢، للأستاذ التلمساني.

بەرزەدا ئەدەبی زانایەتی بزر دەكات و قسەی ساردو سووكی لەبەرانبەردا دەكات![1] ئەوە دەبێ بۆیان لەخوا بپاڕێینەوە كە چاوپێچكی نەزانیو بێئاگاییان لاسایی‌كردنەوەو دەمارگیریی (التقليد والتعصب)یان لەسەر چاو لاببات و، دڵیان لەبوغزو كینەو غەرەز پاك وەكات!

٥- هەرچەندە ئەو پانتایی (مساحة)یەی كە بۆ خستنەرووی هەڵوێستە جوامێرانەكانی سەیید قوطب تەرخان كراوە لەهی زاناو پێشەوایانی دیكە زیاترە، بەڵام پێم وایە هەم ئەو مامۆستا شەهیدە (إنشاءالله) ئەوەندە هەقەی لەئەستۆی بەندەدا هەیە كە زۆر لەبەرهەمەكانی بەتایبەت (في ظلال القرآن)ەكەی بەهرەمەند بووە، لەسەرەتای تەمەن و هەوڵدانی بۆ تێگەیشتن لەئیسلام دا، وە هەم ئەو هەڵوێستە ئیمانی‌یانەی سەییدیش ئەوە هەڵدەگرن لە كتێبێك دا كە لەبارەی هەڵوێستی جوامێرانەی زاناو پێشەوایانەوە دەدوێ، ئەو چەند لاپەڕەیەی بۆ تەرخان بكرێن و، بێگومانیشم هەركام لەهەڵوێستەكانی ئەو شۆڕە سوارەی مەیدانی كارو خەباتی ئیسلامی‌یە، وەك هەڵوێستەكانی زاناو پێشەوایانی دیكەمان چرایەكی ڕێڕۆشن كەرەوەو نیشانەو قووچكە (مَعْلَمْ)یەكی سەر ڕێی مسوڵمانەتی‌و بەڕاستیی بەندایەتی بۆ خواكردن و جەنگ و جیهاد لەپێناودا كردنینی.













١- یەكێك لەوانە مەلایەكی زمان شڕی دانیشتووی یەمەن، كە لەجیاتی (فی ظلال..)گوتوویەتی: (فی ضلال... ضلال...) بێئاگا لەوەی كە قسەكەی بەر لەبێ ئەدەب بوون بەرانبەر بەسەیید قوطب، بێ ئەدەبی‌یە بەرانبەر بەكتێبی خوا، چونكە قورئان گومڕایی (ضلال)ی تێدا نیە!!

## دوا قسـەم دەربـارەی هەڵوێسـتە پرشـنگدارەکانی زانـاو پێشەوایانمان:

دوا قسـەی خـۆم لـەبارەی هەڵوێسـتە پرشـنگدارەکانی زانـاو پێشـەوایانمانەوە لـەم چەند کورتە خاڵەدا دەخەمەڕوو:

١- وەك پێشـتریش گوتوومانــە بێگومــان ئــەو (٢١) زانــاو پێشــەوایەی کــەمن هەڵوێستەکانیانم بەگوڵبژێرەوە هەڵبـژاردوە، هاووێنـەی دیکەشیان زۆرن و تـەنها خۆیـان نین، بەڵام ئەمانە چەند نموونەیەکیانن.

٢- بۆ ئەوەی لە هەڵسەنگاندن و نرخاندنی هەڵوێستی زاناو پێشەوا بەڕێزەکانمانـدا دووچاری هەڵـەو بێوێـژدانی نـەبین، پێویسـتە زۆر بـەوردیی بەهـەل ومـەرج و بـارودۆخی هەرکامێکیان ئاشـنا بـین، ئەوکاتـە چـاکتر پـەی بەحیکمـەتی هەڵوێستەکانیان دەبـەین، (مامۆستا مەلا سەعیدی نۆرسـی)یش جـوانی گوتـوە، کـە گوتوویـەتی ئەگـەر (عبـدالقادر الگیلانی و جلال الدین الرومي) لە ڕۆژگاری من دابان نامەکانی ڕووناکی (رسائل النور)یـان دەنووسیو منیش لەجێی وان بام (الفتح الرباني ومثنوي)یم دەنووسین!

٣- هەرچەندە بێگومان زاناو پێشەوایان سەرمەشقمانن و دەبێ چاویان لێبکـەین و پەندیان لێوەربگرین، بەڵام دەبێ وریاو دڵنیاش بین کە مەگەر چۆن دەنا ئەزموونی هـیچ زاناو پێشەوایەك ناگونجێ کت ومت و وەك خۆی دووبارە بکرێتـەوە، لەسۆنگەی ئـەوەوە کە بارودۆخ و ژینگـەو هـەل ومەرجـەکان جیـاوازو جۆراوجـۆرن، بەتایبـەت لـەبواری کـارو خەبات و سیاسەتی شەرعییەوە.

٤- نابێ بەهیچ جۆرێك ڕێـزو حورمـەت و خۆشەویسـتیمان بـۆ زانـاو پێشـەوایانمان بکەینـە بیـانوو پاسـاو (مـبرِّر)ی عـەقڵی خـۆی بەکارنـەهێنان و بـە کەلـەپورو بەرهـەم و ئـەزموونی ئـەوان وازهێنــان، چـونکە لـەحاڵێکی وادا خۆمــان و ئایینەکـەمان دووچـاری وەسـتان (جمود) دەکەین و شایەدییەکی خراپ لەسەر ئایین و بەرنامـەی تێـرو تـەواویی خوا دەدەین!..

ئا لێرەدا کۆتایی بەم بەشی چوارەم دێنین و دەچینە سەر بەشی پێنجەم و کۆتـایی ئەم کتێبە..



## خوێنەرە بەڕێزەکان!

ئـەم بەشــی پێنجەمــەمان تــەرخان کـردوە بـۆ پووچـاندنەوەی پڕوپاگەندەیـەك و قسەیەکی ژەهراوی, کە لەڕاستی تۆمەت (تهمة) زیاتر هیچی تر نیە.

دیارە هەر لەدێر زەمانیشەوە فیرعەون و نەمروودەکان بەهێزترین چـەکی دەسـتیان لەبەرانبـەر پێغەمبـەرانی خـواو هـەلگرانی مەشـخەڵ و پـەیامی هەقـدا بریتـی بـووە لـە چەواشەکردن و سەرلێشواندنی خەڵکیو، ئەهلی هەق لەبەرچاو بێزانـدنیان لـەڕێی نـاوو ناتۆرەی خراپ وە دواخستن و تۆمەتبار کردنیانەوە.

تـەماشا بکەن فیرعەونێکی طاغووتی خۆ بەپەروەردگارو پەرستراوزانی چەوسێنەر چ بوختان و تۆمەتێکی نارەوا دەداتـە پـاڵ مووسـا(علیه سـلام) بـۆ لـێخن کردنـی سـومعەو کەسـایەتیو خـەڵك و جـەماوەری سـادە لێوروژانـدنی: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ﴾[1].

واتـە: وە فیرعـەون گـوتی: لـێم گـەڕێن بـا مووسـا بکـوژم, وە بـا –بێمنـەت بـێ– لەپەروەردگاری بپاڕێتەوە, چونکە مـن دەترسـم ئایینەکـەتان لێ بگۆڕێ– و بیشێوێنێ– یاخود خراپەو ئاشووب لەوڵاتدا پەیدا بکات!!

بەڵێ وا دیارە فیرعەونەکان هێندە دڵسۆزو بەپەرۆشن بۆ (دیـن) و (ژیـن)ی خـەڵك و جەماوەر تەنانەت لەخوای پەروەردگاریش بێباکن و ئامادەن بـۆ بـەرگرییکردن لـەدین و ژینی خەڵکی، تەنانەت پێغەمبەری خواش بکوژن!!

بەڵام ئایا کێ هەیە– مەگەر یـەکجار بەسـتەزمان و نـەزان بـێ– بەقسـەی بەڕواڵـەت خۆش نیوەڕۆك بۆشی فیرعەونەکان باوەڕ بکات کـە ئـەو شـەڕو هەرایـەی لەگـەڵ بـەرەی هەق دا دەیکەن، لەسەر خوایە نەك لەسەر خورما؟!

---

١– غافر: ٢٦

کێ هەیە نەزانێ کەفیرعەونەکان دین و ژین و ئابڕوو کەرامەتی خەڵك و جەماوەریان لەژێر پێ نەفس و ئارەزوو بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا پلێشاندۆتەوە؟!

ئاخر ئەو کەسەی پێت بڵێ: دەبێ من پەروەردگاری هەرە بەرزت بم (أنا ربكم الأعلى) و نابێ جگە لەمن کەسی دیکە بپەرستی: ﴿لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ﴾[1] ، بەڵێ کەسێکی ئاواو لایەنێکی ئاوا کەخۆی بەپەروەردگارو پەرستراوت دەزانێ، چۆنی بڕوای پێدەکرێ کە لەبەرگری لێکردنی دین و ژینت دا مەبەستی خوابێ نەك خۆی؟! مەگەر هیچی بۆ خواو خەڵك هێشتۆتەوە کە بەرگریی لێبکات؟! لە حاڵێك دا کە لەژێر فشارو گوشاری فیرعەونایەتیو طاغووتایەتی فیرعەون و طاغووتەکاندا دینی خوا بێ هەواڵەو ژینی خەڵکیش شپرزە حاڵەو، خەڵك و جەماوەری چەوساوە لەتاو بێدینیو بێژینی کەوتوونەتە ئاهوناڵە! ئایا لەحاڵێکی وادا دەبێ کەسێك هەر تۆسقاڵێك عەقڵ و لێکدانەوەو ویژدانی هەبێ، دڵ لەدڵ دانی هەبێ، کە قسەوقاڵ و گاڵەگاڵی فیرعەونەکان جگە لە چەواشەکاری چی دی نیە؟!

بەهەرحاڵ ئێمە لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین بەتیشکی خۆری حەقیقەت تەمومژی تۆمەتێك کەپاڵ دەدرێتەوە لای ئیسلامییەکان بڕەوێنینەوە، تۆمەتەکەش بریتیە لەوە کە:

**(ئیسلامییەکان زانایانی ئیسلامیان خۆش ناوێن و ڕێزو حورمەتیان ناگرن)!!**

جا ئێستا با سەرنج بدەین داخۆ ئەم تۆمەتە تا چ ڕاددەیەك ڕاست و ڕەوایە، یان بەپێچەوانەوە قسەیەکی پووچ و بۆشەو، لە تەرازووی بەڵگەو هەڵسەنگاندندا وەك پووش وایە!

ئیدی ئێوەو(٧) خاڵی یەك لەدوای یەك و چڕوپڕ، بۆ ڕەواندنەوەی تەمی ئەو تۆمەتە نەگبەتە.



١- الشعراء: ٢٩

### ١- ڕەخنە لێگرتن و خەم لێخواردن بەڵگەو نیشانەی گرنگی پێدان و بەهێند هەڵگرتنە:

ئەگەر تۆمەتی ناوبراو لەسەر ئەوە بنیات نرابێ کەئیسلامیی‌یەکان کەم و زۆر ڕووی ڕەخنەو گلەیی لەزانایان و مامۆستایان دەکەن لەسەر کەم و کووڕیی‌یەکانیان! ئەوە بێگومان تۆمەتەکەیان بێ بناغەیە, چونکە هەرکەسێك شتێکی بەلاوە گرنگ نەبێ لەبیریدا نابێو پێیەوە خەریك نابێ! کەواتە: ڕەخنەو تێبینی دەربڕین لەسەر زاناو پێشەوایان– ئەگەر لەڕووی ناحەزایەتی‌یەوە نەبێو بێڕێزیو بێنەزاکەتیی تێدا نەبێ– ئەوە نەك هەر بەڵگەی بێڕێزیی نواندن و حورمەت لێنەگرتن و خۆش نەویستن نیە, بەڵکو بەپێچەوانەوە، بەڵگەو ئیسپاتی بەتەنگەوەبوون و خۆشەویستی‌و دڵسۆزیو ڕێزو پەرۆشە, پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ أَصْبَحَ لايَهتَمُّ للمسلمين فَلَيْسَ منهم)[١], واتە هەرکەسێك ڕۆژ بکاتەوەو بەخەم مسوڵمانانەوە نەبێ, ئەوە لەوان نیە.

دەجا ئاشکراشە کە خەم خواردن لە مامۆستاو پێشەوایانی مسوڵمانان و بە تەنگەوەبوونیان بەهەر شێوەیەك کە بگونجێو خزمەتیان پێ بکات و ببێتە مایەی گەشەکردن و بەرەو پێش چوونیان، یەکێکە لەکارو ئەرکە هەرە گەورەو گرنگەکان.

### ٢- قورئان و سوننەت و مێژووی ڕابردوو و واقیعی ئێستامان بەڵگەو شایەدن لەسەرئەوە کە لەنێو زانایان دا باش و باشترو چاك و خراپ هەن و دەبن:

لەسۆنگەی ئەوەوە کە زانایانیش ئادەمیزادن و ئادەمیزادەکانیش بەدەقی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ کەم و زۆر هەڵەو کەم و کووڕیی‌یان هەر هەیە: (كُلّ بني آدمَ خطاءُ وخير الخطائين التّوابون)[٢].

وە لە سۆنگەی ئەوەوە کە زانایانیش زادەو هەڵقوڵاوی کۆمەڵگاو میللەت و ژینگەکانی خۆیانن و کەم و زۆر لەلایەن دەوروبەریانەوە کاریان تێ دەکرێ بە هەردووك

---

١– رواه البيهقي عن أنس، بڕوانە: (كشف الخفا ومزيل الألباس) ج٢ص٣٦٨.

٢– أخرجه الترمذي وابن ماجه وسنده قوي, هەمان سەرچاوەو بەرگ ص١٥٨.

باری چاکەو خراپەدا, بۆیە چاوەڕوانی کردنی نەبوونی هەڵەو پەڵە لە زانایان جا هەرکەسێك و هەر چۆنێکی بن, چاوەڕوانییەکی بێجێیە, وەك پێشتریش گوتوومانە.

بەسەرنج دانی مێژووی کۆن و هاوچەرخ و واقیعی ئێستاشمان، ئەوەی گوتمان وەك ڕۆژی ڕوون دیارەو زاناو پێشەوایانیش وەك هەموو چین و توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگا چاك و خراپ و چاك و چاکترو خراپ و خراپتریشیان دەبینرێن.

ئەم ڕاستییەش هێندە ڕوون و بێ چەندو چوونە بەپێویستی نازانم لێی بدێم و تەنیا مەبەستیشم ئەوە بوو, هەموو لایەك بزانێ کە مادام زاناو پێشەوایان چاك و خراپیان هەبێ, مەدح و زەم کرانیان شتێکی ئاساییە, حەقیقەتێکیشە هەم لە قورئان و سوننەت و هەم لەمێژوو و واقیعیشدا، وەك مانگ لەشەوی چواردەدا دیارو درەوشاوەیەو مشت ومڕ هەڵناگرێ[1].

## ٣- ڕەخنە لێگرتن و بوغزاندن و ناوزڕاندنی زانا خراپەکان (علماو السوو), ڕێزو حورمەت گرتنی زاناو پێشەوا ڕەسەنەکانی تێدایە, نەك بەپێچەوانەوە:

شتێکی ڕوونە کە خەڵکی باسی شتی چاك و پەسەند بەچاکە دەکەن و مەدحی دەکەن و, شتی بە دوو خراپیش بەخراپە باس دەکەن و زەمی دەکەن, وە کەمتروایە هەستی گشتی (الحس العام)ی خەڵکی بەهۆی فیطرەتی خوا ڕسکیانەوە، کە خوا پێی داون بەهەڵەدا بچن.

ئینجا مادام خوای لێبوردەو کاربەجێو پێغەمبەری دڵنەرم و بە بەزەیی ﷺ مەدحی زاناو پێشەوایانی چاك و زەمی ئەوانەی خراپیان کردوە, دیارە ئێمەش بۆمان هەیە – ئەگەر لەسەریشمان فەرز نەبێ– کە لەبەر تیشکی وەحی خوادا مەدحی چاکیان و زەمی خراپیان بکەین, بۆئەوەی چاك بەئاگری خراپەوە نەسووتێو خراپیش لەپەنای چاك دا خۆی نەشارێتەوەو خراپییەکەی پەنهان نەکات!

---

١– ئیمام (ابو حامد الغزالي) لەبەرگی یەکی کتێبی (إحياء علوم الدين)دا و لەباسی (علم)دا باسێکی بەناوی (علماء الآخرة وعلماء السوء) هێناوە.

وه لەڕاستیدا ئەگەر بێت و چاك و خراپی زانایان وەك (دان) و (كا) لەیەك جیا بكرێنەوەو لەكەوو بێژنیگ بدرێن، نەك هیچ بێڕێزییەك و كەم حورمەتییەك بەرانبەر بەزاناو پێشەوایانی ڕاستەقینەی ئیسلام نەكراوە! بەڵكو بەپێچەوانەوە خزمەتیان پێكراوەو حورمەتیان زیادكراوە, چونكە كە خەڵك بۆی دەركەوت فلان كەسی (دین فرۆش) لەڕیزی پێشەوایانی ئیسلام نیە، بەڵكو بابایەكی (بێگانە) و (نامۆ)یە ڕەگەڵیان كەوتوە! هەموو ئەو گلەییو گازندەو تێبینیو ڕەخنانەی كە لەبابا دین فرۆشەكەوە هاتوونەتە دڵییەوە، لەجیاتی ئەوەی بەسەر هەموو زاناو پێشەوایاندا بیانگشتێنێو (تَعْمیم)یان بكات, وەك پارەی قەڵب وماڵی ساختە بەسەر كابرایان دا دەداتەوەو, دەڵێ دیارە ئەم شتانە هەر هی خۆتن و نەئیسلام پێی گوتوویو نە زاناو پێشەوایانی ئیسلامیش فێریان كردووی.

كەواتە: نابێ هیچ زاناو پێشەوایەكی ڕاست و ڕەسەن بەو ڕەخنەو گلەییو گازندەو ناوزڕاندنانە قەڵس و نارەحەت بێ كە ئاڕاستەی خەڵكی[1] دەغەڵ و پووچەڵ و ساختەی نێو جل وبەرگی پێشەوایەتی دەكرێن, بەڵام جێی خۆیەتی كە بابای دین فرۆش و ساختە قەڵس و لالووت بێت و پێشینانیش گوتوویانە: (مل بەقوڕ بۆ خۆی لەخۆی دەگات؟), عارەبیش گوتوویانە: (الخائِنُ خائِفٌ), ئەگەرنا (ئەوەی چاكە بێباكە) چونكە پەرێزی چاكەو بەرچاوی ڕووناكە.

## ٤- تەنیا زانایان ڕەخنەیان لێنەگیراوەو ڕووی گلەییان تێنەكراوەو ڕەواش نیە وابێ:

ئاشكرایە كە ئوممەت تێكڕا لەبەردەم ئەم حاڵەتی ناهەمواریو بێبەندو بارییەی كەپێیەوە گرفتار بووە, بەرپرسیارەو, ڕەست و ڕەوا نیە كەتەنیا زاناو پێشەوایان خەتابار بكرێن, هەر بۆیەش هەركەسێك لێكۆڵینەوەیەكی وردو قووڵ و واقیع بینانەی ئەم حاڵەتە پڕ گرفتارییو ناسۆرە بكات, ناچار دەبێ ڕووی ڕەخنەو گلەیی لەسەرجەم چین و توێژەكانی كۆمەڵگا بكات، لەسەرەوە هەتا خوارێ بە پادشاو گەداو زاناو نازاناو پیرو

---

[1] - بەمەرجێك تایبەت بێ بەوانەوە نەك تەڕو وشك پێكەوە بسووتێنرێو ناوی چاك و خراپ بهێنرێ.

گەنج و دەوڵەمەندو هەژارو...هتد, بەڵام بێگومان ئینسان هەتا پلەو پایەی بەرزترو توانای زیاترو قسەی ڕۆیشتووتر بێت بەرپرسیارتریشە.

وەك لەبەشی سێیەمیشدا گوتوومانە ڕاستبوونەوەی ئەم بارە لارەو چاككردنی ئەم هەل و مەرج و نالەبارو ناهەموارەش، دەبێ لەمامۆستاو زانایانی ئیسلامەوە دەستی پێبكرێ, خواش بەلوتفی خۆی بمانپارێزێ لەوەی كەبەر هەڕەشەی توندی: ﴿...وَإِن تَتَوَلَّوْاْ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمْثَٰلَكُم ﴾[١] ، واتە: وە ئەگەر پشت بكەنە – خوا – كۆمەڵێكی دیكە دێنێ پاشان ئەوان وەك ئێوە نابن.

دیارە هەركەسێكیش بەرپرسیارێتی ئەم بارودۆخ و واقیعە تەنیا بخاتە ئەستۆی زانایانی ئیسلامەوەو خەڵكی دیكەی لێدەرباز بكات, ئەوە بێگومان هەم بێویژدانەو هەم ناواقیع بین و نەزانیشە, هەروەها بەپێچەوانەشەوە هەر ڕاستەو ڕەواش نیە هیچ كەس زاناو پێشەوایانی ئیسلام لەئاست بەرپرسیارێتی ئەم واقیعەدا وەك بەرزەكی بانان دەربكات.

لەبەسەرهاتی مووساش دا (علیه سلام) كە هەتا لەكێوی (طور) گەڕاوەتەوەو تەوڕاتی هێناوەتەوە وەچەی ئیسرائیل (بنی إسرائیل) دەستیان كردوە بە گۆلك پەرستیی، بە فێڵ و پیلانی (سامري) فێڵباز, كە لەو خشڵەی پێیان بووە گۆلك (عجل)ێكی زێری بۆ دروست كردوون و وای لێكردوون كە بیپەرستن, بەرچاو ڕوونیی باش لەوبارەوە هەیە, چونكە:

أ– بەر لەهەموو كەس مووسا (علیه السلام) گلەیی لەخودی خەڵكەكە دەكات و خۆیان بە بەرپرسیار (مسئول) دەزانێ: ﴿ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًا ... ﴾[٢].



١ - محمد: ٣٨

٢– طه: ٨٦

ب- پاشان یەکسەر ڕوودەکاتە هارۆونی برای (علیە سلام)و بەتوندی ڕەخنەی لێدەگرێو سەرو ڕیشی دەگرێ: ﴿ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ﴾[1]

ج- ئینجا لەکۆتاییدا دەست دەکات بەسەرزەنشت و لێپرسینەوەی ئاگری ژێرکایە (سامِري)و عەودالی بەچکەی مانگایە: (قال فَما خَطْبُكَ يا سامِريُّ؟!)

کەواتە: بەر لەهەموو کەس خەڵك و جەماوەر بەرپرسیارن و دەبێ وریاو بێداربن و لەقسەو فەرمانی پێشەواو گەورەیان دەرنەچن و نەکەونە تەڵەو داوی پیلانگێڕان و فێڵبازانەوە.

پاشان پێشەواو چاوساغ بەرپرسیارەو دەبێ شوان و چاودێرێکی هۆشیارو بەمشووربێت، تاکو میللەت بەملاولادا لانەدات و تووشی هەڵدێر نەبێت.

وە لەکۆتاییدا خەڵکی خراپەکارو ناحەز ڕووی ڕەخنەو گلەییو گازندەی تێدەکرێو لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێو سزاو تۆڵەی بەسەردا دەچەسپێنرێ.

## ٥- ئیسلامییەکانیش هەڵەو کرچ و کاڵییان هەیەو هەمووشیان یەك جۆرە بۆچوونیان نیە:

ئێمە کە بەڕەوای نازانین تۆمەتی ڕێز لەزاناو پێشەوایان نەگرتن پاڵ بدرێتە لای سەرجەم ئیسلامییەکان، بۆئەوەی بەهەڵە لێمان تێنەگەن دەبێ ئەم دوو ڕاستییەش بخەینەڕوو:

أ- ئێمە بەڕەواو ڕاستی نازانین کە بەگشتیو تێکڕای ئیسلامییەکان بەوە تۆمەتبار بکرێن کە دانوویان لەگەڵ زانایانی ئیسلام دا ناکوڵێ و ڕێزو حورمەتیان ناگرن، چونکە ئەمە تۆمەتێکە هیچ بناغەیەکی نیە، ئاخر چۆن خەڵکێك خۆی بەئیسلامیی بزانێ زاناو پێشەوایانی خۆش ناوێن و ڕێزیان ناگرێ؟! مەگەر بەدوای هەڵلای مام کوێخا

---

[1] - طه: ٩٢- ٩٣

کەوتوە؟! ئەدی ئەگەر زانایانی ئیسلامیی خۆش نەویٚو ڕێزیان نـەگریٚ، مەگـەر کـیٚ بـرا گەورەو چاوساغ و پێشڕەویەتی؟!

پاشـان خـۆ ئیسـلامییەکان خۆیشـیان هـەر لەلایـەن زانـاو شـارەزاو پسـپۆڕانەوە سەرپەرشتی دەکرێن و پێشەوایەتی دەکرێن! ئایا کارو جموجۆڵی ئیسلامیی بـەبیٚ زانـاو چاوساغ و پێشەوای سەر ڕاست ئەنجام دەدریٚ؟!

**کەواتە:** ڕاست نیە کـە ئیسـلامییەکان بەگشـتیو تێکڕایـان ڕێـزو حورمـەتی زانـاو پێشەوایانیان لەلانەبیٚ, بەڵام بێگومـان ئیسـلامییەکانیش فریشـتەی بـیٚ هەڵـەو بـەفری بیٚپەڵە نین و کەم وکوورِییو کرچ و کاڵییـان هەیـەو (چـەم بـیٚ چـەقەڵ) و (کۆمـەڵ بـیٚ دەغەڵ) نابیٚو, حەتمەن خەڵکی واش لەڕیزی ئیسلامییەکان دا هەیە کـە هـەم لـەبواری ڕێـزو حورمـەت گرتنـی زانـاو پێشـەوایانو، هـەم لـەبوارەکانی دیکـەش خلْتـەو خاڵیـان پێوەیەو، بگرە ڕەنگە کەسانی وا هەبن هەر بەدەست و دەسیسەی پیسیش نێررابن!

ب- ئیسلامییەکان هەموویان یەك کۆمەڵ نین، تاکو سەرجەم خاوەنی یەك جـۆرە بەرنامـە (مـنهج)ی بیروبۆچـوون و هەڵسـوکەوتی کۆمەڵایـەتی (التعامـل الإجتمـاعي) و هەڵوێست و سیایەتی شەرعیی بن!

چـونکە چـەمك و واتـای ڕاسـت و واقیعـی ئیسـلامییەکان ئەوەیـە بگـوتریٚ: (ئیسلامییەکان هەموو ئەو کەسانەن کە بڕوایان بەئیسلام هەیـە، وەك تـەنها عەقیـدەی ڕاسـت و دروسـت و بەرنامـەو پـەیڕەوی هەمەلایـەنی ژیـان و گـوزەرانی تـاك و کۆمـەڵ و بەگوێرەی تواناش کار دەکەن بۆ بەرپاکردنی حوکمی شەریعەت لەژیانی میللەت دا).

جا بەپیٚی ئەم پێناسەیە ئیسلامییەکان زۆر لەوە زیاترن کە لەدوو تویٚو جـوغزی کۆمەڵێکی ئیسلامیی وەك: (کۆمەڵی ئیسلامی) و (یەکگرتوو) و (بزووتنەوە) دا کۆببنەوە, بـەڵکو سـەرجەم تویـێـژەکانی میللـەت و کۆمـەڵگا دەگرنـەوە بـەنێرو میٚـو خوێنـدەوارو نەخوێندەوارو لادیٚییو شارییو پـیرو گـەنج و مـەلاو فـەقیٚو شـێخ و صـۆفیو دەروێـش و....هتدەوە.

جا بێگومان هیچ ماقووڵ نیه هەرکەسێك لەم كۆمەڵ و توێژانە هەڵەیەكی كردو قسەو ڕەفتارێكی ناقۆڵای لێ پشكووتەوە، یەكسەر لەسەر سەرجەم ئیسلامییەكان حیساب بكرێو بكرێتە ماڵ!

چونكە من خۆم كە لەگەڵ تێكڕای چین و توێژەكانی كۆمەڵگای كورد‌ەواریی‌دا تێكەڵم و پەیوەندیو دۆستایەتیم هەیە, زۆرجار وابووە مەلایەك یان شێخێكی طەریقەت یان بابایەكی عەشایەر، ڕووی گلەیی تێكردووم لەسەر قسەیەك یان هەڵسوكەوت و ڕەفتارێكی هەڵە – یان كە ئەوان بەهەڵەیان زانیوە– پاشان كە كەوتووینە نێو قسان, بۆم دەركەوتوە كە ئەو برایەی ئەو شێخ و مەلاو ڕیش سپیو عەشایەرە گلەییان لێی هەیە, نەك هەر لە كۆمەڵی ئیسلامییدا[1] نیە تاكو ئەگەر خەتابار بێ لێپرسینەوەی لەگەڵ بكەین, بگرە لەهیچ كۆمەڵ و ڕێكخراوێكی دیكەش دا نیەو، گەلێك جار ڕەنگە لەوجۆرە كەسانە بێ كەهەبوونی كۆمەڵ و ڕێكخراو (تنظیم)ێكی ئیسلامیش بەداهێنراو (بدعة) و شتێكی هەڵەش بزانێ!! بۆیە بەهیچ جۆرێك ڕەوانیە كە هەڵەو پەڵەی كەسانی دیكە كە بە قسەی لایەنە ئیسلامییەكان ناكەن لەسەروان حیساب بكرێو كە بەردێك لە ئاسمانێوەكەوتە خوارێ، بێسێو دوو یەخەی ئەوان بگیرێ!

ئینجا نابێ لەوەش بێ ئاگابین كە مامۆستایانیش هەموویان یەك جۆرو شێوە نین و، هیچ ڕەوای هەق نیە چاك و خراپیان هەر یەك حوكمیان هەبێ و هەركەسێك گوتی: فلانە (مەلا) پێی خوار داناوە، یەكسەر تۆمەتی دژایەتی كردنی زانایان و ڕێزو حورمەت نەگرتنیانی وەپاڵ بدرێ! چونكە خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴾[2]

واتە: ئایا مسوڵمانان وەك تاوانباران دابنێین؟! ئەوە چیتانە چۆن چۆنی حوكم دەكەن!

---

١– بەلام بێگومان (كۆمەڵی ئیسلامیی)ش لەكەسانی ناشایستە خالی نیەو پاكانەی بۆ ناكەم!

٢– القلم:٣٥– ٣٦

### ٦- نابێ زاناو مامۆستایان دڵیان بەغەیری ئەهلی دین خۆش بکەن، بۆ ڕێزو حورمەت گرتن و پشتگیریکردن و دەستبار بۆ گرتن:

ئەمەیش ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرو نکووڵیی لێنەکراوو تەجرەبەکراوەو شتێکی ئاساییو چاوەڕوان کراویشە, چونکە کەسێك بڕوای بەئایین و ڕێبازێك نەبێ ڕێزو حورمەتی پەیڕەوانی بەگشتیو بەتایبەتی پێشەواو دەمڕاستانیشی ناگرێ, بگرە ئەگەر بۆی بلوێ دژایەتیو بەرەنگاریشیان دەکات!

بۆیە پێویستە مامۆستایان و زانایان هەمیشە ئەو ڕاستیەیان لەلا ڕوون و درەوشاوەبێ, کە هەر کاتێك خەڵکێکی عەلمانی (سیکۆلاریست)[1] بەڕواڵەت وایان پیشان دا کە ئەوە ڕێزیان دەگرن و پشتیان دەگرن, دڵنیا بن کە ئەو جۆرە قسەو ڕەفتارانە بێجگە لە موداراو دیبلۆماسیەت و (مجاملات) چیتر نیەو, مەبەستیشیان تەنیا فریودان و صابوون لەبنی پێدان و سەرەنجام خلیسکاندن و بەکارهێنان و (إستغلال) کردنەو هیچی دی!

باشترین سەنگی مەحەك و تەرازووی کێشان و هەڵسەنگاندنی ئەو قسەو ڕەفتارانەش ئەوەیە کە زاناو مامۆستایانی بەڕێز بەوجۆرە کەسانە بڵێن:

## کاکە گیان!

ئێمە خوامان لە خۆمان خۆشتر دەوێو (ژین)مان بەقوربانی (دین)مان دەکەین, دەجا ئێوەش ئەگەر ڕاستە لەبەر ئیسلام ڕێزی ئێمە دەگرن و پێشمان ناکەون و دەستمان بۆ بەسینگەوە دەگرن! ئەوە ئێمە خۆمانمان بەلاوە گرنگ نیە لەبەرانبەر دین و شەریعەتی خوادا, بۆیە لەجیاتی پێش خۆخستنی ئێمەو دەست بەسینگەوە بۆ گرتنمان, ئایین و شەریعەتی خوا پێش خۆتان بخەن و ڕێزو حورمەتی بگرن و دەستی بۆ بەسینگەوە بگرن! چونکە ڕێزو حورمەت و پلەوپایەی ئێمە هی ئایین و شەریعەتی

---

١- لەکتێبی (سۆزی نەتەوایەتیو بیری ناسیۆنالیزم) لەبەشی چوارەم دا (مسوڵمانەتیو کوردایەتی لەنێوان ئیسلامیو عەلمانیەکان دا) پێناسەیەکی وردی وشەی (عەلمانیەت)مان کردوە. بڕوانە چاپی چوارەم، نووسینگەی تەفسیر، هەروەها لە کتێبی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)و کتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی..) بیش دا بەهەمان شێوە.

خوایەو هی ئەوەیە کە نازناوو شۆرەتمان، جێگرو میراتگری پێغەمبەری خوا (رسول الله)یە ﷺ !

جا ئەگەر ئەو برادەرانە تەکلیف و داوای ڕاست و ڕەوای زانایان و پێشەوایانی ئیسلام و میللەتیان گرتەوەو جێبەجێکرد, ئەوە دیارە ڕێزو حورمەت و لەبەرهەستان و پێش خۆدان و دەست لەسەر سینگ دانانەکەشیان ڕاست بووە, ئەگەرنا وەك گوتمان با هیچ پێی دڵخۆش نەبن و هیچ حیسابی لەسەر نەکەن و نیشانەی پرسیار(؟!)یشی لەئاقاردا دابنێن.

بەڵێ، پێویستە لەلای هەموو کەس و بەتایبەت مامۆستایانی بەڕێز شتێکی ڕوون و بێ چەندوچوون بێ, کە تەنیاو تەنیا ئەهلی دین ڕێزو حورمەتی بەڕاستی لەزانایانی دین دەگرن و, تەنیا موجاهیدانی ئیسلامیشن کە بەڕاستی دەبنە پشتگیرو پشتیوان و قەڵغانی سەر سەرو کوتەکی دەست و خەنجەری بەر پشتێندی پێشەواو چاوساغ و مشوورخۆرانی ئیسلام و, با غەیری ئەوە دڵ بەهیچی دی و کەسی دی خۆش نەکەن و هەرگیز چاوەڕێی هاتنەدی گفت و بەڵێنی درۆو قسەی بۆش نەکەن! خوای پەروەردگاریش بەو پێغەمبەرەی فەرمووە کە ئەوان خۆیان بەمیراتگری دەزانن: ﴿ وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾[1] واتە: وە ئەگەر -دوژمنانت- ویستیان فێڵت لێ بکەن، ئەوە بێگومان خوات بەسە, هەرئەوە کە بەیارمەتی خۆیو بەهۆی بڕوادارانەوە پشتگیریی کردی.

**کەوابێ:**

پێویستە زانایانی میراتگری پێغەمبەریش ﷺ وەك پێشەواو میرات لێگیراوەکەی خۆیان بکەن و تەنیاو تەنیا دڵ بەیارمەتی خواو پاشان خەڵکی بڕوادار خۆش بکەن و بەهیوای هیممەت و بەرەکەتی کەسی دیکە نەبن, ئەگەرنا دووچاری نائومێدیو پەنجەی پەشێمانیی گەزین و دەست لەبنی هەمبانەی خاڵیەوە دەرچوون دەبن!

---

١- الأنفال: ٦٢

## ٧- بەندو تۆمەتی ڕێز لەزانایانی ئیسلام (علماء الإسلام) نەگرتن و خستنەڕووی چەند ڕاستیەکی بێقسەکەر:

هەرچەندە ماوەیەکی زۆر دوو دڵ (مُتَرَدِّدْ) بووم لە نووسینی ئەم خاڵی حەوتەمە, بەڵام سەرەنجام مەسەلەکەم هەڵبڕی‌و بڕیاری نووسینیم دا.

ئەم خاڵەش لەم چەند بڕگەیەدا دەخەمەڕوو:

**یەك:** ئاشکرایە کەتۆمەت دروست کردن بۆ هەرکەسێك کارێکی ئاسانەو تەنیا زمان و زارو شەوێلاگە جووڵاندنێکی چەند چرکە(ثانیة)یی دەوێ, بەڵام جیاوازی نێوان قسەی ڕاست و هی درۆ بەڵگەیە, هەربۆیەش خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ ... قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾[1]

واتە: بڵێ بەڵگەتان بێنن ئەگەر ڕاستگۆن!, بەم پێیە هەموو تۆمەت و قسەو دەعوایەکی بێبەڵگە، بەدرۆ (كَذِبْ) دادەنرێ‌و خاوەنەکەیشی بەدرۆکەر (كاذِبْ)!

**دوو:** سوپاس و ستایشیش بۆ خوای پەروەردگارو لێی بەزیاد بێت، وەك (التحدُّث بنعمة الله) دەڵێم: لەوەتی فامم کردۆتەوە نەك هیچ مامۆستاو زانایەکی ڕەسەن و تەنانەت هەر مەیلەو چاکیشم نەبوغزاندوە, بگرە مسوڵمانانێکیش کە زانیومەتەوە یان دیتوومەو بیستوومە بەناهەق بوغزو غەرەزەیان لەگەڵم هەبووەو غەیبەتیان کردووم و بگرە درۆو بوختانیشیان[2] بۆ هەڵبەستووم — خوای زاناو ئاشکراو پەنهان ئاگادارە — کە لەکاتی تایبەتی پاڕانەوەی خۆم دا گەردنم ئازاد کردوون و دووعای خێریشم بۆ کردوون و، ئێستاش هەر لەسەر ئەم هەڵوێست و ڕەفتارەی خۆم بەردەوامم و — إنْ شاءَالله — بەردەوامیش دەبم, چونکە خوای بەخشندەو لێبووردە فەرموویەتی: ﴿ ... وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾[3] واتە: با لێبووردن و چاوپۆشیی بکەن, ئایا حەزناکەن کە خواش لەئێوە ببووری؟ وە خوا لێبووردەو بە بەزەییە.

---

١- النمل: ٦٤

٢- مەبەست لەبوختان (بهتان)ە نەك (قذف).

٣- النور: ٢٢

**سێ**: وە ئەوە کە لەوەتی لەمەیدانی کاری ئیسلامییشدا ئەسپ تاو دەدەم, کەم و زۆر هێرشم کردۆتە سەر هەرکەس و کۆمەڵ و توێژێك کەپێم وابووە ناهەق بوون و لەئیسلام وە دوورکەوتوون! ئەوە تایبەت نەبووە بەمامۆستاو زانایانەوەو سەرجەم توێژەکانی کۆمەڵگاو میللەتم پێگرتۆتەوە، لەپادشاوە تاگەداو، لەعەوامەوە هەتا مەلا.

ئینجا ئەگەر بەش و پشکی مەلاو شێخان هەندێك جاران زیاتر بووبێ, لەبەرئەوە بووە کەپێم وابووە ئەوان پتر باریان بەلادا لار بووە, پاشان هیچ کاتێکیش بەگشتیو بەموتڵەقی باسی ئەوانیشم نەکردوەو هەمیشە چاك و خراپیانم لەیەك جیاکردوونەتەوە, هەر بۆیەش وشەو تەعبیری وەك:

کۆلکە مەلای دین فرۆش

زڕە شێخی دڵنەخۆش

مسوڵمانۆچکەی بێهۆش

فەریکە مسوڵمانی بۆ ڕژێمی طاغووتیو ڕێچکەی شەیطانیی بەجۆش

چەند وشەو تەعبیرێك بوون کە گەلێك جاران بەکارم هێناون و ڕەنگە جاری واش بووبێ زیادەڕۆییشم لەوبارەوە کردبێ, بەڵام ئەسڵی مەبەست ئەوە بووە کە پاك و پیس و چاك و خراپی مەلاو شێخ و غەیری وانیش ئاوێتەو تێکەڵ نەکرێن! چونکە وەك پێشتریش گرتوومانە: لەوجۆرە سەودایانەدا بەتەئکید زانای ڕاستەقینەو مەلاو شێخی پاك و چاك زەرەرمەندو, ئایەخ و بێبایەخ و دەغەڵ و پووچەڵەکانیش بەهرەمەند دەبن.

کەواتە: لەپەرۆش و دڵسۆزییم بۆ پێشەواو زاناو شێخی چاك و ڕەسەن هێرشم کردۆتە سەر بوودەڵەو پوچەڵەکانیان[1] و, بێگومان لەبەرانبەر ئەوەش دا چاوەڕێم کە ئەگەر سوپاسیش نەکرێم بەلای کەمەوە خەتاباریش نەکرێم!

---

١- چونکە بەدوو (قید)ی (کۆلکە)و (دین فرۆش) زاناو پێشەوای شارەزاو دیندارو, بەدوو (قید)ی (زڕ)و (دڵنەخۆش)یش شێخی ڕاستەقینەو سەرو دڵ و ساغ، لە مەلاو شێخی خراپ و ساختە جیادەبنەوە, واتە: من مەلایەکم پێخراپە کە کۆلکە مەلایەو دین فرۆشەو, وشێخێکیشم بەلاوە بۆشە کەزڕەو دڵنەخۆشە! بەڵام مەلای چاك و شێخی چاك جێی هەموو حورمەت و ڕێزێکمانن..

**چوار:** وەك لەبڕگەی پێشووشدا ئاماژەم پێکرد من لەگەرمەی بەرگریی (دِفـاعْ) لـە ئیسلام کردنم دا خۆمم بەناچار بینیوە کە هەرکەس و لایەن و توێژێك بەلار بزانم، باسی (لاریی)یەکەی بکەم و خاڵی تێدا بخەمە سەر پیتان (أَضَعُ النقاط على الحروف)، بۆئەوەی هەرکەسێك ئەو لاریی‌و نارێکی‌یەی بینی، یەکسەر نەیخاتە سەر ئیسلام و بزانێ کە ئەو کەس و لایەن و کۆمەڵە، کە هەڵەو لاریی‌یەکەی تێدایە، تەنیا خۆی لێی بەرپرسیارەو هەڵەو پەڵەو لاریی‌یەکەی ماڵێکی قەڵبەو سەربەخۆیەتی! هەر بۆیەش وێڕای زنجیرەی:

(ئیسلام و ڕێچکان) کە (سۆزی نەتەوایەتی)یش ئاڵقەیەکیەتی، وەنامیلکەی: (کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟!) وە زنجیرەی: (با چاکتر ئیسلام بناسین!)[1] وە نامیلکەی: (چارەسەری کێشەی کورد لەنێوان ئیمان و پەرلەمان دا) وە کتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان: ڕاستی‌یەکانی ئیسلام و دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکاندەپووچێنەوە)، بەڵێ وێڕای ئەم کتێب و نامیلکانە کە وێڕای هەقێتی ئیسلام، پووچێتی ڕێچکەو بیردۆزەکانیشیان تێدا خراوەتەڕوو، چەندان کتێب و نامیلکەشم -سەرەڕای چەندان کۆڕو دەرس و وتار- تەرخان کردوە، بۆ خستنەڕووی هەڵەو پەڵەو کەم وکووڕی مسوڵمانان بەگشتی‌و ئیسلامیی‌یەکان بەتایبەت، بۆ وێنە: لەبارەی نارێکیی‌و هەڵەو پەڵەکانی: (بزووتنەوەی ئیسلامیی) -کاتی خۆی- یەوە هەرکام لە:

(دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی)و (بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و قۆناغی نوێی)و (بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون)م نووسیوە.

وە دەربارەی حاڵەت و جم وجۆڵ و کاروبێداریی ئیسلامیی کوردستان بەگشتی، کتێبی: (چەند ڕێڕوونیی‌یەك بۆ ئیسلامیی‌یەکانی کوردستان)م نووسیوە.



---

[1] - دوایی تێکەڵ بە بەشی یەکەمی (مسوڵمانی کامڵ) کرا، دواتریش بەشی یەکەمی مسوڵمانی کامڵ تێکەڵی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی..) کراو (خواپەرستیی مسوڵمان)یش بە ناوو نیشانی: (خواپەرستیی ئیسلامیی..)و لەچوار بەرگ دا کرایە کتێبێکی سەربەخۆ.

وه بەتایبەت لەبارەی تەزکیەی نەفس و ڕاست کردنەوەی هەڵەو کەم و کووڕییەکانی ئەهلی تەصەووف و ڕێبازەکانی تەصەووف (طرق التّصوّف)وە کتێبی: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)م نووسیوە.[1]

وە دەربارەی زانایانی ئیسلام و سەرنج و تێبینییەکانم لەسەر ئەوان و جۆرو شێوازی پێشەوایەتی کردنیان و، ئامۆژگاریکردنی گەنجەکان بەگشتیو بەتایبەت فەقێو قوتابیانی زانستە شەرعییەکان و هەڵسوکەوت کردنیان لەگەڵ مامۆستایان دا، ئەم کتێبەی بەردەستتانم نووسی: (**زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟!**)

کەواتە: مەسەلەی قسەکردن و نووسین لەبارەی زاناو پێشەوایانی ئیسلامەوە بەمەلاو شێخ و غەیری ئەوانیشەوە ئاڵقەیەکە لە زنجیرەیەك و بەشێکە لە ستراتیژێکی گشتیو کەم و زۆرپەیوەندی بەڕێزو حورمەت نەگرتنی پێشەوایانەوە نەبووەو نیە!

**پێنج:** هەرچەندە بەندە بۆ ڕێدۆزینەوەو بەرچاوڕوون بوونەوەم پاش هیدایەتی خوای دادگەرو بەخشەر هیدایەتدەر، زیاتر خۆم بە قەرزارو منەتباری زاناو پێشەوایانی پێشوومان دەزانم، بەهەموو جۆرو توێژەکانیانەوە هەر لەتوێژەرەوانان (مُفسرين)ی وەك: (الطبري و الرازي و القرطبي و ابن كثير و الزمخشري و الآلوسي سيد قطب)وەو ڕاڤەکەرانی سوننەت (شُراح السنة)ی وەك: (النووي و البغوي و ابن تيمية و ابن القيم و ابن حجر العسقلاني و الشوكاني و سيد سابق و الألباني)...هەتا سەرجەم زانایانی شەرعزان (فقيه) و پسپۆڕی بواری تەزکیەو .... هتد، کە ستایش و سوپاسی شایستە بۆ خوا، ماوەیەکی زۆری ئەوەندە تەمەنەی کە گوزەراندوومە لەخزمەت ئەو بەرهەمە بەهێزو پێزانەو هاو وێنەکانیاندا بووم و لێیان بەهرەمەند بووم، بەڵام وەك وەفاو قەدر زانین بەپێویستی دەزانم ئەگەر تەنیا بەناوهێنانیش بێ ئاماژەیەك بەو زاناو مامۆستا بەڕێزانەی کوردستان بکەم کە چ بەدەرس لەلا خوێندن بێ چ بەنیزیکیو سەردان و دیدارو هاموشۆ، کەم و زۆر چ لەڕووی زانستییەوەو چ لەڕووی ڕەوشتییەوە، لێیان سوودمەند بووم:

---

١- بەتایبەت چاپی سێیەمی کە گەلێك شتی گرنگی لێ زیادکراوە.

١- مامۆستا مەلا ئەحمەدی سکتانیی[١] ناسراو بە (قاضي) کە یەکەمین مامۆستام بووە، دەرسی زانستە شەرعییەکانی لەلا بخوێنم, لەساڵی (١٩٧٤)ز لەڕانیە, لە (پەیمانگای ئیسلامیی).

٢- مامۆستا مەلا شێخ ئەمین شێخ مصطفی پێنجوێنی.

٣- مامۆستا مەلا (عبدالله) هەڵەبجەیی.

٤- مامۆستا مەلا (عبدالله) خەیاڵ.

٥- مامۆستا مەلا (عبدالرحمن): ئەو چوار مامۆستا بەڕێزەش لە (پەیمانگای ئیسلامیی) لەسلێمانی دەرسیان پێگوتووم.

٦- مامۆستا مەلا (حسین)ی دەشتێوی[٢]

کە ساڵێك لە حوجرەکەیدا بووم لەمزگەوتی (مەولەوی) لەسلێمانیو لەڕووی زانستیو ڕەوشتییەوە لێی بەهرەمەند بووم.

٧- مامۆستا مەلا (ئەحمەد)ی قاضی, شاعیرو صۆفی کە جاروبار لەسلێمانی هاموشۆیم دەکرد، لەڕووی مەعنەوییەوە سوودم لێبینیوە.

٨- مامۆستا مەلا (محمد)ی بەردەڕەشی کە بۆ دواجارو ماوەی چەند مانگێکی (١٩٨١-١٩٨٢)ز لەدێی (بەردەڕەش)ی سەر بەشاری (بانە)ی کوردستانی ئێران دەرسم لەلا خوێند.

هەروەها ئەم چەند مامۆستا بەڕێزانەش کەم و زۆر لێیان بەهرەمەند بووم, هەرچەندە بەڕێژەیەکی کەمتر لەوانەی پێشوو:

١- مامۆستا مەلا (عبدالکریمی مُدرس).

٢- مامۆستا مەلا (عثمان عبدالعزیز)ی پریسی[٣]

٣- مامۆستا مەلا (محمد طە)ی بالیسانی[٤].

٤- مامۆستا مەلا (سید محمدی پیرداودی)

---

١- (سکتان) دێیەکە لەناوچەی خۆشناوەتی.

٢- (دەشتێو) دێیەکە لەڕۆژهەڵاتی قەڵادزەوەیە لەناوچەی پشدەر.

٣- ناوی دوو دێیە لەنزیك هەڵەبجە (پریسی سەروو) و (پریسی خواروو).

٤- (بالیسان) دێیەکە لەناوچەی خۆشناوەتی.

٥- مامۆستا مەلا (مجيد)ی شەقڵاوەیی.

٦- مامۆستا مەلا (شَيخ عبداللطيف)ی واژەیی[١]

٧- مامۆستا مەلا (محمد)ی نوورەدینی[٢]

٨- مامۆستا مەلا (سيد أحمد)ی نوڵچکەیی[٣], ناسراو بە (مەلا پەپوولە).

٩- مامۆستا مەلا (سيد نجم الدين) عەنەبی[٤].

١٠- مامۆستا مەلا (شێخ صديق)ی سەرگەتی[٥].

خوا پاداشتی یەك یەکیان بە چاکترین شێوە بداتەوەو ئەوانەیان کە دنیایان بەجێهێشتوە خوا لەگەڵیان بەکەرەم بێت و پلەو پایەیان بەرزو بەرزتر بکاتەوەو لەچڵکی گوناح و هەڵەو پەڵەکانیان خاوێنیان بکاتەوەو, ئەوانەشیان کە ماون ساغ و سەلامەت و ڕاوەستاوو نەلەخشاوبن.





١- (واژە) دێیەکە لەناوچەی شارباژێر.

٢- (نوورەدین) دێیەکە لەنیزیك قەڵادزەوە.

٣- (نۆڵچکە) دێیەکە لەناوچەی بەری مەرگەو سەر بەناحیەی (بنگرد)ە

٤- (عەنەب) دێیەکە لەنیزیك هەڵەبجەوە.

٥- (سەرگەت) دێیەکە لەناوچەی هەورامان و لەنیزیك ناحیەی (بیارە)وەیە.

**لەکۆتاییش دا دەڵێم:** هەرکەسێك دان بەفەزڵ و چاکەی زاناو مامۆستایانی بەڕێزو دڵسۆزی کوردستان دا نەهێنێ، کە لەسەختترین هەل ومەرج و دژوارترین بارودۆخی هەمیشە پڕ کێشەو گرفت و ناسەقامگیری وڵات دا، دەستیان لە بڵاوکردنەوەی زانستە شەرعییەکان و تێگەیاندن و پێگەیاندنی فەقێو قوتابیان هەڵنەگرتوە ! دیارە یان بابایەکی بێئاگاو نەشارەزایە, یان سپڵەو نا سپاس و بێ ویژدانە !

بەڵام هیچ گومانیش لەوەدا نیە کە کەم و کووڕییش لەهەموو لایەکەوە زۆر بووەو زۆرەو حەیفێ نەك هەر گشت (مەلا ناو)[1]یکیش مەلا نیە, بگرە– لەگەڵ ڕێزو حورمەتمان بۆ مەلای چاك و ڕەسەن– (مەلا ناو)ی وا هەیە (بەڵا)یەو بەمل ئیسلام و مسوڵمانان دا هاتوەو، کارێك بەئیسلام دەکات بۆ شێواندن و بێزراندنیەو, زەبرێك لە مسوڵمانان دەدات بۆ چەواشەکردن و هەڵخەڵتاندنیان, هیچ ناحەزو دوژمنێکی ئیسلام و مسوڵمانان ئەوەی لەدەست نەیەت و، ئەو خزمەتەی بۆ ئەهلی کوفرو نیفاق پێنەکرێت ! !

**ئیدی وەك مامۆستایان دەڵێن:**

خوایە ئەوەی چاکە چاکتری بکەیەو ئەوەی خراپە چاکی بکەیەو ئەوەش کە چاك نابێ پاکی بکەی!

لەکۆتاییشدا دەڵێم:

**سُبْحانك اللّهم وبِحَمْدِكَ, أشْهَدُ أنْ لا إله إلا أنت, أسْتَغْفِرُكَ وأتُوبُ إليك**

**(٩)ی (ذوالحجة) ١٤٢١ك بەرانبەر بە ٢٠٠١/٣/٤ز**

**دوا پێچوونەوەی بۆ چاپی سێیەم:**

**١٩ی ذي القعدة ١٤٣١هـ/ ٢٧/١٠/٢٠١٠ز**

**هەولێر**



---

١- (مەلاناو) کەسێکە کە لەلامەلایەتی بەس ناوەکەی پێبڕابێ, وەك (سەلەفی ناو) (صۆفی ناو) و (شێخ ناو).. هتد.

 ناوەڕۆك 

 

## بەرهەمەكانی دانەر



١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی ٢/ ٢٠٠٦.

٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچكان. چاپی ٣/ ٢٠٠٦

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا. چاپی ١ /١٩٨٧

٤- كۆمەڵی خوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید كێیەو چۆنە؟ چاپی٣ /٢٠٠١

٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامی. چاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ كامەیە؟! چاپی ١/ ١٩٨٩

**تێبینی:** دواتر خرایە نێو كتێبی (مسوڵمانی كامڵ: بەشی یەكەم: بیروبڕوای مسوڵمان) وە دواتر ئەمیش خرایە نێو كتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە .

٨- ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون. چاپی ٣ /٢٠٠٥، بۆ عەرەبیش تەرجەمەكراوەو لەژێر چاپە.

٩- كوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! چاپی ١ / ١٩٨٩

١٠- حوكمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغووت. چاپی ٢ /٢٠٠٥

١١- سۆزی نەتەوایەتیو بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا. چاپی٣/ ٢٠٠٥

١٢- مسوڵمانی كامڵ/ بەشی یەكەم: بیروبڕوای مسوڵمان. چاپی ١ /١٩٩٧

**تێبینی:** ((دواتر خرایە نێو كتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە)).

١٣- چارەسەری كێشەی كورد لە نێوان ئیمانو پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢

١٤- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣

١٥- بزووتنەوەی ئیسلامییو ئایندەیەكی گەشو ڕوون. چاپی ١/ ١٩٩٥

١٦- پرۆژەی بەرنامەی فیكریی كاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٧- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەكانی كوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٨- ئیسلامو كێشە هەنووكەییەكان. چاپی ١ /١٩٩٥

١٩- با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات. چاپی ٢ /٢٠٠٦.

٢٠- مسولمانی کامڵ: بەشی دووەم/ خواپەرستی مسولمان - بەرگی یەکەم . چاپی ١ / ٢٠٠٠ .

٢١- مسولمانی کامڵ: بەشی دووەم/ خواپەرستی مسولمان - بەرگی دووەم . چاپی ١ / ٢٠٠٠ .

**تێبینی:** ئەم کتێبە بە هەردووک بەرگەکەیەوە ئێستاکە بۆ جاری دووەم لە چوار بەرگدا چاپ کراوەتەوە بەناوونیشانی: خواپەرستیی ئیسلامیی .

٢٢- گەڕانەوە لای خوا (عزّ وجلّ) . چاپی ٤ /٢٠٠٥

٢٣- زانایانی ئیسلام کێن‌و چۆنن ؟! چاپی ٢ / ٢٠٠٢

**تێبینی** : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٤- بنچینە گرنگەکانی هەڵس‌وکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا، چاپی ١ / ١٩٩٩ .

**تێبینی:** ئەم نامیلکەیە باسێکی بەرگی یەکەمی کتێبی: (خواپەرستی ئیسلامیی)یە، وە بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوەو ئێستا لەژێر چاپە.

٢٥- مزگەوتەکانی کوردستان لە نێوان ئاوەدان کردنەوەو وێران کردن دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٦- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی‌یەو چۆنە؟ چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٧- بنەما شەرعییەکان‌و هێڵە گشتیەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسەن .

**تێبینی:** (ئەم نامیلکەیە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی).

٢٨- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج‌و هەڵوێستەکانی. چاپی ١ /٢٠٠١

٢٩- پاساوو بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵیی ئیسلامیی، ئاڵقەکانی: ١و ٢ و ٣ و ٤ . چاپی ١ / ٢٠٠١

٣٠- ئافرەتی مسولمانی کورد مافە شەرعییەکانی‌و ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٠.

٣١- ئافرەت‌و خێزان لە سایەی شەریعەت دا . چاپی ٢ / ٢٠٠٥

٣٢- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم . چاپی ٥ / ٢٠٠٥

**تێبینی**: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٣– چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشكو برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٤– سنووره قەدەغەكان مەشـــكێنن! (چاوپێكەوتنی دكتۆر حسین محمد عزیز) . چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣٥– چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی دا بكەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

**تێبینی**: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٦– شەهید كێیەو چ پلەوپایەیەكی هەیە؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٧– جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجو ئاگادارییەك. چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٨– بۆئەوەی لەسەر جیهادكردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٩– جیهاد لەڕێی خوادا چییەو بۆچی دەكرێو چۆن دەكرێ؟ چاپی ١/ ٢٠٠٢.

٤٠– ئەشكەنجەو زیندان (چاوپێكەوتنی هاوژین عومەر) چاپی ٢ / ٢٠٠٦ .

**تێبینی**: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی كراوەو چاپو بڵاوكراوەتەوە.

٤١– كارو پڕۆژەی ئیسلامیمان (وتاری كۆنگرەی یەكەمی كۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی ٢ / ٢٠٠٦ .

٤٢– ئیسلامو مسوڵمانەتیو كاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٤٣– ئیمانوعەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/١، ئیمانوعەقیدەی ئیسلامی چی یەو چۆنە؟! ١ تا ١٢ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٤– ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٢، خوا بە یەكگرتن (التوحید) لە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگارێتی دا. ١٣ تا ٢٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٥– ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٣، خوا بەیەكگرتن لە ناوو سیفەتو لە پەرستراوێتی دا، ٢٧ تا ٣٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٦– ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٤، ئیمان بە فریشتەكانی خوا (عزّوجل)، كتێبەكانی خوا (عزّوجل)، پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام). ٣٧ تا ٤٠ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٧– ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٥، ئیمان بە ڕۆژی دوایی قەزاو قەدەر ٤١ تا ٤٥ . چاپی ١ / ٢٠٠٨

٤٨– ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/٦، تایبەتمەندییو دیدو بۆچوونەكانی

